

# بەراوردی ئایینەکان

## ( لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی شارستانی لەسەر ئایینەکان لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ )


نووسینی

أنور الجندي

وەرگێڕانی

نهاد جلال حبيب الله





نارین

بسم الله الرحمن الرحيم



ئارێن

# بەراوردی ئایینەکان

## لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی شارستانی

## لەسەر ئایینەکان لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ





نـــــاوی کتێـــــب     بەراوردی ئایینەکان

نووســـــــــینی     أنور الجندی

وەرگێرانـــــــــــی     نهاد جلال حبیب الله

نەخشەسازی نـاوەوە     کۆمپیوتەری نارین (محمد علی)

نـۆرەو سـالّی چـاپ     یەکەمی ٢٠١٢ز

ژمــارەی ســپاردن     ١٣٨٦ی سالّی ٢٠١٢ی پێدراوە

ISBN: 9953 - 85 - 989 - 2

بازاری زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی



website: www.nareenpub.com
E-mail: info@nareenpub.com
Nareen_pub@yahoo.com
تەلەفۆن: ٢٥١١٩٨٢ ٦٦ (٠٠٩٦٤)
مۆبایل: ٧٥٠٤٠٦٤٦١٠ ٠٠٩٦٤

# بەراوردی ئایینەکان

(لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی شارستانی لەسەر ئایینەکان
لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ)

نووسینی

أنور الجندي

وەرگێڕانی

نهاد جلال حبيب الله

ناریـن

# پێشەکی وەرگێڕ

خوایە سوپاس و ستایش بۆ تۆ، ستایشێ شیاوی گەورەیی و شکۆت بێ، سوپاس بۆ تۆ تـا ڕازی دەبیت. تەواوی سوپاس بۆ تۆ کە ڕازی بوویت، سوپاس بۆ تۆ پاش ڕازیبوونت، صەلاتو سـەلامی خوا لە پێغەمبەری خواو ئالوبەیتی و هاوەڵانی.

پاشان:

دەمێك بوو تامەزرۆی ئەوەبووم سەبارەت بە بەراوردی ئایینەکان شتێ پێشکەش بکرێ بە گەنجانی کوردستانی ئازیز کە بەری دڵ بگرێ و ئاهێ بە بـەردا بێنێتـەوە، چـونکە بەڕاسـتی خوێنەرانی کورد لەم بوارەدا شارەزاییان زۆر کەمەو ناحەزانی ئیسلامیش ئەم بـوارە دەکەنـە سـەنگەرێ بۆ لێدانی ئیسلام و هزری ئیسلامی، خۆزگە ئەوەشـیان بـە مـشتومڕێکی ژیرانـە ئەنجام دەدا، بەڵکو ناحەزانەو بە فێڵ و ساختە لێ نەویون چ بە نووسین یان وانەو بابـەت یـان بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ سـەبارەت بـە بـەروردکاری ئـایینی شـتانێ دەڵـێن کـە بەرگـەی شنەبایەکیش ناگرن.

هەموو هەوڵ و توانایەکی ئەم جۆرە کەسانە بۆ یەك شتە کە لەدیـدو ڕوانگـەی خۆیانـەوە یان لەلای ئەوانەوە کە پێیان سەرسامن یان تەنانەت ئەوانەش کە هاوڕایان نـین بـە شـتێکی نوێ سەیر دەکرێ، لە کاتێکدا وتـەو پـەیام و گوتاریـان هـەمان گوتـارە کۆنەکـەی جـارانی سـەردەمانی زووە کە بەرامبەر بە پەیامی خوا بەکاریان هێناوە ﴿إِن هَذَا إِلَّا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ﴾.

بەڵێ هەموو هەوڵی زۆربەی ئەوانەی ئەمڕۆ لەسەر بەراوردی ئایینەکان دەدوێن بۆ ئەوەیـە بڵێن ئیسلامیش ئەفسانەو چیرۆکی پێـشینانەو هـیچ جیاوازیـەکی نیـە لەگـەڵ ئایینـەکانی پێشوودا تا لێرەوە بڵێن هەگبەی ئیسلامیش هەمان هەگبەی ئایینـەکانی تـرەو پەیڕەویـشی وەك پەیڕەوی ئایینەکانی پێشوو هەمان ئەنجامی پێشووی دەبـێ کـە لـە ئایینـەکانی تـرەوە بینـراوە، بەرامبـەر بـەوەش بەدیلگـەلێکی وا دێـنن کـە تەمـەنی هـەر کامیـان ناگاتـە سەدەیەکیش.

هەر لە دروست بوونی مرۆڤەوە مەیدانی ململانێی نێوان مرۆڤ و شەیتان (لایەنی خراپـە) دەست پێدەکات و تا ئەمڕۆش بەردەوامەو هەتا ڕۆژی دواییش بەردەوام دەبێ، بۆیە هـەرکات خوا پەیامێکی ناردووە لایەنگرانی شەیتان هەوڵیان داوە ئەو پەیامە لەناوببەن، ئەگەر نـەکرا لاڕێی بکەن کە ئەمەیان لە لەناوبردنەکە خراپترە، ئەمەشیان بەرامبەر بە چەندین ئـایین کـرد ﴿يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِ﴾ ئەوە بـوو جوولەکایـەتییان لاڕێکـردو کردیـان بـە ئـایینێکی ڕەگەزی، مەسیحیەتیشیان لاڕێ کردو کردیان بە ئایینێکی ڕۆحی بێ جەستەی دوور لە دنیاو هەڵگری بیری سیانە خوایی.

بە بەردەوامی پەیامی خوا هەوڵیداوە بازنەی ڕەوایی ئارەزووکانی مرۆڤ بپـارێزێ و لەگـەڵ ئامـانجی ژیانیـدا بیانگونجێنـێ، دوورگـرتن لـە زێـدەڕەوی یـان کـەمڕەوی لـە گرتنەبـەری ئارەزووەکانی ژیاندا ﴿وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ الدُّنْيَا﴾هاودەم بەمە کارکردن بۆ ڕۆژی دوایی کـە ئەوە ئامانجی بالآیە﴿وَالْآخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَى﴾ واتە ئەو پێناوانەی خۆشی ژیـانی دنیـا بکـرێن بـە هۆکارێ بۆ بەدەست هێنانی بەهەشتی ڕۆژی دوایی، بۆ نموونە:

١- پەیامی خوا بۆ تێرکردنی ئارەزووی خواردن زۆربەی خواردن و خواردنـەوەکانی حـەڵاڵ کردووەو بە فەرزیشی داناوە مرۆڤ نان بخوات و بە پێویستی داناوە چێژ لە ڕۆزی خوا وەربگرێ ﴿كُلُواْ مِن طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَـاكُمْ﴾ ئەمەشی بە چاکەو هەنگاوی چاکەکاری داناوە مادەم نیـازی چاکەی هەبێ.

٢- بۆ نەرم و نیانی و ڕاستگۆیی و چاکەی نێـوان مرۆڤـەکان کـە خـودی خۆشـی ژیـانی دنیایان بۆ دێنێتە دی خوا پاداشتی ڕۆژی دوایـی دانـاوە، واتـە بـەهۆی چـوونی کەسـێ بـۆ وەرگرتنی خەڵاتێ دووبارە خەڵات دەکـرێ، ئایـا ئەمـە چ نارەحـەتی و زیـانێکی تێدایـە بـا تەنانەت ئەگەر خەڵاتی دووەمیشی تێدا نـەبێ (کـە لـە بـوونی خۆمـان زیـاتر دڵنیـاین لـە دووەمیان) ئایا تەنها بوونی خەڵاتی یەکەم ئەوە ناهێنێ کەسەکە بڕوات بۆ وەرگرتنی؟

٣- بۆ چێژی جنسی خـوا هاوسـەرگیری دانـاوەو ئەنجامـدانی کـاری جنسـی نێـوان ژن و مێردیشی بەخێرو چاکە داناوە، بەرهەمی کارەکەشیانی بەرز ڕاگرتـووە کـە بـوونی منداڵـەو

دەیکاتە سەرچاوەی بەردەوامی دەستکەوتنی پاداشت، ئەگەریش بەرهەمی منداڵی نەبێ دیدی گەشبینی و بەڵێنی پاداشتی گەورەیان پێدەدات.

بەگشتی بە مرۆڤەکان دەڵێت چاك بن بۆ یەکدی و ڕێزی یەکدی بگرن و خۆشیەکانی ژیان لەبیر مەکەن و ڕۆژی دواییش لەبەرچاو بگرن.

ئەمە ئەو دێوەزمەی بەرچاوی ناحەزانی پەیامی خوایە کە بەردەوام هەوڵیان داوە لاڕێی بکەن، بۆ ئیسلامیش هەوڵیانداوەو تا ئێستاش لە هەوڵدان و هەرگیزیش سەرناکەون ﴿يُرِيدُونَ لِيُطْفِئُوا نُورَ اللَّهِ بِأَفْوَاهِهِمْ وَاللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ﴾.

ئایا ڕاستە ئیسلامیش هەروەك پەیامەکانی ترە؟

لە جوولەکایەتیدا ڕەگەزی باڵا هەیە (شعب الله المختار) ئەمانە خوای تایبەت و جیا لە خەڵکیان هەیە (یەهوا) ژیانی دنیا تاکە ژیانەو ماددە پێوەرو بنەماو هەموو شتێکە.

لە مەسیحیەتدا: سێ خوایی هەیە، جەستە هیچەو دەبێ سزا بدرێ چونکە جەستە ڕێگری خۆشبەختی گیانە، گیان تاکە ئامانجە، جەستەو گیان پێکەوە نایانکرێ، بۆ مانەوەی یەکێکیان دەبێ ئازاری ئەوی تریان بدەیت، بۆیە ئازاردانی جەستە مەرجە بۆ حەسانەوەی ڕۆح، ژیانی دنیا هیچ نرخێکی نیەو تەنها ژیانی ڕۆژی دوایی گرنگە، چێژوەرگرتن لە دنیا تاوانە، هەموو مرۆڤێ بە تاوانباری دێتە دنیاو کەسیش ناتوانێ ڕاستەوخۆ خوا بدوێنێ.

لە زەردەشتیدا دوو خوایی هەیە، خوای چاکەو خوای خراپە، خوای چاکە هەر چاکەی لێ دەکەوێتەوە، بۆیە پێویستە خوای خراپە ڕازی بکرێ تا خراپەو توندی نەنوێنێ، دواتر مانی هات کە ئامانجی پشت گوێ خستنی ژیانی دنیاو ئازاردانی مرۆڤ بوو، مەزدەکیش ئامانجی ڕەوایی چێژەکان بوو تا مرۆڤ چ چێژێکی دەوێ وەریبگرێ بێ هیچ سنورێ.

لە ئایینە هیندیەکانیشدا کەسێ دەبرێتە ئاستی خواو پەرستنی بتەکان شانازیە چونکە دارو تەختە پەرستن ڕێی گەیشتنە بە تاکە خوا، زۆرجار بوون و نەبوونی ڕۆژی دوایی دەکرێ بە دارێکی دەستو کەی بیانەوێ ڕۆژی دوایی هەیە، کەی بیانەوێ حاشا دەکەن لە بوونی.

بەگشتی ئەوە پەیامی ئەو ئایینانە بووە، بەڵام پەیامی ئیسلام:

١- خوا تاك و تەنهایەو هەموو شتێ بەدەست خوایەو هەموو شتێ دروستکراوی خوایە.

٢- شەیتان لایەنی خراپەی گرتووەو دروستکراوی خوایەو دەسەڵاتی نیەو فێڵ و پیلانی لاوازە.

٣- مرۆڤ دروستکراوی ڕێزداری خوایەو هەمیشە خوا لەگەڵیدایەو ئاگاداریەتی، فێڵی شەیتان بەرامبەری لاوازەو مرۆڤ دەتوانێ زاڵ بێ بەسەر خراپەداو خواش لەوەدا پشت و پەنایەتی.

٤- ژیانی دنیاو ڕۆژی دواییش هەیە، خۆشیەکانی ژیانی دنیا ڕەوان لە سنوری خواییداو پشت کردنە دنیا حەرامەو دنیاپەرستیش حەرامە، بخۆ، بەڵام زۆر مەخۆو پیس مەخۆ، خۆش بخۆ. خوا پێی خۆشە شوێنەواری بەخششی خۆی بەسەر مرۆڤەوە ببینێ، خۆش و پاك بخۆ، جوان بپۆشە، جوان ببینە، جوان وەربگرە، ڕۆح و جەستەت پاك و خاوێن ڕاگرە ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ﴾.

٥- پەیوەندی نێوان خواو مرۆڤ ڕاستەوخۆیەو هیچ نێوەندێ نیە، قورئان و سوننەت تاکە سەرچاوەو دڵ و بینایی وبیستن پێناوی وەرگرتنی سەرچاوەن، کاری مرۆڤ لە ژیاندا بنیادنان و بەختەوەرییە، دڵخۆشکردنی مرۆڤەکان پێناوی گەیشتنە بە بەهەشت بەڵام نەك لەسەر بنەمای چاوپۆشی لە ڕازیکردنی خوا.

٦- بەدەر لەمانە، هەرچی پەیامی زەمینی و ئاسمانی هەن ڕۆژ بە ڕۆژ لەبەردەم ڕەوتی زانستیدا وەستاون، بەڵام ئیسلام زانست وەرگرتنی بە فەرز و پێویستی داناوە، زانا بەڕێز سەیر دەکرێ و خوا لە ڕیزی خۆی و فریشتەکاندا زانایان بە شایەت دەگرێ، زانستخواز خۆشەویستی خوایەو بوونی زانست شانازیە و زانست وەرگرتن و بەخشین ڕێی گەیشتنە بە بەهەشت.

دەی هەموو ئایین و ڕەوتەکان لەبەردەم توێژینەوە زانستیەکاندا هەڵەو کەم و کورتییان دەردەکەوێ تەنها ئیسلام نەبێ کە بەردەوام ئیعجازی دەردەکەوێ، بڕوانن چی ڕەوت و ئایین

هەیە لەگەڵ گۆڕانی زانستدا دەگۆڕێن، تەنها ئیسلام نەبێ کە بە سەقامگیری وەستاوەو ڕۆژ بە ڕۆژ ڕێڕەوی زانستی بە توێژینەوەکانی دان دەنێت بە ڕاستیەکانی ئیسلامدا، بۆیە بەدەیان بەرگ نووسینی ئیعجازی قورئان و فەرموودە دەبینین کە زۆریان لەلایەن ناحەزانی ئیسلامەوە ئەنجامدراون و دواجار بەو هۆیەوە زۆربەیان موسڵمان بوون، کەچی نابینیت بەرگێ یان دوو بەرگ لەسەر ئیعجازی ئایین یان ڕەوتێکی تر هەبێ، بەڵکو هیچ ئیعجازێکیان نیە.

لەوە زیاتر هەموو ڕەوت و ئایینەکان چوار سەدەیە لە هەموو لاوە لێدەنەون بۆ لێدان و لەناوبردنی ئیسلام، کەچی بەردەوام پێشڕەوی ئیسلام دەبینین، هەموو ئەو هەوڵانەی لاڕێکردنە نەبوونەتە هۆی ئەوەی بچووکترین گۆڕان لە سەرچاوەی ئایینەکەدا هەبێ (قورئان و فەرموودە) قورئانێ کە هەر بە حەق مانەوەی ئیعجازی گەورەیە ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾.

بەڵام داخەکەم ئەو ناحەزانەی قسەدەکەن لەسەر سەرچاوەکانی ئیسلام (قورئان و پێغەمبەر ﷺ و فەرموودە) دوای چەند سەدەیەك لەدوای پێغەمبەر ﷺ ڕاچڵەکین تا بزانن ئیسلام چیەو کەی هاتووەو موحەممەد کێیە؟ بۆ ئەوەش ناچاری گەڕانەوە بۆ نووسینەکانی ئیبن ئیسحاق و ئیبن هیشام و ئیبن خەیات و .... هتد، ئیتر چ عەقڵێ قبووڵ دەکات قسەی ئەوانە وەرگری کاتێ خودی ئەو نووسینانە مابن، کاتێ ئەو ڕۆژهەڵاتناسانە دوای چەند سەدەیەك ئینجا زانیویانە دەبێ شتێ لەسەر پێغەمبەر ﷺ و ئیسلام بزانن دەکرێ بە چ عەقڵێ قسەی چەند سەدە دواتری کەسانێکی دوور لە سەرچاوە بخەینە پێش نووسینی کەسانی هاوسەدەی سەرچاوەکانی ئیسلام.

پاش ئەمە دەڵێین کە نەخێر لە بەراوردی ئایینەکاندا بێویژدانیە ئیسلام وەك ئایینەکانی تر سەیر بکرێت چونکە:

١- نەگۆڕاوە.

٢- پێشڕەوی بەردەوامە.

٣- خاوەن سەرچاوەی چەسپاوە.

٤=ئیعجازی بەردەوامی دەردەکەوێ.

٥- لەگەڵ سروشتی مرۆییدا گونجاوەو هیچ نەگونجانێکی نیە.

بۆیە گوتاری (أساطیر الأولین) بۆ ئیسلام گوتارێکی هەڵەیەو کۆنیشە، چونکە خوا لە قورئاندا ئاماژەی پێداوە ئەم جۆری بەراوردکاریەی ئایینیە بۆ ئیسلام دەستە خەڵاتی جاهیلانی سەردەمی کۆنە، ئەوانەی تەنها بڕوایان بە ماددە هەبوو یان ئەوانەی بت و داریان دەپەرست نەك زانستێکی نوێ بێ یان توێژینەوەیەکی هاوچەرخ بێ کە ڕاستیەکی نیشان دابێت.

لەم ڕوانگەوە بە پێویستمان زانی وەك هەوڵێکی سەرەتایی نووسینێ بە کوردی بخرێتە بەردەستی خوێنەری کورد تا شارەزاییەکی دروست وەربگرن لەسەر بەراوردی ئایینەکان کە بەڕاستی پێویستی بە دەیان و سەدان نووسینی تر هەیە، بۆ ئەمەش کتێبێکی مامۆستا ئەنوەرلجوندیمان هەڵبژارد کە بەناوی (الأسلام و العالم المعاصر) دایناوە بەڵام لەبەرئەوەی هەموو نووسینەکە بەراوردی ئایینەکان لەخۆدەگرێ و بەراوردی ئیسلام دەکات لەگەڵ جوولەکەو مەسیحیەت و هیندۆسی و بوزی و بەرهەمی و زەردەشتی و مەجوسی و هیلینی و فیرعەونی و مارکسی و...هتد بۆیە بۆ چاپە کوردیەکەی ناونیشانی (بەراوردی ئایینەکان)مان هەڵبژارد.

نووسەر لەم کتێبەیدا بە دیدێکی وردی هزریەوە باس لە هەریەك لەو ئایینانەی پێشوو دەکات و لایەنە ڕاستیەکانیان دەخاتەڕوو و بەوپەڕی وردەکاری زانستیەوە مێژووی سەرهەڵدانیان و ڕەوتی ڕێکردەیان نیشان دەدات، بەڕاستی نووسینەکەشی بەرهەمێکی پڕ سوودو بەکەڵکە، بەو هیوایەی خوای گەورە بیخاتە بەر پاداشتی ڕۆژی دواییمان، پاشان مایەی سوود بێ بۆ هەر موسڵمانێك و خەڵاتێ بێ بۆ کوردستانی ئازیز.

هاوکات پێشتر کتێبێکی مامۆستا ئەنوەرلجوندیمان وەرگێڕا بە ناونیشانی (فیکری ڕۆژئاوا) کە برای ئازیزمان کاك فائق لە دەزگای (نارین بۆ چاپو بڵاوکردنەوە) بەچاپی گەیاند (خوا پاداشتی بنووسێ) لەو کتێبەشدا ژیاننامەی ئەنوەرلجوندیمان هێناوەو بە پێویستی دەزانین

لێرەشدا ئەو ژیاننامەیەی دابنێینەوە تا زیاتر ئەو کەسایەتیە بێنازو کەنارخراوە بناسرێ، ژیاننامەکەشی نووسینی مامۆستای ئازیز مامۆستا ئیکرام کەریمە کە لە گۆڤاری ڕێنوێندا بلاوی کردەوەو پاش مۆڵەتی لێوەرگرتنی بڕیارماندا لە سەرەتای ئەم کتێبەدا ئەو نووسینە دابنێین.

إن أريد الأصلاح ما استطعت وما توفيقي إلا بالله عليه توكلت و إليه أنيب.

نهاد جلال حبيب الله

١٥/٤/ ١٤٣٣

Nihad.jalal@gmail.com

# کورتەیەك لەسەر نووسەر( أنور الجندی )

## نووسینی: إکرام کریم

ئەنوەر جوندی بەحەق ئەو بیرمەندە گەورەیە کە کەم کەس ئەیناسیت، سەیرە بیرمەندو بەحیکمەت و زانایەکی وەك ئەم زاتە موسڵمانان بێ ئاگابن لێی؟! ئەم مامۆستایەی کە هەتا لەگەڵی دەڕۆیت زیاتر گەورەیی و فرەیی ئاستی بێ کۆتای مەعریفیت بۆ ئاشکرا دەبێت، قەڵەمەکەی بە راستی بەقەد شمشێری یەك سوپا بەرگری لە ئیسلام کردووە، هێندە کتێبی بەنرخی نووسیوە کە ئەگەر نەیناسیت دەڵێیت ئەمە یەکێکە لە زانا ناودارو گەورەکانی مێژووی موسڵمانان.

هەر باشە لەپاش مردنیشیان یادی زاناو پیاوە گەورەکان بکرێتەوەو لابکرێتەوە بەلای ئەو کەلەپوورەی کە بەجێی دەهێڵن بۆمان، هەرچەندە وەفاو راستی لەوەدایە کە لە ژیاندا بە یادی زاناو پیاوە گەورەکانەوە بژین و لە خزمەتیاندا گرێی دڵی خۆمانیان بۆ بکەینەوە و سوود لە حیکمەت و ئەزموون و زانستەکانیان وەربگرین و ئەوانیش ئاسوودەو دڵخۆش بکەین بە چالاکی و گوێگرتن و گوێرایەڵی بۆیان.

چەند زانا لە ژیانی خۆیاندا لە بێمەیلی خەڵکی نائومێد بون، هەبووە سەری خۆی هەڵگرتووە، هەبووە کەشکۆڵی سەفەری لێ هەڵگرتوە و هەبووە هەڵوێستی ناباش و پڕ زیانی وەرگرتوە لە خەڵکی وەك کاردانەوەیەك بۆ ئەو بێمەیلییەی خەڵکی بۆ خۆی و بۆ زانستەکەی!!

ئەبوحەیانی تەوحیدی لە کۆتایی ژیانیدا چوەتە ناو کتێبخانەکەی و چاوێکی گێڕاوە بەناویاندا و بەحەسرەت و دڵ ئێشانێکەوە تێرتێر بۆی ڕوانی و لەداخی بێمەیلی و ناحاڵی بوونی خەڵکی لێی ئاگری خۆشکردو دانەدانە هەموو کتێبەکانی سووتاند کە هەموو تەمەن و عەقڵی خۆی تیدا سەرف کردبوو!

سەعدەدینی تەفتەزانی لە گەرمەی وانەوتنەوەیدا بە قوتابییەکانی کە فێری (منطق) و (فەلسەفە) و (زانستەکانی دین)ی ئەکردن، یەکێك لە منداڵەکانی هاتە ژوورەوەو وتی: باوکە

لەماڵەوە نانمان نیە، تەفتەزانی کتێبەکەی لە دەست کەوتە خوارەوەو زمانی بەسرا، قوتابیەکانی سەریان بەرزکردەوەو عەرزیان کرد قوربان! دەرسمان بۆ تەواو بکە، هاتە زمانو وتی نانمان نیە هەموو زانستێکی لە بیر بردمەوە!

نەزری کوری شەمیل زانای گەورەی (نحو) کتێبەکانی دا بە شانیدا و لەشار چوویە دەرەوەو کەشکۆڵی سەفەری هەڵگرت ، قوتابیەکانی پێشیان لێ گرت و عەرزیان کرد: قوربان! بۆچی جێمان دەهێڵی؟ بە حەسرەتێکەوە فەرمووی: کورینە! خوا ئەزانێت ناوساجیەکم شك ببردایە جێم نەئەهێشتن !

ئەمانەو سەدان زانای گەورە کاتێك کە توێژینەوە لە کەلەپورەکانیان ئەکەیت هەست دەکەیت عملاقێکن و لە پشت یەك شاخی گەورە بەرهەمەوە وەستاون و شەو رۆژیان داوەتە دەم یەك بۆ خزمەتی دین و دنیای خەڵکی.

(ئەنوەرلجوندی) یەکێکە لەو زانایانەی کە بالای لە بالای زۆربەی زانایان و بیرمەندان بەرزترەو نووسین و شوێنەوارەکانیشی شایەتی ئەو راستیەن.

ئەنور لجوندی خاوەنی خەزێنەیەکی پر کتێبە بۆ نمونە:

١. دووسەد کتێبی هەمە چەشن لە هەموو بوارەکانی رۆشنبیری ئیسلامیدا.

٢. زیاد لە سێ سەد نامیلکەی تر کە پێکەوە قوتابخانەیەکی فیکری دائەمەزرێنن.

٣. دە (مەوسوعەی) ی گەورەی نووسیوە کە یەکێکیان بە ناوی (مقدمة المناهج و العلوم)ە کە چل بەرگەو لە (١٠) جەڵد کتێبدا کۆکراوەتەوەو ئەم مەوسوعەیەی هەوڵێکە بۆ دانانی بەرنامەیەکی رۆشنبیری تێرو تەواو کە جێگەی هەموو سەرچاوەیەك بگرێتەوە بۆ رۆشنبیرانی ئیسلامی و ئەوانەش ئەیانەوێت لەسەر ئیسلام بخوێننەوە.

**یەکەم: (موسوعة مقدمات العلوم والمناهج) کە دە موجەڵەدو ٦٣٠٧ لاپەرەیە و موجەڵەدەکانی بەم شێوەیەن:**

(١) الفكر الإسلامي (بناء الفكر الإسلامي وتطوره، مخططات غزو الفكر الإسلامي، مؤامرات إنبعاث الفكر الوثني الهليني والشرقي القديم) ط الاولى ١٣٩٩هـ /١٩٧٩م دار الأنصار بالقاهرة.

(٢) تاريخ الإسلام (من فجر الإسلام إلي العصر الحديث، عالم الإسلام وعالم الغرب_ من الوحدة الإسلامية إلي الترك والعرب

(٣) العالم الإسلامي المعاصر(عالم الإسلام المعاصر، العالم الإسلامي والغزو الصهيوني، العالم الإسلامي والغزو الشيوعي).

(٤) اللغة والأدب والثقافة (اللغة العربية وقضاياها، خصائص الأدب الغربي وقضية الشعوبية، الثقافة العربية اسلامية أصولها وانتماءها) ط دار الأنصار ١٩٨٢ م.

(٥) التبشير والاستشراق والدعوات الهدامة (التبشير والاستشراق وأثرهما في الفكر والاجتماع، المؤامرة على تاريخ الإسلام _ الإسلام والدعوات الهدامة ) ط دار الأنصار ١٩٨٣م.

(٦) المجتمع الإسلامي (نظام الإسلام، قضايا المجتمع، التربية الإسلامية ومناهج التعليم) ط دار الأنصار ١٩٨٥م.

(٧) الحضارة والعلم والعلوم الاجتماعية (مفاهيم العلوم الاجتماعية، الإسلام والحضارة، الإسلام والتكنولوجيا) ط دار الأنصار ١٩٨٦م.

(٨) طابع الإسلام بين الأديان والأيديولوجيات (عطاء الإسلام للبشرية، العلمانية في ضوء الإسلام والأيديولوجيات المعاصرة) ط دار الأنصار ١٩٨٦م.

(٩) المنهج الغربي أخطاؤه والشبهات المثارة ضد الإسلام (أخطاء المنهج الغربي الوافد _ من التبعية إلي الأصالة دراسة قضايا التعليم والشريعة واللغة العربية ـ موقف الإسلام من الفلسفات القديمة).

(١٠) تاريخ اليقظة الإسلامية في مراحلها الثلاث (اليقظة الإسلامية فى مواجهة الاستعمار _ اليقظة الإسلامية فى مواجهة التغريب _ اليقظة الإسلامية فى الشيوعية ـ والموسوعة طبعة دار الأنصار١٤٠٩ هـ.

دووهەم: (الموسوعة الإسلامية العربية) لەم بەشانە پێکدێت:

(١) أصول الثقافة العربية ومصادرها الإسلامية ط دار الكتاب اللبناني ١٩٦٤م.

(٢) خصائص الأدب العربي.

(٣) العروبة والإسلام.

(٤) الإسلام والفلسفات المعاصرة.

(٥) حضارة التوحيد وحضارة الوثنية.

(٦) الفصحى لغة القرآن.

(٧) الشريعة الإسلامية في مواجهة الرأسمالية والديمقراطية والماركسية.

(٨) الإسلام والعالم المعاصر.

(٩) سقوط العلمانية ط دار الكتاب اللبناني بيروت ١٩٩٣ هـ / ١٩٧٣م الأولى.

(١٠) الإسلام والدعوات الهدامة.

(١١) الفلسفات القديمة والمعاصرة في ضوء الإسلام.

(١٢) مفاهيم النفس والأخلاق والإجتماع في ضوء الإسلام.

(١٣) أخطاء المنهج الغربي الوافد ط دار الكتاب اللبناني بيروت الأولى ١٩٧٤م.

(١٤) مخططات التبشير الغربي في غزو الفكر الإسلامي.

(١٥) مخططات الاستشراق في تغريب الفكر الإسلامي.

(١٦) المخططات الإستشراقية في تغريب الفكر الإسلامي.

(١٧) الإسلام وحركة التاريخ ط دار الكتاب اللبناني بيروت.

(١٨) العالم الإسلامي والإستعمار السياسي، والاجتماعي، والثقافي ط دار الكتاب اللبناني بيروت الأولى ١٩٧٩م .

(١٩) التربية والتعليم والثقافة في ضوء الإسلام.

(٢٠) الشبهات والأخطاء الشائعة في الأدب والاجتماع والتاريخ ط دار الاعتصام ١٩٩٥م.

(٢١) الأخطار التي تواجه الأمم.

(٢٢) القيم الأساسية للفكر الإسلامي والثقافة العربية.

(٢٣) الإسلام والثقافة العربية في مواجهة التغريب.

(٢٤) يقظة الفكر العربي في مواجهة الاستعمار.

(٢٥) معالم الفكر العربي

**سێیەم:** (موسوعة معالم الأدب العربي المعاصر): **ئەم بەشانە لەخۆدەگرێ:**

(١) النثر العربي تطوره وأعلامه.

(٢) الأدب العربي الحديث في معركة المقاومة والتجمع.

(٣) المعارك الأدبية.

(٤) الفكر العربي المعاصر في معركة التغريب والثقافة.

(٥) الصحافة السياسية في مصر.

(٦) الشعر العربي المعاصر تطوره وأعلامه.

(٧) القصة العربية المعاصرة تطورها وأعلامها.

(٨) اللغة العربية بين خصومها وأنصارها.

(٩) أدب المرأة العربية تطوره وأعلامه.

(١٠) معالم الأدب العربي المعاصر في النقد والفنون المختلفة.

**چوارەم:** (موسوعة التأصيل الإسلامي) **ئەم کتێبانە لەخۆدەگرێ:**

(١) من سقوط الخلافة إلي مولد الصحوة ط بيت الحكمة للنشر والتوزيع بالقاهرة بدون تاريخ الجزء الأول .

(٢) من سقوط الخلافة إلي مولد الصحوة ط بيت الحكمة للنشر والتوزيع بالقاهرة بدون تاريخ الجزء الثاني .

(٣) من سقوط الخلافة إلي مولد الصحوة ط بيت الحكمة للنشر والتوزيع بالقاهرة بدون تاريخ الجزء الثالث .

(٤) من سقوط الخلافة إلي مولد الصحوة ط بيت الحكمة للنشر والتوزيع بالقاهرة بدون تاريخ الجزء الرابع.

پێنجەم: (موسوعة معلمة الإسلام)

لە دوو بەرگدا ئیسلام دەناسێنێ

(١) المجلد الأول خمسون مصطلحا في مختلف المجالات.

(٢) المجلد الثاني خمسون مصطلحا في مختلف المجالات.

شەشەم: (موسوعة العلوم الإسلامية)ط دار الاعتصام ١٩٨٢م

(١) الفكر الإسلامي والثقافة العربية المعاصرة في مواجهة تحديات الإستشراق والتبشير والغزو الثقافي.

(٢) تاريخ الغزو الفكري والتغريب خلال مرحلة ما بين الحربين العالميتين ١٩٢٠: ١٩٤٠م.

(٣) أسلمة المناهج والعلوم والقضايا والمصطلحات المعاصرة.

(٤) معالم تاريخ الإسلام المعاصر.

(٥) من اليقظة إلي الصحوة خلال المرحلة من ١٩٣٣: ١٩٨٨م.

حەوتەم: (موسوعة تاريخ الصحافة الإسلامية خلال القرن الرابع عشر الهجري من ١٣٠١ هـ: ١٤٠٠هـ، ومن ١٨٨٤: ١٩٨٠م)

(١) الصحافة السياسية في مصر منذ نشأتها إلي الحرب العالمية الثانية.

(٢) تطور الصحافة العربية في مصر (إطار لملامح المجتمع وصورة العصر).

(٣) تطور الصحافة العربية بين الحربين ١٩١٩: ١٩٣٩م في العالم العربي.

(٤) تطور الصحافة في العالم العربي بين الحرب العالمية الثانية إلي اليوم.

(٥) تاريخ الصحافة الإسلامية الجزء الأول ويتحدث فيه عن مجلة المنار.

(٦) تاريخ الصحافة الإسلامية الجزء الثاني ويتحدث فيه عن مجلة الفتح.

(٧) الصحافة والأقلام المسمومة.

(٨) الصحافة الكاريكاتورية .

هەشتەم: (موسوعة القرن الخامس عشر الهجري)

(١) الأخطاء الشائعة ط دار الاعتصام ١٩٩٥م.

(٢) معالم التاريخ الإسلامي المعاصر ط دار الاعتصام ١٩٨١م.

(٣) المد الإسلامي ط دار الاعتصام بدون تاريخ .

(٤) إعادة النظر في كتابات العصريين في ضوء الإسلام، دار الاعتصام ١٩٨٥م.

(٥) القرن الخامس عشر: قضاياه وتحدياته.

(٦) إطار إسلامي للفكر المعاصر ط المكتب الإسلامي،ط١، ١٤٠٠هـ /١٩٨٠م.

(٧) مشكلات العصر وقضايا الفكر ط.

(٨) نوابغ الإسلام ط دار الاعتصام ١٩٨٣م.

(٩) الأخطار التي تواجه الأمم.

(١٠) الصحوة الإسلامية منطلق الأصالة ط دار الاعتصام بدون تاريخ.

(١١) تصحيح المفاهيم في ضوء الكتاب والسنة ط دار الاعتصام ١٩٨٣م.

نۆیەم:(معالم التاريخ الإسلامي المعاصر)

(١) الإسلام وحركة التاريخ.

(٢) العالم الإسلامي والاستعمار السياسي والاجتماعي والثقافي.

(٣) العروبة والإسلام.

(٤) الإسلام والغرب.

(٥) الوحدة الإسلامية وعودة الخلافة.

(٦) خريطة الإسلام المعاصر.

(٧) مصر العربية الإسلامية.

دەیەم: معالم تاريخ الإسلام

(١) تاريخ الإسلام في مواجهة التحديات.

(٢) المؤامرة على الإسلام.

(٣) المخططات التلمودية والصهيونية في غزو الفكر الإسلامي.

(٤) مقدمة المناهج.

(٥) من التبعية إلى الأصالة في مجال التعليم و القانون واللغة.

(٦) ألف مليون مسلم في مواجهة الأخطار والتحديات.

(٧) حركة اليقظة الإسلامية في مواجهة الاستعمار والتغريب والشعوبية.

"محمد المجذووب"ی هاوڕێ و نوسەری دیاری میصری ئەڵێت: پەنجا بەرگی لە (معلمه الاسلام)نوسیوە!.

٥. ئەوەی دەستی پێی گەشتبێت لە ڕێبەرانی فەرهەنگ و ئەوەی هاوچەرخ لە (١٧) هەڤدە جەڵدا ژیاننامەو بەرهەم و نووسینەکانیانی داوەتە بەر ئەشتەری ڕەخنەو لێکۆڵینەوەی زانستی.

٦. ژیاننامەی گەورە پیاوانی ئیسلام بە شێوازێکی زۆر بەچێژو وردەکارانەوە کە تەنیا لەسەر ژیانی حەسەن بەننا (٣)بەرگ کتێبی نووسیوە و تیدا میتۆدی ئەو زانا بەرزانەی باس کردوە کە خۆیان و شاگردانیان لەسەر پەروەردە کردوە وەك (نوابغ الفكر الاسلامی) کە تیدا لە ژیانی (ابن خلدون و بیرونی و غەزالی و ئیبن تیمیە و ئیبن حەزم و شافعی...هتد) توێژیوەتەوە.

٧. مامۆستا ئەنوەرلجوندی بە درێژایی ٦٠ساڵی تەواو لە وتار نووسین نەکەوت و بەردەوام نووسینی لە ڕۆژنامە دیارو بەناوبانگەکاندا دەنووسی.

# ناونیشانی هەندێك لە كتێبەكانی:

١. شبهات حول الفكر الاسلامي.

٢. نقد مناهج الغرب.

٣. اخطاء المنهج الغربي الوافد.

٤. الضربات التي وجهت الى الامة الاسلامية.

٥. تأصيل مناهج العلوم.

٦. اليقظة الاسلامية في مواجهة الاستعمار.

٧. اقباس من السيرة العطرة.

٨. قضايا الشباب المسلم.

٩. نحو بناء منهج البدائل الاسلامية للنظريات و الايدولوجيات و المفاهيم الغربية الوافدة.

١٠. موقف الاسلام من العلم او الفلسفة الغربية.

١١. مقدمات العلوم و المناهج

١٢. اطار اسلامي للفكر المعاصر.

١٣. بناء منهج جديد للتعليم و الثقافة على قاعدة الاصالة.

١٤. التربية و بناء الاجيال في ضوء الاسلام.

١٥. ترشيد الفكر الاسلامى.

١٦. نظريات وافدة كشف الفكر الاسلامي زيفها.

١٧. نحن و حضارة الغرب.

١٨. وحدة الفكر الاسلامي:مقدمة للوحدة الاسلامية الكبرى.

١٩. نوابغ الاسلام.

٢٠. مصححوا المفاهم.

٢١. المسلمون على مشارف القرن خامس العشر الهجري

٢٢. اسلمة المناهج والعلوم والقضايا و المصطلحات المعاصرة.

ماموٚستا ئەنورلجوندی دوو جوٚر کتێبی گیرفانی نووسیوە:

یەکەمیان: لە ژێر ناوی (في دائرة الضوء) کە پەنجا ئەڵقە کتێبی گیرفانییە.

دووهەمیان: لە ژێر ناوی(على طريق الاصالة) ئەمیش هەر پەنجا ئەڵقەیە.

## کورتەیەکی ژیانی ئەنوەرلجوندی ( ١٩١٧-٢٠٠٢ ).

ناوی تەواوی بریتیە لە (احمد انور سید احمد الجندی) لە رۆژی دەی مانگی ربیع الاولی سالّی ١٣٣٠ کۆچی بەرامبەر سالّی (١٩١٧) ی زاینیدا لە دێی (نەخیلە)ی سەربە شاری دیروطی سەر بە پارێزگای (اسیوط) لەدایك بووە.

لە مالّێکی دینداردا هاتوەتە دنیاو باوکی پیاوێکی خوێندەوارو خاوەن کتێبخانەیەکی گەورەی خۆی بووە.

لەتەمەنی مندالّیدا و هەر لە مزگەوتی لادێکەیاندا هەموو قورئان لەبەردەکاتو ئەچێتە بەر خوێندنی حکومی.

دەست بە نووسین و وتاردان ئەکات و سەرنجی مامۆستاو هاورێکانی رائەکیشێتو لە بەشی (ئابووری و بەرێوبردنی بانکەکان) زانکۆی ئەمریکی تەواو دەکات و فێری ئینگلیزیەکی چاك دەبێت کە تایبەت بۆ ئەوە ئەیخوێنێت تا چاودێری وردی ئەو نووسینانە بکات کە دژ بە ئیسلام و موسلّمانان ئەنووسرێن، وەك پێغەمبەری خوا ئەفەرموێ (من تعلم لغە قوم امن مکرهم) هەرکەسێك زمانی میللەتێکی تر فێر ببێت ئەوە لە فرت و فێلّ و پیلانیان بەدوور دەبێت.

ئەو مامۆستاو کەسایەتیانەی کە رۆلّی گرنگیان بینیوە لە پێگەیاندنی ئەنوەر لجوندیدا بریتی بوون لە دوو کەس، یەکەمیان (حەسەن بەننا) و ئەوی تریان (شێخ فخرالدین)ناوێك کە هیچ زانیاریەك دەربارەی ئەم دووهەمەیان نیە و نازانرێت کێ بووە، ئەوەندە نەبێت مامۆستا ئەنوەرلجوندی خۆی دەربارەی ئەم شیخ فخرالدینە ئەلّێت: (لە قۆناغی گەشەکردن و دروست بوونمدا پیاوێکی بەرێزم ناسی کە ئاراستەی فیکرمی بە تەواوی گۆڕی و کردمیە خاوەنی فیکرێکی رەسەن و میتۆدێکی راست و دروست بەتایبەت لەو نووسینانەدا کە لە رۆژنامەکاندا بە گشتی و لە رۆژنامە ئیسلامیەکاندا بەتایبەتی بلاّوم ئەکردنەوە کە تا ئیستاش هەر بەردەوامم لەسەری) ئەم پیاوە گەورەیە هەر ئەوەندە لە ژیانی ئەزانرێت بەلاّم ئەوەندە بەسە کە بیرمەندێکی گەورەی وەك ئەنوەرلجوندی ئەم شایەتیەی بۆ بدات و خۆی بە

قەرزاری ئەو بزانێت وئەبێ ئێستا ڕۆحی چەندە بەختەوەر بێت کە بیرمەندێکی گەورەی وای خستبێتە سەر فیکری ڕەسەنی ئیسلامی.

بەلاّم مامۆستا حەسەن بەننا کە پیاوێکی بەناوبانگ و ڕێبەرێکی ئیسلامی گەورەیە مامۆستا ئەنوەرلجوندی سێ کتێبی لەسەر نووسیوە کە یەکەمیان لە سەرەتای گەنجێتیدا لەسەری نووسیوە بە ناوی (الاخوان المسلمون فی میزان الحق)، پاشان کتێبێکی چڕتر و زانستی تری لەسەر نووسیوە بە ناوی (قائد الدعوة...حیاة رجل وتأریخ مدرسة) سێەمین کتێبی دەربارەی حەسەن بەننا بریتی بووە لە (حسن البنا...الداعیة الامام و المجدد الشهید) کە کتێبێکی گەورەی شەش سەد لاپەڕەییەو لە تەواوی ژیانی ئەو مامۆستا بەرێزەی کۆڵیوەتەوەو سەرسامی خۆی دەربریوە بەرامبەر خۆی و فیکر و بەرنامەی کاری و ئەو قوتابخانە ئیسلامیەی کە ئەو خشت خشت پێکەوەی ناوە.

حەسەن بەننا هەر لە قۆناغی گەنجێتیدا دەستی گەشتە مامۆستا انور الجندی و بۆی دەرکەوت کە ئەم گەنجە گەوهەرێکی گرانبەهایە و پێویستە ئاراستەی تەواو بکرێت، دکتۆر یوسف القرضاوی ئەڵێت (ئیمام حەسەن بەننا بوو هانی مامۆستا ئەنوەرلجوندی دا دەست بداتە قەڵەم و بنووسێت، لەسەفەرێکی فەریزەی حەجدا لە خزمەتی ئیمام بەننا دەبێت و پێی دەڵێت: خورپەیەك بنووسە دەربارەی ئەم گەشتەمان، کە لە پاشاندا خورپەکەی بۆ ئەخوێنێتەوە سەرسام ئەبێت پێی و هانی ئەدات بۆ (نووسینی مەنهەجی).
محمود خلیل ئەڵێت: (ئیمام بەننا پێشنیاری نووسینی (مقدمات العلوم و المناهج) ی بۆ ئەکات تا ببێتە توێشوویەکی تەواو بۆ بەرەی یەکەمی بزاڤی ئیسلامی لە میصر بەتایبەتی و لە هەموو دنیادا بە گشتی) کە زانایەکی وەك محمود خلیل راست ئەڵێت:"کاری لەو شێوە بە دامەزراوەیەکی گەورەش ناکرێت".

محمود خلیلی نوسەرو هاوڕێی مامۆستا ئەنوەرلجوندی قەناعەتی وایە ئەنوەرلجوندی (پاسەوان و ئەمینداری یەکەمە بۆ فەرهەنگ و ڕۆشنبری ئیسلامی) بە درێژای چوار بەرەی یەك لە دوای یەکی ڕابوونی ئیسلامی وەك ئەڵێت:(کان انور الجندی بحق هو الامین الاول علی الثقافة الاسلامیة لاربعة اجیال متعاقبة، جیل البناء والتاسیس، جیل الصبر والجهاد ، جیل التکوین و الانتشار، جیل التربیة و المستقبل).

## خاڵەکانی وەرچەرخان لە ژیانی ئەنورلجوندیدا:

ئەنوەرلجوندی خۆی ئەڵێ: (من لە ناوجەرگەی روداوە گەورەکانەوە هاتوومەتە دەرەوە: بۆ نمونە لە ساڵی ١٩١٧ زاینیدا لەدایك بووم کەساڵی پەیمانی (بلفۆر) بوو، (تێیدا بڕیارێکی نێودەوڵەتی درا بۆ دامەزراندنی قەوارەیەکی نامۆ کە ئیسرائیلە لە لەشی دنیای ئیسلامیدا)، لەسەردەمی گەنجێتیشمدا کە ساڵی ١٩٢٤ بوو خیلافەتی ئیسلامی روخێنرا، ئەوەبوو پاش ماوەیەك مارکسیەکان لە میصردا دەستیان کێشا بەسەر دەزگاکانی ڕاگەیاندندا، پاشان گلان و ئاشبەتاڵی ساڵی ١٩٦٧ ڕویدا (ئیسر ائیل زەوی پێنج دەوڵەتی عەرەبی داگیر کرد، سینا لە میصر و جولان لە سوریا وکەرتی رۆژئاوا لە ئوردن و مەزارعی شەبعا لە لوبنان و قودس لە فەڵەستین)، داگیرکردنی قودس فاکتەرێکی زۆر گەورە بوو بۆ جارێکی تر گەرانەوەی خەڵکی بۆ لای خوا و بۆ لای ئیسلام، ئەوەش وا ئەخوازێت دەستی ئەم رابوونە ئیسلامیە بگیرێت و بەرەو روشدی فیکری ببرێت و ئەم کارەش هەموو بیرو بیرکردنەوەی منی داگیرکردوە).

## ئاستی فیکری و زانستی ئەنوەرلجوندی:

ئەنوەرلجوندی دەرچووی زانکۆی ئەمریکییەو ئینگلیزیزانێکی بەتوانایەو ئەوەی چنگی کەوتبێت لەسەرچاوەی بێگانە خوێندویەتیەوە و خوێندنەوەی بۆ زۆرێك لەو کتێب و وتارانە کردووە کە دەربارەی فیکری ئیسلامی و مێژووی ئیسلامی و بیری ئینسانی نووسراوە.

خۆی دەڵێت: لە(دارالکتب)دا لیستی زیاد لە دوو ملیون کتێبم خوێندۆتەوە و چەندین نامیلکەشم لێدروست کردوون، نێوەڕۆکی (فەهرەست)ی هەموو گۆڤارە گەورەکانی وەك (الهلال) و (المقتطف) و(المشرق)و (المنار)و (الرسالە)و (الثقافة)م خوێندوەتەوە و سەرباسی هەندێ لە بابەتەکانیانیشم لای خۆم تۆمار کردووە بەدرێژایی (بیست ساڵ) ڕۆژنامەی"الاهرام"مم نەبواردووە و خوێندنەوەم کردووە بۆ (المقطم)و (المؤید)و (الهوا) و (البلاغ)و (کوکب الشرق)و (الجهاد) و چەندین گۆڤاری تریش.

هەروەها دەیان گۆڤارو بلاْوکراوەی ترم خوێندوەتەوە کە لە ولاْتی ئێمەداو لەم سەدەیەدا هاتوونەتە بەر دیدی خوێنەران، هەموو ئەو خوێندنەوەو بەدواداچونانەم بۆ ئەوە بووە سەرکەوتوانە بابەتێکی دیاریکراو لە کاتێکی دیاریکراودا بنوسم)!!!

گەر ئەمەی کردبێت بۆ نووسینی کتیبێك یان راستکردنەوەی بابەتێك ئیتر ئاساییە کە نووسینەکانی ئەو قوولْیەو هەمەلایەنیەی هەبێت.

## سەرەتاکانی نووسینی:

ئەنوەرلجوندی کە دەستی قەڵەمی گرت، یەکەمین کتێبێك کە نووسی بریتی بوو لە (مصابیح علی الطریق) کە کتێبێکی ئەدەبی بوو ئەوکات هێشتا تەمەنی لە ٢٠ ساڵ تێنەپەراندبوو، بابەتی ئەم کتێبە بریتیە لە بەرگریکردن لە بەها جوانەکانی لادێکەی خۆی و لادێکانی میصر و تێدا باسی ئەوە ئەکات پێویستە پارێزگاری لەو بەها جوانانە بکرێت.
زۆری نەبرد کتێبێکی تری نوسی بەناوی (أخجلوا من دیارینا) کە مەبەستی بوو بە داگیرکەری بەریتانی بڵێت: لە وڵاتەکەمان بچنە دەرەوە و دەست وەرمەدەنە کاروبارمان و ئاژاوە مەخەنە ناو ماڵ و منداڵمان، دەسەڵاتی ئینگلیزی ئەوکات کە حاکمی راستەقینەی میصر بوون کەوتنە بازارو کتێبخانەکانو هەموو نوسخەی کتێبەکەیان کۆکردەوە و یاساغیان کرد بفرۆشرێت و ئەنورلجوندی لاویشیان دەستگیر کردو خستیانە بەندینخانەو چەند مانگێکی تێدا بەسەر برد.
ئەنورلجوندی فەلسەفەی لە ژیاندا ئەوە بووە (وشەی جوان و ڕاستی هەر سەر ئەگرێت با پاش ماوەیەکیش بێت).

ئەنوەرلجوندی کە کتێبی (وجهة الاسلام) ی (جب) رۆژهەڵاتناسی خوێندەوە کە راو سەرنجی کۆمەڵێك رۆژهەلاتناسی دەربارەی ئیسلام باسکردووەو ڕێژەو قەبارەی ئەو پیلانە ترسناکەی بینی ئەچێنرێت بۆ ئەم دینە، دائەچڵەکێت و دڵ و فیکری قەڵەمەکەی پێکەوە گرێ دەگرن و بڕیار ئەدات خۆی و ژیان و فکری وەقف بکات بۆ ئەوەی بەربگرێت لەو پیلانە ترسناکەی کە رۆژهەڵاتناسان کاری بۆ دەکەن.
مامۆستا ئەنوەرلجوندی خۆی لەم بارەیەوە ئەڵێ: ژیانێکی هێمنو ناسکم ئەگوزەراند کە ڕووبەڕووی (تحدی)یەکی وا بوومەوە ژیانی گۆڕیم بە ژیانێکی زۆر قووڵی هەمە لایەنە، دوو شتی سەرەکی بوونە هۆی ئەوەی ڕوو لە جۆری ئەم ژیانە بکەم و هەر ئەو دوو شتە بوو کە (گەردنگیری) و (ترسناکی) و (کارکردنی) تێدا دروستکردم تا باز بدەم بەسەر ڕووداوەکاندا:

یەکەمیان بریتی بوو لەو کتێبەی پێنج کەس لە ڕۆژهەلاَتناسان دەربارەی ئیسلام نووسیبویان یان کە (هاملتۆن جب)ی پێشەنگیان ئەو بیرۆکە زۆر ترسناکەی ڕاگەیاند کە چەند ساڵە ڕۆژهەلاَتناسان کاری لەسەر دەکەن، ئەویش بریتیە لە (تەنگپێهەڵچنینی ئیسلام) واتە هەڵکوڵینی ئیسلام لەناوەوە کە بریتی یە لە هەوڵدان بۆ ئەوەی ئیسلام بکەنە دینێکی ڕۆحی‌و قۆرخی بکەنەوە لەوەدا کە تەنیا بریتیە لە نوێژو چەند عەقیدەیەکی شەخصی و هیچ پەیوەندیەکی بە کاروباری کۆمەڵگەو سیاسەت‌و ئابوریەوە نییەو پێویستە دووربخرێتەوە لەو بوارانە، ئەم پێنج ڕۆژهەلاَتناسە کتێبەکەشیان لە هەموو ولاَتانی ئیسلامیدا بلاَوکردنەوە لە (مغریب)ە وە تا (ئەندۆنیسیا) کتێبەکە وەرگێرایە سەر زمانی عەرەبی بە ناوی (وجهة الاسلام)، ئەم کتێبە فکری هەموو داگیر کردم بە ڕادەیەك برپیارمدا لەگەڵ دڵسۆزانی تردا پەلاماری ئەم پیلانە بدەم، بەلاَم بیریشم ئەکردەوە کە چۆن‌و لە کوێوە دەست پێبکەم، منێك کە ڕێژەیەکی کەم ڕۆشنبیریم پێ هەیە، بۆیە پێوستە باش بیر لەم ڕوبەڕوبونەوەیە بکەمەوە پێش دەستەو یەخەبون لە گەڵیدا.

ئەم خولیاو خەیاڵە ئەوەندە سەرقاڵی کردم هیچ بوارێکم بۆ نەمایەوە کە کارێکی تری تێدا بکەم و ئەو هەستەم لا دروست بوو ئەبێت شان بدەمە ژێر ئەمانەتی ڕاگرتنی ئەم هێرشە ترسناکە بۆسەر ئوممەتی ئیسلامی، بۆیە دەستمکرد بە چاوخشاندنەوەیەکی تەواو بە بنەماکانی فیکری ئیسلامی و بەرنامە و مێژووی ئیسلامدا، سەر لەنوێ خوێنەوەیەکی وردم کرد بۆ مێژووی ئەم ئوممەتەو لە بەرامبەر ئەو قۆناغانەدا ئەوەستام کە تیایدا شەڕی پێ فرۆشراوە بە ئیسلام‌و ئەو شەڕو هەڵمەتانەش چۆن ڕاگیراوە بەچەکی (قورئانی پیرۆز)و (سونەتی پیغەمبەر)(ﷺ) و(ژیاننامە شیرینەکەی).

دووەمیان/ کتێبێکی تر بوو کە هی نووسەرێکی موسڵمانی ناشنام بوو، بەناونیشانی (کیف صححت اسلامی)، ئەم کتێبە بەروونی ئەوە دەردەخات ئیسلام تەنها دینێکی ڕۆحی و عیبادەتی نیە بەلکو بریتییە لە بەرنامە بۆ هەموو ژیان وپێویستیەکی تێرو تەواوە بو کۆمەڵگە مرۆییەکان، عەقیدەو عیبادەتیش بەشێکە لە ئیسلام نەك تانوپۆی ئیسلام بێت،

ئەوەم بۆ روون بویەوە کە ئەمڕۆ زۆربەی موسوڵمانان بەوشێوەیە بۆ ئیسلام ئەڕوانن کە رۆژهەڵاتنناسان و مژدەدەران وکلکەکانی روژئاوا باسی دەکەنو کاری بۆ دەکەنو هەوڵ ئەدەن ئیسلام تەنیا بەندی ناو نوێژەکانو مزگەوتەکان بێتو بە تەواوی دوری بخەنەوە لە کایەکانی سیاسەتو ئابوری‌و کومەڵناسی‌و کاری پەروەردەکردن.

بەم شێوەیە بۆم دەرکەوت راستی بانگەوازی ئیسلام چییە وئەم بیرۆکەیەی تریش چیە کە هەندێ لە ئەڵقە لەگوێکانی رۆژئاوا ڕەواجی پێ ئەدەن.

هەر لەو کاتەوەی کە لەشەڕەکانی خاچ پەرستیدا قەشە لویسی (نۆیەم)بەدیلگیراو لە نزیکەوە بۆی دەرکەوت دینەمۆی شۆڕشەکانی بەرگریکاری بریتییە لەئیسلام، بۆیە بریاریدا هێرشی سەربازی رابگرێت و بانگەشە بۆ جۆرە هێرشێکی تر بکات کە بریتییە لە(شەڕی وشە)،بە رای ئەو بەوە دەبێت چەمکی ئیسلامەتی لارو خوار بکرێت و بکرێتە دینیکی لاهوتی و ببرێتە ریزی ئەو دینانەی کە دەستیان تێخراوەو بە دەستی مرۆڤ دانراون.

ئەم پیلانە سەری لەوەوە دەردەکرد بنەماکانی ئابوری‌و پەروەردەو سیاسەت هەموو لە بازنەی ئیسلام دەربهێنرێت و چەمکی (عەلمانیەت)بەرز ڕابگیرێت و پیرۆزی پێ بدرێت !!.

جا لەو ڕۆژەوەو دروست لەساڵی(١٩٤٠)ەوە هاتمە سەر ئەو بڕیارەی پێویستە بگەڕێم بەدوای ڕەگو ڕیشەی ئەم نەخشانەدا(ڕۆژهەلاتناسان، مژدەدەران، هێرشی فکری، رۆژئاواگەری...تا لەو تویژینەوانەوە بگەمە کێشە سەرەکی‌و گەورەکە کە بریتیە لە (ڕاستکردنەوەی چەمکەکان)، دە ساڵی تەواو هەرچی دۆسیەکانی دار الکتب و گۆڤار و روژنامەکان هەیە هەمووییم خوێندەوە، لەبەر ئەوەی پێوست بوو بزانم رەگو ریشەکانی ئەم هێرشە دڕندانەیە لە کوێوە هاتووەو چۆن دەستیان پێ کردووە، چونکە رۆژنامەو گۆڤارەکان هەر لەکاتی داگیرکردنی ئینگلیزەوە تا ئەمرۆ لەگەڵ رووداوەکاندا ژیاون.

پاش ئەم خوێندنەوە زۆرە مامۆستا ئەنوەرلجوندی دەستی دایە نووسینی جددی دەربارەی ئیسلام و گەورەیی ئیسلام، هەروەك خۆی ئەڵێ (کانت اعمالي قائمة اساسا علی التعریف بعظمة الاسلام و تأریخه وتراثه وتقدیم صورة الامة الاسلامیة في مجال عظمة تاریخها و امجادها

وکان هذا مفهومی للدعوة الاسلامة) ئەمە وایکرد دوو جۆر کتێب بنوسێ: جۆرێکیان باس لە گەورەیی بەرەی یەکەمی ئیسلامەتی بکات و چوار جەڵد کتێبی بۆ نووسی بە ناوەکانی (الشرق فی فجر النهضة) و (الاسلام تاریخ و حضارة) و(صور مضیئة من التراث) و (نوابغ الاسلام)، جۆرێکی تر کە باس لە گەورەیی بەرەی هاوچەرخ بکات لە ژێر ناونیشانی (اعلام القرن الرابع عشر الهجری) کە چوار جەڵدیشی لەمەیان نووسی بە ناونیشانی (اعلام الدعوة والفکر) و (تراجم الاعلام المعاصر) ، (اعلام واصحاب الاقلام) و (اعیان البیان و اللغة)، هەروەها دەستی دایە نوسینی کتێبی (مصابیح التراث والعصر)

ئەم دوو زنجیرە لەو دوو زنجیرەیە دەچێت کە ڕێکخستنە ئیسلامیەکان لە ساڵەکانی هەشتاکاندا بە دەستنووس دەریدەکردن لە ژێر ناونیشانی (زنجیرەی ناودارانی ئیسلام) و (زنجیرەی هەلکەوتوانی ئیسلام).

مامۆستا ئەنوەرلجوندی لە سەرەتای نووسینەکانیەوە هەموو جەختکردنەوەی لەسەر ئەوە بوو (گومان و پلانەکان) وەلاَم بداتەوە تا ساڵی ١٩٨٠ و دوای ئەو سالاَنە دەستی دایە تەرشیدی رابوونو نووسینی (بەرنامە ریشەدارەکان) و (المناهج التفصیلیه) کە خۆی پێی خۆش بوو ناوی بنرێت (البدائل الاسلامیة).

کۆتا کتێبی ئەنوەرلجوندی بریتیە لە کتێبی (نجم الاسلام لا یزال یصعد).

ئەنوەرلجوندی پاش ژیانێکی پڕ سەروەری و پڕ هەژاری و بێ کەسی لە رۆژی ٢٠٠٢/١/٢٨ رۆژی دووشەمە دنیای بەجێهێشت و گیانی گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگاریو کۆتایی هات بە ماندووبونی دنیایو پاش خۆی کتێبخانەیەکی گەورەی بەجێهێشت کە بەراستی شایەتی ئەوەی بۆ ئەدەن پیاوێکی بلیمەتو تا ئەوپەر خوێنەوار بووەو موسڵمانێکی هەستیارو زۆر وریا بووە، پاسەوانێکی چاوکراوە بوە لە سەنگەرەکەی خۆیدا، خشپەیەك، تارماییەك، جووڵەیەك... کەوتبێتە بەرچاوی، خێرا سەرچاوەی ئەو شتەی دۆزیوەتەوەو زەنگی ترسناکی لێداوەو سەربازگەی موسڵمانانی بێدارکردوەتەوە بۆ ئەوەی غافلگیر نەکرێن.

## هەندێك لە ڕەوشتەکانی مامۆستا ئەنوەرلجوندی:

هەرچەندە وەك پێویست ژیانی ئەم مامۆستا بلیمەتە تۆمار نەکراوە، بەڵام چەندین زاناو نووسەری گەورە گەورە هەریەکەیان لە گۆشەیەکەوە ڕەوشتێك لە ڕەوشتەکانی ئەم پیاوەی باس کردووە:

دکتور یوسف القرضاوی ئەڵێت: مامۆستا ئەنوەرلجوندی پیاوێکی دنیا نەویست بووو بە دوای بریق و باقی دنیادا نەدەگەڕا، زۆر قانع و سوپاسگوزار بوو، هەموو ئاوات و حەزەکانی لە سێ شتدا کۆ ببوویەوە، بخوێنێت و بنووسێتو ئەو نووسینانەش بلاّویکاتەوە، وەك ئەو پیاوچاكو زانایە بوو لەناو (سلف)دا کە پرسیاریان لێ کرد: کامەرانی خۆت لە چیدا ئەبینیت؟ فەرموی: (کامەرانی لەوەدایە بەڵگەیەك ببینی کە خۆی بنوێنێ و گومانێك ببینی کە لە سەرشۆڕیدا کزکز ئەکوژێتەوە !!).

تیمێکی تەلەفزیونی ویستیان بەرنامەیەکی پێ تۆمار بکەن بۆ تەلەفزیون، پاش ئەوەی چوونە ماڵەوە بۆ لای لە خانوەکەیدا شوێنێکی گونجاوی وایان نەدۆزیەوە کە چاوپێکەوتنەکەی تێدا ئەنجام بدەن لەبەر کوتی و پەرشو بلاّوی کتێبەکان بە ژوورەکاندا، ناچار پێشنیاری ئەوەیان کرد لە یەکێك لە میوانخانەکانی شاردا ئەو چاوپێکەوتنە تۆمار بکەن، مامۆستا ئەنوەرلجوندی وتی: ئێوە بڕۆن، منیش پاشان دێم، وتیان: جا چۆن سەیارەکەت لەم کۆڵانە جەنجاڵانەدا دەرئەکەیت؟ وتی: سەیارەم پێ نیە بە پاس دێم بۆ میوانخانەکە... تیمە تەلەفزیۆنیەکە زۆر تەریق دەبنەوە کە پیاوێکی بلیمەتی وا ئەوەندە هەژارو کەمدەستە، بۆیە پاش ئەوەی بەرنامەکە تۆمار دەکەن بەڕێوەبەری مۆنتاژ لە زەرفێکدا بڕێك پارە ئەداتە مامۆستا ئەنوەرلجوندی و ئەڵێت: ئومێد ئەکەم جەنابی مامۆستا ئەم بڕە کەمەمان لێ وەربگرێ وەك دیاریەك هەرچەند شایان بە جەنابیشتان نیە، سەیرئەکەن مامۆستا ئەنوەرلجوندی پارەکە وەرناگرێو ئەڵێ: من کە چاوپێکەوتنم بۆ ئەنجامداون نیازم نەبووە بە پارە قسەتان بۆ بکەم ئامادەش نیم نیەت و نیازم بگۆڕم ، پاشان من چ شتێکی وام کردووە تا شایانی ئەوە بێت خەلاّت بکرێم! چەند ئەوان مکوریان کرد لەسەر داواکەیان ئەم هەر

قبولّی نەکردو دەستی برد تەوقەی لە گەڵدا کردن و خواحافیزی لیّ کردن، ناچار بە سەیارەکەی خۆیان گەیاندیانەوە بۆ ماڵو ناو کتێبەکانی!!! ئەمە وای کرد عبدالسلام بسیونی ئەدیب و ڕۆژنامەنوس ئەم هەڵوێستە تۆمار بکاتو بە درێژی بۆ مێژوو بڵێت(وأوصلناه و نحن في حياء منه ومن تواضعه و ورعه ونحن ايضا في خجل من انفسنا وحرصنا على الراحة و الكشخة !).

ئەنوەرلجوندی خۆی ئەڵێت: لە ژیانمدا بە دوو لێقەومانی گەورەدا تێپەربووم، یەکەمیان دامەزراندنم لە بانکی سووخۆریدا و دووهەمیان کارکردنم لە ناو ڕۆژنامە گەریدا، بەلاّم سەبارەت بە بانك ئەوە ئەوپەری هەوڵمداوە دووربم لە بەشی ژمێریاری سووخۆری و هەوڵم هەر ئەوە بوو کە تەنیا لە بەشی بازرگانیدا کار بکەم و لەگەڵ ئەوەشدا زۆر ئەترسام و زۆر خۆشم ئەپاراست لەو ترسەی تووشی حەرامێك ببم، هەمیشەش مامەڵەی پاك وبیّ غەل و غەشم ئەکرد و باسی ئیمان و پارێزکاریم بۆ چواردەورەکەم ئەکردو پێم ئەوتن ئێمە وەك ئەو کەسە واین کە ناچارە لە ناو ترسناکیەکدا ژیان بگوزەرێنیّ، بۆیە پێویستە هەمیشە چاوی بەسەر سەرچاوەی ترسناکیەکەوە بێت و لێی غافڵ نەبێت و بەردەوامیش دوعا بکات خوا رزگاری بکات لەو ترسناکیە، کاتیّ گواستیشمەوە بۆ ناو ڕۆژنامەگەری، ڕاستە سەرەتا ڕۆژنامەگەرییەکی ئیسلامی پاك و بیّ غەل بوو، بەلاّم پاشان بوو بە ڕۆژنامەگەریەکی حزبیو سیاسی، من زۆر خۆم لەوە ئەپاراست کە نەیەڵم ئەو ڕۆژنامەگەریە قوتم بدات، بۆیە سەرەتا هەر ئەو لاپەرانەم ئەگرتە ئەستۆ کە بابەتی ئەدەبی بوون، پاشان تەنیا ئەو لاپەرانەم ئەگرتە ئەستۆ کە کاروباری ئیسلامی بوون، لە بواری ڕۆژنامەگەریدا تووشی سەختیەکی تریش بووم ئەویش ئەوە بوو کارم کەوتە لای مارکسیەکان و بە فەزلی خواوە توانیم باز بەسەر هەموو فریودانەکانیاندا بدەم و دەست بە هەموو هۆکارێکی ژیانی پر عەیش و خۆشی بنێمو (دە) ساڵم بەرێکرد لە گەڵیاندا یەك خەلاّت چیە بۆم نەهاتەوەو تاکە دڵخۆشی خۆشم بەوە ئەدایەوە کە من خۆم بۆ بەرهەمهێنانی پرۆژەیەکی فیکری گەورە ئامادە ئەکەم و ئەمەویّ یەکلا ببمەوە بۆی؟

ئەنوەرلجوندي پیاوێكی تا بلێی بەدینو صالح بووە، خواناسو خواپەرست بووە، کچە تاقانەکەی ئەڵێ: باوکم هەمیشە حەزی ئەکرد دەستی بە دەست نوێژ بێت تەنانەت بۆ نانخواردنیش حەزی ئەکرد بە دەستی بەدەستنوێژەوە نان بخوات و بە دەستی بەدەستنوێژەوە بنووسێت و دوای عیشا ئەخەوت و پێش فەجر هەڵئەساو شەونوێژی ئەکرد تا بانگی بەیانی، پاشان ئەچوو بۆ مزگەوت و نوێژەکەی بە جەماعەت ئەکردو دووسەعات دوای نوێژی بەیانی ئەخەوتو پاشان هەڵئەسا هەندێك لە ئیش و کارەکانی ماڵەوەی بەدەستی خۆی ئەکرد، حەزی بە خزمەتکردنی دەرودراوسێ بووو دەبەو دەفرەکانی بۆ پڕئاو دەکردن و ئەیبردە بەردەم ماڵەکانیانو دای ئەنا، چەند جاریش نانی گەرمی لە بازار بۆ ئەهێنانەوە.

ماۆستا ئەنوەرلجوندی (غەرقی رەحمەت بێت) سوودی زۆری لەم نوێژی بەیانیانە ئەبرد، ئەوەتا خۆی ئەڵێت:(تعلّمت من مدرسة صلاة الفجر الایمان العمیق وحبّ النّاس والحرص علی مساعدتهم)

ئەنوەرلجوندی پیاوێكی کەمبلێ بووە، بەلاّم قەڵەمەکەی هەمیشە خەریکی قسەکردن بوو، دکتورژ یوسف القرضاوی ئەڵێت: جارێکیان پێموت: ئەریٚ باشە جەنابت ئەوەندە خوێندوارو رۆشنبیری بۆچی ناچییتە سەر مینبەر و قسە بۆ خەڵکی بکەیت؟ وتی: من خوا یەك پیشەی پێ داوم و هەر ئەوەش ئەزانم ئەویش بریتیە لە پیشەی قەڵەم گرتن و نووسین!! رانەهاتوم وتار بدەم و رووبەروی خەڵکی رابوەستم و قسە بکەم، وتم: ئاخر خەڵکی مافیان بەسەرتەوە هەیە کە لەو هەمووە فەرهەنگ و زانستە بەشیان بدەیت ، وتی: خوا تەنیا ئەم چەکی قەڵەمەی بە من داوە بەلاّم چەکی قەڵەم و دەمیشی بە تۆ و بە محمد الغزالی داوە، ئەوەش فەزڵی خوایە و بیەوێت بیدات بە هەر کەسێ پێی ئەدات.

# کۆتا رۆژەکانی ئەنوەرلجوندی

مامۆستا ئەنوەرلجوندی وەك دکتۆر یوسف قرضاوی ئەیگێرێتەوە و دەربارەی ئەڵێت: مامۆستا ئەنوەرلجوندی لە ساڵەکانی کۆتایی ژیانیدا زۆر بێ کەسانە ئەژیا و کەوتە سەر جێگە و گرێی خەم و خەفەتەکانی تەنیا هەر لای خوای خۆی ئەکردەوە، هەروەك چۆن یەعقوب(علیه السلام) تەنها هانای بۆ لای خوا ئەبرد و شکاتی حاڵی خۆی و بێمەیلی خەڵکی هەر لە لای پەروەردگاری ئەکرد، چەند ناخۆش بوو لەو قۆناغە هەستیارەی تەمەنیدا هاوەڵێك، ناسیاوێك، وەك پێویست لێی نەئەپرسیەوە؟ جا دکتۆر قەرزاوی ئەڵێت: زۆر ئەم شیعرەی ئیمامی عەلی ئەوتەوە کە ئەڵێت:

| | |
|---|---|
| ولا خـــــير في ود امرئ متلــون | اذا الريح مالت مال حيث تميل |
| جواد اذا استغنيت عن اخذ ماله | وعــنــد زوال المــال عنك بخيل |
| فمــا اكــثر الاخوان حين تعدهــم | و لكـنهـــم في النـــائبات قليل |

پاشان دکتۆر قەرزاوی ئەڵێ: ماوەیەك پێش مردنی کچە تاقانەکەی لە قاهیرەوە پەیوەندیەکی پێوە کردم و سەلامی باوکی پێ گەیاندم و وتی لە جێگەدا کەوتووە و لە پێ کەوتوە، خەریکە بڵێم نە کەس ئەیبینێت و نەکەس هەواڵێکی ئە پرسێت! لەگەڵ ئەو هەموو بەرهەمەیدا، ئەم وشانەی وەك تیرێك جەرگی بریم و دڵم بۆی پڕ بوو وتم سەلامم بە جەنابی باوکت بگەیەنە و دوعای خێریشم بۆی هەیە و داواکارم خوای گەورە شیفای بدات و خوا یار بێت لە فرسەتێکی نزیکدا سەردانی ئەکەمو دێم بۆ میصر بۆ لای، ئەوەبوو نامەیەك و سکرتێر ی تایبەتی خۆم کاك عصامم نارد بۆ لای تا بەڵکو سەلام و ئەحواڵپرسینی منی پێ بگەیەنێت و لە ئازارەکانی کەم بکات، کچەکەی پاش ئەو سەردانەی تەلەفونی بۆ کردم وتی باوکم زۆر سوپاسی نامەکەتی کردووە و لێت نەشارمەوە کە نامەکەتان بۆ خوێندەوە دەستی بە گریان کرد بۆ نامەکەو ئەوەشی لەگەڵ نامەکەدا بوو، وتم: جا دادە گیان مەگەر من جگە لە ئەرکی خۆم هیچی ترم کردووە؟ منیش و خەڵکێکی تریش هەموو قەرزاری باوکی تۆین و هەموو ئومەتی ئیسلامیش قەرزاری باوکی تۆیە و ان شاللە لە زووترین فرسەتدا سەریش

نەدەم لێتان، کەچی قەدەری خوا زۆری نەبرد وەفاتی کرد و ڕێکنەکەوت بۆ کۆتا جار بە خزمەتی ئەو مامۆستا پایەبەرزەم بگەم، خوا لێیخۆش بێت و لە ریزی سالحاندا وەریبگرێت‌و لە جیاتی ئێمەو هەموو ئوممەتی ئیسلامی باشترین پاداشتی بداتەوە، بە راستی مامۆستا ئەنوەرلجوندی یەکێکە لەو زانایانەی کە ئەتوانی بڵێی فەقیهێکی ئیسلامی‌و مێژوونوسێکی موسوڵمان و عارفێکی گەورە و بیرمەندێکی بلیمەت و زاهیدێکی کەموێنەو خوێندەوارێکی مەوسوعی بووە و بە کەمترین خوێندنەوەش بۆ کتێبەکانی ئەو راستیانەت بۆ ئەسەلمێت.

مامۆستا ئەنوەرلجوندی ئەوەندەی کتێب نووسیوە ئەتوانی بڵێیت کتێبەکانی ئەو بەسە بۆ هەر کەسێ کە بیەوێت توێژینەوە لە ئیسلامدا بکات یان بیەوێت بە بەرنامەیەك خزمەت بە ئیسلام بکات.

## * دەروازەی لێکۆڵینەوەکە :

زانستی بەراوردی ئایینەکان زانستێکی کۆنەو موسڵمانانی سەرەتاو پێشتر یەکەم کەسانێ بوون بە ویژدانەوە لێی نەوین و بە سپاردەکاریەوە پایەو بنەماکانی ئەم زانستەیان دانان و بەمەش لەوپەڕی لێبووردەییدا ڕاستی شتەکانیان ئاشکرا کرد، ئەبورەیحانی بیرونی و ئیبن حەزم و شەهرستانی و چەندێکی تریش بەپێی ڕێبازێکی پەیوەست و چەسپاوی دادپەروەری و ویژدان باسی بەراوردکاریەکانی ئایینەکانیان هێناوەو قسەو ڕاجیاکانیان بەوپەڕی ئازادیەوە خستونەتەڕوو و بەشێوەیەکی تەواو ڕوون و بەوپەڕی لێبوردنەوەو بەبێ لادان لە حەق و ڕاستی باسی ڕێبازو مەزهەب و ئایینەکانیان کردووە، هەرکەسیش چاوێ بخشێنێ بە کتێبی (الأطباء)ی ئیبن ئەبی ئوسەیبعە و کتێبی (طبقات الحكماء)ی ئیبن قەتفی و کتێبی (طبقات الأدباء)ی یاقووت و کتێبی (الوافي بالوفيات)ی صەفەدی و کتێبی (تأريخ حكماء الأسلام)ی بەیهەقیدا دەبینێ چۆن ئەو لێبوردەییە هەبووە.

نووسەرە موسڵمانەکان باسی ژیانی کەسانی مەسیحی و جوولەکەو مەجووسییان هێناوە وەك ئەوەی بە نەوەی یەك دەستە سەیریان بکەن، بیرونی لە سەدەی پێنجی کۆچیدا سەبارەت بە ئایینەکانی هیند کتێبی نووسیوەو هەستی هیچ کەسێکی سەر بەو ئایینانەی نەورووژاندووەو نەبووەتە هۆی هەست بریندارکردنیان.

ئەمەش لای کەس نامۆ نییە، بەڵکو نامۆییەکە لە پێچەوانەکەیدایە، چونکە ئیسلام لەسەر بنەمای بڕوابوون بە خواو کتێبەکانی و هەموو پێغەمبەرەکانی بیروباوەڕی خۆی داناوەو واتای لێبوردن و ویژدانی بەرامبەر بە هەموو ئایین و ڕەگەزو تاقمەکان بەخشیوە، بەڵکو ئەمەشی بەکارهێناوە بۆ ئەوانەش لە ئایینەکان بەدەرن بە مەرجێ گومان و دوودڵی لەناو ئومەتدا دروست نەکەن.

دیدی ئاییندارى دیدێکی مرۆییەو لە سروشتی ڕیشەیی خۆیدا هەیە مەگەر دەستەیەکی کەم نەبێ کە ئەو سروشتەیان شێواوە یان عەقڵ و درکیان تەواو نییە، بەڵام ئەم ساڵانەی کۆتایی چەند لێکۆڵینەوەیەکی نوێیان بەخۆوەدی -سەبارەت بە بەراوردی ئایینەکان- ئەمانە

هەندێکیان بە دیدی دەمارگیری ئایینی نووسەر نووسراون یان هەندێکیان لە دیدێکی تەواوی ماددیەوە دامەزراون کە بە چاوی کەمیەوە دەڕواننە ئایینەکان و هەوڵ دەدەن بە ئارەزووبازیو گاڵتەجاری ڕاڤەیان بکەن.

هەندێ لەو لێکۆڵینەوانە مۆرکی ساختەی زانستیان لەخۆداوە تا لە پشتەوە ئامانج و مەبەستەکانیان پەردەپۆش بکەن، زیاترینی ئەم کارانەش ملکەچی ئاراستەی صەهیۆنی تلموودین، ئەو ئاڕاستەی کە هەوڵ دەدات بە جارێ هێرش بکاتە سەر مەسیحیەت و ئیسلامیش چونکە ئەو دوو ئایینە دوای جوولەکە هاتوون، ئەگەریش ئایینی جوولەکایەتی بیەوێ شوێنی ئایینەکانی دوای خۆی بگرێتەوە، ئەوا ئەگەر هەمان ئایینەکەی مووسا (علیە السلام) بوایە بە دڵنیاییەوە ناکۆکیەکە کەمتر دەبوو یان لەوانەیە هەر ناکۆکی نەبووایە، چونکە سەرچاوەی ئایینەکان یەکە کە ئەویش خوایە و بنەڕەتی گەورەشیان یەکە کە یەکخواپەرستی و دادپەروەری و ئەخلاقە، بەڵام هەموو لێکۆڵینەوە زانستیەکان بەتایبەت لەلایەن خودی هاوئایینەکانیانەوە جەخت لەوە دەکەنەوە چەند ڕاڤەیەك تەئویلی ڕاستیەکانیان کردووە، چەند ڕاڤەیەکی تریش جگە لەوەی ڕاستیەکانیان گۆڕیون بگرە کەم و زیادیان تێدا کردون، ئەو دەقە یەکەمینانەی تەورات و ئینجیلیش کە دابەزین بە هیچ جۆرێ نەماون، ئەمە بڕیاری توێژینەوەی زانستیە جیا لەوەی قورئانی پیرۆزیش ئەوەی تۆمار کردووە، قورئانیش کۆتاو سەر مۆری کتێبەکانە.

سەرەڕای ئەمانەش لێکۆڵەرانی بەراوردکاری ئایینەکان لەگەڵ بیروباوەڕەکانیاندا پێکدا دەدەن و ناکۆکن، کاتێ لە ئیسلام دەکۆڵنەوە یان وای دەبینن وەك جوولەکەو مەسیحیەتەو ئەو کات دەڵێن ئیسلام دووبارەیەکی ئەو دوانەیەو هیچی تر. یان دەبینن جیایە لەو ڕاڤە جوولەکەیی‌و مەسیحیانەی کە لە لایانن و پێیان وایە ئیسلام لەگەڵ چەمك و بیروباوەڕیاندا بەریەك دەکەوێ.

لێکۆڵەرانی بەراوردکاری ئایینەکان نەیانتوانیوە لە بیروڕا یان ئارەزووی خۆیان دەربازبن چونکە لە کەنارێکی جوزئیەوە دەوەستن و لایەنگیری دەکەن، لەکاتێکدا لێکۆڵەرە موسڵمانەکان لە بەراوردکاری ئایینیدا لە ناوەڕاستدا وەستاون و نەکەوتوونەتە لایەنگیری.

هەندێ جار یەکخواپەرستی بنەڕەتی سەرەکی ئیسلامە لەگەڵ چەند بڕواو واتایەکی دیدی لێکۆڵەرانی بەراوردکاری ئایینیدا ناگونجێ، جاریش هەیە تەواوگیری ئیسلامی کە ئایین و کۆمەڵگەو عەقڵ و دڵ و ئایین و زانست پێکەوە دەگونجێنێ لەگەڵ ئەو بڕواو دیدە بنەڕەتیانەی ئەو لێکۆڵەرانەدا ناگونجێ کە لەسەر بنەمای جیاکردنەوەی بەهاو ئاڕاستەکان بە یەك دید ڕاوەستاوە. ئیدی تا ئەوبەریێ یان جوزئی بێ.

لێرەوە لە دیدی ئینطیشاریەکاندا تەواوگیری ئیسلامی بەکەم یان زیادەڕەوی دەردەکەوێ، جا ئەگەر بەراوردکاری ئایینەکان لەسەر بنەمای هەواو ئارەزوو یان هەوڵی دانانان بە چەمك و واتای هەڵە یان دژایەتی ئایینێ یان نانەوەی گومان لەگەڵ و ئومەتێکدا وەستابێ ئەوا ئەو بەراوردکاریانە نرخی ئەوە مەرەکەبەیان نیە کە بۆ نووسینەوەیان سەرف کراوە، چونکە زۆر لە بەردەم ڕاستیەکاندا خۆ ناگرن و ڕێبازی بنەڕەتی و ڕەوتی زانستی تەفروتوونایان دەکات.

لە بەراوردکاری هەموو ئایینەکاندا بە ئاسمانی و زەمینیەکانەوە ئیسلام لە هەموویان جیاوازە چونکە ئایینی کۆتاو کامڵە و بنەڕەت و سەرچاوەکانی چەسپاو و جێ متمانەن و هیچ لارێکردنێکی تێدا نیە یان ساختە یان گۆڕانکاری تێدا نەکراوەو تا ئەمڕۆش ڕێنمونی مرۆڤایەتی دەکات و هەتا هەتاش هەیە هەر ڕێنمونی مرۆڤایەتی دەکات، بەپێی دیدو بڕیاری ئیسلام چەمك و واتای ئاین ئەوەیە لە ئادەمەوە تا موحەممەد یەك ئاین دەبێ و یەك سەرچاوەش دەبێ چونکە لە خواوەیە، یەك بنەڕەتیشی هەیە چونکە لەسەر یەکخواپەرستی وەستاوە، چی جیاوازیەکی تر لەنێو ئایینەکاندا هەبێ تەنها لە ئەنجامی ئەوەدا بووە کە ئەو ئایینانە پەیوەستی چەند نەتەوەو دەستەیەك بوون و ئایینی و گشتگیرو گشتی نەبوون وەك ئەوەی ئیسلام گشتی و گشتگیرەو کۆتاو سەرمۆری ئایینەکانە.

ئەمە قۆنـاغی پێـشکەوتنی مرۆڤایـەتی بـووەو ئەڵقـە دوای ئەڵقـە هـاتووە تـا ئـایینی مووسایی هات بۆ نـەوەکانی ئیـسرائیل و دوای مووسـاش چـەند پێغەمبـەرێ نێـردراون بـۆ نەوەکانی ئیسرائیل کە کۆتایـان پێغەمبـەر عیـسا بـوو، دواتـر لـەناو عەرەبـدا پێغەمبـەر موحەممەد بە پێغەمبەر نێردرا بۆ هەموو مرۆڤایەتی، لەوەشـدا عەرەبـەکان بوونـە هـەڵگری ئاڵای ئیسلام بۆ هەموو مرۆڤایەتی و ئایینەکەش ئایینێکی گشتی و کۆتاو سەرمۆر بوو، لەم مەیدانەدا ئایینە ئاسمانییەکانی جوولەکایەتی و مەسیحیەت و ئیسلام مانەوەو تـا ئـەمڕۆش ماونەتەوە.

هەموو ئەمانەش لەبنەڕەتدا لە پێغەمبەر ئیبراهیمەوە دەسـت پێدەکـەن تـا دەگاتـە لای پێغەمبەر موحەممەد، سەرەتا لـە ئالوبـەیتی ئیـبراهیم و ئیـسماعیل و ئیـسحاقی کوڕیـەوە دەستی پێکردو بە یەکخواپەرستی بەردەوامی بەخۆیەوە دی و دواتر بەهۆی ڕاڤـەی زاناکـانی ئایینی حەنەفیەتەوە کە کردیان بە دەمـارگیری ئـەو یەکخواپەرسـتیە گـۆڕا، کاتـێ پـەیامی پێغەمبەر عیسا هات بوو بە ڕێککەرەوەی شەریعەتەکەی مووساو تەواوکەری پەیامەکەی تـا ئایینێکی جیهانی بێ بەڵام ئەمیش گۆڕا و کرا بە ئایینێ کە لەسەر چـەمك و واتـای سـیانە خـوایی و تاوانبـاری و خـاچ دامـەزراوە، ئیـسلام هـات تـا مرۆڤایـەتی بگێڕێتـەوە بـەرەو یەکخواپەرستی دروست و گەڕانەوە بۆ لای پەروەردگاری تاك‌و تەنهای بێ هاوەڵ و هاوتا.

مەزهەبەکانی ڕاڤەی ئایینەکان زۆر جۆراوجۆر بوون وەك ڕاڤەی سایکۆلۆژی و فەلـسەفی و مێژوویی، دیدو ڕێبازەکانیش بەپێی هەواو ئارەزووەکان زۆر بوون، ڕاستترین ڕاڤەش بۆ ئیسلام کە لە بواری بەراوردکاری ئایینیدا پێویستە وا لێی تێبگەین ئەوەیـە ئیـسلام لـە خواوەیـە و ئایینی یەکخواپەرستی دەق چەسـپاوەو گـۆڕان لـە بنەڕەتەکانیـدا نیـە چـونکە لـە دیـدگاو سەرچاوەی فیترەتەوە هاتووە ﴿فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا﴾ ﴿وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلاً﴾ هەرگیزیش گۆڕانکاری لە ئایینی خوادا نابینی.

ئیسلام هـات و هـاوڕای بنـەڕەتی ئایینـە ئاسمانیـەکان بـوو و بوویـە تەواوکـەریان (بـۆ گەشەسەندن یان پێشڕەوی بە پەیامـە خواییـەکانی پێـشوو ئەگەرچـی لـە کرۆکـدا گونجـاو و هاوڕابن).

دیارترین شتێ کە ئیسلام بـۆ پەیامـەکانی پێـشووی زیـادکرد برایـەتی جیهـانی لەسـەر بنەمای یەك یاسای گشتی ئەخلاقی دانا.

ئەگەر بەراوردکاریەکی ڕوونی نێوان ئیسلام و ئایینەکان هـەبێ ئـەوا دەبـێ بـەراوردێکی نێوان ئیسلام و بیری مرۆیی هەبێ، ئیسلام ئەو خودێتیـە تایبەتیـەی خـستووەتەڕوو کـە لـە قورئانەوە هاتووە و مۆرکی یەکخواپەرستی هەیـە لـە بەرەنگاربوونـەوەی ئایینـەکان و بـیری مرۆییدا و جەخت لەوەش دەکاتەوە سەختە ئیسلام و لق و پۆپەکانی تێکەڵ بە هەر چـەمك و واتاو بەهایەك بکەین کە لە بنەڕەت و سەرچاوەدا جیاوازی ڕوون و قووڵیـان هـەبێ، ئیـسلام دەیەوێ کەسایەتیەکی نوێی تەواو جیاواز لەو کەسایەتیەی پێشوو دروست بکات کە پێشتر لە ڕوانگەی ڕاڤەو لاڕێبووە دەمارگیریەکانەوە یان لە ڕێی فرەیی یـان کەنارخـستنی ئـەخلاق لـە شەریعەت یان کەنارخستنی بیروباوەڕ لە ئەخلاق دروست بووەو دیارترین تایبەتمەندی ئیـسلام لەکارخـستنی نێوەنـدگری نێـوان خـواو مـرۆڤ و چەسـپاندنی جیاکاریـەکانی نێـوان خـواو پێغەمبەرایەتی و ڕێزگرتنی مرۆڤ بەرامبەر بە کۆیلایەتی و بتپەرستی و شوێن کەوتەیی.

لێرەوە ئیسلام دەردەکەوێ و هەموو بیری مرۆییش ناتوانـێ پـەکی بخـات یـان ملکەچـی بکات، ڕەسەنی ئیـسلام لەوەدا دەردەکەوێ کە هەر بنەڕەتێکی نـامۆ بـەخۆی بـێ بەرپەرچـی دەداتەوەو قبووڵی ناکات.

ڕاستیەکەی ئەوەیە بوترێ خاڵی پێکگەیشتن و جیاوازی نێـوان ئیـسلام و ئایینـەکانی تـر ئەوەیە ئیسلام ئایینێکی تـەواو و کۆکـاری نێـوان دوو بەشـەکەی ژیانـەو ئـایینێکی تـەواو لاهووتی یان تەنها پەرستشکاری نیە. بەڵکو ئایین و بەرنامەی ژیان و پەرستش و شەریعەتو ئەخلاقیشە.

لە ڕوانگەی ئەم خاڵەوە برێك هەڵوێستی نووسەرانی ڕۆژئاوا لە دیدی ڕاستی سەبارەت بە تێگەیشتن لە ئایینەکان لادەدات و هەڵوێستی ئێمەش لە هەڵوێستی ئەوان جیاواز دەبێ، چونکە ئەو دیدە تەواوگریە بۆ بوون و ژیان و کۆمەڵگە کاریگەریەکی قووڵی دەبێ لە چەمكو واتای شارستانیەت و یاساو بنەماو ڕێبازەکاندا و تەواو لە دیدی ئایینەکان جیا دەگرێ. بەڵام دەبێ ئەو ئیسلامە کامە بێ کە جێی بەراوردکاریە لەگەڵ ئایینەکانی تردا و جێی تەحەدداو مەترسیە لە هەموو لاو ڕوانگەکانی ئەو ململانێیەوە کە ڕۆشنبیریەکانی ڕۆژئاوایان لەسەر دامەزراوەو هەموو ئەو بانگەوازی ڕۆژئاواگەریانەو شاڵاوە ڕۆشنبیریانەی هەوڵ دەدەن ئیسلام لەوەدا کورت بکەنەوە کە ئایینێکی پەرستشکاری لاهوتی یەو دەیانەوێ لە لایەنە تەشریعیو ئەخلاقیەکەی جیای بکەنەوە، ئەو لایەنەی کە نیزامی هەموو کۆمەڵگەی لەخۆ گرتووەو بە چەند بنەماو بنەڕەتێکی تەواو و بنەڕەتی ڕێکیدەخات.

مەزاج و یەکبوونی موسڵمانان ماوەی چواردە سەدەیە لەسەر ئەم چەمك و بەهایە پێکهاتووە با نەتەوەو نیشتمان و پەیوەندییان بە خاك و نەتەوەوە جیاوازبوو بێ، سەختیشە موسڵمانان لەو چەمك و واتا تەواوکارە دەربکرێن، هەموو هەوڵەکانیش کە بۆ ئەو دەرکردنە دەدرێن تەئویلێکی پووچن بە مەبەستی لێدانی ئیسلام بە هەمان ئەو گورزەی کە پێی درا لە ئایینەکانی ترو لەڕێی خۆیان لایدان و بنەڕەتی یەکخواپەرستی و سروشتی خواییان لادان لەپێناو ڕازیکردنی ئارەزووی دەروونی مرۆیی کە حەزی لەوەیە کەم و زیاد بکات تا ویست و چێژەکانی بێنێتە دی.

هەموو ئەو هەوڵانە بۆ ئەوەن لەو بنەمایانە دەرچن کە ئیسلام بۆ تەواوکاری کەسایەتی دایناون و دەیەوێ لە کەوتن و داڕمان بیانپارێزێ و بەرزیان بکاتەوە، ئەو جیاوازیە ڕوونە نهێنی هەوڵی هەندێ لەو کەسانەیە کە لێکۆڵینەوە دەکەن لەسەر بەراوردکاری ئایینەکان.

لە ڕاستیدا ئیسلام خاوەن ئەو ئاسۆ بەرزو دیارەیە کە ماددەو ڕۆح و دنیاو ڕۆژی دوایی و ئایین و زانست و دڵ و عەقڵ لەخۆ دەگرێ، ئیتر چۆن وەسفی کەموکورتی پێ بدرێ لە کاتێکدا ئەو ئایینانەی تر لەسەر بنەمای لەتبوون و شکان وەستاون، بەو جۆرە دەکرێ لای

خودی بانگخوازانی بەشکاری و دابەشکاری پەیوەست بە دیدو چەمکی ماددەو ئایین و زانست و عەقڵ ئیسلام لە قەوارەیەکی جیا لە ڕیشەی سروشتی مرۆیی و فیترەتی بوونی تەواوی مرۆییدا وەسف بکەن.

دەکرێ بەپێی ڕاجیاییان ئیسلام بە ئیزدواجیەت وەسف بکەن و لەراستیشدا ئیزدواجی نیە چونکە مەرجی ئیزدواجیەت پێکەوە نەگونجان و پێکدادانە، بەڵام ئەم چەمکە تەواوە نموونەی دەستوەردانی سروشتی نێوان دوو بەشی مرۆڤ و پێکگەیشتنی ڕاشکاوانەی نێوان دوو ڕەگەزی پێکهاتەی مرۆیی دەنوێنێ کە تەنگژەی پەرتبوون و ڕاراییی و ململانێی نەفسی کۆکاری بە ڕۆژئاوا دەبەخشێ، ئەمەش ئەو کۆمەڵگانەی ئەمرۆ دەبڕێ و بەهێز لەناویان دەبات.

هەندێ لەو بیردۆزانەی هێنراون هەوڵ دەدەن بدەن لە دیواری بەهێزی بیری ئیسلامی بە نیازی ئەوەی درزێ بکەنە ئەو دیوارەوە تا ئەو نیازەیان بەدیبهێنن کە پەرتکردن و لەتکردنی یەکبوونیەتی و ئەو چەمکە لەتکاریە دابمەزرێنن کە نیازی تەنگپێهەڵچنینی ئیسلام و تواندنەوەی لە دیدی ماددی بتپەرستی جیهانیدا بەدیبهێنن، ئەمەش نیازو ئاواتی داگیرکەرانو ڕۆژئاواگەران و شاڵاوی ڕۆشنبیرییانە.

بەڵام ئیسلام بەپێی سروشتی پێکهاتەیی و قووڵی ئەزموونی و بەرەنگاربوونەوەی مەترسیەکان و توانا مرۆییەکانیشی توانای بەرەنگاربوونەوەی هەیەو هەرگیز لە ڕابردوودا خۆی بەدەستەوە نەداوەو لە داهاتوویشیدا هەرگیز خۆی نادات بە دەست بیرۆکە هاوردەکان یان فەلسەفە هاوردەکراوەکانەوەو دەشتوانێ وەرگرێ و ببەخشێ و بەرپەرچی شتەکان بداتەوە، واتە ئەو شتانەی لەگەڵ سروشت و پێکهاتەیدا ناگونجێن.

بیری ئیسلامی لە سروشت و پێکهاتەی یەکخواپەرستی پوختیەوە بەردەوام بەرەنگاری بیردۆزەکان دەبێتەوەو ڕای خۆی لە بارەیانەوە دەڵێ و بە ویژدانیشەوە قسەیان لەسەر دەکات و هەموو شتێ قبووڵ ناکات، هاودەم بە لێبووردەیی و کرانەوەشی بە ڕووی ڕۆشنبیری و هزری

جیهانیدا توانای چالاکی وەرگرتن و بەخشین لەسەر بنەمای خۆی هەیە بۆ ئەوەی لە بنەڕەتەکانی خۆی دەرنەچێ.

ئیسلام لە واتا باڵا مرۆییە هاوبەشەکاندا لەگەڵ ئایینەکاندا بەیەك دەگات و لە جیاکردنەوەی نیزامی کۆمەڵگە لە پەرستش و شەریعەت لە بیروباوەڕو ئەخلاق لە هەموو ڕێبازی کۆمەڵایەتیدا ڕاجیاوازەو ئەو جیاکاریانە قبووڵ ناکات و هاودەم بەوەی ئایینی فیترەتە ئایینی عەقڵیشەو بە سروشتی خۆی ئایینێکی واقعیەو لەگەڵ گۆڕانی سەردەمەکاندا هەڵدەکات و ئامانجی پێشخستنی مرۆڤە.

دیارترین بەخششی ئیسلام توانای چارەسەری پرسە گەورەکان و توانا مرۆییەکانە بەوپەڕی سادەیی و ئاسانییەوە و لایەنە ڕۆحی و ماددیەکان لە ژیانی مرۆڤدا کۆدەکاتەوەو زانست و بیروباوەڕ لە ژیانی هزردا پێکەوە دەبەستێ و کۆمەڵگەو ئەخلاق لە بواری ئاکاردا پێکدەگەیەنێ.

خودی وشەی ئاین لە بیری ڕۆژئاواییدا هەمان واتای ناو بیری ئیسلامی نیە چونکە وشەی (Religion) واتای نیزامێکی کەهەنوتیە کە کەنارگیری و دانپێدانان و سووچ گرتنەو تیایدا مرۆڤ بەسەر براکەیدا زاڵەو لە لێخۆشبوونی لە تاوانەکانیدا دەسەڵاتی هەیەو وەرگرتنی تەوبەی ئەوی بە دەستە، وشەی (رليحوزنتى) واتای خۆبەدەستەوەدانێکی بەو جۆرە پەرستشە یان بەو بەشداربوونە لەگەڵ خوا پەرستشدا لەڕێی بەجێگەیاندنی هەموو فەرمان و ڕێگریەکی سەرۆکی ئایینەکەوە[1].

ئەم تێگەیشتنە ڕۆژئاواییە بۆ واتای ئاین هاوشێوەی ئەو نێوکرۆکانەیە کە باری یەکەمی مەسیحی نواندنی و ئیسلام شۆڕشی بەسەردا کرد تا چاکسازی تێدا بکات، ئەو واتایەش کاریگەری خراپی هەبووە لە دەروونی ڕۆژئاواییەکاندا هەر لە سەرەتای چاکسازی ئایینی پرۆتستانتیەوە، دواتر هەر لەو کاتەوە بوو بە کاریگەرییەکی مەترسیدار کە پیاوانی ئایینی

---

١- علال الفاسي: دعوة الحق، يونية سنة ١٩٦٨.

خۆیان سەپاند بەسەر خەڵکی ئەو ئایینەداو نەیاندەهێشت سەرقاڵی خوێندن و مەعریفە بـبن، ئەمەوە کۆمەڵگە هەستی بەوەکرد پێویستە لە ئاین (بە واتا ڕۆژئاواییەکەی) ڕزگاربن، واتـە شۆڕشی دژ بە کلێساو دەسەڵاتی قەشەکان و ڕزگاربوون لە ئەرستۆقراتی دەرەبەگی.

ئێمەش وا واتـای ئایینمـان بـە واتـا ئیـسلامیەکەی والێکـردووە تـەنها تەشـریع بـێ و وشەکەمان بەسۆزی ڕۆژئاوایی پڕکردووەتەوەو بە سروشـتی حـاڵ وامـان لێهـاتووە بـە واتـای وشەی (ریلجن) لە ئاین تێدەگەین و وەك ڕۆژئاوا بیر لە ئاین دەکەینەوە، ئیتر بـاری ئـەوانمان نەخوێندووەتەوە کە پێویستی بەو دیدە ڕەخنەییەی کۆمەڵگەیەکە کە لەسەر دەسەڵاتی کلێسا دامەزراوەو تیایدا تەڵاق چەند سەخت بووە با تەنانەت یەکێ لە دوو هاوسەرەکەشـی تووشـی زینا بێ، هەروەها دامەزرانی ئەرستۆکراتیەکی دەرەبەگی کە پیاوانی ئایینی دەیانپاراسـت و گەلیان پێ دەکردە کۆیلە.

لەمەوە پرسی جیاکردنەوەی ئاین لە دەوڵەت سەریهەڵدا، جا ئاین بەو واتا ڕۆژئاواییە لـە وڵات و بیری ئێمەدا هیچ بوونێکی نیـە، دەوڵـەت و ئـاین لای ئێمـە یـەك شـتن و دەوڵـەت هەردەبێ لەسەر بنەمای بیروباوەڕ یان ئاکارو ئەخلاق دامەزرێ و پارێزەری یاسا بێ و ئـەویش بەرپرسە لە بەدیهێنانی یاسا ئەگەر هاتو لە وڵاتدا یاسا نەبوو.

(دەوڵەتی ئیسلامی دەوڵەتێکی ئیکلسریلیکی کەهەنوتی نیە بەو واتایەی کە ڕۆژئاوا لێی تێگەیشتووە) بێگومان هەسـتنەکردن بـە جیـاوازی نێـوان واتـای ئـاین لای مەسـیحیەت و موسڵمانان لە گومڕاکردنی زۆربەی ئەو موسڵمانانەدا مەترسیەکی گەورەیە کـە فێرکاریـەکی ڕۆژئاواییان وەرگرتووە بێ ئەوەی لەپاڵ ئەوەدا وانەیەکی دروستی ئیسلامی وەربگرن تا بـزانن ڕاستی ئیسلام چیە، لەبەرئەوەی ئەو وشە زمانەوانیانەی واتا زینـدووەکانیان بـە بـەرداکراوە ڕۆژانە لەسەر زاری خەڵك بەکاردێن ئیتر وشەی ئاین لـە ئەندێـشەی ئـەو چـینە ڕۆشـنبیرەدا تەنها واتا ڕۆژئاواییەکەی دەگەیەنێ.

کەمالیەکان لە تێگەیـشتنی ئیـسلامدا گومڕابـوون و شـوێن پێـی ئـایینی مەسـیحییان گرتەبەر و یەك حوکمیان دەدا بەسەر هەردووکیاندا، ئەو شـاڵاوەش دوژمنـان دەیکەنـە سـەر

ئیسلام شوێنەوارێکی ئەو هێرشە توندەیە کە ماددیگەراکان دژ بە ئایینەکان دەیگرنەبەر، مەسیحیەت کراوە بە شمشێری دەست و ئامانجی سەرەکی هێرشەکە.

لێرەوەو لەسەر بنەمای ئەم ڕوونکردنەوانە بەڕوونی مەترسی ئەو ئاڕاستە ڕۆژئاواییەمان بۆ دەردەکەوێ کە دەیەوێ دەقەکانی قورئان و شەریعەت ملکەچی ڕێڕەوی ڕۆژئاوا بکات و وشە ئیسلامیەکان بگۆڕێ و واتای ناو هزری ئیسلامییان لێ داماڵێ و واتای تریان بەبەردا بکات.

# *پێناسێکی ئیسلام:

ئیسلام ڕێبازە نەوەك بیردۆزە، ڕێبازێکی تەواو و پڕاوپڕی وایە کە ئامانجی بەدیهێنانی بنیادی کۆمەڵگەیەکی خواپەرستیە لەسەر زەویدا، بۆیە ئیسلام گرنگی بەوە دەدات چەند ڕێنماییەکی گشتگیر لە سیاسەت و ئابووری و کۆمەڵایەتی و پەروەردەدا دابنێ، لە دەقێکی گشتیدا بەتاڵ کراوەتەوەو چەند بنەمایەکی تایبەتی بۆ داناوە، بەوەش سیفەتی هەمیشەیی و مانەوەی هەیە، ئەو ڕێنماییانە سیفەتی تەواوەتی و گشتگیری و پەیوەندییان هەیە.

ئیسلام گرنگی بەوە دەدات ڕێبازی ژیان و نیزامی کۆمەڵگە بێ، بۆیە پشتی بەستووە بە:

**یەکەم:** ئازادکردنی بیرو هزر لەدەست بتپەرستی و ماددەگەری.

**دووەم:** ئازادکردنی مرۆڤ لە کۆیلایەتی.

**سێیەم:** ئازادکردنی مرۆڤایەتی لە کۆتی دەمارگیری و بێئابڕوویی.

بەها بنەڕەتیەکانی ئیسلام ئاسۆ فراوان و ڕوانگە نەرمن و جێی هەر نوێگەریەکن لەپێناو پێشکەوتن و بنیادناندا، وێڕای ئەوەش بەستوویی و دەمارگیری دیمەن و دیاردەی ئیسلام نین، بەڵکو ئیسلام نیزامێکە دەروونی مرۆیی تێر دەکات و پێویستیە ڕۆحی و مادییەکانیشی پێ دەبەخشێ، تیایدا جیهانی بینراوو نەبینراو بەیەك دەگەن.

ئیسلام بیرۆکەیەکی فەلسەفی یان مەزهەبێکی سۆفیگەرا نیە، بەڵکو ڕێبازێکی ژیانە کە لەگەڵ هەناسەو ڕێکردەی سروشتدا پێکدەگات و لەگەڵ بنەڕەتی سروشتیدا دەگونجێ، ئەو سروشتەی کە خوا خەڵکی لەسەری دروست کردووە، ئیسلام لەگەڵ ویژدان و عەقڵ و زانستدا تەبایە، ئیسلام مۆرکی خۆی داوە بەسەر ژیانی هەڵگرانیدا و ژیانی بەرەو پێش بردون و ئەمەش بەردەوام دەبێ، بۆیە هەر بزاڤێکی هزری یان ڕاپەڕینێکی کۆمەڵایەتی ناتوانێ خۆی لەو ڕاستیە بێئاگا بکات و لەو واقیعە دەرچێ.

بێگومان ئیسلام ڕێبازێکی کۆمەڵایەتیە کە هەموو مرۆڤایەتی دەگرێتەوەو ئایین بەشێکیەتی، ئیسلام لە یەکەم خشتەوە کۆمەڵگەی ئیسلامی دروست کردو لە یەکەم خاڵی سەرەتاوە شارستانیەتی ئیسلامی دامەزراند.

ئیسلام بیروباوەڕێکی ماددی نیە کە پێوەرە ماددییەکانی بەسەردا جێبەجێ بێن، هەروەها بیروباوەڕێکی رۆحی نیە کە پەیوەندی هەبێ بە خەو و موعجیزەو خەواریقەوە، هیچ پەیوەندییەکیشی نەبێ بە ماددەو ژیانەوە، بەڵکو ئیسلام بیروباوەڕێکە بەجارێ جەخت دەکاتەوە لە ڕۆح و ماددەیش.

توێژەران جەخت لەوە دەکەنەوە ئیسلام لەبەردەم شاڵاوی موژدەبەری ڕۆژئاواییدا ناشکێ، چونکە موسڵمان ناکرێ ببێ بە مەسیحی یان جوولەکە، چونکە ئیسلام مەسیحیەت و زیاتر لەوەش لەخۆ دەگرێ، ئەگەر مەسیحیەت ئایین بێ ئەوە ئیسلام ئایین و شەریعەتیشە، ئەگەر مەسیحیەت بڵێ چی هی قەیسەرە بۆ قەیسەرو چی هی خوایە بۆ خوا، ئەوا ئیسلام دەڵێ هەموو شتەکان تەنها بۆ خوا.

ئیسلام توانای ڕاکێشان و هەڵمژین و شێوە نەرمی هەیە تا هەموو دەستکەوتەکانی سەردەمی خۆی لەخۆگرێ و بەربەستێ نەبێ لەبەردەم ئازادی بیردا، هەروەك هەر لە دامەزرانیەوە دەرکەوت بۆ هەموو گەل و ڕەگەزەکان گونجاوە، دەی بۆ هەموو جۆرە عەقڵ و پلەو ئاستێکی شارستانیش گونجاوە، بەڵێ ئیسلام ئایینی فیترەتەو توانی ئەو هێزە بدات بە شوێنکەوتوانی کە هەموو هێزەکانیان شکاندن و ئەوانەش دەیانویست لەناوی بەرن یان لەخۆی گرتن یان تەفرو توونای کردن.

هەروەها ئیسلام دوو کێشەی چارەسەرکرد کە بیری ڕۆژئاوایان سەرقاڵ کردووە، برایەتی مرۆیی و دادوەری کۆمەڵایەتی.

ئەوەی ئیسلامی لە دارِمان و لێکهەڵوەشان پاراست مانەوەی قورئانی پیرۆزە دوور لە هەموو مەترسیەك و هیچ دەستێکی لێ نەدراوە، ئیسلام ئەو ڕۆشنبیریەی یەکخست کە ڕەگەزە جیاجیاکان لە سایەی خۆیدا پێکەوە دەبەستێ با موسڵمانیش نەبن، ئیسلام زاتێکی

خاوەن ڕێزو شکۆی بۆ موسڵمان دروست کردووەو لەگەڵ ڕەوتدا ناڕواو شوێن هەر کاروانێ ناکەوێ، بەڵکو دروستکراوێکی تایبەتە، خواپەرستی لە سروشتدا و مرۆڤ بوون لە ئامانجدا، ساکاری و ڕوونی سیفەتی ئیسلامن، هەروەها ئیسلام چارەسەری داناوە بۆ هەموو کێشەکانی مرۆڤ و کۆمەڵگەو چارەسەرەکانیشی کرۆك و ئامانج چەسپاون و شێوەو پێناویان دەگۆڕێ، ئیسلام پێشوەخت چارەسەرو بنەماکانی نەسەپاندووەو بەزۆرو تۆپزی پەیڕەوی نەکردون.

لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) بنەڕەتەکانی ئیسلام کامڵ بوون و دوای ئەوە کەس نەیوێراوە شتێکی بۆ زیاد بکات، نهێنی و نەگونجان و بەریەککەوتنی هزری یان نەگونجانی لەگەڵ عەقڵدا بوونی نیە، دیارترین دیاردەی ئیسلامیش توانای نوێگەریە لە ناوخۆی خۆیدا و نەرمی داڕشتنەوەی خۆیەتی، ئەو پەردانەشی لابردووە کە دەیانەوێ کرۆك و ناخی داپۆشن.

ئیسلام بەردەوام بزاڤێکی رزگاری خوازی بووەو دەبێ، بەرامبەر بە داگیرکاری بزاڤێکی دادوەری کۆمەڵایەتی بووە بەرامبەر بە دەرەبەگایەتی، بزاڤێکی شوراو ڕاوێژکاری بووە بەرامبەر بە خۆسەپێنی، بزاڤێکی برایەتی بووە بەرامبەر دووبەرەکی دەمارگیری و ڕەگەزی، بەڵکو نەرمیەك لە بنەڕەتی گۆڕانیدا هەیە بەپێی سەردەم و کاتەکان و ڕەچاوی بارەکانی کردووە و باری کۆمەڵە گۆڕاوەکانی لەبەرچاو گرتووە، ئەمە بێ ئەوەی لە بنەڕەتە چەسپاوەکانی خۆی دەربچێ، ئەمەش لەبەر ماوە فراوانی و نەرمی لاکانی و توانای لەخۆگرتنیەتی.

هەروەها ئیسلام مەعریفەو بیروباوەڕو زانست و فەلسەفەی لەیەك جیا کردونەتەوەو عەقڵو دڵی پێکەوە یەکخستووەو زانست و ئایینی کۆکردونەتەوە، پێی وایە مەعریفەی مرۆیی گشتییەو بیروباوەڕەکان تایبەتن و هەر دەستەو گەلێ بیروباوەڕی خۆیان هەیە، هەروەك زانستی سوودبەخش و زانستی بێسوودو بیروباوەڕی ئیسلامی یەکخواپەرستی لەیەك جیا کردووەتەوە، مەعریفەی ئیسلامی دوورە لەوەی دابەش بێ بۆ مەعریفەی عەقڵی و مەعریفەی ئایینی، ئیسلام خزمەتکاری کۆمەڵگەو بانگخوازو ڕەوتەکان نیە، بەڵکو فەرمانڕەوایەو بنەڕەتی سەربەخۆی ناملکەچی خۆی هەیە، هەروەها ئیسلام پێناوی دەستی

ژیارەکان نیەو بوونی سەربەخۆو تایبەتی خۆی هەیە و خاوەن پێوەری تایبەتی خۆیەتی و ڕازی نیە بە تەئویلکردن لە بنەڕەتە گشتیەکاندا وەك سوو و زیناو مەی و کوشتن.

ئیسلام بیروباوەڕێکی پێشکەوتووخوازە، بەڵام نەك بەو واتایەی پشتگیری بیردۆزەو بیروباوەڕەکان بێ، بەڵکو لەبەرئەوەی یەکەم هێزە مرۆڤی بەرەو پێش بردو لە کۆیلایەتی و بتپەرستی و شیرك و ماددیگەرایی ڕزگاری کرد.

بێگومان پەیوەندی ئەمڕۆی موسڵمانان قورئانە، قورئان بە تەنها تاکە بەڵگەی گشتگیری یەکبوونی موسڵمانانە و پێشەواو پێشەنگی موسڵمانان لەمڕۆدا تەنها قورئانە، بارتلمی سانهلیر ڕاست دەکات کاتێ دەڵێت: (ڕێنماییەکانی قورئان کە عەقڵی ملیۆنەها کەسی بەرەو پێش برد تا ئەمڕۆش بەردەوامە و ڕۆژانە گەلانێکی دواکەوتوو پێشدەخات کاتێ ڕاستیە پێویستیەکانی زاتی مرۆیی لە دیدی ئایینی و کۆمەڵایەتی و ڕەوشتیەوە دەخاتە بەردەستیان).

بەپێی دەربڕینی برناردشۆ ئیسلام تاکە ئایینێکە تا ئەمڕۆش توانای هەرسی بارە جیاجیاکانی ژیانی هەیەو دەتوانێ هەر چینێکی خەڵك بۆ لای خۆی ڕاکێش بکات.

رینان پێشبینی گەڕانەوەی ئیسلام دەکات و دەڵێت: (نازانین لەوانەیە عەقڵی ئیسلامی وەچەلێکەوتەو فرە توانا بنەوێتەوە داهێنانی شارستانیتێکی باڵاتر لە هاودەمە جیاکەی).

بێگومان لە قوڵایی ڕیشەی ئیسلامدا لە مەیدانی کەش و شارستانیەتدا هێزێ هەیە توانای بزاوتی بواری پێشکەوتنی پێ دەدات بێ ئەوەی لە ڕیشەو بنەڕەتەکانی دابڕێ و بێ ئەوەی شوێنکەوتەکانی بنەڕەتی بیروباوەڕی خۆیان لەدەست بدەن.

ئیسلام (میانڕەوی) گرتووەتەبەر و ئەمەش بووە بە تایبەتمەندی بۆی تا ئەوەی لێکۆڵەرێکی وەك (جب) بڕوای بەوە هەیە هێشتا ئیسلام پەیامێکی هەیە بیگەیەنێت بە هەموو مرۆڤایەتی و لەنێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادایەو زیاتر لە هەر سیستمێ توانای خۆی بۆ گونجاندن و وابەستەکاری نێوان ڕەگەزە جیاجیاکانی سەلماندووە، ئەگەر مەرج بێ پێوەندی

لەنێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا هەبێ تا ناکۆکی و دژایەتی نەهێڵێ ئەوا ئەو نێوەندە هەر دەبێ ئیسلام بێ.

بێگومان ئاین لای موسڵمانان ڕەگەزێکی ڕیشەیی وایە کە هیچ دەرفەتێکی جیابوونەوە لە ژیان و کۆمەڵگەی موسڵمانانی نیەو ئەوەش ڕاستیەکی واقعیە و بەشێکی تەواوکاری ژیانی ڕۆژانەی موسڵمانانە.

بەپێی دەربڕینی (تریتۆن) جلێ نیە زانایان بیکەنە بەر، بەڵکو ئەگەر بەزمەکە قەوما و شەو تاریك داهات وا لە موسڵمانان دەکات باوەڕ چەسپاوبن و گەردەلوول و ڕەشەبا نەیانجوولێنێ.

توێژەران جەخت لەوە دەکەنەوە بیری ئیسلامی لە واقیعدا زۆر لە بیری ڕۆژئاوا کاراترە و شەریعەتی ئیسلامیش بوارەکانی ژیانی ڕۆژانە لەخۆ دەگرێ و تەنها لە مەسەلەی پەرستش و ئاکاردا بەر تەسك نابێتەوە لە کاتێکدا ئایینەکانی تر لەو نەوانەدا بەرتەسك بوونەتەوە.

لێرەوە زانستێتی زانستی ئایینەکان ناتوانێ بەچاوی ئایینەکانی تر بڕوانێتە ئیسلام مەگەر ئەوەی ئیسلام بە ئایینی خوا بزانێ، واتە لەسەروو ڕاستیە سروشتی و کۆمەڵایەتی و زانستیەکانەوەیە، بەڵێ ئیسلام دەستکردی مرۆڤ نیە و بێگومان ئایینی خوایە، ئایینی فیترەت و ڕوانینە و مرۆڤێ کە عەقڵی لەبری بێئاگایی کاربکات دەگاتە بەرزی ئیسلام.[1]

بێگومان وەك وەسفی کەسە بە ویژدانەکان (ئیسلام کەسێکی نموونەیی وا دروست دەکات کە شکست و نەتوانین نازانێ)، نهێنی هێزی ئەو کەسەش بڕوا بوونیەتی بە خوای تەنها و بێ هاوەڵ و بەوەی خوا هەموو شتی بەدەستە، بەهۆی ئەم ئیمانەوە کاتێ ئەو کەسە بانگ دەکرێ بۆ جەنگ لە مردن ناترسێ چونکە بڕوای وایە لەپێناو خوادا دەجەنگێ، بەڕاستیش ئیسلام ڕێ نادات مرۆڤ ملکەچی دەسەڵاتی جگە لە خوا بێ و ڕێ نادات هیچ کەسێ ببێتە بەندەی مرۆڤێکی تر، بەڵکو ئیسلام سوورە لەسەر ئەوەی بانگەوازی موسڵمان بۆ ئەوە بێ دژ بە هەر

---

١- لە توێژینەوەکەی دکتۆر فاروقەوە.

پەرستشێکی جگە لە خوا ڕاپەڕێ و هەست بەوە نەکات لە کەسانی تر کەمترە و تەنها بۆ خوا ملکەچ بێ چونکە جیاوازی نیە لەنێوان هەژارو دەوڵەمەند و گەورە و بچووك و ڕەش و سپیدا تەنها بە لەخواترسان نەبێ.

# بەشی یەکەم

# ( جیهان و ئیسلام )

## باسی یەکەم

## ( جوولەکایەتی )

کاتێ ئیسلام لە مەککە دابەزی بۆ سەر موحەممەدی کوڕی عەبدولاّ ئەمە سەرەتای کۆتایی هاتن بەو پەیامانەی ئاسمان بوو کە لە دروستبوونی (ئادەمەوە) بەردەوام بووە و خاکی ڕۆژهەلاّتیش پێگەی سروشتی بووە، کاتێ ئیسلام هات پەیامەکەی موساو پەیامەکەی عیسا مابوون و ئەم دوو پەیامەش پێش ئیسلام هاتبوون و تا ئەمڕۆش بلاّون و لە چەندین بەشی جیهاندا شوێنکەوتەیان هەیە.

پرشنگی ئیسلامیش کە بلاّوبوویەوە گفتوگۆیەکی فراوانی لەگەڵ شوێنکەوتەکانی ئایینەکاندا دەستپێکرد، ئیتر هەندێ لەو ئایینانە ئاسمانی و هەندێکیان زەمینی بوون، هەرچەندە ئەو ئاسمانیانە لە ڕاڤەدا شتێ لە ساختەیان تووش بوو بوو.

شوێنکەوتوانی پەیامی موسا (علیە السلام) ناوی پەیامەکەیان نا یەهودیەت وەك چۆن شوێنکەوتوانی پەیامەکەی پێغەمبەر عیسا ناوی پەیامەکەیان نا مەسیحیەت، سەبارەت بە جوولەکایەتی پێشتر ئایینێکی تایبەتی داخراو بوو کە تەنها ئەو شوێنکەوتانەی دەگرتەوە، بەلاّم مەسیحیەت لە بەیتولمەقدیسی نشینگەیەوە دەرکەوت و پەڕیەوە بۆ ئەورووپاو توانی هێرش بەرێتە سەر جیهانی ڕۆژئاوا و پەیوەستی دەوڵەتی ڕۆمانی بێ (بە بەشە ڕۆژئاوایی و ڕۆژهەلاّتیەکەشیەوە) و مۆرکی خۆی بدات بە کۆمەڵگەو چوارچێوەیەکی ئایینی بۆ بیری یۆنانی و یاسای ڕۆمانی دابەزرێنێ.

ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی لە ماوەی هەزار ساڵدا ئەو دەوڵەتە قەبەو بەرفراوانەی خۆی دامەزراندو زاڵبوو بەسەر شام و میسرو هەموو مەغریبدا، لە ڕۆژئاواشدا دەوڵەتی کیسراکان

لە فارس دەوڵەتی خۆیان دەمەزراندو ئایینی مەجووسییان گرتەبەر کە لـە پاشـماوەی ئـایینی زەردەشتی بوو.

ململانێی سەربازی و هزری نێوان ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی و فارس زۆر گەورە بوو، جەنگ و ململانێی نێوان دەوڵەتی بتپەرستی لە ڕۆژهـەڵات و دەوڵـەتی مۆرکپێـدراوی مەسـیحی لـە ڕۆژئـاوا تونـد بـوو، لـە نیمـچە دوورگـەی عـەرەبیش ئـەو ناوچـە لـەنێو خۆیـدا پـەنگی خواردبوویەوەو پەیوەستیەکی زۆر کەمی لەگەڵ ڕووداوەکانـدا هـەبوو و لـەنێو بتپەرسـتیەکی ڕیشە باریك و تازەدا نغرۆ بوو بوو و لەنێو ئەو بازنەشدا کەسانێ کـە مەسـیحی و جوولەکـە بوون دەژیان.

پاش ماوەیەکی دوور لە پەیامی ئیـبراهیم و ئیـسماعیل لـە مـاوەی مێژوویـەکی دوور و درێژدا زیاد لە دوو هەزار ساڵ پاش پەیامی یەکخواپەرستی و هاواری پاکی حەنەفیەت، ئـەو بتپەرستیە هات تا پەیامی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵا سـەرلەنوێ بـە پـەیامی ئیبراهیمـەوە هات و بوو بە کۆتا و سەرمۆری پەیامی ئاسمانی لە زەویدا.

یەکخواپەرستی بانگەوازی ئایینی ڕاستی خواییـە بـۆ هـەموو پێغەمبـەران، بانگـەوازی ئیبراهیمیشە بۆ پێغەمبەران و سپاردەی ئەوە بۆ ئیسماعیل و ئیسحاق کە دوو باپیرە گەورەی موسڵمانان و مەسیحی و جوولەکەکانیشن، ئیسماعیل هاودەستی ئیبراهیمی بـاوکی کەوتـە بنیادنانی کەعبە لە مەککەدا و خۆی و نـەوەکانی لـەوێ نیـشتەجێ بـوون، لـەو نەوانەشـی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵا هات کە کۆتایی پێغەمبـەران بـوو، ئیـسحاقیش بـاپیرە گـەورەی نەوەی ئیسرائیلە، قورئانی پیرۆزیش ئاماژە بەوە دەکات کە ئیبراهیم بـاوکی (عەرەبـە) ﴿مَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِـنْ حَـرَجٍ مِّلَّـةَ أَبِـيكُمْ إِبْـرَاهِيمَ هُـوَ سَـمَّاكُمُ الْمُـسْلِمينَ مِـن قَبْـلُ وَفِـي هَذَا﴾(سورة الحج).

هەروەك قورئانی پیرۆز باوکایەتی ئیبراهیمی بۆ پێغەمبـەران دوای خـۆی تۆمـار کـردووە وەك دەفەرموێ ﴿وَوَهَبْنَا لَهُ إِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ كُلاًّ هَـدَيْنَا وَنُوحـاً هَـدَيْنَا مِـن قَبْـلُ وَمِـن ذُرِّيَّتِـهِ دَاوُودَ وَسُـلَيْمَانَ وَأَيُّـوبَ وَيُوسُـفَ وَمُوسَـى وَهَـارُونَ وَكَـذَلِكَ نَجْـزِي الْمُحْـسِنِينَ وَزَكَرِيَّـا وَيَحْيَـى

وَعِيسَى وَإِلْيَاسَ كُلٌّ مِّنَ الصَّالِحِينَ وَإِسْمَاعِيلَ وَالْيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطاً وَكُلاًّ فضَّلْنَا عَلَى الْعَالَمِينَ﴾.

لەم دەقە قورئانیەوە دەردەکەوێ ئیبراهیم باپیرەی جوولەکە و مەسیحی و موسڵمانانیشەو ئەو سێ پێغەمبەرەی خوا لە ڕەچەڵەکدا بەیەك دەگەن و بۆ یەك هەوڵ تێکۆشاون و هەموویان لەگەڵ ئەوانەی باوەڕیان پێهێناون ئەو خاکەیان لە بابلەوە تا کەنعان تا میسر تا حیجاز بە میرات وەرگرتووە، ئەو دەسەڵاتە تەنها بۆ گەلێ نەبووەو تایبەتمەندی هەبێ، بەڵێنی خوا بۆ ئیبراهیم بە هاتنی پەیامی پێغەمبەران لە ئیبراهیمەوە تا موحەممەد هاتە دی.

سەرچاوە دروستەکان و لەپێش هەموویانەوە قورئانی پیرۆز پاڵپشتی ئەوەیە و یەکدەنگن لەسەر ئەوەی ئیبراهیم لە خاکی بابل (شاری ئوری کلدانی) لەنێوان ڕووباری دیجلەو فورات ژیاوە کە لەوێ پەیکەرو بتپەرستی و فرە خودایی هەبووەو ئیبراهیم ئەو خەڵکەی بانگ کردووە تا لەدەست بتپەرستی و خورافە ڕزگاربن و خوای تاك و تەنها بپەرستن، هێندەی نەبرد لە بازنەی بانگەوازەکەوە چوو بۆ حەران و لەوێ سارەی ئامۆزای خۆی بە هاوسەر گرت، دواتر چوو بۆ شام و ناوی خاکی کەنعانی لێنراو دواتر بەرەو میسر کشاو لەوێ هاجەرەی کەنیزەی بەهاوسەر گرت، دواتر گەڕایەوە بۆ فەلەستین و لەوێ ئیسماعیلی پێ بەخشرا، هێندەی نەبرد ئیسماعیل و ژنەکەی برد بۆ دۆڵی مەککە ﴿رَّبَّنَا إِنِّي أَسْكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ عِندَ بَيْتِكَ الْمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ الصَّلاَةَ فَاجْعَلْ أَفْئِدَةً مِّنَ النَّاسِ تَهْوِي إِلَيْهِمْ وَارْزُقْهُم مِّنَ الثَّمَرَاتِ لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ﴾.

ئیبراهیم لە مەککە نەمایەوەو بەردەوام دەهات و دەچوو تا ئیسماعیلی کوڕی گەورە بووو پێکەوە پایەکانی کەعبەیان داناو خوایش کەعبەی کردە ڕێگەیەك بۆ خەڵك و ئارامی و دڵنیایی ﴿وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَاهِيمُ الْقَوَاعِدَ مِنَ الْبَيْتِ وَإِسْمَاعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّا﴾ بەو جۆرە ئیبراهیم (علیه السلام) دوو لقی پێکەوە کۆکردەوە:

لقی ئیسحاق لە شام کە ئەویش یەعقوبی کوڕی بوو کە بەنی ئیسرائیل بۆ ئەو دەگەڕێنەوە، خوای گەورە لە نێویاندا تەوراتی نارد بۆ مووسا پێغەمبەر، لە نێویاندا چەندین

پێغەمبەر نێردران، کۆتا پێغەمبەریش بۆ بەنو ئیسرائیل سەید مەسیح عیسای کوڕی مەریەم بوو، کۆتا پەیامیش کە نێردرا بۆیان ئایینی عیساو کتێبی ئینجیل بوو.

لقی ئیسماعیل لە مەککە کە لەگەڵ دایکی لە مەککە مایەوەو خەڵکی لە هۆزی جورهوم لەلایان نیشتەجێ بوون، ڕەچەڵەکی عەرەبی حیجاز دەگەڕێتەوە بۆ دوو کوڕەکەی ئیسماعیل (نابت. قیزار)،[1] ئیسماعیل باپیرە گەورەی پێغەمبەر موحەممەد(ﷺ)، ئیسماعیل ئەو سەربڕاوەی خوایە کە قورئانی پیرۆز چیرۆك و بەسەرهاتەکەی باس کردووە.

پەیوەندی نێوان ئیبراهیم و موحەممەد (علیهما السلام) بەڕوونی لەوەدا دەردەکەوێ کە ئیسلام نوێکاری بانگەوازی حەنیفیەو موحەممەدیش ﷺ نزای ئیبراهیم و مزگێنی عیسایە بە دەقی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ وەك چۆن ئیمامی ئەحمەد لە موسنەدەکەیدا گێڕاویەتیەوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (أنا دعوة إبراهيم و بشارة عيسى).

قورئان جەخت دەکاتەوە لەو پەیوەندیەی نێوان باوکی پێغەمبەران و کۆتای پێغەمبەران وەك نزاکەی ئیبراهیم لەکاتی بنیادنانی کەعبەدا دێنێ ﴿رَبَّنَا وَاجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَا أُمَّةً مُّسْلِمَةً لَّكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبْ عَلَيْنَا إِنَّكَ أَنتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ رَبَّنَا وَابْعَثْ فِيهِمْ رَسُولاً مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ﴾ گۆڕانێکی زۆر لەو ڕاستیانەدا هەیە لە نێوان ئەو دەقانەی قورئاندا کە هیچ شتێ بە ناڕاست ناهێنێ و نێوان دەقەکانی عەهدی قەدیمدا کە بە یەکدەنگی رای لێکۆڵەران و مێژوونووسانی جوولەکەو خودی ڕۆژئاواییەکان ئەو عەهدی قەدیمە تەوراتی دابەزیو نیە.

هەروەها ڕا جیایی هەیە لەسەر هەڵوێستی ئیبراهیم بەتایبەت و هەموو ئەوەش کە پەیوەندی هەیە بە لقەکەی ئیسماعیلەوە و کۆچکردنی بۆ مەککەو بوونی ئیسماعیل و بنیادنانی کەعبەو ناکۆکیەکەش بە ئامانجی جەخت کردنەوەیە لە لقی ئیسحاقی بە تەنها و هەوڵدان بۆ پەیوەستکردنی بەڵێنی خوا بۆ نەوەکانی ئیبراهیم کە زەوییان دەداتە دەست و هەوڵدان بۆ بەرز ڕاگرتنی ئەو ڕەگەزەی نەوەی ئیبراهیم جیا لە ڕەگەزەکەی تری، ئەمەش

---

١- البداية والنهاية ج١، تأريخ الطبري ج١.

بـەهۆی دەسـتکاریکردنێکی زۆر و لادانێکـی مەترسـیداری ڕووداوەکـانی مێـژوو و دەقـە چەسپاوەکانی پەیامە ئاسمانیەکانەوە.

ئەمە مەترسیدارترین شتێ بوو تووشی پەیامەکەی پێغەمبەر مووسا کرا کاتێ ئـایینێکی دەمارگیری ڕەگەزی دامەزرێنرا و بنەڕەتە سەرەکیە دابەزیوەکانی ئاین و پەیوەست بە چـەمك و واتای کۆکەرەوەی یەکخواپەرستی و یەکخەری هەموو خەڵك و ڕاوەستاو لەسەر بڕوابوون بە خوای تەنها نەك جیاکاری ڕەگەزی ناو خەڵك ساختە کراون و گـۆڕدران، چـونکە لـە بنەڕەتـە ڕاستیەکاندا هاتووە زەوی دەبڕێ بە لەخواترسان.

ئەم گۆڕان و لادانە گۆڕانێکی گەورەی لە چەمك و واتای بیروباوەڕدا دروست کـردو لـەبری خوای تەنها خواوەند یەهوا دانـراو تـەورات سـەبارەت بـە ئیـبراهیم و کوڕەکـانی و میراتـی پێغەمبەران لە وەچەی ئیبراهیمەوە ساختەکرا، هەروەك نکـوولی دەکـات لـە ڕۆژی دوایـی و زیندوو بوونەوەو دژی هەموو بەها بنەڕەتیەکانی پەیوەست بە دادوەری و برایەتی ناو ئایینە و زۆربەی حەرامەکانی ناو پەیامی عیسا حەڵاڵ دەکات وەك سوو و زیناو کوشتنی بەناحەق.

قورئان ئاماژە بەوە دەکات خوا کە تـەوراتی دابەزانـدووە بـۆ سـەر مووسـا ڕێنمـوونی و ڕووناکی لە تەوراتدا هەبووەو بیروباوەڕو شەریعەتی لەخۆ گرتووە و موژدەی هاتنی موحەممـەد و پەیامەکەی تیا بووە ﴿الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوباً عِنـدَهُمْ فِـي التَّوْرَاةِ وَالإِنْجِيلِ﴾(سورة الأعراف).

ئەوەی لە تەوراتدا سەبارەت بـە یەکخواپەرسـتی و داننـان بـە ڕۆژی دوایـی و حـساب و پاداشت و سزا هەبووە لابرا، قورئـانیش ئامـاژە بـەوە دەدات ئـەو تەوراتـەی دەستاودەسـت دەکات ئەو تەوراتە دابەزیوە نیەو گۆڕان و لادانی تێدا ئەنجام دراوە، چەمك و واتای قورئان و پەیامەکانی پێغەمبـەران بـۆ مرۆڤایـەتی لەوەشـدا پەیوەسـتن کـە یـەك پـەیامن و ئـەویش ئیسلامە، ئەڵقەی کۆتایی لە ئیبراهیمەوە بۆ موحەممەد مـۆرکێکی تایبـەتی و تەواوێتیـەکی ڕوونی هەیەو سپاردەیەکی گەورە خراوەتە سـەر ئـەو ناوچـەیە (نیمـچە دوورگـەی عـەرەبی) ڕێبازێکی تایبەتیـشی لـەخۆ گرتـووە کـە دەکـرێ پێـی بـوترێ (حەنەفیـەت) کـە پێنـاوی

کۆکەرەوەی هەر ئاکارێکی بەرزو مەردایەتی پێش ئیسلامەو هەندێ جاریش وەسفی عەرەبایەتی پێ دەدرێ، بەڵام لەڕاستیدا ئەوە تەنها چۆڕاوەی ئەو ئایینە یەکخواپەرستییەیە کە هەموو پێغەمبەران هێناویانە هەر لە ئیبراهیمەوە تا موحەممەدو پێغەمبەریش وا وەسفی دەکات: (من نێرراوم تا ئاکارە بەرزەکان تەواو بکەم) (إنما بعثت لأتمم مكارم الأخلاق) ئەوە بوو بە ئیسلام ئەوەی بەجێ گەیاندو بەهاکانی لە داڕمان و لادانی سەردەمەکانی پێشوو ڕزگار کرد.

بێگومان هەر پێداچوونەوەیەکی خێرای بتپەرستی عەرەبی پێش هاتنی کۆتایی پێغەمبەران ئەوە ئاشکرا دەکات کە ئەو ئایینە بتپەرستییەکی تازە پێگەیشتوو و بێ ڕیشەی قووڵەو وەك بتپەرستی یۆنان و فارس و هیند نیە، چونکە ئەوان فەلسەفەو بۆنەی قوڵیان هەیەو بەڵکو ئەمەی نیمچە دوورگە گۆڕینی ئەو بانگەوازە یەك خواپەرستیە بوو کە ئیبراهیمو ئیسماعیل هێنایان و بەردەوام ئاڵاکەی لەسەر دەستی ئەوە پێغەمبەرەکانی بەرزبووە تا قورئان هات وەك ڕاست دانانی کتێبی بەردەست و خاوەن هەژموون بەسەریدا.

جوولەکایەتی لەو شێوەیەدا تووشی گۆڕان بووو نەیتوانی ڕێنموونی پێشکەش بە مرۆڤایەتی بکات و یەك دوای یەك پێغەمبەران بە درێژایی چەندین سەدە هاتن تا ڕزگاری بکەن و ڕاستی بکەنەوە تا ئەوەی پەیامەکەی سەید مەسیح هات کە کۆتا ئەڵقەی پەیامە نێردراوەکانبوو بۆ بەنی ئیسرائیل.

لە ماوەی ئەو مێژووە دوورو درێژەشدا لە موساوە تا عیسا جوولەکە تووشی چەند چەرمەسەری و ڕووداوێکی سەخت بوو و ڕەگەزەکەیان گۆڕانێکی گەورەی تووش بوو و خوێنی نامۆ تێکەڵیان بوو تا ئەوەی وایلێهات هیچ پەیوەندییەکیان بە ڕەچەڵەکی ئیسحاق یان ئایینی موساوە نەما، ئیتر جوولەکایەتی گۆڕدرا بۆ ماددیگەراییەکی سەرکەش و خراپ، پەیوەندییان بە گەلانەوە کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو لە گۆڕانی بنەڕەتەکانی ئاییندا و جوولەکەش لە مەنفادا (تاراوگە) لە بابل لەدوای ساڵی ٥٨٦پ.ز دا کاریگەر بوون بە بیرکردنەوەی کۆنی بابل بەتایبەت لە نەخشە دانان بۆ لایەنە کۆمەڵایەتی و سیاسی و

ئابووریەکانی ئایینی جوولەکایەتی و ئـایینی عیـبری بـوو بـە ئـایینی جوولەکـە، جـادوو و فاڵچیەتی و ئەفسانەی رۆژئاوایی لە کتێبەکانی پەرستشی (ئالکابالا)دا چوونە ناو ئایینەکەو ئەو ساتەوە نکوڵییان دەکرد لە هەر لایەنێکی رۆحی و مەعنەوی ژیان و گیـانی زێـدەرۆیی و خۆبەزلزانی زاڵ بوو بەسەر چەمك و واتایاندا.

لێرەوە جوولەکایەتی لەبەر دژایەتی کردنی فیرەت نەیتوانی وابکات لای هیچ گـەلێ قبـوڵ بکرێ کە پەیوەندییان پێوە هـەبوو، هـەوڵی دا لـە ئـەورووپاو ئاسـیاو تەنانـەت ئەفریقاشـدا بانگەوازەکەی بڵاوبکاتەوە بەڵام سەیری کرد بە تەواوەتی چەمك و واتاکانی بەرپەرچ درانەوە، ئـەو چـەمکانەی خۆبـەزلزانی و خۆبەگـەورەگرتنی رەگـەزی و دانـانی خواوەنـدی جـەنگ و سەربازەکانی بە خوداوەندو نکوڵی لە ژیانی رۆژی دوایی و فەزڵدانی بـەنی ئیـسرائیل بەسـەر هەموو خەڵکدا و بیانووی ئەوەی دەقێکی مۆرکراو لەنێوان ئەوان و خـوادا هەیـەو خـوا ئـەم بوونەی تەنها بۆ ئەوان دروست کردووەو گەلانی تریش کۆیلەی ئەوانن، ئەمە وێڕای دەسـتدانە باری مەترسیداری سوو و زێدەڕۆییان لە دەستگرتن بەسەر گەلاندا بەهۆی سامانەوەو گۆڕینی ڕێبازە جیاجیاکانی ژیان لە خزمەت ئەو ئامانجەدا بن، لێرەوە جوولەکایەتی نەیتوانی شتێ بە مرۆڤایەتی ببەخشێ کە بەرەو ڕێی حەق و باوەڕداری ببات، هەرچەندە ئەو چەمك و واتایانەی پێـدەدان کـە لەسـەر ئەفـسانە و خورافـەو جـادوو وەسـتابوون و نـەوە دوای نـەوە بـوو بـە فەرهەنگیان.

لە ڕوانگـەی ئـەم چـەمکە دەمارگیریانـەوە کـە لەگـەڵ ئاڕاسـتەی حەنەفیـەتی پـەیامی ئیبراهیمو پێغەمبەرانی دوای ئەویشدا نەدەگونجا بۆیە جوولەکایەتی نەیتوانی لەیەك شـوێندا سەقامگیربێ یان ژیار و شارستانیەتێ بنیادبنێ، بەڵکو لەچەند شاڵاوێکی یـەك دوای یەکـدا تووشی چەوساندنەوە بوو، ئەوە بوو لە (٥٨٨پ.ز)دا بختنصەر هێرشی بردە سـەریان و تـەفرو تونای کردن و خەڵکەکەی بەدیلی برد بۆ بابـل و لـەوێ مـاوەی پـەنجا سـاڵ لـە بەندیخانـەدا مانەوە، ئینجا سەرجۆنی پاشای ئاشوور (٣٢٢پ.ز) هێرشی بردە سـەریان و بەسـەریاندا زاڵ بوو و لەسووریا ڕاوەدووی نان، ئینجـا ڕۆمانـەکان بەسـەرکردایەتی تـەیتس (٧٠ز) هـاتن و

پەرستگاکەیان سووتاندن و پەیکەرێکی بتپەرستیان لەبریدا دروستکرد تا ئەوەی دواتر مەسیحیەت زاڵبوو، سووتاندنی پەرستگای جوولەکە لەسەر دەستی تەیتس و وێرانکردنی بەدیهاتنی پێشبینی سەید مەسیح بوو، لەو کاتەوەی ڕۆمان لێیدان ئیتر سەرپێ نەکەوتنەوە.

ژمارەیەك لە پێغەمبەران لەناو بەنی ئیسرائیلدا دوای موسا دەرکەوتن کە کۆتا پێغەمبەریان مەسیح عیسای کوڕی مەریەم بوو، ئەو پێغەمبەرانە هەوڵیاندا جوولەکایەتی لەلادانی ڕزگار بکەن و بیگێڕنەوە بۆ یەکەم ڕێکردەی خۆی بەپێی بنەماو واتاکانی ئەو تەوراتەی دابەزیە سەر مووسا، دیارترینی ئەو پێغەمبەرانەش داوود و سولەیمان بوون، بەڵام پێغەمبەرانی خوا نەیانتوانی لەو گۆڕان و لادانە ڕزگاریان بکەن و ئەو ڕووداوە گەورانەش هیچ دڵی نەرم نەکردن تا سەید مەسیح بە کۆتا پەیامی ئاسمانەوە بۆ بەنو ئیسرائیل هات.

گۆستاف لۆبۆن لە کتێبەکەیدا (اليهود والحضارات الأولى) جەخت لەوە دەکاتەوە جوولەکە زانست یان هونەریان نەبووە و هیچ مافێکیان لەو زەویەدا نەبووە کە داگیریان کردووە، ئەوان نامۆ بوون بەو خاکە، نەریت و ئایینیان هاوردەو وەرگیراوو دزراوی دەوڵەتانی دراوسێ بوو، لەپاڵ ئەوەشدا دڕندەی دڵڕەق بوون، لە سیفری یەشوعدا هاتووە (چی ژن و پیاو و منداڵ و پیرو تەنانەت مەڕو وشتر لەشاردا هەیە بە شمشێر بیکوژن و شارەکەو هەرچیش تیایدایە بەئاگر بیسوتێنن) لە کاتێکدا دەبینین موسڵمانان وەسیەتەکەی ئەبو بەکریان بەجێدەگەیاند (منداڵی بچووك و پیرو ژن مەکوژن، مەڕو مانگا سەرمەبڕن و دارخورما مەبڕن و مەسووتێنن). زۆرێ لە لێکۆڵەران بەدواداچوونیان کردووە بۆ ئەو لادانانەی کە جوولەکایەتی کردبووی بە بنەڕەتی خۆی و ساختەکانیان ئاشکرا کردووە، فرنسیان جاك دومال و ماری لوروا سەبارەت بە بەڵێنی خوا بۆ بەنی ئیسرائیل بە تەنها کە گوایە زەوی بەڵێن پێدراویان بۆ هەیە، لەو بارەوە دەڵێن (ئەگەر ئەو بەڵێنە ڕاست بێ ئەوە پشکی کوڕی ئیبراهیم بۆ عەرەب دەبێ).

توێژەران لە بواری زانستی ڕەگەزەکاندا (گاڵتە دەکەن بە ئەفسانەی گەلی هەڵبژاردەو ساختەو فێڵەکەی لە پێوەری زانستدا ئاشکرا دەکەن و دەڵێن ئەو گەلەی لە تەوراتدا باسی

هاتووە و بە گەلی هەڵبژاردەی خوا هاتووە گەلی جوولەکە نیە نە بە نزیك و نە بە دوور، ڕووداوەکانی تەورات لە سیفری خروجدا و لە مەزامیرە نبوئاتیشدا جەخت لەوە دەکەنەوە، ئەو گەلەی دژ بە پێغەمبەرەکانیان هەستان و بەدرۆیان زانین و لەخوای خۆیان هەڵگەڕانەوەو ئەو خوایەیان بە مرۆڤێ دانا کە بجەنگێ و کەوان و چەکی هەبێ گەلی وا ناکرێ گەلی هەڵبژاردەبێ).

# باسی دووەم

## ( مەجووسیەت )

کاتێ ئەوە بـاری جوولەکایـەتی بـوو، مەجوسـیەت و بووزیـەت و بەرهـەمی ڕۆژهـەڵات هەبوون و ئایینی ئاسمـانی نـەبوون و دوور بـە دوور ملکەچی بتپەرسـتی کـۆن بـوون، ئـەو بتپەرستیەی لەسەر فرەیی و چەندێتی و جادوو و ئەفسانەو فاڵچێتی و ژمارەکان و پەرستشی دیاردە سروشتیەکان وەستا بوو.

ئیمپراتۆریەتی فارسی دژ بە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمـانی بـوو، لـەو کۆمەڵگـە پـڕ ناکۆکـەدا چەندین مـەزهەبی پەرستشی خۆر و ئاگر و ئاو هەبوو، خۆر خوای باڵایان بـوو و کاڵایـان بـۆ بەخت دەکردو قوربانییان پێشکەش دەکردو ئاویـان لـە پیـسی دەپاراسـت، فارسـەکان پـێش هەموو شتێ ئاویان بەپیرۆز ڕادەگرت تا ئاستێ ئاویان بە دەموچاویان نەدەشـۆردو تـەنها بـۆ خواردنەوە یان ئاودێری بەکاریان دەهێنا.[1]

سەبارەت بە پێگەی ئاگر ئەوە وێنەی نەبوو و سنووری بۆ نەبوو، ئـەوە ئـەو ئـاگرە پـیرۆز سەیرکراوە بوو کە لە هەموو شوێنێ پەرستگای بۆ دروست دەکـراو تیایـدا ئـاگر هەڵـدەکراو خزمەتکاری پیرۆز سەیرکراو لە پەرستگادا هەبوو لای ئەو پەیکەرەی ئاگری پیرۆزی تیا بـوو، ئەو پەرستگایانە چەند دەرگایەك و چەند شوێن ئاگرێکیان لە هەشت پایە هەبوو.[2]

سەبارەت بە چەمکی مەجوسیەت لـە مەزدیەوەیـە کـە ئـایینی کـۆنی ئەزدیەکانـە یـان زەردەشتی نوێگەری مەزدی کە لەسەر پەرستـشی هێـزە سروشـتیەکان و ڕەگـەزو کاکێـشانە ئاسمانیەکان وەستاوە، چەند خواوەندێکی تر لەپاڵ ئەو خواوەندانەی سروشـتدا دانرابـوون وەك هێزە ئەخلاقیەکان یان چەند ڕایەکی مەعنەوی پەیکەر بۆکراو، لەو ئایینەدا خواوەندی چاکەو خواوەندی خراپە هەبوون و ململانێ و نـاکۆکی لـەنێوان ئـەو دوو خواوەنـدەدا هـەبوو (ئـیتر

---

١- إيران في عهد الساسانيين: ارثر كريستنس.

٢- هەمان سەرچاوە.

ئایینێکی دوو فاقی بوو کە بڕوای هەبوو بە بوونی دوو خواو بـوونی چـاکەو خراپـەو پـاکی و پیسی و دووخواکەش لەگەڵ یەکدا لە ململانێدان، ڕەگەزەکانیش دژ و نـەیاری یـەکن مـەزدا حوکم و دەسەڵاتی خۆی هەیەو خۆر هێمایـەتی، ئـەهریمان ئـەمیری تـاریکی و ئاراسـتەکاری خراپەیە.[1]

لەبەرئەوەی لای ئەوان ئەو خواوەندانە لەیەك جیاو ناکۆك بوون بۆیـە بیرۆکـەی ململانێـی نێوان ئەو دوو ڕۆحە سەریهەڵدا کە لە دروست بوونی جیهانەوە هەبوون ئەوانیش گیانی چاکەو گیانی خراپەن، لە نێو هاریکارەکانی مەزداشدا شەش خواوەند هەبوون،[2] هەروەها پەرستـشی میترا هەبوو کە لە مەزدی جیا بوو و زۆر کاریگەر بوو بە زانستی ئەستێرەگەری کلـدانی کـە لای مەجوسیەکانی ئاسیای بچووك پەرەی سەند، ئەوانە پێیان حەرام بوو ڕەگەزو کەسەکان بە (الدقن) پیس بکرێن و مردوو بسووتێنرێ، ئەمـە لـە ڕوانگـەی بیروبـاوەڕەوە، لـە ڕوانگـەی نیزامی کۆمەڵگەوە ئەوا بەهاوسەر گرتنی دایك و خوشکیان پێ ڕەوا بوو.

هەروەها نیزامی کۆیلایەتی و گیانی خێڵەکی هەبوو کە چینەکانی لەیەك جیـا دەکـردەوە ئیتر بەهێز ستەمی لە لاواز دەکرد، ئەوان دڵڕەقی و دڕندەیی زۆریـان لـەنێو خۆیانـدا ئـەنجام دەدا، ئەمە وێڕای دەسەڵاتداری و خۆسەپێنی سەرکردەو فەرمانڕەواکان.

مێژوونووسان وا وەسفیان دەکەن (دڵڕەق و سەرکەش و یـاخی و خۆبـەزلزانن و هـەنگاوی جیاو تایبەت دەنـێن و دەڕۆن و بانگەشـەی ئـەوە دەکـەن تەنانـەت مـردن و ژیـانی کۆیلـەو بەردەستەکانیان بەدەست ئەوانە) ئەمە سەرەڕای زێدەڕۆیی و زۆر سەرقاڵ بوون بە ڕابـواردن و شەومانەوە لەسەما و ڕابواردندا، سەرەڕای ڕاوکردن و ئارەزووبازیەکان.[3]

دیارترین دیاردەی کۆمەڵگەی فارسی لە پێش ئیسلامدا نیزامی کۆیلایـەتی بـوو، چـینی جووتیارو پیشەگەران بە سووك سەیردەکران و ئەرستۆقراتی دەرەبەگی تەنها ئەندامانی حەوت

---

١- العقائد، عمر عنايت.

٢- ايران في عهد الساسانيين.

٣- هەمان سەرچاوە.

خێزانە گەورەکە بوون و میراتی خانەدانییان هەبوو و خاوەنی کۆیلەکان بوون، مەجووسیەت دوای زەردەشت دووجار گەشەی سەند، یەکەم بە دەرکەوتنی مانی ٢١٦ز. و مەزدەك ٤٨٧ز.، سەبارەت بە مانی تێکەڵەی زەردەشتی و نەزەری بوو لە مەزهەبێکی نوێدا، مانەوی بانگەوازی بۆ ئەوە دەکرد کار نەکەن و واز لە دنیا بهێنن و چێژی دنیایان نەوێ و هەوڵی فەنابوون بدەن، مەزدەکی ژن و سامانی بۆ هەمووان بە ڕەوا و هاوبەشی گشتی دەزانی.

مەترسیدارترین شتی ناو بیروباوەڕی فارسی ئەوە بوو وەك خوا سەیری پاشاکانیان دەکردو پێیان وا بوو خوا هەڵیبژاردوون بۆ دەسەڵاتی ناو خەڵك و خەڵکی هیچ مافێکیان نیە بەسەریانەوە، (برۆن) کە نووسەرەوەی مێژووی ئەدەبی فارسیە پێی وایە بیردۆزەی حەقی خوایی بەهێز نەبووە وەك ئەوەی لای فارس لە سەردەمی پاشا ساسانییەکاندا وەرگیرا، کیسراکان بانگەشەی ئەوەیان دەکرد بەتەنها ئەوان خاوەن مافن تا تاجی پاشایەتی بکەنە سەرو ڕەچەڵەك و بنەڕەتێکی خواییان هەیە، ئیسلام کاتێ هات بیردۆزەی مافی خوایی و بیردۆزەی کۆیلایەتی تێکشکاند و پەرستگا ئاگریەکانی کوژاندەوەو دەوڵەتی ساسانی ڕوخاندو لەبووندا نەیهێشت.

کشانی ئەسکەندەری مەکدۆنی بەرەو فارس لە ساڵی ٣٣١پ.ز. دا ئەوپەڕی کاریگەری هەبوو بۆ سەر ئەو تێکەڵیەی کە لەنێوان زەردەشتی و فەلسەفەی ئیغریقیدا ڕوویدا، مانەوەی جوولەکەش لە بابل و نیمچە دوورگە دوای ئەوەی بختنصر دەری کردن و ڕاوەدووی نان بۆ ئەوێ کاریگەریەکی زۆری هەبوو تا فارسەکان زانستەکانی ئەستێرەگەری و جادوو و ئەفسانە وەربگرن، لەو ماوەیەدا جوولەکە کەوتنە کۆکردنەوەی وتەو ڕێنماییەکانیان لەژێر ناوی (تلمود) دا.

مێژوونووسان ئاماژە دەدەن بەو تێکەڵبوونەی لەنێوان فەلسەفەی ئیغریقی و ئایینە ڕۆژهەڵاتیەکاندا ڕوویداوە، کاتێ خواوەندی بابلی و ئیغریقی بەیەك گەیشتن و مۆرکی ئیغریقی زەردەشتی داگرت و پەیکەری خواوەند زیۆس و ئەپۆلۆن و میترا و هەمس لە

ڕۆژهەڵاتدا دروست کران، لە هەمان کاتدا چەندین بیردۆزەی پەیوەست بە کیمیـاو جـادوو بـۆ فەلسەفەی یۆنانی زیادکران و ئەفسانە ئیغریقی و بابلی و ئێرانییەکان تێکەڵ بـوون و وێنـەو ئەفسانە ڕۆژهەڵاتییەکان لەژێر ناوی خواوەندانێکی یۆنانیدا شاراوەبوون.[١]

---

١- ایران فی عهد الساسانیین.

# باسی سێیەم

## (بەرهەمی و بووزی)

ئەگەر چاوێ بخشێنینەوە بە ڕۆژهەڵاتدا دەبینین بەرهەمی و بووزی و چینی وەك ئایین هەن و لەو دیدەشەوە لەنێوان هیند و ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا بوونەتە پەیوەندی، لێرەوە وێنەیەکی سەرسوڕهێنەرو شێواوی بیروباوەڕی تەناسوخی ڕۆحەکان و وەحدەتولوجود و سیانە خوایی و پەیکەرسازی بۆ خوا دەبینین، لێرەوە دەبینین بەرهەمی کۆن بەسەر جوولەکایەتیدا دەنازێ و ڕێنماییەکانی خۆی (فیدا) بە نزیکەی هەزارو پێنج سەد ساڵ پێش مەسیح نووسیوەتەوە، بووزی لە هینددا وەك نوێکەرەوەی بەرهەمی دەرکەوت و لە سەیلان بڵاوبوویەوە تا گەیشتە چین و بۆرما و بەتەواوی لە هیند دەرچوو.

سەبارەت بە بەرهەمی بڕوای بە سیانە خوایی هیندەکان (برهما و فشنۆ و سیفا) هەیەو شوێنکەوتووانی بڕوایان هەیە بە تەناسوخی ڕۆحەکان و دەڵێن ڕۆح تەنها بەوە لە تاوانەکانی پاك دەبێتەوە، هەروەها خۆکوشتن دروشمیانە، جیاوازی نێوان بەرهەمی و بووزی ئەوەیە یەکەمیان لەسەر جیاوازی چینەکان وەستاوەو تیایدا کاهینەکان تایبەتمەندی سەروو ئاستی مرۆڤیان هەیە، بەڵام بووزیەت هات و ئەو کۆتەی شکاند.

زانا ئەبولحەسەنی نەدەوی دەڵێت (بەرهەمیەت زۆر لە ڕەوتی یەکەمی خۆی لایدا و ساکاری خۆی و پەیوەندی ڕاستەوخۆی ڕۆحی خۆی بە دروستکەری بوونەوە لە دەستداو هێزی ڕەوشتی خۆی لەدەستداو بەرەبەرە وا ئاڵۆزی تێکەوت تا ڕۆژ بەڕۆژ یەکخواپەرستی پوختی لە بیروباوەڕدا و دادوەری لە کۆمەڵایەتیدا لەدەستدا لەکاتێکدا ئەو دووانە دوو پاڵپشتی پەیوەست بە بنیادی ئایینی ناخ و واقیعی ژیانن).

ئایینی بەرهەمی بەرەبەرە هێزو قەڵەمڕەوی خۆی لەدەست دەداو بێ متمانەیی بەرامبەری زیادی دەکرد، ئەم گرژیە و ئەم ڕاڕاییە لە کۆمەڵگەی هیندیدا و گەڕان بەدوای ئایینی تردا لەجێی ئایینی بەرهەمی لە کەسێتی (بوزا)دا خۆی دەنواند، ئەمەش لە سەدەی شەشەمی

پێش زایین دا بوو، بوزا بە بیرۆکەیەکی نوێ یـان ئـایینێکی نوێـوە دەرکـەوت کـە دەروونـی دادەماڵی و ئـارەزوو و هەسـتەکان و یەکـسانی و تاودانـە کـاری تـەفروتوونا دەکـرد و دژی تەقلیدو بۆنەکان و ئەو جیاوازیە سروشتیە بوو کە لە سەردەمی کۆتاییدا تووشی کۆمەڵگـەی هیندی ببوبوو، ئەم بیرۆکە یان ئایینە بە خێرایی بڵاوبوویـەوەو بەشـی باشـوور و ڕۆژهـەڵاتی ئاسیای گرتەوە.

بووزیەت بە واتای خۆی ئایین نەبوو چونکە بیرۆکە یان بیروباوەڕێکی نـەبوو سـەبارەت بـە بوونی دروستکەری بوون و بنەماو ڕێبازو گەڕانەوە لای خوا، بەڵام خێـرا ئـەو بزاڤـە ئایینیـە گەورەیە لاڕێ بوو و بت و پەیکەرو بۆنەکان هێرشیان بردە سەر واتە ئـەو شـتانەی بووزیـەت لەدژیان هەستاو ڕاپەڕی بەڵام لـە ماوەیـەکی کەمـدا خـودی بووزیـەت بـوو بـە ئـایینێکی بتپەرستی کە تەنها بەپێی ناوو ژمـارەی بـت و پەیکـەرەکان لـە ئـایینی بەرهەمیـەت جیـا دەکرایەوە، ئیتر بووزیەت بەرەو داکەوتنی ئەخلاقی و فرەیی و مەترسـی و زۆری مەزهـەب و ڕەوت چوو.

(ئەبشورا تویا) دەڵێت: لەناو بووزیەتدا دەوڵەتێ دامـەزرا کـە گرنگـی دەدا بـە دیـاردەو ڕووکارەکـانی خواوەنـدەکان و پەرسـتـشی پەیکـەرەکان و گـۆڕینی مەیـدانی پەیوەندیـە برایەتیەکانی بوزیەت و تیایدا داهێنان دەرکەوت.

(ریاس ریفدس) ژنە نووسەری ئەوروپی دەڵێت (بیرۆکە و بیرە لاوازو ناسـاغەکان فێرکـاری ڕەوشتی بووزایان شێواند تا لەپشت ئەو تێڕامانە تینوانەدا خۆی داپۆشی، مەزهـەبێکی نـوێ لە ئایینەکەدا سەریهەڵدا و گەشەی سەندو زاڵ بوو بەسـەر دڵـی خەڵکـدا، دواتـر کـز بـوو و مەزهەبێکی تر هات و شوێنی گرتەوە، تا ئەو وەهمانە کەڵەکەیان بەست و کەشەکە سنوردار کرا و تاریکی بارەکەی گرتەوە، وانە ساکارەکانی دامەزرێنەری ئایینی بەهۆی سەرنج لێدانـە کەلامی و ئارایشت و قسەرازاندنەوەکانەوە شێواو بـوون) لـە جیهـانی بـەرفراوانی بوزیـدا و لەماوەی دوورو درێژی دەسەڵاتی بوزیدا چاکسازێکی گەورەی بووزیەتی بنەڕەتی دەرنەکـەوت

تا دژایەتی ئەو بووزیەتە نوێیە بکات و ئەو ئایینە گەورەیە بـۆ گـەنجی جـارانی بگێڕێتـەوەو ساکارییە فەوتاوەکەی و پاك و پوختییە ونبووەکەی نوێ بکاتەوە).

بەوجۆرە ئایینی بەرهەمی لە بەردەم بووزیەتدا بە شکاوی مایەوە تا (شنکر ئەجاریە) لـە سەردەمی مەسیحیدا هات و چالاکییەکی گەورەی دژ بە بووزیەت ئەنجامدا، بەرهەمی هێندە بڵاوبوویەوە تا توانی ئایینی بوزی لـە هینـد دوور بخاتـەوەو بازنەکـەی بەرتەسـك بکاتـەوەو دەسەڵاتی لاواز بکات تا بەتەواوەتی لاواز بوو و وەك ئایینێکی کۆنی هیندی قسە لەسەرکراو مایەوە.

شنگر توانی بووزیەت لە ژیان دووربخاتەوە بەڵام نەیتوانی بەرهەمیەت بۆ بـاری یەکـەمی خۆی بگێڕێتەوەو بیروباوەڕی یەکخواپەرستی و پەیوەندی ڕاسـتەوخۆ بـە خـواوە بگێڕێتـەوەو نێوەندگەری نێوان بەندەو خواو دادوەری کۆمەڵایەتی و یەکسانی نێوان چینەکانی بۆ چارەسەر نەکرا.

هیندۆسی نوێ لە بەرهەمیەتدا کۆمەڵگەیـەکی سەرسـوڕهێنەری دروسـتکرد کـە لەسـەر چەمك و واتای (پاکێتی زێدەرەو بەرۆژوو و نەرمی شەو و ئەشکەنجەدانی دەروون) وەسـتابوو، بەو پێیەی مرۆڤ دیلی حەرامیەو خوا خۆی تووشـی چـەند جـۆرە بەڵایـەك دەکـات و زۆر لـە خۆشی ژیان دوور دەکەوێتەوە، کاتێ پیر بوو دەچێتە دارستان و مووی کورت ناکاتەوەو نینۆك ناکات[1] و لەژێر تیشکی خۆردا دەژی، لە ژیانیشدا دەبـێ مانگـا پـیرۆز ڕاگـرێ و ملکەچـی سیستمی چینایەتی و دەسترۆیی بەرهەمیەکان بێ.

لە ئایینی هیندۆسدا چینەکان پایەی بنەڕەتی بیروبـاوەڕن، بـەراهاما گـەورەو ئـەوانی تـر کۆیلەن، کۆیلەکان بۆیان نیە پێشکەون و ببنە بەرهەمی، چونکە سەرچاوەی چینایەتی بـەپێی ڕەچەڵەك بووەو ڕەگەز زاڵ بووە تا هەر شـتێکی تـر، بـەڵکو بەرهـەمی بـەوەش ڕازی نـەبوو ڕەگەزو ڕەچەڵەك بکاتە بنەڕەتی سیستمی چینایەتی بەڵکو هەندێ دەقی پیرۆزی بۆ هێنا کـە دەیوت خوا چینەکانی بەو شـێوەیە دروسـت کـردووە، دواتـر ئـەو دابەشـکاریە بـە هـەتایی

---

١- بروفيسور أتربا: ثقافة الهند وحياتها الروحية.

دەمایەوەو هیچ ڕێیەك نەبوو بۆ لابردنی یان بۆ ئەوەی هەر کەسێ لە بەشێکەوە بەرەو بەشێکی باڵاتر پێشکەوێ.

لە تێگەیشتنی هیندۆسیدا بەرهەمی وا بوو کە لە دایك دەبوو لە ڕیزی یەکەمی دنیادا دادەنرا[1] و چی لە جیهاندا هەبوو موڵکی بەرهەمی بوو و لەهەر بوونێکدا مافی هەبوو، ئەگەر کەسی بەرهەمی هەژار بکەوتایە بۆی هەبوو سامانی بەردەستی ببات بۆ خۆی چونکە کۆیلەی بوو، هیچ لەسەر ئەوەش سزا نەدەدرا، کۆیلە بەخۆی و دەستکەوتیەوە موڵکی گەورەکەی بوو، بەرهەمی بە هیچ تاوانێ پیس نەدەبوو با کوشتنیش بوایە، باج لە کەسی بەرهەمی وەرنەدەگیرا، کەسی بەردەستی بۆی نەبوو سامانی زیادە کۆبکاتەوەو دەبوو هەر بە کوڕی چینی خوارەوە بێنێتەوەو ئەگەر لە بەرەی خۆی زیاتر پێی ڕاکێشا دەستی ببڕن.

ئەمانە هاوشێوەی پەیامی تلمودی جوولەکەن کە دەڵێن خوا ئەوانی بەگەلی هەڵبژاردەی خۆی هەڵبژاردووە، ئیسلام کە هات ئەم سیستمە چینایەتیەی تێکشکاندو بوو بە هۆکارێکی گۆڕان لەو کەشانەدا کە مایەوە.

هیندۆس و بەرهەمیش دژی ئەوە بوون هیچ تیشکی بەختەوەری یان چاکەی ژیانی دنیا هەبێ و بەو پێیە دەبێ لە ڕەشبینی و ڕاڕایی و بەکەمگرتنێکی تەواودا بڕوانیتە ژیان، کتێبی پیرۆزیان (یۆگا واستسها) دەڵێت: بەختەوەری لەم جیهانەدا هیچ ڕێگەیەکی بۆ نیەو خۆشیەکانی ژیان تەنها فێڵ و خەیاڵن، هیچ خێرێ لە جەستەدا نیە چونکە جێی کەموکورتیو ناتەواویەکانە، هیچ بەهایەك بۆ خۆشی و سامان و شکۆو دەسەڵات نیە.

بەرهەمی لە سەدەی هەشتەمی پێش زاینەوە لە هیندۆسیەوە دەرکەوت و لەهەمان چوارچێوەی کۆنی ئەودا بیروباوەڕو پەرستشی کۆنی هیندی هەبوو، لەپێشڕەوی ئەوانەشدا پەرستشی ئاژەڵەکان بەتایبەت مانگاو پەرستشی هێزە سروشتیەکان و پەرستنی ئەندامی زاوزێ بووکە بە بڕوای ئەو هۆکاری دروستبوونە.

---

١- د. أحمد شلبي: أديان الهند الكبرى.

لەو دیاردە پیرۆز سەیرکراوانەی هیندیەکان دەیانپەرستن خواوەندی ئاسمان و خواوەندی هەورە بروسکەو خواوەندی ئاگر و خواوەندی گەردەلوول و خواوەندی باران و خواوەندی ڕەشەبا بوو، مانگا لە ئایینی هیندۆسی و بەرهەمیشدا بەرزترین پێگەی هەبوو و لەو خواوەندە هیندیانە بوو کە بە درێژایی سەدەو سەردەمەکان ئەو پیرۆزیەی لەلایەن لاواز نەبوو و بەدایکی مرۆڤ وەسف دەکرا.

گرنگترین بیروباوەڕی بەرهەمی سیستمی چینایەتی بوو کە بریتی بوو لە تەناسوخی رۆحەکان و تەجەسودو سیانە خوایی و وەحدەتولوجود، سەبارەت بە تەناسوخ لەسەر ئەو بنەڕەتە دانرابوو گوایە یەك گیان چەندین جار دێتە دونیاو دەژی تا دەرفەتی خۆپاکردنەوەی هەبێت، تەجەسوود بریتی بوو لە نکوولّی لە بوونی خوا و ڕۆژی دوایی چونکە هەست پێنەکراون.

دیارە بەرهەمیەکان سیستمی چینایەتییان داناو[1] چەندین تایبەتمەندییان بۆ خۆیان داناو بەرهەمیەکان لەسایەی ئەو نیزامەدا بوونە خۆسەپێن و توندو تیژی و ستەمیان دەرکەوت و خەڵکیش لە دەستیان بێزار بوو، دواتر چەند بانگەوازێ دەرکەوتن کە کۆتی بەرهەمی هیندۆسییان کەم کردەوە، ئەمەش لە سەدەی شەشەمی پێش زایینندا بوو وەك دەرکەوتنی چینی و بووزی، هەرچەندە ئەم دووانەش هەر لە بازنەی هیندۆسیدا دەخولانەوەو لێی دەرنەدەچوون.

سەبارەت بە چینی بریتی بوو لە سزادانی نەفس، ئەمە دواتر گواسترایەوە بۆ ناو مەسیحیەتیش، خۆکوشتن لەناو ئایینی چینیدا لوتکەی ئامانج بوو و تەنها بۆ پیاوە ئایینیە تایبەتەکان هەبوو. واتای خۆکوشتن بریتی بوو لە وازهێنان لەو کارانە کە گومانی زیان گەیاندن بە هەر گیاندارێکیان هەبێ، لە دیدی چینیدا ژیان سەختیەکی بەردەوامەو نارەحەتیەکی پەیوەست و نەبڕاوەیە کە سایەو سێبەری نامێنێ و دەڕوات و ژیانیش تیایدا هیچ و بێ واتایە.

---

١- هەمان سەرچاوە.

سەبارەت بە بووزیەتیش بریتی بوو لە ڕزگارکردنی نەفس و پاك کردنەوەی و سەرکوت کردنی ئارەزووەکان، بەڵام خێرا لاڕێ بوو و بتپەرستی و بۆنە و پەیکەرەکان تێکەڵی بوون، بووزیەت ڕەوتێکی ئەخلاقی بێ بیرو هزر یان بیروباوەڕی سەبارەت بە خوا بوو، بەڵام مۆرکی دنیانەویستی و بەرپەرچدانەوەی خۆشی ژیانی وەرگرتبوو، لوتکەی ئامانجیشیان لە بووزییەتدا بە (سەفانا) ناسرابوو کە مرۆڤ دوای ڕزگاربوونی لە هەموو ئازارو سەرکەوتنی بە ڕزگاری حەقیقی پێیدەگات.[١] بووزیەت بەتەواوی نکوڵی لە دەروون و نەفس دەکردو هەمان بڕواشی هەبوو بەرامبەر بە ئەودیو سروشت، بەڵام خێرا لە سەدەی یەکەمی دوای مەسیحدا بووزیەت گۆڕاو شێوەیەکی نوێی وەرگرت و خودی بووزا لە مەزهەبی نوێدا کرا بە خوایەکی شاراوەی خاوەن نهێنی سەرسوڕهێنەر، لەوانە ئەو خواوەندە خۆی خستۆتە شێوەوە تا مرۆڤایەتی ڕزگار بکات و ئەرکی تاوان و هەوڵە کۆنەکانیان لە ئەستۆ بگرێ و ڕێ نەدات تاوانی تری نوێ ئەنجام بدەن.

لەمەوە بووزا بوو بە هێمای ئەو خواوەندە ڕزگارکەری کە سات و ناسات لە شێوەی جەستەی مرۆڤێ دێتە سەر ئەم جیهانی سەر زەویە تا مرۆڤایەتی لەو خودەی خۆی ڕزگاربکات کە هەموو جارێ بە بووزا ناو دەبرێ.

بووزیەت لە کۆتا قۆناغی بڕوایدا دەگات بە قۆناغی زەفانا، زەفانا وشەیەکی نارِوونە بە واتای سڕینەوەو نەمری و ژیانەوە و حەسانەوە دێ، مەبەستی لایەنە ڕۆحیەکەیەتی وەك ئەوەی هەستەکان لەدەست دەدات و لەو ساتەدا کە هەست بە ئازار دەکات دەروون ڕزگار دەبێ و هەستی نامێنێ و پەیوەندی بە جەستەوە دەبڕێ.

دکتۆر (شلبی) دەڵێت: دیارترین چەمك و واتای بووزی زەفانایە کە واتای ئەوەیە تاك بگاتە ئاستی کوشتنی ئارەزوو و حەزەکانی لەوپەڕی پلەی خۆشی ڕۆحیداو دەروونی خۆی پاك بکاتەوەو هەموو ویستەکانی لەناو بەرێ.

---

١- غلاب: الفلسفة الشرقية.

ئایینەکانی هیندو لەپێش هەموویانەوە هیندۆکی ئەو ستەمە گەورەیە نیشان دەدەن کە لە دەروونی مرۆیی کراوە سەبارەت بە پەیوەندی بە ژیانەوەو پەیوەندی لەگەڵ کۆمەڵگەدا لە روانگەی لارێکردنی دیدو واتای ئایینی دەقەکانەوە. ئەم سلبیەتە (نەرێنیە) مەترسیدارەی بواری ژیانی و کەنارگرتنی لە ژیان و دنیانەویستی و ئەوبێبەشبوونەی بانگەواز بۆ رۆژووگرتنی بەردەوام دەکات و دەڵێ دەبێ لە ژێر تیشکی سوتێنەری خۆردا دابنیشی و دژی هەموو ئارەزوو و ویستەکان بوەستیتەوەو ئەشکەنجەی دەروون بدەیت، هەموو ئەمانە کاریگەری قووڵیان هەبوو لە بنیادی کۆمەڵگەو بنیادی بووندا بەو جۆرەی کە ئایینەکان داوایان لە مرۆڤ کردووەو ئەو سپاردەیان داوەتە دەست.

لەلایەکی ترەوە دەبینی ئەو زەلیل کردنە دڕندانەو بەکۆیلە کردنە سەر سەختانە هەبووە دەبینین چینی کۆیلەکە زۆرینەی کۆمەڵگە بوون لە خزمەتی بەرهەمیە دەسەڵاتدارەکاندا بوون هیچ هیوایەکیشیان بەوە نەبوو رۆژێ لە رۆژان بە رێزەوە سەیر بکرێن یان پلەیان بەرز بێتەوە، تاك لە هیندۆکیدا گرنگیەکی وای نەبوو، بەڵکو پشتگوێ خرابوو،[1] سەرەڕای ئەوەی ئەگەر ژنێ پیاوەکەی بمردایە لێی حەرام بوو شوو بکاتەوە، جەستەی مردوو دەسوتێنرا، ئەوپەڕی لێبووردەیی بۆ زەلیلی هەبوو تا ئەوەی دەگەیشتە ئاستی ڕازی بوون بە زەلیلی، ئەمە سەرەڕای خورافەو جادوو و ئەفسانەو پێشکەشکردنی قوربانی بە خواوەندەکان، ئیسلام کە دەرکەوت دژی هەموو ئەوانە وەستاو ملیۆنەها کەسی لەوانە رزگار کرد.

---

١- أديان الهند الكبرى.

# باسی چوارەم

## (هێلێنی)

کۆمەڵگەی یۆنانی هێلێنی لەو کاتەوەی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی (١٤٦پ.ز) چوویە ئەوێ کە وێنای ئەفلاتوون بوو لە کۆمارەکەیدا جوانترین وێنەیەك پێشکەشی کردبێ بریتی بوو لە ئاژەڵێتی ئافرەت و دەسەڵاتداری گەورە بەسەر کۆیلەداو دانان بە کۆمەڵگەی کۆیلایەتی و دەسەڵاتداری چینایەتی و بانگەوازی گەرم و بەردەوام بۆ بێ ئابڕوویی، بانگەوازی بۆ ئەوە دەکرد کوڕو کچیان جلی کەم بپۆشن، دەبێ هەست بە شەرمی درۆو گاڵتەجاڕی نەکەن کاتێ دەبینن لە کۆمەڵگەیەکی جەستەپەرستدا جەستەی مرۆیی بێ بەرگ و ڕووتەو پەیکەری گەورەی خواوەندەکان لە بەرد و کاشی سپی لە مەیدانەکاندا بە ڕووتی دروست دەکرا، دواتر بە مەی و سەما ئەو خواوەندانە ڕازی دەکران.

ئەفلاتوون ڕای وایە کۆمەڵگە هاوسەرگیری تاکەکەسی و خێزانی تایبەتی نەبێ و حەز دەکات باوك و کوڕ یەك نەناسن و دەبێ نەخۆش و پەککەوتەکانیش ڕێی مردنیان بۆ دیاری بکرێ، ئەفلاتون و دواتریش ئەرستۆ جەخت لەوە دەکەنەوە کۆیلە مافی هاوڵاتی بوون و یەکسانی بۆ نیەو بگاتە هەر ئاستێکی سەرووتریش هەر کۆیلەیەو گەورەش چەندە لاواز بێ هەر گەورەیە، ئیتر گەورەکان دەسەڵاتدارو دەستەیەکی هەڵبژاردەی ناو خەڵکن و لەنێوان خۆیاندا خزمایەتی دەکەن و منداڵیان دەبێ تا ئەوانیش دواتر ببنە گەورە، ئەمە هیواو خەونی ئەفلاتوون نەبوو بەڵکو لە ڕاستیدا واقعی کۆمەڵگەی یۆنانی هێلێنی هەر وابوو و ڕەگەزی هەڵبژێردراوی دەپاراست و گەورەش بۆی هەبوو کۆیلە بە هەر جۆرێ بەکاربهێنێ.

یۆنانییەکان ڕووتییان دەکردە شتێکی نموونەیی و پێویستی جوانی و پاڵەوان و گەورەو خواوەندەکانیشیان بەڕووتی نیشان دەدان، هەروەها سەماو مۆسیقاش کاریگەری هەبوو، ئیغریقیەکان سەمایان بە خواوەندی گەورەی خۆیان دەزانی و بە ژن و پیاوەوە لە کۆڕی تایبەت و گشتییاندا سەمایان دەکرد، نموونەی باڵا لای ئەوان بەرزڕاگرتنی جەستەی مرۆڤ

بوو، لە نێوانیاندا نەریتی پیرۆز ڕاگرتنی پاڵەوانەکان هەبوو، هەر شارێ پاڵەوانی تایبەتی خۆی هەبوو تا ئەوەی وەك خوایەك یان نیمچە خوایەك سەیری دەکرد و بۆنە و جەژنی ئایینی پڕ پیرۆزی بۆ دادەنا، ئەو چیرۆکانەی شانازی و گەورەییان دەنواند دەگێڕدرانەوەو لە چەند بۆنەیەکی وادا کە شتانێکی نیمچە نهێنی و کارەساتی دڵتەزێن بن باس دەکران، لێکۆڵەرەوان دان بەوەدا دەنێن کاهینی دیاردەیەکی ڕۆژئاواییە نەك ڕۆژهەڵاتی و بە پیشەیەکی پیرۆز سەیرکراو دانراوەو لەسەردەمی بتپەرستی یۆنانیدا پەرستگایان هەبوو و خزمەتکارو پاسەوانیان بۆ دانرابوو و ڕێی هەر هەنگاوێکی تاکە کەسی یان نەتەوەیی بەسترابوویەوە بەڕای دەنگی ناخۆشی کونجێکی تاریکی سەر پەرستگاکانی یۆنانەوە.[1]

هەموو وێنەی کۆمەڵگەی ئیغریقی هێلێنی لە چیرۆکی ئیغریقیدا ڕوونە تا ئەوەی (مفید شوباشی) دەڵێت: خراپە لەو داستانانەدا خراپەیەکی تەواو وایە کە توندیەکەی هیچ جۆرە چاکەیەك لەخۆ ناگرێ، جەنگی تەروان کە دە ساڵی خایاند بەبێ بیانوویەکی مەعقول هەڵگیرساو لەسەر هەڵگیرسانی ئەو جەنگە پێشتر ڕاجیاییەك لە ڕای سەرکردەکانی ئیغریقدا هەبوو تا دواتر یەکدەنگ بوون، چونکە هێلێنی ژنی منیلاس (لە گەورەکانی ئەوان بوو) عاشقی پاریسی ئەمیری تەروان بوو و لەگەڵیدا ڕایکرد بۆ وڵاتەکەی پاریس بێ ئەوەی بەڵێنی خۆی بۆ مێردەکەی بپارێزێ، بەو جۆرە جەنگی وێرانکەر لە پێناو ژنێکی ڕاکردوودا هەڵگیرسا کە تەنها بۆ ئەوە باش بوو پشتگوێ بخرایە، کەچی ئاگرەکەی بەر گەلان کەوت بێ ئەوەی هیچ بەرژەوەندیەکی بۆ ئەوان هەبێ یان هیچیان دەستکەوێ، لە زۆربەی نارەحەتیەکانی ئیغریقدا کە هاتووە ژنی ئیغریقی ناپاکی نواندووە و بێ هیچ بەرگریکاریەك تاوی داوەتە سووکایەتی و ئەنجامدانی دڕندانەترین تاوانی پڕ مەترسیدار کە ئەنجامی زۆر خراپی لێکەوتووەتەوە.

چیرۆکی (کاترا) هەیە کە تیایدا (کلیتمنسترا) بەر پیرۆزی پەیوەندی هاوسەرگیری ناکەوێ‌و لە ئامادەنەبوونی (ئەخمنین)ی مێردیدا کە چوو بوو بۆ هێرش بردنە سەر تەروادە و سوپایەکی بردبوو تا تۆڵە لە ئەمیری تەراوادە بکاتەوە لەو کاتەدا ژنەکەی عاشقێ دەگرێ و

---

١- زکی مبارك، الرسالة، سنة ١٩٤٢

بەو تاوانەشەوە ناوەستێ و دڕندەیی خۆی بۆ ئارەزووە ئاژەڵانیەکەی خۆی نواند و بە ناپاکی و بە هاوبەشی لەگەڵ (ئیگۆست)ی عاشقیدا مێردە پاڵەوانەکەی خۆی دەکوژێ.

بەمجۆرە چیرۆکی ئیغریقی وێنەی ژیانی گەلێ نیشان دەدات کە بیروباوەڕی بتپەرستی عەقڵی داپۆشیوەو ڕاستیە واقعیەکانی لێ داشاردووەو هەستە ناوازە و جوانە مرۆییەکانی تێدا لاواز کردووەو ڕەقی و حەزی خراپەی لا ورووژاندووەو لەوەشدا بیانووی بۆ پەیداکردووە، زۆربەی کات خواوەندەکانی ئیغریق ڕەق بوون و حەزیان لە تۆڵە بووە، ئەگەر ببوایە بەرامبەر ستەم لێکراوێ بە ویژدان بووایە یان سۆزی بۆ بێنازێ هەبووایە مەرجی ئەوەی هەبوو سۆزو ویژدانەکەی لە هەر سیفەتێکی مرۆیی دامالڕێ و ڕێ نەدات نیازەکە بێتەدی، ئەمەش تەنها بەرامبەر بە بەندەکانی نەبوو، بەڵکو دەیدان بە گژی یەکداو لەناوی دەبردن.

ئەو بارەش هەمووی (بەڕای خۆیان) پلان و هەنگاوی ئەو خواوەندانە بووە، دەوترێ بتپەرستانی ئیغریق خۆیەخۆ نەبوونەتە وێنەی خواوەندەکانیان یان بەشێوەیەکی ڕاستتر وێنەی خواوەندەکانیان لەسەر شێوەی خۆیان دروست دەکرد.[١]

لێرەوە دەردەکەوێ ئەخلاقی یۆنان ئەخلاقی کامەرانی بووە، ئامانجی بالایان بەختەوەری هەستی بووە و ئەوە بالاترین ئامانجی ژیانیان بووە، ئەرستۆ فەردیەت و ئازادی تاك دیاری دەکات و بە مافی هەمووانی نازانێ و تەنها بۆ گەورەکانی دیاری کردووە، تەنها سەرکردەکان بۆیان هەیە بە کۆیلە نەگیرێن چونکە ڕۆحی بالاو دلێرییان هەیە، هەروەها کەسی بالا بۆی هەیە قەڵەمڕەوی بەسەر کەسی نزمدا بلاو بکاتەوەو کەسی نزمیش دەبێ ملکەچ و گوێڕایەڵ بێ، هەروەها کەسی ئازاد سەرەڕای تووشبوونی بە توندو تیژی و کۆیلایەتی هەر ئازادە، کۆیلەش با سەرکەوتنیش بەدەست بێنێ هەر کۆیلەیە، بەلام ئەفلاتون تاك لە بەهای فەردی خۆی دادەماڵێ تا بیکاتە پێناوی سوخرە بۆ خزمەتی دەوڵەت و قەوارەی لە دەزگا گەورەکەیدا تێکەڵ دەبێ.

---

١- مفيد الشوباشي: رحلة الأدب العربي إلى أوروبا.

هەڵەیەکی فەیلەسوفانی یۆنان ئەوەیە دەڵێن مادده ئەزەلیەو خوا تەنها ئاگاداری شتە گشتیەکانەو قسەی دەهریەو قەدەمیەتی جیهانیان هەیەو لە ئاست مەنتقی قیاسیدا وەستاون‌و ئەو مەنتیقە وێنەی کۆمەڵگەیەك بوو تیایدا گەورەکان لە لووتکەدا بوون بۆ ئەوەی ڕۆژێ لە ڕۆژان چاویان لەوە بێ بەرەو بەختەوەری بچن.

ئایینی ئیغریقییەکان ئایینێکی سروشتی بوو باسی فرە خوایی دەکردو هەر خوایەك خاوەن هێزێکی تایبەتی سروشتی بوو و سەرپەرشتی دەکرد، (زیۆس) گەورەی خواکان بوو و خواوەندی هەورە گرمە و هەورە بروسکە بوو، (دیمیتر) خواوەندی زەوی و پیت بوو، (ئەفرۆدیت) خواوەندی جوانی و (ئپۆلۆ) خواوەندی خۆرو (نبتۆن) خواوەندی دەریا بوو، گەلی یۆنان بە تەواوەتی وەك خۆیان خواوەندیان دەپەرست واتە وەك مرۆڤێ کە هەموو شتێکی بۆ ببێ و خواوەندەکان دەیانتوانی ژنی یەکتر ببەن و دەست درێژی بکەنە سەریان و سیفەتی خراپی و لارییان هەبێ و چاوچنۆکی و ترسنۆکی و حەزی تۆڵەسەندنەوەیان هەبێ.

ئیتر کۆمەڵگەی یۆنانی ئەو کۆمەڵگە بتپەرستیە بوو کە لەسەر بنەمای ترس لە دیاردەکانی سروشت وەستابوو، تۆتۆنیە کۆنەکان پێیان وابوو زستان هێزێکی لەناوبردنی مرۆڤی هەیە، زستان و شەوی دوورودرێژ یاریگەی ڕۆحە خراپە ترسناکەکانی ناخ و جەرگەی زەوی بوون کە دەهاتنە دەر لە قوڵایی دەریا شەپۆل دەرەکانەوە بە دوای ڕاوی مرۆییدا دەگەڕان، جەژنەکانیش بۆ ڕازیکردنی ئەو ڕۆحە خراپانە بوون.

ئەنیس فریحە دەڵێت: یۆنانەکان لە دیدگای مرۆڤەوە سەیری خواوەندەکانیان دەکردن و وەك مرۆڤ هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکردن، ئەوان دەیانوت ئەو خواوەندانە دەژین و دەکوژرێن و دەدزن و ژنی یەکتر دەڕفێنن، بە دەربڕینێکی تر خواوەندەکانی یۆنان مرۆڤ بوون بەڵام خۆسەپێن و بەهێزبوون و هەموو سیفەتێکی جوانی و هەموو دڕندەیی و خراپەیەکیشیان هەبوو، بۆیە لەبەردەم ئەو خواوەندانەدا ترس و ڕکەبەری بەسەر کەسانی تایبەتی ئیغریقیدا زاڵ نەبوو، کەسی یۆنانی لەبەردەم خواوەندەکەیدا وا هەستی نەدەکرد بەندەیەکی زەلیلەو پێویستی بە سۆزو میهر هەیە. بەڵکو خۆی گەورەی خۆی بوو و دڵنیابوو ئەو گەورەی

سەرزەویە و ژیانی کەسی ئیغریقی و جەستەو جوانی جەستەی بەپیرۆز دەزانی و هەوڵی یەکەمی بۆ ژیانی دنیاو خۆشیەکانی بوو، مۆسیقاو گۆرانی و سەما و شیعرو پەیکەرو وێنەو هەڵکۆڵین کاری بوو، کتێبەکانی مێژوو بە دوورو درێژی چەندین بەشیان هێناوە سەبارەت بە خراپی ڕەوشتی یۆنانیەکان و ڕۆچوونیان لە بێئابڕوویی و خراپەدا و تاودانە خۆشی و ڕابواردن و خراپی ڕەوشتی شەخسییان، زۆریش باسی دیموکراتیەتی یۆنانی کراوە، بەڵام دیموکراتیەت بۆ گەورەکان بوو، کۆیلەکان لە ژیانی پێش ئیسلامدا هیچ جۆرە مافێکیان نەبوو.

بیروباوەڕی ئایینی لە کەشوهەوای یۆناندا بارگرژو شێواو بوو و هەندێکی لە دیدگای ڕەواقیەکانەوە بوو بەو پێیە چی پەرستراوو دروستکراو لەبووندا هەن بەیەك هۆکار بوون کە ئەویش یەکێتی کرۆکی ناوازەو تاکەکانەو ئەم بوونەش خوایەکی نیە تا بەڕێوەی ببات و هەموو جیهان لە صودفەوە بووەو مرۆڤ هەر لە خۆوە بووەو سروشت و ئایینەکان لە خواوە نین و نکوڵی لە هەمیشەیی بوون یان بوونی دوای مردن دەکەن.

ئەنیس فریحە دەڵێت: هەموو ئایینەکان لە دەوری پەرستشی خواوەندەکاندا دەخولانەوە، لە بۆنەو ئاهەنگی پەرستشیان بریتی بوو لەوەی چێشتێکی پیرۆز دانراویان هەبوو کە تیایدا ئاژەڵێکیان سەردەبڕی و پێکەوە گۆشتەکەیان دەخوارد، جۆرێ لە هاوسەرگیری پیرۆز یان مانەوەی پیرۆز لە جەژنیاندا هەبوو کە وا دەردەکەوێ بێئابڕوویی تێکەڵی تەواوی وابووە کە بە باسکردنیشی بێزاری ڕوومان تێدەکات.

ئەم پەیوەندیە جنسیەی نێوان ژن و پیاوە کاهینەکان یان نێوان ژن و پیاوی هۆزەکان لەچەند کاتێکی دیاریکراو یان چەند بارێکی تایبەتدا دەبێ بە هێمای گاڵتەجاڕی پەیوەست بە پیت و بەرهەم ڕاڤە بکرێ.

یەکێ لە خواوەندەکانیان دیونیوس خواوەندی مەی بوو و لە ئەفسانەدا باسی هاتووە کە بە جیهانی شارستانیدا دەگەڕێ تا مەی نۆشان فێر بکات، پەرستشەکەشی ئەوە بوو هوشە لە دەوری بوون و جەستەی بەش بەش دەکراو دواتر لە مەرگ ڕادەپەڕێنرا، وەك زەکی موبارەك

دەڵێت بتپەرستی یۆنانی لەسەر پەرستشی بە کەیف و خۆشی وەستابوو و ئارەزووی خواوەندەکان لای ئەوان لە دیدی هەستیەوە لەوپەڕدا بوو بەجۆرێ وێنای ناو سروشتی هەستیان دەکرد وەك توڕەیی و توندو تیژی و خۆسەپێنی، ئەو دیدەی بتپەرستی یۆنانی بەرامبەر بە هاودەمی ئارەزووبازی و حەزو چێژو هەستەکان دەوەستا.

فەلسەفەی یۆنانی نکوڵی دەکرد لە پێغەمبەرایەتی و زیندووبوونەوەو حەزی بە بێئابڕوویی‌و تەعتیل دەکرد، بەڵکو فەلسەفەی یۆنانی هەر لە بنەڕەتەوە دژی پێغەمبەرایەتی بوو، بتپەرستی[1] بریتیە لە پەرستشی هەستپێکراوی دیاریکراو و بینراو کە فرە خوداییش دەگرێتەوە، بتپەرستی و فرەخودایی پەیوەستی یەکن، چونکە پەرستراو دەگۆڕێ، هەروەك بتپەرستی و دیاریکردنی پەرستراو بە وێنە پەیوەستن لەگەڵ فرەخودایی و دیاریکردنی وێنەی خودا، پەرستشی خوایەك لەپشت خواوەندی نادیارو دیاری نەکراوەوە کە نازناوی خوای خواکانە یان دروستکەری ئاسمانەکان و زەویە، بەمجۆرە هاوبەش دانانە بۆ ئەو خوایەی کە پێویستە بە تەنها بپەرسترێ.

ئیسلام هێرشی بردە سەر بتپەرستی و فرەخودایی و بانگەواز دەکات بۆ پەرستنی یەك خوا کە شێوەو کەسێتی ناسراو و دیاریکراو نیەو ڕاستی و حەقیقەتی بە سنورداری نیە چونکە لەسەروو سروشتەوەیەو لە سەروو هەر دیاریکردن و وردەکاریەکی دیاریکردنەوەیە، ئیسلام دەیەوێ ملکەچی و گوێڕایەڵی مرۆڤ بۆ خوایە نەبێت کە ئەکرێ فرەو زۆربێ و لەناوچوونی نەبێ.

---

١- دکتور محمد البهي: الرسالة ١٩٤٥

# باسی پێنجەم

## (ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی)

سەبارەت بە ئیمپراتۆریـەتی ڕۆمـانی ئـەوە وێنەیـەکی سیـستمی دڕندانـەی سـەربازی و خوێنڕشتن و زێدەڕۆیی لە پەرستنی هێـزو دەسـەڵاتداری کەسـانی سـەرکەش و خۆسـەپێن و پەرستنی ئیمپراتۆرو کۆیلایەتی تەواو بوو بۆ دەستەی سەربازی لەژێر سـایەی کـۆت و بـاری قورسدا تا ئەوەی ڕەوشتی دەسەڵاتداران خراپ بوو و لە خراپەو بێئابڕوویـدا خنکـابوون و لـە خۆشی و ڕابواردندا ڕۆچووبوون.

ڕۆمەکان سیستمی چینایەتی ناو کۆمەڵگەو جیاوازی ئیعتباری مرۆیی نێوان ئەنـدامانیان لە ئیغریقەوە بە میرات وەرگرتبوو، ئەو بیرۆکەی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی[1] لەسـەر وەسـتا بـوو هەنگاونانی بەهێزو قۆرخکردنی گەلانی تر بـوو لـە بەرژەوەنـدی تـەنها نیـشتمانی دایکـداو بەس‌و بۆ خۆشگوزەرانی دەستەیەکی تایبەت، ڕۆمانیەکان ئەو توندوتیژیە و ستەمەی خۆیـان بە خراپەو داکەوتن نەدەزانی، دادوەری ناسراوی ڕۆمانی تەنها بۆ خودی ڕۆمەکان بوو.

ئەگەر گەورەترین بیریارانی یۆنان (سوقرات، ئەفلاتون، ئەرستۆ)بن و بیانوویان هێنابێتەوە بۆ کۆیلایەتی یۆنانی، ئەوا گەورە بیریارانی ڕۆمان بریتین لە (سیشرون، تاسیناس، سنکا) کـە نکۆڵی ناکەن لە سیستمی کۆیلایەتی و دژی ئەو نەریتە داڕمێنـەرەی ئـەخلاق و شـکێنەرەی هەستی باڵا نین، ئەمەش نامۆ نیە چونکە دیدی دەسەڵاتداری لە دەروونی ڕۆمەکاندا هەبووەو بنەڕەتی ئەخلاقییان بووە، ڕۆمانییەکان لەو نەریتە خراپەدا بەختەوەریان بـۆ خۆیـان دروسـت دەکرد نەك تەنها بە حوکمی نەریتەکانیان، بەڵکو بە حوکمی ئەو پاڵنەرە دەسەڵاتداریانەی لە هەر دڵێکدا هەبوو و ئەگەر قسەت لێ دەرکردایە پاڵنـەری بـەهێزترو قەناعـەتی تـەواوتریان دەدرکاند، پاڵنەری حەزی هێز لە دەروونی ڕۆماندا توندو ڕەقی ئەوانی زیاتر دەکرد.

---

١- محمد أسد: الأسلام على مفترق الطرق.

بەڵێ ئەو دیاردە ڕوونانە: دیاردەی دڵڕەقی لە هەڵسوکەوت بەرامبەر بە کۆیلەو کوشتن بەوەی کەسیان بۆ سزایەکی ئاسایی دەخستە بەردەم ئاژەڵە درندەکان، ئەمانە ڕووخساری ڕۆمانی بوون، ڕۆمانەکان بەجۆرێ بەرامبەر کۆیلە ڕەق بوون کە دڵ خۆی نەدەگرت، هەر کۆیلەیەك لە قسەی گەورەکەی دەرچوایە دەکوژراو هەموو کۆیلەکانی ئەم خێزانەش لەگەڵیدا دەکوژران، لەپاڵ ئەمەدا وەك کاڵا کۆیلەیان دەفرۆشت و وەك دارو بەرد سەیریان دەکردن[1] و ئەوپەڕی ڕەقییان بەرامبەر دەنواندن بەوەی زمانیان دەبڕین یان قورقشمی تواوەیان دەکرد بە دەمی کەسی تاوانباردا، سەکۆی زۆرانبازی خراپترین دیاردەی دڵڕەقییان بوو، ئەوان دەچوونە ئەوێ تا دیمەنی خوێن ڕژان و جەستە لەت لەتکردن ببینن و دەنگی هاوارو ئاهەکان ببیستن، ئەمەش تەنها بۆ پیاوان نەبوو، بەڵکو ژن و کچانیش دەهێنران، بێگومان دەردەکەوێ ژیاری ڕۆمانی وەك ژیاری ئیغریقی لەسەر شانی کۆیلەکان ڕاپەڕی و بەهۆی ئەوانیشەوە داڕما.

پاش ئەوەی دەوڵەتی ڕۆمانی بە چەند قۆناغێکی جیاجیادا تێپەڕی وەك پاشایەتی و کۆماری، ئەوە بوو لە (٧٥٤ پ.ز تا ٥٠٨) نیزامی پاشایەتی بوو، لە (٥٠٨پ.ز تا ٤٨ پ.ز) نیزامی کۆماری بوو کە جەختی دەکردەوە سەر سروشتی خانەدانان، لە (٤٨ پ.ز)ەوە سیستمی ئیمپراتۆری بوو کاتێ قەیسەر دەستی گرت بەسەر دەسەڵاتدا، گۆڕینی حەوزی دەریای ناوەڕاست بۆ ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی نزیکەی دوو سەدەو نیوی خایاند، کۆتا شوێن کەوتە دەست ڕۆمانەکان میصر بوو، ئەمەش دوای جەنگی (ئەکیتۆم) کە (ئەگوستس) لە (٣٠پ.ز) دا هاتە ناو میسر، ئەو ساڵە بوو بە ساڵێکی جیاکەرەوە لە مێژووی ڕومانەدا، چونکە کۆتایی سەردەمی کۆماری و سەرەتای سەردەمی ئیمپراتۆری بوو.

هەروەها ناوچەکانی وڵاتی گەل و ئاسیاو سوریا و وڵاتی یۆنانی گرت، هەروەك لە بنیادێکی سیاسی و ژیاریدا مەغریبیشی داگیر کرد، ماوەیەك کە حەوت سەد ساڵ زیاتری خایاند وا چوو تا لە ٤٧٦ز. دا ڕووخا، دیارە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی لە ساڵی ٣٣٠ز.دا ئایینی مەسیحی قبووڵ کرد.

---

١- الثقافة: ١٩٤٧م .

ژیاری ڕۆمانی زێدەڕۆیی و لێکهەڵوەشانی تووش بوو، (درایەر) لە کتێبەکەیدا (تأریخ أوروبا الاخلاقی) دەڵێت: کاتێ دەوڵەتی ڕۆمانی لەڕووی هێزی جەنگی و قەڵەمڕەوی سیاسیەوە گەیشتە لووتکەو شارستانیەتی گەیشتە لووتکە لەوێوە لە خراپەو گەندەڵی ئەخلاقی و داکەوتنی ئاییندا بەرەو نزمترین ئاست دادەکەوت و ژیانیان بەفیڕۆدان و تاودانە ڕابواردن بوو، بڕواو قەناعەتیان وابوو ژیان دەرفەتی ڕابواردنەو تیایدا مرۆڤ لە بەهەشتێکەوە بەرەو ڕابواردن و لە ڕابواردنەوە بەرەو چێژ دەچێ، دنیانەویستی و ڕۆژووی جارجارەیان تەنها بۆ بووژاندنەوەی ئارەزووی خواردن بوو، دادپەروەرییان تەنها بۆ درێژەدان بوو بە تەمەنی چێژەکان، سفرەیان بە قاپی زێڕو زیو و مرواری دەرازێنرایەوەو خزمەتکار بە جلی جوان و کەشخەوە لە دەوریان بوون و ئافرەتانی جوانی ڕۆمی و ڕووت و بێ جل لەدەوریان بوون، کۆتری ناوازەو مەیدانی بەرفراوانی خۆشی و سەکۆی جەنگی پاڵەوانەکان لەگەڵ یەك یان لەگەڵ دڕندەکان جێی خۆشییان بوو، لەو جەنگەدا دەبوو یەکێکیان ئەوی تر بکوژێ و خوێنی بڕژێ.

ئەوان بڕوایان وابوو ئەگەر شتێ شیاوی پەرستن بێ هێزە چونکە مرۆڤ بەوە دەتوانێ سامانێ کۆبکاتەوە کە خەڵکی تر بە عەرەقەی نێو چاوان و دەستی ماندوو بە دەستی دەهێنن، ئەگەر کەسێ لەو مەیدانەدا بەهێزی بازووی سەرکەوت ئیتر ئەتوانێ دەستبگرێ بەسەر سامان و موڵکداو داهاتی دەرەبەگی دیاری بکات، گەورەی دەوڵەتی ڕۆمی هێمای ئەو هێزە زاڵە بوو، نیزامی مەدەنی ڕۆمی شان و شکۆی پاشای بەرچاو دەخست، بەڵام دەبینین هەڵخەڵەتێنەر بوو وەك چۆن لە سەردەمی دارمانی ژیاری یۆنانیدا دەیبینین.

سەبارەت بە بواری ئایینی لای ڕۆمانەکان ئەوا بتپەرست بوون و ئیمانێکی چەسپاو بە ئایینی خۆیان نەبوو، نیزامی بتپەرستی خورافی ئایینی کە لەناو ڕۆمدا زاڵ بوو یەکپارچە گومان و دوو دڵی و لاوازی ئایینی دەخواست، هەرکات لە زانستدا پێشبکەوتنایە و بیریان ڕۆشن بوایە زیاتر گاڵتەیان دەکرد بە ئایین، هەر لە یەکەم ڕۆژەوە بڕوایان وابوو خواوەندەکان لە سیاسەت و کاروباری دنیادا هیچ پشك و دەسەڵاتێکیان نیە.

قەشــە (ئۆگەسـتین) سـەبارەت بــە بیروبـاوەڕی ڕۆمـان دەڵێـت: ڕۆمــە بتپەرسـتەکان لــە پەرستگاکاندا خواوەندەکانیان دەپەرستن و لە شوێن پەیکەرەکاندا گاڵتەیان پێ دەکردن ئایینی ڕۆمی دەسەڵاتی ڕۆحی خۆی بەسەر شوێنکەوتووانیدا لەدەستدابوو، سـۆزی ئـایینی لــە دڵــی خەڵکـدا سـارد بــوو تــا ئــەوەی خــەڵکی بەرامبــەر بــە خواکانیـان دەدوان و هەنـدێ جـار سووکایەتیان پێ دەکردن، ئیدی ئایین لــە ئاکـارو سیاسـەتی گــەل و کۆمـەڵگــەدا کاریگــەری نەبوو.

(لیکی) لە کتێبەکەیدا (مێژووی ئەوروپا) دەڵێـت: ئـایینی ڕۆمــی لــە بنەڕەتـدا لەسـەر خۆپەرستی وەستابوو، تەنها بــەرەو خۆشـگوزەرانی و پاراسـتنی تاکـەکان لــە سـەلامەتی و سەختیەکان دەچوو، ئەوەی سەیری بکات دەبینێ سەدان پاڵەوان و کەسی گەورە لەناو ڕۆمـدا دەرکەوتن بەڵام کەسیان کەناری نەگرت لە دنیاو خۆشیەکانی، لە مێژووی ڕۆمدا نموونەیــەکی قوربانی و خۆبەختکردن هەبێ دەبینی هیچ کاریگەری ئایینی لەسەر نــەبووە، بــەڵکو لەسـەر نەتەوایەتی بووە، دیاردەی تایبەتی ڕۆمانی گیانی داگیرکاری و دیدی ماددی بــوو بــۆ گــەڕان بەدوای ژیاندا، ئەمەش بە میراتی مایەوە بۆ ئەوروپیە نوێ و هاوچەرخەکان.

(موحەممەد ئەسەد) دەڵێـت: لــە ڕاسـتیدا ڕۆمانیــەکان ئایینیـان نەدەناسـی و خواوەنـدە تەقلیدیەکانیان تەنها بەرامبەر خورافەی یۆنانی بوون و لەبەر عورفی کۆمەڵایەتی لە بوونیان بێدەنگ بوون، ئەگەر نا هەرگیز ڕێ نەدەدرا بــە دەسـتوەردەنە لایەنــە حەقیقیــەکانی ژیـان، بەڵکو دەبوو ئەگەر داوایان لێبکرایــە کەســە ئایینیــەکان بــە دڵــی ئــەوان بـدوێن و بکەونــە ســەرکۆنە، هــەرگیز چــاوەڕێی ئــەوەیان لێنــەدەکرا یاسـاو شــەریعەتی ئــەخلاقی بـدەن بــە مرۆڤایەتی.

# باسی شەشەم

## ( مەسیحیەت و ڕۆژئاوا )

لە ساڵی ٣٠پ.زدا ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی فراوانخوازی و قەڵەمڕەوی خۆی تەواو کردو لە ساڵی ٣٢٠دا بوو بە مەسیحی و لە ساڵی ٤٧٦ز دا ڕووخا، ئیمپراتۆر ئیسکەندەر لە ٣٣٢پ.ز دا هات، لە سنووری ڕۆمانیدا هەموو مەڵبەندەکانی ژیاری کۆن هەبوون جگە لە فارس و هیند، لە سەردەمی ئیمپراتۆر تراجان (١١٧ز) دا گەیشتە ئەوپەڕی فراوانی و لە زەریای ئەتڵەسی لە ڕۆژئاواوە تا فورات لە ڕۆژهەڵاتەوە هاتبوو و لە ڕۆژئاوادا وڵاتانی بەریتانیاو گالیاو سیبریاو ئیتاڵیای دەگرتەوە سەرەڕای باکوری ئەفریقا تا تەرابلوس، بەشی ڕۆژهەڵاتی ئیمپراتۆریەتی بەلقان و ئاسیای بچووك و بەرزاییەکانی وڵاتی دوو ڕووباری دەگرتەوە، سەرەڕای شام و میسرو بەرقە.

ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی لە ساڵی ٣٩٥دا بوو بە دوو بەشەوە، ئیمپراتۆریەتی ڕۆژهەڵاتی و ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی، کاتێ ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی لە ساڵی ٤٧٦ز.دا ڕووخا میراتیەکەی بۆ ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی مایەوە کە تا سەردەمی سوڵتان موحەممەدی فاتح مایەوە تا ئەوەی ئیسلام بەشەکانی ئەفریقاو ئاسیای لێسەندو دواتر ڕووخاندی.

لە سەروبەندی پێگەیشتن و لووتکەی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیدا لە ڕۆژهەڵاتدا مەسیحیەت دەرکەوت، خێرا پەڕیەوە بۆ ئەوروپاو لە ململانێیەکی سەختدا لەگەڵ بتپەرستی یۆنانی ڕۆمانیدا ماوەیەکی زۆر بەریەککەوتن تا مەسیحیەت توانی بوونی خۆی بسەلمێنێ و لە ساڵی ٣٣٠ز.دا وەك ئایینێکی ئیمپراتۆریەت دانی پێدابنرێ.

پەیامی سەید مەسیح وەك کۆتای پێغەمبەران بۆ بەنی ئیسرائیل هات تا سنورێ دانێ بۆ لارێکردنی جوولەکەو بردنی بەرەو مۆرکی ماددی و ڕەگەزایەتیەك کە جوولەکەی بەرز ڕادەگرت، بۆ ئەمە ڕێبازێکی دانابوو کە ڕێبازی بنەڕەتی خوایی گۆڕیبوو، واتە ئەو ڕێبازەی

مووسا هێنای، مێژوونووسان ماوەی نێوان پەیامی مووسا و پەیامی عیسا بە (١٢٨٠) ساڵ مەزەندە دەکەن.

سەید مەسیح هات تا ئەو لادانانە ڕاست بکاتەوە کە جوولەکە لە پەیامەکەی مووسادا ئەنجامیان دابوو وەك لە مەسەلەی خوایەتیداو داهێنانی خوایەکی تایبەت بۆ خۆیان، یان لە مەسەلەی بڕوابوون بە زیندووبوونەوەو پاداشتدا، یان لە مەسەلەی مژدەدان بە هاتنی موحەممەدی کۆتایی پێغەمبەران و حەڵاڵکردنی سوو و جادووگەری و فاڵچیەتی و بەرزڕاگرتنی ماددیەت و بتپەرستی،

لێرەوە پەیامی سەید مەسیح عیسای کوڕی مەریەم ڕوون و دیاریکراو بوو.

*پەیامێ بوو تەنها بۆ بەنی ئیسرائیل بوو.

* تەواوکەری شەریعەتی موسەوی بوو و پەیوەندی بەوەوە هەبوو، بۆیە پەیامەکەی عیسا نیزامێکی تایبەتی تەشریعی نەبوو

(وا مەزانن من هاتووم تا ناموس و پێغەمبەران هەڵبوەشێنمەوە بۆ هەڵوەشاندنەوەی نەهاتووم بەڵکو بۆ تەواوکاری هاتووم) (مەتا ١٧:٦)

مەسیح نێردرا تا لاریەکانی باری بەنی ئیسرائیل ڕاست بکاتەوەو ئەوەی لە بنەڕەتیاندا لارێ بوو ڕاستی بکاتەوە کە دواتر جوولەکە کاریگەر بوو بوو بە بیری کۆنی بابلی و لە چەمکی حەنەفیەتەوە بەرەو دەمارگیری و لە یەکخواپەرستیەوە بەرەو بتپەرستی چوو بوو، پەیامەکەی مەسیح بۆ ڕاستکردنەوەو تەواوکاری هات، قورئان بەو شێوە وردە وەسفی دەکات ﴿وَمُصَدِّقاً لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَلِأُحِلَّ لَكُم بَعْضَ الَّذِي حُرِّمَ عَلَيْكُمْ﴾ واتە مەسیحیەت تەواوکەری جولەکایەتیەو سەید مەسیح کۆتا پێغەمبەری بەنوئیسرائیل بووە.

دیارترین چەمك و واتای پەیامی عیسا بریتی بوو لە ئازادکردنی بیروباوەڕو پاکڕاگرتنی لایەنی ئەخلاقی و جەخت لێکردنەوەی، لەدایکبوونی عیسا بە شێوەیەکی نائاسایی بۆ ئەوە بوو تا دەروونەکان توانای خۆیان بۆ دەرکەوێ و موعجیزەکان ببینن دوای ئەوەی چەمك و

واتای فەلسەفەی یۆنانی زاڵ بوو بوو بەسەریاندا و نە فەلسەفەش هەوڵی هۆكارو جێ هۆكار پەیوەست بكات و جگە لەوە بەرپەرچ بداتەوە.

قورئانی پیرۆز ئاماژەی داوە بە ئەركی عیسا ﴿وَرَسُولاً إِلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنِّي قَدْ جِئْتُكُم بِآيَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ أَنِّي أَخْلُقُ لَكُم مِّنَ الطِّينِ كَهَيْئَةِ الطَّيْرِ فَأَنفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيْراً بِإِذْنِ اللّهِ وَأُبْرِئُ الأكْمَهَ والأَبْرَصَ وَأُحْيِـي الْمَوْتَى بِإِذْنِ اللّهِ وَأُنَبِّئُكُم بِمَا تَأْكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ فِي بُيُوتِكُمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾

بەوجۆرە ژیانی عیسا وەك لەدایكبوونەكەی بەڵگەیەكی خوایی بوو، شتێ لە سەروو زانستی سروشتی لای ئەوانی نیشان دا، ئەوەش بەڵگەیەكی گەورە بوو لەسەر بوونی ڕۆح، لە كاتێكدا لە پێشتر جوولەكە نكوولێیان لێدەكردو دەیانوت موعجیزە بوونی نیە، ئەمەش بە كاریگەری فەلسەفەكان بوو، بانگەوازەكەی پێغەمبەر عیسا لە بنەڕەتدا دروستكردن و پەروەردەی ڕۆح و بڕوابوون بوو بە زیندووبوونەوە، ئەمە لە كاتێكدا ماددیگەری لە كۆمەڵگاكانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا وێنەیەكی ویستراو و باو بوو.

بەڵام دوای سەید مەسیح زۆری نەخایاند تا مەسیحیەتیش لە چەمك و واتای دیاری كراوی خۆی دەرچوو لە كاتێكدا وەك تەواوكەری پەیامی مووسا بۆ بەنی ئیسرائیل هاتبوو بۆ بانگەوازی یەكخواپەرستی و ئەخلاق، كەچی خێرا بەرەو بوارێكی تر چوو و گۆڕانێكی زۆری تووش بوو تا ئاستێ (ئارنۆلد توینبی) گەورە مێژوونووس لە كتێبەكەیدا (المسحية بين أديان العالم) بەو شێوەیە وەسفی دەكات (مەسیحیەت پێكهاتەیەكی تێكەڵی جسوری لاهوتی جوولەكەو فەلسەفەی ئیغریقی بوو).

سەرەتا مەسیحیەت لە كۆشی كەشوهەوای ئیسرائیلدا دژ بە ئایدۆلۆژیای تلمودی دەركەوت، ئەو تلمودیەی بۆ تەورات و جوولەكایەتی زیادكرابوو و جەختی دەكردەوە سەر ماددیەكان، كەچی مەسیحیەت جەختی دەكردەوە سەر مەعنەویەكان و لەپێش هەموویانەوە پەرستش و دنیا نەویستی و بانگەوازی دەكرد بۆ وازهێنان لە دنیاو دانان بە ڕۆژی دوایی و پاداشتدا (لە كاتێكدا جوولەكە بڕوای نەبوو بەپاداشت و زیندووبوونەوە)، مەسیحیەت

بانگەوازی دەکرد بۆ نەرمونیانی نێوان مرۆڤەکان (کەچی جوولەکە داوای دەکرد هەرکەس جوولەکە لەناوی بەرن جوولەکە نیە)، مەسیحیەت بانگەوازی دەکرد بۆ خاکیبوون و چاکەکردن لەگەڵ کۆمەڵگەی مرۆییدا (جولەکە بڕوای وابوو چاکە تەنها بۆ خۆیان بێ)، مەسیحیەت بانگەوازی دەکرد بۆ ئەوەی خوا پەروەردگاری هەموو جیهانیانە نەك تەنها پەروەردگاری مەسیحیەکان (جولەکەش بڕوایان وابوو خوا یەهوا تەنها خوای جوولەکەکانەو پەیوەندی نیە بە دروستکراوەکانی ترەوە)، مەسیحیەت بانگەوازی دەکرد بۆ لێبووردەیی لە کاتی دەسەڵاتدا، بەڵام جوولەکە تەنها تۆڵەو سوویان لا هەبوو، مەسیحیەت بانگەوازی دەکرد بۆ ڕێزگرتنی مافی گشتی بە گوتاری (چی هی قەیسەرە بۆ قەیسەرو چی هی خوایە بۆ خوا)، بەڵام جوولەکە تەنها مافی خۆیانیان لەلا گرنگ بوو.

بەڵام ئەو چەمك و واتایانەی مەسیحیەت بەو شێوەیەی پەیامی سەید مەسیح و ئینجیلی دابەزیو لە ئاسمانەوە هێنابووی خێرا تووشی گۆڕانێکی زۆر بوو، ئەو گۆڕانەش لەسەر دەستی یەکێ لە گەورەترین بانگخوازەکانی بوو کە ئەویش پۆلس بوو.

بۆ ئەوەی لە حەق دەرنەچین تیشك خستنە سەر ئەو گۆڕانە جێدەهێڵین بۆ نووسەرە بە ویژدانە مەسیحیە ڕۆژئاواییەکان، (ئەرنست دی بنسین) لە کتێبەکەیدا (Islam or true Christianity) دەڵێت (بیروباوەڕو ئەو نیزامە ئایینیەی لە ئینجیلدا هەبوو ئەوە نەبوو کە سەید مەسیح بە گوفتارو بە کردار بانگەوازی بۆ دەکرد، سەرچاوەی ناکۆکی نێوان مەسیحیەت و جوولەکەو نێوان جوولەکەو موسڵمانان لە مەسیحەوە نیە بەڵکو لەبەر لێزانی و فێڵزانی پۆلسە، ئەوە تەنگژەکەی جوولەکەیی و مەسیحیە کە لەسەر شێوەی تەجسیم شرۆڤەی پەرە پیرۆزەکانی کردو شێوە پێدانی بۆ بەکارهێناو ئەو پەرانەی بۆ پڕکرد لە پەند و پێشبینی، پۆلس لە خۆچواندنی بە (ئەستافنوس)ی بانگخوازی مەزهەبی مرۆییدا نەریتە بووزیەکانی لکاند بە مەسیحەوە ئەو تێکەڵەی قسەو چیرۆکی بەیەکەوە نەگونجاوی دانا کە ئەمڕۆ لە ئینجیلدا هەن و مەسیح لە شێوەیەکدا نیشان دەدات کە لە بنەڕەتدا لەگەڵ مێژوودا یەك ناگرێتەوە، نەك مەسیح بەڵکو پۆلس و ئەو قەشانەی دوای ئەو هاتن، ئەمانە ئەو بیروباوەڕو

نیزامــە ئاییینیــەیان دانــا کــە جیهــانی مەســیحی وەك بنــەڕەتی بیروبــاوەڕی مەســیحی ئەرسەدۆکسی لە ماوەی هەژدە سەدەدا وەریگرت).

مامۆستا (جارزر) (لە کۆلیژی حیرتون لە کامبردج) لە وانەیەکیــدا بــە ناونیــشانی (ئایــا مەســیح دامەزرێنــەری ئــایینی مەســیحیە) دەڵێــت: یەســوع بــە ســیفەتی پێغەمبــەرێکی شوێنکەوتەی کڵێسەی جوولەکە نەك دژی کڵێــسەی جوولەکــە بــۆ هاوســەردەمیەکانی خــۆی دەرکەوت و هەندێ قەشە پشتگیرییان کرد).

(مستەر برنخل) ئایینی مەسیح دەداتە پاڵ پۆلسی نێردراوو دەڵێت: (مەسیحی ئینجیــل و مەسیحی پۆلس دوو کەسایەتی جیاوازی وان کە لەگەڵ یەکدا ناگونجێن و یەکناگرنەوە).

سەرچاوە مێژووییەکان لەسەر ئەوە یەك دەنگن کە سەید مەسیح تا ساڵی هەشتەمی دوای مەسیح بەردەوام بووەو لەو ساڵەدا پــۆلس دەرکــەوتووە کــە یــەکێ لــە گــەورەترین زاناکــانی جوولەکە بووەو شایەتی زانست و زیرەکــی بــۆ دراوە، ســەرەتا ئــەو سەرســەختترین دوژمنــی مەسیح و نەیاری ڕێنماییەکانی بووە هەرچەندە هەرگیز نەچووە بۆ لای سەید مەســیح کەچــی خەڵکی هاندەدا تا گاڵتە و ئازاردان بەرامبەر بە حەواریەکان بەکاربهێنن، ئەم کەسە دەیــوت مەسیح دابەزیوەتە خوار بۆ لای و ڕاستیەکانی فێرکردووەو فــەرمانیکردووە ڕایانبگەیــەنێت، ئیتر بە بەرگی نوێوە خۆی نیشانی خەڵك دا.

بە مەسیحی بوونی پۆلس ســەرەتای قۆنــاغی فەلــسەفەییەتی، ئــەو گۆڕانــەی لــە بــاری مێژووییەوە پەیوەست بە جوولەکەییەوە کە تەواوکەری جوولەکایەتی بــوو گــۆڕا بــۆ بــارێکی تەواو جیاواز لەوە، لێرەوە ئەوەی گەیشتە ئەورووپا مەسیحیەتی دابەزیو نــەبوو بــەڵکو چــەند ڕاڤەیەکی پۆلس بوون بۆ مەسیحیەت و دواتر لە سایەی ئــەو ڕاڤانــەدا مەســیحیەت دابــەش بوو، ئەمەش لە ئەنجامی دەرکەوتنی بیروباوەڕی سیانە خوایی و لێکۆڵینــەوەکانی پەیوەســت بە ناسوت و لاهوت و ماددەو توانا.

مەسیحیەت ماوەیەکی دوورو درێژ دژی بتپەرستی ڕۆمانی ململانێی کردو نەیتوانی خۆی بەسەر ئەورووپادا بسەپێنێ، بەڵام ئەوروپیــەکان ئــەوەیان لێــوەرگرت کــە لــە بازنــەی ژیــانی

بتپەرستی یۆنانی کۆنیاندا لەگەڵ ڕەوشت و نەریتیاندا دەگونجا، دەکرێ بڵێین ئەوروپا مەسیحیەتی وەرگرت بەڵام بەردەوام بە بەرهەمی ڕۆژهەڵاتی دەزانی و بە نامۆ سەیری دەکرد.

گیانی ئەوروپی گیانێکی هەمیشە ڕۆحی بتپەرستی ڕەق و توند بوو کە ڕقی بوو لە ڕەحمەت و برایەتی، کاتێ قوستەنتین بوو بە مەسیحی و وەك ئایینێکی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی دانی پێدانا خێرا دابەش بوو بوو بۆ دوو بەش، سەردەم لەگەڵ سەردەمی یەکەمی مەسیحدا نێوانی خستبوو و تا لە ساڵی ٣٢٥ز. دا کۆنگرەی (نیقە) بەستراو لەوێدا بڕیار درا بە خوایەتی مەسیح و وتی مەسیح لە کرۆکی خوایەو بەپێی دێرینی خوا ئەویش دێرینە، هاوکات عەقڵی ئەوروپی دیدی بتپەرستی خۆی سەپاند بەسەر ئایینی خواییداو لەگەڵ واتاو چەمکە کۆنە ئەفسانەییەکاندا ڕێی بڕی و ئایینی میترا (خواوەندی ڕزگاری) واز لێهێنا، مەسیحیەتی ڕۆژئاوایی واتای میترایی بوو لە بەرگێکی نوێدا، میترایی پەیڕەوی پەرستش بوو لە دۆڵ و ئەشکەوتەکاندا.

بەوجۆرە مەسیحیەت بوو بە چوارچێوەیەك بۆ کۆمەڵگەی بتپەرستی بە پەرستش و کەسایەتی و بۆنەکانیشیەوە، مەسەلەی نوێکردنەوەی پەیوەندی نێوان خواو پێغەمبەر ماوەی دوو سەدە جیهانی ڕۆمانی سەرقاڵکرد، دەستەی (ئەسناسیۆس)ی خاوەنی بیرۆکەی سیانەی پیرۆز سەرکەوتن و (ئاریۆس) و پشتیوانەکانی کە خاوەنی بیرۆکەی مرۆڤیتی و پێغەمبەرایەتی مەسیح بوون شکستیان خوارد، چونکە ئاریۆس مەسیحی بە خوا نەدەزانی و دەیوت ئەو دروستکراوێکە کە لە باوکەوە لەدایك نەبووە بۆیە لە کرۆکدا یەکسان نین، بەڵام کۆربەندە مەسیحیەکانی دواتر سوور بوون لەسەر سەرخستنی بیرۆکەی سیانەی پیرۆزو ئاریۆسیەکانیان بەدەرچوو لە ئایین و کڵێسا لەقەڵەم دەدا.

دیارترین چەمك و واتاکانی بانگەوازی مەسیحی بریتی بوون لە:

**یەکەم:** دنیانەویستی و تاودانە گەڕانەوە ڕووەو ڕۆژی دوایی، مەسیحیەت دنیای لەوەدا کورت کردبوویەوە بۆ کارکردن بێت بۆ ژیانی ئەو دنیاو دەیوت ژیانی مرۆڤ لەم دنیایەدا نیەو

لە ڕۆژی دواییدایە، بە دوای ئەمەدا ڕەهبانیەت دەرکەوت، ئەو بانگەوازە پشتی دەبەست بەو وتەی سەید مەسیح: (مەملەکەتی من لە جیهانی ئاخیردایە). ئەو بانگەوازەی سەرچاوەی نارەزاییەکی زۆری پاشاکان بوو، چونکە ئەوان خاوەن دەسەڵاتی ڕەسمی بوون و فەلسەفەی یۆنانیش لەسەر پەرستشی ژیانی دنیا وەستابوو، بۆیە ئەرکی مەسیحیەت لە ئەوروپادا سەخت بوو.

**دووەم:** دەیوت مەسیح لەپێناو ڕزگارکردنی جیهان و پاککردنەوەی لە تاوانەکەی ئادەم و خۆقوربانی کردنی لەو پێناوەدا هاتووە.

**سێیەم:** مەسیحیەت وەك ئایینەکانی تری بەنی ئیسرائیل لە چوارچێوەی سروشتی خۆی دەرچووە، چونکە ئەو لە بنەڕەتدا تەواوکەری شەریعەتی مووسا بوو کەچی کرا بە ئایینێکی جیهانی.

**چوارەم:** باسی سیانە خوایی دەکرد.

ئەم چەمك و واتایانە لەو تەحەدیانەدا کە دواتر تووشیان بوو کاریگەری خۆیان هەبوو چونکە لەرێی ڕاستی خۆی دەرچوو بوو، ئەو چەمك و واتایانەش وەڵامی دژیان دەخواست لەوانە نەیاری ئەوروپا بۆ دنیا نەویستی مەترسیدارترین شتێ بوو مەسیحیەت بەرەنگاری بوویەوە یان بیرۆکەی تاوان و سیانە خوایی مەترسیدارترین شتێ بەرەنگاریان بوویەوە عەقڵ بوو، مەسیحیەت لە بازنە ئەخلاقی تەواوکاریەوە دەرچوو بۆ ئایینێکی جیهانی کە ئەمەش سەرچاوەی چەندین ڕەخنە بوو چونکە ئەو لە مەیدانی شەریعەو نیزامی کۆمەڵگەدا بەرتەسك بوو.

لێکۆڵەران جەخت لەوە دەکەنەوە ڕاڤە مەسیحییەکان لە ئاین و فەلسەفە هاوچەرخەکانی خۆیەوە وەرگیراون، بیرۆکەی سیانە خوایی لە ئایینی فیرعەونیدا هەبوو، بیرۆکەی عشائی خوایی هەر لەوێدا هەبوو، بیرۆکەی ڕزگاربوون لە ئایینی میترائیدا هەبوو، بەڵکو هەندێ توێژەر لەوە زیاتر دەچن، (عومەر عینایەت) لە کتێبەکەیدا (العقائد) دەڵێت: ڕێنماییەکانی مەسیحیەت هەموویان لە ئایینی مەجوسی و زەردەشتی و بەرهەمی و هیندستانی و

بووزیەکاندا هەبوون، ئایینە هندی و میسری و بابلی و ئایینەکانی تر کە قسە لەسەر کەسایەتیەکان دەکەن وەك مەسیح ئەوانە بێگومان هەموویان لە مەسیحیەت کۆنتربوون و زیاتر لە پێش ئەوەشدا لە سەردەمی دووەمی زایینیدا ئینجیلەکان بنوسرێنەوە ڕاڤە مەسیحیەکان و دەرچوونیان لە بنەڕەتی ئاسمانی خۆیان. زانا (درابەر) لە کتێبەکەیدا (تأریخ أخلاق أوروبا) دەڵێت: بتپەرستی و هاوەڵ دانان بە کاریگەری ئەوانە چووە ناو نەسرانیەت کە پیشەو پایەی بەرزی ناو دەوڵەتی ڕۆمانییان لەدەست بوو. بنەماکانی بتپەرستی هاوشانی یەك دەرکەوتن، لێرەدا ئیسلام جیایە لە نەسرانیەت چونکە ئیسلام بەتەواوەتی ڕکەبەری بتپەرستی لەناوبردو بە پوختی بیروباوەڕی خۆی بڵاوکردەوە).

بەڵام نەسرانیەتی تووشبوو بە بتپەرستی ڕەهبانیەت و سزادانی جەستەی بە نمونەی تەواوی ئایین و ئەخلاق داهێنا، لە ئەنجامی ئەوەدا گەنجی و پیاوەتی کە بە فەزڵ و چاکە دادەنرا بوو بە عەیبەو ئابڕوچوون و خەڵکی کەوتنە دنیانەویستی و گیان سوکی و ڕاشکاوی و لێبووردەیی و وازهێنان لە دلێری و بوێری و دەستبەرداری ئەوانە بوون.

(لۆردماکولی) گۆڕانی مەسیحیەت بۆ ناو ئایینێکی بتپەرستی بەو شێوە نیشان دەدات: شوێنکەوتووە مەسیحییەکانی مەسیح لە ئیمانیاندا تووشی هەمان دەردەدڵ بوون کە یۆنان و فارس و کەسەکانی تر تووشی بوون، ئیتر خوایان لە شێوەیەکی مرۆییدا نیشان دەدا کە لە نێویاندا دێ و دەچێ و لەنیازو حەزیاندا بەشداریانە، ئەمەش ڕووەو کەوتن و هەڵوەشانیان دەبات، هەروەك لەسەر گۆڕەکان دەگری لە سەرجادەو شوێنان دەخەوێ بەمە لە بەرگێکی نوێدا بتپەرستییان نیشانی هەموو جیهاندا)، دواتر قەشەو ڕوهبانی وا هەبوو وەك یۆنانەکان خواوەندیان زیاد دەکرد، بۆ نموونە قدیس جۆرج لەلایان خواوەندی جەنگ بوو وەك چۆن لای یۆنانەکان خواوەند مەریخ بوو، هەروەها عەزراو سلیاو چەندی تریان بە خواوەندی جوانی و هونەری ئەدەب دانا وەك چۆن لای یۆنانەکان گوڵ و حەوت هەسارەکەی تر خواوەندی جوانی بوون.

زۆرێك پێیان وایە مەسیحیەت (لەڕووی ئەوەوە کە بەرنامەیەکی تەواوکاری موسایییە) نیزام و شەریعەت لەخۆ ناگرێ، دواتر ناچار بوو لە بتپەرستی و بۆنەو دابی فیرعەونیەوە کە لە بنەڕەتدا لە یۆنانەوە وەرگیرابوو نیزامێ دابنێ، لێرەوە گیانی بتپەرستی یۆنانی فیرعەونیو مەسیحیەتی پێکەوە دەبەستەوە، لە فیرعەونیدا سیانە خوایی فیرعەونی (ئوزریس و ئیزیس و حۆرس) هەبوو و تیایدا ئەکلیرۆس (پیاوانی ئایینی و پەستگاو کاهینەکان) و پسولەی لێخۆشبوون و قوربانی و مۆسیقاو سروودو مەی و بەرازو تابوتی مردوو و هێماو ئاماژەکان هەبوون.

لەلایەکی ترەوە فەلسەفەی یۆنانی دوای ئەوەی زۆرێك لە یۆنانیەکان وەریانگرت و لە ئایینی مەسیحدا بوونە هەڵگری زانست لەبەرئەوەی مەسیحیە یەکەمینەکان زانستی وایان پێ نەبوو بەرامبەر فەلسەفەی یۆنانی بوەستنەوە، بۆیە دیدی مەسیحی یۆنانی زاڵبوو و مەسەلەکانی فەلسەفەی یۆنانی زاڵبوون، کاتێ مەزهەبی خوایەتی مەسیح دوای مشتومڕێکی دوو سەدەیی زاڵ بوو ئاریۆسیە یەکخواپەرستەکان دەرکران و پەرتەوازە کران و مافە مەدەنیەکانیان لێ زەوت کران.

لە ساڵی ٣٣٠ز.دا ئەوروپا بە ڕەسمی بوو بە مەسیحی و ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیش لە ساڵی ٤٧٦ز.دا ڕووخا، ئەو مێژووە مشتومڕێکی زۆری ناوەتەوە، ئایا مەسیحیەت بوو ژیاری ڕۆمانی لەناوبرد، جێی خۆیەتی بوترێ مەسیحیەت ئەوروپای لەزۆر شت ڕزگار کرد، گرنگترینیان پەرستنی پاشاکان و جادووگەری و ئەفسانەو بتەکان و لە کرۆکی جوولەکەیی تلمودی پەیوەست بە ماددیەتی زێدەڕەوی دەمارگیری ڕزگاری کردو ئەوروپای لە بتپەرستیەوە بۆ ئایین و لە دڵڕەقیەوە بەرەو سۆزو میهر برد.

(توینبی) ئاماژە بەوە دەکات و دەڵێت مەسیحیەت کۆتی ملکەچی تاکی بۆ دەوڵەت لە شێوەی کۆمەڵگەی یۆنانی ڕۆمانیدا تێکشکاندو شوێنکەوتوانی هاندا بەرەو ڕزگاربوون لە خزمەتکاری گشتی و کەنارگرتن لە سوڵتانە ستەمکارەکان بە پێدانی بیرۆکەی بەکەمزانینی

ژیان،[١] دەیوت پێگەی قورسی لە ژیانی هاوچەرخەوە گواستراوەتەوە بۆ ژیانی داهاتوو، دواتر توینبی کاریگەری ئەو ئاراستەیە لە بنیادی ژیاردا دەنوێنێ و دەڵێت: بێگومان ژیانی دنیا بەو گەشەسەندنە زیانێکی گەورەی لێکەوت و هەڵوەشانێکی گشتی لە قەوارەی سیاسیدا دەستپێکردو ڕەوتی دەوڵەت و خێزان هەڵوەشایەوەو بنیادنەرانی کۆمەڵگە داوایان دەکرد هەڵوەشێتەوە بۆ ڕەگەزە تاکەکانی، ئەمەش بەرەو بەربەریەتی دەبرد چونکە شارستانیەت لە سایەی هاریکاری کارای هاوڵاتیاندا و سووربوونیان لەسەر ملکەچکردنی بەرژەوەندیە تایبەتیەکانیان بۆ بەرژەوەندی گشتی دەبێ و وازهێنان لە جیهانی دنیا کەسان و شتانی دەوریان لەناو دەبات و ئەوەش بە خراپە دەچوێنن، ئەم بیرۆکەیە ماوەی هەزار ساڵ بەسەر عەقڵی خەڵکدا زاڵ بوو.

توینبی ئەو گۆڕانە وێنا دەکات کە مەسیحیەت بەدیهێنا کاتێ خەڵکی لە دیدی خوای ڕەق و توندو خۆسەپێنی جوولەکەیی‌و خوای جەنگەوە گواستەوە بۆ دیدی باوکایەتی، ئەو دەڵێت (ئەو مەسیحیەتەی ئێرەی جیهانی هیلینی گرتەوە و وێنەیەکی بگۆڕی ئایینی جوولەکەیە، ئەم گۆڕانە لەڕێی ئەوەی ئایینی جوولەکە بیرۆکەیەکی هیلینی دەرخوارد درا کە لە دیدی جوولەکەدا تەواو جیا بوو لەوەی ئایینی جوولەکەیی دەینواند، ئەویش بیرۆکەی تەجسیدە، توینبی پێی وایە مەسیحیەت کاتێ جیهانی هیلینی لە فرە خوداییەوە گواستەوە بۆ بیرۆکەی تەجسید نەیتوانی لە دەست بتپەرستی هیلینی ڕزگاری بێ، چونکە ئایینی هیلینی بڕوای هەبوو بە فرە خودایی و مەسیحیەتیش لە هیلینیەوە جادوویەکی سەرکەشی دەست کەوت کە زامن بوو بۆ گرتنی هەموو دەروونە هێلینیەکان لەگەڵ ئەمەشدا خودی ئایینی مەسیحی نەیدەتوانی لە جیهانی هیلینیدا ڕێی خۆی ببڕێ ئەگەر بەرگێکی هیلینی نەپۆشایە وەك ئەوەی ئەو ئایینانەی بەرامبەر ڕکەبەرەکانیان دەوەستان ئەنجامیان دەدا، بیروباوەڕی هیلینیش پەرستشی مرۆڤی تێدا بوو.

---

١- ئەمە دەربڕینی یەکێ لەو لێکۆڵەرانەیە کە کتێبی (دارمانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی) وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی.

ئەمە ڕای توینبی مێژوو نووسە کە ناسراوە بەوەی بیروباوەڕی مەسیحی زاڵە بەسەر بیریدا، سەبارەت بە (جیبۆن)ی مێژوونوس کە دیدێکی ڕاشکاوی هیلینی هەیە هەمان ڕای هەیە بەڵام بە جۆرێکی تر ڕاڤەی دەکات و دەڵێت: چوونە ناو مەسیحیەتیان بەلایەنی کەمەوە خراپ بەکارهێنانی هەندێ کاریگەری هەبوو لە دارمانی دەوڵەتی ڕۆمانیدا، پیاوانی ئەکلیرۆس لە موژدەبەریدا بە چەند ڕایەك سەرکەوتوو بوون کە بانگەواز دەکەن بۆ خۆڕاگری و هەڵبژاردنی ترس و ئەو گەورانەیان هان دەدان کە هانی چالاکی ناو کۆمەڵگەیان دەدا، بەڵکو کۆتا ڕۆحی جەنگی ناو دێرەکانیان ئەسپەردەکرد و لایەنێکی گەورەی سامانی گشتی و تایبەتیش بەوەقف دانرابوو بۆ کاری چاکەو چاکەکاری و مووچەی ئەو سەربازانەی دابەش کرابوون بەسەر خەڵکێکی ژن و پیاودا کە هیچ خێرو سودێکیان نەبوو و تەنها دەیانتوانی مزگێنی دنیانەویستی و کەنارگیری و فەزڵی پاکداوێنی و ئیمانو گورو تین و گەورەییەکان بدەن. جیبۆن پێی وایە ئەگەر ڕووخانی دەوڵەتی ڕۆمانی جۆرە هۆکارێکی دابنرێ بەوەی قوستەنتین بووبێ بە مەسیحی ئەوە ئایینە سەرکەوتووەکەی ئەو کەوتنەی پێشخست و سروشتی جەنگاوەرە دڕندەکانی لابرد.

جیبۆن هەستی بەوە کرد گیانی مەسیحیەت دژی بنیادی کۆمەڵگەی یۆنانیە بۆیە ئەوەی سەلماند ئەوە هۆکارێکی لاوازکردنیەتی کاتێ بوو بە ئایینی دەوڵەت بەڵام مەسیحیەت توانی لە ماوەی سەردەمی داکەوتنی جیهانی سەردەمی ناوەڕاست لە داکەوتن بپارێزێ، بەوە مرۆڤی لە خراپترین باری خراپەوە ڕزگارکرد کاتێ بنیادەکان دەڕووخان و کارەساتەکە قەوما.

بەڵام جیبۆن پێی وا نیە دەرکەوتنی مەسیحیەت لە دەوڵەتی ڕۆمانیدا تاکە سەرچاوەی ڕووخانی ئەو دەوڵەتە بێ، بەڵکو پێی وایە لێکهەڵوەشان و زێدەڕەوی و بێئابڕوویی و کۆیلایەتی هەموو ئەمانی هۆکاری خستنی ئەو ئیمپراتۆریەتە بوون، ئەو جەخت لەوە دەکاتەوە زێدەڕەوی و ژنانی بوون هۆکاری ڕووخانی ئیمپراتۆریەتن و دەڵێت ئەو گەندەڵیەی لە کۆشکدا سەریهەڵدا و بە شارەکاندا بڵاوبوویەوە لەسەربازگەو فەیلەقەکاندا ژەهرەکەی بڵاوبوویەوە، نەبوونی توانای خۆڕاگری بەرامبەر ئەو سەختیانەی تووشی فەیلەقە سەربازیەکان

بوو و سەرچاوەکەی زێدەڕەوی بوو ئەوە هۆکاری ڕاستەوخۆی ڕووخانی ئیمپراتۆریەت بوو، ئەو جەخت لەوە دەکاتەوە ئەو دووانە ئەنجام بوون نەك هۆکار. ئەو دەڵێت ئیسرافی شێتانە کە لەباری جەنگ یان لە ژیاردا زاڵە دەکرێ لە ڕوانگەی ڕووداو و کارەساتە تۆقێنەرەکانی ناو گەلانی لاوازو داکەوتەدا ڕاڤەی پێشکەوتنی زێدەڕەوی و کەیفکاری بکرێ. دابەشکردنی باجەکان و ئاستی ئەو بەرتەنگی و فشارەی گەل بەهۆی ڕەقی و توندی دەوڵەمەندو دەسەڵاتدارانەوە بە دەستیەوە دەیناڵاند، چونکە ئەوانە ئەرکەکەیان خستبووە سەرشانی گەلی هەژار تا ئەمە وایکرد تاکی گەلی ڕۆمانی ئامادە نەبێ ئەرکی هاولاتی ڕۆمانی جێبەجێ بکات.

جیبۆن ئاماژە دەکات بە سیستمی توندو دڵڕەقانەی کۆیلایەتی و بەدیارترین هۆکاری دارمانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی دادەنێت، پاشان دەڵێت ڕووخانی ڕۆما ئەنجامێکی سروشتی بوو بۆ ئەو زێدەڕەویەی لەسنور دەرچوو بوو، چونکە بەڕوونی هۆکاری لێکهەڵوەشان و لەناوچوون دیاربوون و کشانی ئیمپراتۆریەت و فراوانبوونیشی هۆکاری دارمان و وێران بوون بوو.

جیبۆن دەڵێت خۆشگوزەرانی زۆرترین هۆکاری لێکهەڵوەشان و لەناوچوون بوون ئەگەر جیبۆن پێی وایە مەسیحیەت پەیوەندی هەبووە بە ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیەوەو بە سروشتی هۆکاری ڕووخانی دادەنێت، ئەوە زۆربەی بیریارانی سەدەی هەژدەهەم هەمان هەڵوێستیان بەرامبەر بە ئاین بەگشتی و مەسیحیەت بەتایبەتی هەیە چونکە بڕوایان وایە ئاین لەسەر کۆمەڵێ خورافەی گەشەسەندوو و کەڵەکەبووی سەردەمی ناشارستانیدا پەیدا بووەو دەمارگیری کوێرانەو نەبوونی لێکبووردنی لێکەوتووەتەوە، ئەو ڕایانە لە کتێبەکەی مۆنتسکیۆدا (عظمة الرومان وانحطاطهم) خراونەتەڕوو.

(زوریموس)ی مێژوونووس پێی وایە هۆکارێکی گرنگی داکەوتنی باری ئیمپراتۆریەت مەسیحیەت بوو و ئیمپراتۆر قوستەنتینی گەورە دەکاتە بەرپرسیاری یەکەم لەوە، ڕووخانی ئیمپراتۆریەت لە ڕۆژئاوادا ئەنجامی ئەو نیقمەتە خواییە بتپەرستیە بوو.

قەشە ئۆگەستین پێی وایە رووخانی رۆما (کە بە بابلی دووەم ناوی دەبات) واتای قۆناغێکی سەرەتایی سەرکەوتنی مەملەکەتی نەمری خوا بوو، لە کتێبەکەیدا (شاری خوا) دەڵێت ئەوە دەستی رێنوێنی خوایە بۆ رووداوە کەونیەکان و ئاراستەکردنیان و مرۆڤایەتی دەربازبوونی نیە لە شوێنکەوتنی ویستی خواو ملکەچ بوون بۆی، مێژووش تەنها رێکردەی مرۆڤایەتیە رووەو ماڵی نەمری.

دکتۆر (ئیبراهیم عەلی تەرخان) دەڵێت: دوای حەوت سەدە مێژووی کۆماری و پێنج سەدە لە ئیمپراتۆریەتی، ئەوکات رۆما رووخاو لە ساڵی ٤٧٦ز.دا بەفعلی و لە ٤٨٠ز.دا بە رەسمی شکۆو ناوچەی دەسەڵاتی خۆی لەدەستدا، بەوجۆرە نەخشەی سیاسی ئەوروپا گۆڕا، لە مێژووی دارمانی ئیمپراتۆری لە رۆژئاوادا دامەزران و هاتنی ئەو دەسەڵاتە جەرمانیانە هەبوو کە دەوڵەتانی ئەوروپای رۆژئاوای نوێیان پێکهێنان.

ئەنجامێکی مەترسیداری گواستنەوەی پێگەی گرنگی ئاراستەو سەرکردایەتی بوو لە کۆشکی پاشا سیاسیەکانەوە بۆ لاتران واتە بۆ کڵێسای ناو رۆما کە ئیتر پاپا بوو بە گرنگترین کەسایەتی رۆمانی لە ئیتاڵیا، ئەمەش واتای پێشکەوتنی مەترسیداری کڵێساو دەسەڵات و تایبەتمەندی بوو، سەرەڕای ئەمەش کاریگەریی دەسترۆیی ئایینی لە روانگە جۆربەجۆرەکانی رۆشنبیریەوە کاریگەری زۆر قوڵی هەبوو لە ژیانی کۆمەڵگەی ئەوروپی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، کاتێ (ئەدواکر) لە ساڵی ٤٧٦ز.دا دەستی گرت بەسەر رۆمادا مێژوونوسان ناویان نا سەدە تاریکەکانی رۆژئاوای ئەوروپا.

دکتۆر ئیبراهیم دەڵێ: لە سەرەتای سەدەی پێنجەمی زایینیەوە (ئەریك)ی قووتی شاری رۆمای گرت و تالآنی کردو جیهانی مەسیحیش بەهۆی ئەو کارەساتەوە چەند سەدەو نەوەیەك پێگەی شان و شکۆو دەسەڵاتی شێوا. ئایا ئەوە تۆڵەی بتپەرستی و پەرستگا کۆنەکانی بوو؟ یان پاداشتی وەرگرتنی مەسیحیەت بوو؟ قەشە ئۆگەستین لە کتێبەکەیدا (شاری خوا) وەلامی دەداتەوەو دەڵێت رۆما شارێکی سەرزەوی و دەستکردی مرۆڤ بوو و بەهیچ جۆرێ لەگەڵ ئەو شاری خوایەدا بەراورد ناکرێ کە تیایدا دیاردە ماددیەکان نین و سنوری بۆ

دانانێن، بەڵکو سنورەکەی هەموو باوەڕدارانی هەموو شوێنێ دەگرێتەوە، ئەوەش ڕوون دەکاتەوە خواوەندە یۆنانیەکان هیچ سوودو زیانیان بۆ خۆیان نەبووەو لە خێرو خراپە یان دادپەروەریدا هیچ دەستێکیان نەبووە ﴿وَكَذَلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَا أَخَذَ الْقُرَى وَهِيَ ظَالِمَةٌ إِنَّ أَخْذَهُ أَلِيمٌ شَدِيدٌ﴾.

کاتێ مەسیحیەت هات جیهان تەواو پێویستی پێی بوو تا بەوە بەرەنگاری سیستمی کۆیلایەتی ناو ڕۆماو ماددیەتی جوولەکەو خۆبەزلزانی ڕەگەزییان بوەستێتەوە، مەسیحیەتیش بڵاوبوویەوە چونکە ئایینی لێبوردن و لێبووردەیی و خاکیبوون بوو و زیاتریش لەنێو هەژاران و نەداراندا بڵاوبوویەوە کە بێبەش بوون لە خۆشی و ڕازاوەیی ژیانی ڕۆمانی.

مەسیحیەت بەرەنگاری گورزی بیری یۆنانی و چەمك و واتاکانی ڕۆمان بوویەوە، ڕێبەری پۆلسی جوولەکە ڕەگەزو ڕەگەزنامە ڕۆمانی و ڕۆشنبیری ئیغریقی کاریگەریەکی گەورەی کردە سەر وێنەی دواتری و ئەو ڕاڤانەی دەیکردن.

مەسیحیەت لە جوولەکایەتی جیابوویەوەو بەرەو جیهانگیری چوو و سەربەخۆبوونیشی تەنها لە ڕوانگەی ڕزگابوونی لە لادانی ماددی بوو، بیردۆزەی بەخواکردنی مەسیح دەرکەوت لە کاتێکدا مەسیح مرۆڤ بوو و کۆتا پێغەمبەری بەنی ئیسرائیل بوو. مەسیحیەت شۆڕشێکی چاکسازی بوو بۆ پاککردنەوەی ئایینی جوولەکایەتی کە برێ نارێکی و شەخەڵی تێکەڵ کرابوو، دواتر بوو بە ئایینێکی سەربەخۆ کە ڕکەبەری جوولەکەو بتپەرستی ڕۆمانی دەکرد، مەسیحیەت بەدەست ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیەوە چەرمەسەریەکی زۆری چەشت لووتکەکەشی ستەمەکانی (قلدیانوس) ٣٠٣ بوو کە کەوتە کوشتن و چەوساندنەوەو ڕووخاندنی کڵێساکان و سوتاندنی کتێبە پیرۆزەکان، لەوەوە سیستمی ڕەهبانیەت و دەرکەوتنی دێرەکان و کەنارگیری مەسیحیەکان لە ژیان و کۆمەڵگە دەرکەوت.

بەوجۆرە بەردەوام مەسیحیەت لێی دەدرا تا قوستەنتین هات و ئازادی کرد، ئیتر بوو بە ئایینی بیرو بیرۆکە، کاتێ ئیمپراتۆریەت ڕووخا کڵێسا لەساڵی ٤٧٦ەوە دەستی گرت بەسەر کۆمەڵگەی ئەوروپیدا تا سەدەی پانزەهەم واتە نزیکەی هەزار ساڵ بەو جۆرە مەسیحیەت

نزیکەی هەزار ساڵ دەستی گرت بەسەر ئەوروپادا، پێشتر هەزار ساڵ دەسترۆیی بۆ ژیاری ئیغریقی ڕۆمانی بوو (٧٠٠پ.ز تا ٧٠٠ز)، بەو جۆرە تا ڕۆشنبیرانی یۆنان ڕازی بـن کەوتـە وەرگرتنی بیرۆکەی پەیوەندی خوا بە زەویەوە لە فەیلەسوفانی یۆنان، ئەمەش لەڕێی وشە یـان کوڕی خوا یان ڕۆحی پیرۆزەوە بوو.

بێگومان مەسیحیەت چەمك و واتایەکی نوێی ڕەحمەت و لێبووردەیی بە هەموو ئـەوروپا گەیاند کە بەشێکی زۆری شوێنەواری هەزار ساڵەی ژیـاری یۆنـانی و ڕۆمـانی لـە سیـستمی کۆیلایەتی و دڵڕەقی دڕندانە و جەستە پەرستی و مرۆڤ بـەخوا دانـان و ململانـێ و کـەیف و لێکهەڵوەشانی کەمکردەوە، کاتێ مەسیحیەت هات بانگـەوازی دەکـرد بـۆ خۆشەویـستی و ڕەحمەت و دنیانەویـستی، بـەڵام نـەیتوانی لـە کـۆتی بتپەرسـتی و بیروبـاوەڕی فرەخـودایی ڕزگاربێو شتێکی زۆر لەوە هاتە ناو مەسیحیەتەوە:

لە بیروباوەڕی یەکخواپەرستی و جیاوازیە قووڵەکانی نێوان خوایـەتی و پێغەمبەرایـەتی و مرۆڤبووندا گۆڕانی تـووش بـوو، لـە چـەمك و واتـای پەیوەنـدی بـە ژیـانی ڕابـواردن یـان دنیانەویستی و چەمکی بەرپرسیارێتی تاکەکەسی و تاواندا گـۆڕانی تـووش بـوو، ئەمـە بـۆ مێژوونووسان و توێژەران ڕوون بوو و زۆرێکیان بە ویژدانەوە ئاماژەیان پێدەداو بیانوویان بـۆی ئەوە بووە مەسیحیەت ویستی دڵی بتپەرستە ڕۆمانیەکان بەدەسـت بهێنـێ بۆیـە بازنەیـەکی هاوشێوەی ئایینی پێشووی خۆیانی پێدان.

(بیری) دەڵێت: عیسا جوولەکە بوو و بۆ هەتا هەتایشە وادەبـێ، بـەڵام (شـائول) لەسـەر حیسابی عیسا مەسیحیەتی داناوەو دواتر ئەو شائولە بە پۆلس ناسراوە کە لە ڕاسـتیدا ئـەو دامەزرێنەری مەسیحیەتەو کەسێکی سیاسی و لێزان بووە، پۆلس برێ ڕێنمایی جوولەکەی لە ئایینەکەیدا هێناوە تا دڵـی جـەماوەری جوولەکـە ڕابکێـشێ، چـەند وێنەیـەکی فەلـسەفەی ئیغریقیشی هێنا تا بەوە شوێنکەوتەیی یۆنان ڕابکێـشێ، ئینجـا کەوتـە بانگـەوازی ئـەوەی عیسا ڕزگارکەرو فریادڕەسە، ئەوەشی لە زۆربەی دەستەو مەزهەبـە جوولەکەکانـەوە ئامـادە دەکرد، کەسانێکی تر دەیانوت مەسیح چووەتە ناو کۆمەڵگەیەکی فرەشێوە لە مۆرك و یاساو

نەریتدا، کاریگەریەکەشی لە گۆڕانیدا ورد بوو و لەوەوە بەخشین و وەرگرتنی هەبوو بەڵام نەیتوانی کۆمەڵگەی ڕۆمانی لەو بتپەرستیەی ڕزگاریکات هەرچەندە گیانێکی سۆزو لێبووردەیی پێدا کە هێندەشی نەبرد لە دژی ڕاپەڕی و مۆرکە دلڕەقیەکەی خۆی وەرگرتەوە. سەبارەت بە بیروباوەڕیش ئەوا ڕاپەڕینی عەقڵی ئەوەی خستەڕوو بڕێ شتی لە توانا بەدەرو نهێنی و ئەفسانە هەن کە عەقڵ قبووڵیان ناکات، بۆیە ئەو نەگونجانە قووڵەی لەگەڵ ئایین بەگشتی و مەسیحیەت بەتایبەتی بوو.

ئەگەر پۆلس بڕێ لە بیری ئایینە کۆنەکانی بۆ مەسیحیەت زیادکردبێ وەك بیرۆکەی ڕزگارکردن و پێشکەشکردنی نەزرو پەیکەرو خوێندن و وێنەو بۆنەی تری بتپەرستی ئەوا بۆ هەموو ئەمانە سەرەتا بانگەوازەکەی عیسای لە سەرچاوە حەقیقیەکەی خۆی جیاکردەوە کە تەواوکەری جوولەکایەتی بوو نەك بەکەم دانانی جوولەکایەتی، دواتر بیری وای بۆ دانا کە لەگەڵ سروشت و فیترەت و عەقڵ و سروشتی پوختی ئاسمانیدا نەدەگونجا، ئەمەش مەترسیدارترین تەحەددای دژ بە مەسیحیەت بوو لە سەردەمی ڕێنیسانسدا دوای ئەوەی چەمك و واتاکانی عەقڵ بە پێوانەکانی زانست و مەنتیق بەرز ڕاگیران، مەترسیدارترین داهێنانی پۆلس لە مەسیحیەتدا بریتی بوو لە کلێساو ڕەهبانیەت، سەبارەت بە کلێسا ئەوا زاڵ بوو و دەسەڵاتی گرتە دەست و بەرامبەر هەموو سەرکردەکان و خەڵك قەڵەمڕەوێکی گەورەی دروست کردو دادگای دلڕەقانەی دامەزراندو قەسابخانەی دروستکردو مافی زانینی نهێنیەکان و ڕاڤەی کتێبە پیرۆزەکانی بەخۆی بەخشی.

سەبارەت بە ڕەهبانیەت لەگەڵ ژیانی مرۆییدا نەدەگونجا چونکە کەنارگرتن بوو لە ژیان و سزادانی جەستە بوو، ئەمەش مەترسیەکی گەورە بوو لە سنووردارکردنی بیرەوشتی کۆنی ڕۆمانی و لەگەڵ فیترەتیشدا نەدەگونجا.

ئەم دوو ڕێکخستنە سەرەڕای سەختی بیروباوەڕەکەی بوونە گەورەترین هۆکاری دژ بە مەسیحیەت لە داهاتوودا، مەسیحیەت وا دەردەکەوێت هەنگاوێکی ڕوونی گرتبێتە بەر کە دنیانەویستی و ڕەهبانیەت و کەنارگیری لە ژیان بوو بەرامبەر ئەو هەنگاوەی جوولەکایەتی

کە لەسەر زێدەڕەوی لە خۆشگوزەرانی ژیان و سووخواردن و بێڕەوشتی هەردووکیان تەواو لە سروش و فیترەت بەدوورن و لەگەڵ شێوەی حەقی ئاییندا ناگونجێن، ئیتر دەمارگیری زاڵ بوو بەسەر جوولەکایەتیداو ڕەهبانیەت و دوورگرتن لە ژیانیش زاڵبوو بەسەر مەسیحیەتدا.

هێندەی نەبرد مۆرکی ئیغریقی خۆی سەپاند بەسەر مەسیحیەت و ئەورووپاو دەوڵەتی ڕۆمانیشدا.

# باسی حەوتەم

## (فیرعەونی)

لە میسردا کۆمەڵگەی فیرعەونی وەك کۆمەڵگەکانی فارس و یۆنان و ڕۆمان بتپەرستی فرەخودایی و کۆیلایەتی دڵڕەقانە بوو و تیایدا تاك و ئیمپراتۆر دەپەرسترا، لە میسردا فیرعەون دەپەرسترا، لە ئایینی کۆنی فیرعەونیدا سیانەی پیرۆز هەبوو (ئیزیس و ئوزێرس و حۆرس) خواوەندەکان لە (تیبە)دا جیاوازبوون و بریتی بوون لە (ئاموون و حوت و سخت)، لە (منف) جیاوازبوون و بریتی بوون لە (فتاح و سخت و ئەمۆزیس) بەڵام فرە خوداییان هەبوو، هەروەك ژیاری فیرعەونی ئاژەڵی پیرۆز ڕادەگرت وەك گا و بەران و قاز و گا (ئەبیس) دەپەرستراو جێی پیرۆزی بوو و پاشان ئحمس لە منف پەرستگایەکی گەورەی بۆ دروست کرد، هەروەك ناوی خواوەندەکان و جۆری بۆنەکان جیاوازبوون، نیل دەپەرستراو خەڵاتی پێشکەش دەکراو فیرعەونیش بە زیندوویی و مردوویی دەپەرسترا.

کاتێ میسریەکان لە خوێندنگەی عەین شەمس و دواتر لە خوێندنگەی ئەسکەندەریە تێکەڵ بە کەسانی تر بوون بیری بتپەرستی میسری کاری کردە سەر بیری ئیغریقی و دواتر بیری مەسیحی تا ئەوەی دەوترێ چیرۆکی مەریەمی عەزراو مەسیح بەو جۆرەی لە مەسیحیەتدا هاتووە بۆ ئەوە بووە لە چەند لایەکەوە بچوێنرێ بە چیرۆکی ئیزیس و خواوەند حۆرسی کوڕی لە میسری کۆندا، دەرچوونی مەسیحیەت لە یەکخواپەرستی پوخت و وەرگرتنی بیرۆکەی سیانە خوایی لەپاڵ بیرۆکەی یەکخواپەرستیدا سیانە خوایی نێوان خواوەندەکانی میسرمان بیردەخاتەوە هەرچەندە خوایەك بەجیا لەوانی تر گەورەتر سەیر دەکرا.

میسریەکانیش وەك فارس و ڕۆژهەڵاتیەکان هێزە سروشتیەکان و فەرمانڕەواکانی خۆیان بەخوا سەیردەکردن، لە دیدی ئەواندا خۆر گەورەترین خوا بوو لەبەرئەوەی واتای گەورە دیاردەی سروشتی بوو و هێزێکی ڕۆحی هەیە کە کەون بەڕێوە دەبات، خواوەندەکانی چوار

پایەکەی جیهانیش هەبوون، پەرستشی سێ فیرعەونەکەو ئەکلیرۆس و پیدانی لێخۆشبوون و قوربانی کردن و تابوتی مردوو و هێماو ئاماژە و پەرستگاو کاهینەکان ناسراون و هەموو ئەمانەش گوازرانەوە بۆ ناو مەسیحیەت.

پەیکەرە فیرعەونییەکان پەیوەست بوون بە حساباتی ئەستێرەو گەردوونەوە، پەیکەرەکان لە پەرستشەکانی یۆنانی و بابلی و مەجوسیەکانیشدا هەبوون، میسری فیرعەونی پەیوەندی هەبوو بە مەجوسی فارسیەوە هەروەك پەیوەندی هەبوو بە بتپەرستی یۆنانی و ڕۆمانیەوە، ئەو پەیوەندیانەش سیاسی و بازرگانی بوون، ئەوان (قمبیز)ی پاشای فارس و ئەسکەندەری سەرکردەی یۆنان بوون.

دواتر میسر مێژوویەکی پەیوەست بە فارس و یۆنان و ڕۆمانی هەبوو، ئەو پەیوەندیانەی ئیغریق لەڕووی بازرگانیەوە بەرەو کەناراوەکانی ڕۆژهەلاتی فراوان بوون و لە سەدەی حەوتەم و شەشەمی پێش زاییندا لەگەڵ میسردا فراوان بوون، کاتێ فارسەکان لە ٥٢٥پ.زدا لە میسر جێپێی خۆیان چەسپاندو میسر بوو بە ناوچە دەسەلاتێکی فارسی ئەمە ڕێگرنەبوو لە هاتنی بەلێشاوی ئیغریقیەکان بۆ میسر تا لە ٣٣٢پ.ز دا ئەسکەندەر گرتی.

کاتێ ئەسکەندەر هات پیاوانی ئایینی ئاموون پێشوازییان لێکردو وەك کوڕی گەورە خواوەندیان وێنەیان کردو هەموو نازناوێکی فیرعەونییان پێدا، نهێنی ئەمە لەوەدایە ئەوان ئەسکەندەریان بە ڕزگارکەریان لەدەست فارس دادەنا دوای ئەوەی زۆربەی خاکی ولاتی فارسی شکاند، ئەمە لە دیدی مێژوونووساندا بە خالێکی گەورەی وەرچەرخان دادەنرێ چونکە لەوێوە مێژووی فیرعەونی میسر کۆتایی دێ و مێژوویەکی نوێی هەزار سالەی نێوان یۆنانی و ڕۆمانی دەست پێدەکات.

کاتێ ئەسکەندەر مرد پەتلەسیەکان شوێنیان گرتەوەو پەیوەندی نێوان میسرو یۆنان بەهێزتر دەبوو تا زمانی یۆنانی بوو بە زمانی ڕەسمی، بەوجۆرە مایەوە تا عەرەبەکان هاتن، ئەمەش کاریگەری قوولی هەبوو لە بیروباوەڕو ڕۆشنبیری و بیرو هزریشدا.

لەو ماوەدا نووسین لە میسری کۆنەوە کە هیرۆگلیفی بوو گۆڕا بۆ ئەبجەدی یۆنانی، بەتلیمۆس لە میسردا دەسەڵاتێکی میراتگری بۆ کوڕو نەوەکانی دامەزراند کە سێ سەدە بەردەوام بوو، لەو ماوەیەدا یۆنانەکان لە میسردا پەرستگایان بۆ خواوەندە ئیغریقیەکانی خۆیان دامەزراند، بەتلیمۆس هەوڵیدا لەڕێی ئایینەوە میسری و ئیغریقەکان یەکبخات بەوەش ئایینی سیانەی پیرۆز بەکارهات کە لە سەرووی ئەو سێ خوایەوە خوایەکی کۆنی میسری دانرا کە (ئۆزوریس ئەپیس) بوو و ناوێکی ئیغریقییان بۆ دانا کە (ئیسراپیس) بوو و لە وێنەیەکی تەواو ئیغریقیدا بردیان بۆ ئیغریق تا وەك خوا قبوڵی بکەن و بیپەرستن.

ئیغریقیەکان خۆیان بە خاوەن ژیاری باڵا دەزانی و ژیاری خۆیان زۆر لەسەروو ژیاری میسریەکانەوە دادەناو ڕەگەزی خۆیان باڵاتر لە هەموو ڕەگەزە مرۆییەکان سەیردەکرد، میسریەکانیش بوو بوون بە ئیغریقی و زمانی ئیغریقی فێربوو بوون و بەجوانی دەیانخوێندەوەو بەو زمانە دەیاننوسی و ناوی ئیغریقییان لەخۆیان دەنا، ئیغریقیەکان ڕازی بوون بە پەرستشی ئەو خواوەندە فیرعەونییانەی بەرگێکی سادەی مەسیحی ئیغریقییان کرابووە بەر، هێندەی نەبرد میسر گوازرایەوە بۆ قەڵەمڕەوی سیاسی و ڕۆشنبیری ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی.

گۆڕانی حەوزی دەریای ناوەڕاست بۆ ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی نزیکەی دوو سەدەو نیوی خایاند، میسریش کۆتا ناوچەی ئەو حەوزە بوو کە کەوتە دەست ڕۆمانەکان دوای جەنگی ئەکتیۆم و چوونی ئۆگستس بۆ میسر لە یەکەم ڕۆژی ئۆگەستسی ٣٠پ.زدا کە ئەو ساڵە کرا بە سنورێکی جیاکەرەوەی نێو مێژووی ڕۆما لەنێوان کۆتایی سەردەمی کۆماری و سەرەتای سەردەمی ئیمپراتۆریدا، ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیش دامەزرا و پلەی لووتکەو کەماڵی خۆی وەرگرت.

دوای ئەوەی میسر پێشتر لەژێر دەستی پەتلەمیەکانەدا لە ئەسکەندەریە دەوڵەتێکی سەربەخۆ بوو لەو کاتەوە بوو بە ویلایەتێکی سەر بە دەسەڵاتی ڕۆما و ڕۆماش خەزێنەیەکی دارایی بەسەر میسردا سەپاند کە ئەویش بریتی بوو لە گەنمی میسر.

دیارە (کلیۆپاترا)ی کچی بەتلیمۆس لەگەڵ بەتلیمۆسی سیانزەی برایدا دەسەڵاتی باوکی بە هاوبەشی وەرگرت و بەپێی نەریتی خۆیان ئەو دوانە پێکەوە هاوسەرگیرییان کرد و بە زەمانی دەوڵەتی پەتلەسی و گۆڕانی میسر بۆ ویلایەتێکی ڕۆمانی ڕۆڵی کلیۆپاترا کۆتایی پێهات.

مەسیحیەت کە لەسەر دەستی قەشە مرقصی لە ساڵی ٥٤ زاییندا چوویە میسر کەوتە ململانێیەکی سەختەوە لەگەڵ بتپەرستیدا، دەوڵەتی فەرمانڕەوای ڕۆمانی ئەوپەڕی هەڵوێستی ستەم و توندو تیژی و لێدانی بەرامبەر ئایینی نوێ بەکارهێنا، هەرکات سەردەم پێشکەوتایە دەتبینی مەسیحیەت جێپێی خۆی لە میسردا بەهێزتر دەکرد و بتپەرستیش دەڕووخا.

ئیمپراتۆر قوستەنتین لە ساڵی ٣٢٥ز.دا وەك ئایینی ڕەسمی خۆی و دەوڵەت دانی پێداناو زۆرێ لە پەرستگا میسریەکان کران بە کڵێسا، دواتر ئەوانی تریش داخران تا ئیمپراتۆر جۆستنیان هات و (نریس)ی سەرکردەی خۆی نارد بۆ دورگەی فیلەو لەوێ پەرستگاکانی تری پەرستشی ئیزیس و ئوزەریسی لەناو بردو مەسیحیەتیش لە قۆناغی چەوساندنەوەی زۆری نەوە شەهیدەکانیەوە پێشکەوت بە تایبەت لەسەردەمی دەسەڵاتی (وفلستاند) لە دەوروبەری ساڵانی ٢٨٤ز.دا کە چەوساندنەوەی زۆری بەخۆوە دی.

لە میسردا ڕەهبانیەت دەرکەوت و دێرەکان لە هەموو شوێنێ دروست کران و نزیکیەکی روونی نێوان بیرو هزرو بیروباوەڕو ڕۆشنبیری نێوان قیبتی لەلایەك و فیرعەونی و یۆنانی لەلایەکی ترەوە دەرکەوت، زمانی قیبتی وەك کۆکەرەوەی هیرۆگلیفی و ئەبجەدی یۆنانی دەرکەوت و دابەش بوو بۆ پێنج شێوەزار و پیت بە دەنگەکانیش بۆ وەڵامی پیتە بێدەنگەکان بەردەوام بوون، خوێندنگەی ئەسکەندەریەی فەلسەفی کاریگەری قووڵی هەبوو لەو مۆرکەدا کە مەسیحیەت هەیبوو دیارترین کەسەکانی بریتی بوون لە (میلۆن) و (ئەفلۆتین).

چوونی میسریەکان بۆناو مەسیحیەت ناڕەزاییەکی بێدەنگ بوو بەرامبەر بەو ستەمەی ڕۆمانەکان کە سیستمی کۆیلایەتی سەختیان داهێنا بوو و میسریەکانیان ڕیشەکێش

کردبوون‌و وەك دارو پەردوو وابوون بۆ پەرستشی فیرعەون، ئەوان مەسیحیەتییان بە ئازادکەر دەزانی لە ستەمی باوو بتپەرستی خنکێنەر.

زانای شوێنەوارناس (ساسبیرو) لە وانەیەکیدا دەڵێت: ئەگەر گەلی میسری بە گشتی نەسرانەتیان وەرگرتایە ئەوا درکیان دەگۆڕا، بەڵام ئەوەی ڕوویدا ئەوە بوو پیاوانی چینە باڵاکانی بتپەرستی لە وەچەی سەرۆك کاهینەکان و دەرەبەگ و کەسە گەورەکان دوای بەرگرییەکی دوورو درێژی دژ بە مەسیحیەت دواجار خۆیان دا بەدەست ئەو ڕەوتە ئایینیەوە بەڵام دیدی نەسرانییان بە ڕۆحی کۆنی میسریەوە مایەوە، وەك دەزانن دەوترا کلێسای یەکەمی سەردەمی یەکەمی مەسیح ڕێنماییەکانی خۆی لەدوو سەرچاوەوە وەرگرتووە: ئەنتاکیەو ئەسکەندەریە.[١]

زۆرێ لە لێکۆڵەران و مێژوونووسان لەسەر بنەمای ئەم ڕایە پێیان وایە فیرعەونی لەناوچوو بەڵکو مەسیحیەتی کرد بە بنەمایەك بۆ نوێکردنەوەی چەند سەد ساڵەی خۆی تا پێش دەرکەوتنی ئیسلام، لێکچوونێکی ڕوونیش لەنێوان فیرعەونی و نەسرانیەتدا هەیەو چەند خاڵێ بنەڕەتی ئەو دوو بیروباوەڕە پێکەوە کۆدەکەنەوە، (گۆستاف لۆبۆن) ئاماژە بەوە دەدات زۆربەی خواکانی میسریەکان بە شێوەی سیانەی باوك و دایك و کوڕ دەرکەوتوون، هەر شارێ بەتایبەت یەکێ لەو سێ خوایەی پەرستووە، بەڵام سیانەیەکی یەکانگیر لەنێوانیاندا هەبوو (ئوزوریس، ئیزیس، حۆرس).

سیستمی ئەکلیرۆس یان دامەزراندنی پیاوانی ئایینی لە فیرعەونیەتدا وەك هی نەسرانیەت وابوو، پەرستگا گەورەکان و سەرۆکی کاهینان لە دۆڵی نیلدا لەسەر نیزامی میلیشیا پاسەوانی تایبەتیان هەبوو بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکانیان وەك چۆن لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لەبەردەرگای مەسیحیەتدا هەبوو و تا ئێستاش لە ڤاتیکاندا هەیە.

ئایینی فیرعەونیش ڕێکخستنی خۆسەپێنی یان بیانووی ستەم و نیزامی چینەکان بوو کە لەسەر بنەمای دەسەلاتی کاهین و پەرستشی فیرعەون وەستا بوو، پەرستشکارە ستەم

---

١- محاضرة ماسبيروفي ١٩ نوفمبر ١٩٠٨.

لێکراوەکان کە هەرگیز پلەیان نەدەگەیشتە چینی ئازاد هەبوون، ئەمە وەك سیستمی کۆیلایەتی ناو فارس و یۆنان و ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی وابوو.

چەند مەسەلەیەك لێکچووی نێوان مەسیحیەت و فیرعەونی بوون وەك مەسەلەی قوربانی و پیرۆزێتی و مۆسیقاو سروودو مەی و بەرازو تابووتی مردوو و هێماو ئاماژەکان، ئەوەی ئایینی کۆن و نەسرانیەتی لە میسردا لەیەك جیا دەکردەوە بریتی بوو لە زمانی گشتی هیرۆگلیفی،[1] هەرکات مەسیحیەت لە ڕۆژئاوا بە بتپەرستی ئیغریقی دەگەیشت و لەو بازنەیدا خۆی دەبینیەوە لە دەروونی بتپەرستان نزیك دەبوویەوە و ئەوانیش دەبوونە مەسیحی، بە هەمان شێوە لە کەشی فیرعەونیدا مەسیحیەت وێنەی بیروباوەڕی کۆنی وەرگرت، بۆیە فیکری میسری توانی مەسیحیەت قبووڵ بکات و وەری بگرێ.

---

١- أحمد صبري: قناع الفرعونية.

# باسی هەشتەم

## (بتپەرستی عەرەبی)

نیمچە دوورگەی عـەرەبی لـە بانگەوازەکـەی ئیـبراهیم و ئیـسماعیلەوە یەکخواپەرسـتی وەرگرت، بەڵام دوای سەردەمانێ بتپەرستی تێکەڵ بوو و لە بیروباوەڕی پوختی خۆی لایدا.

مێژوونووسان ڕایان وایە بتپەرستی لە حیجازو نیمـچە دوورگـەی عەرەبیـدا نەخۆشـیەکی بیانی بوو کە لە ڕۆژهەڵاتی ئوردون و وڵاتی کەنعانەوە هات بۆیان و (عەمری کوڕی لوحـەی) لەو کاتەدا ئەو بتپەرستیەی برد بۆیان کە خوزاعە لە حیجازدا لە نزیکی چوارسەد ساڵ پـێش ساڵی کۆچیدا دەسەڵاتیان لەدەستدا بوو ئەمەش کورتترین تەمەنی بتپەرستی بوو، هەر بۆیـە لە وڵاتی عەرەبدا پەیکەرو ڕێکخستن و ئەفسانەی وەك هی بتپەرستی قـووڵی هینـدو چـین و پەرستگاکانی ڕۆماو ئەسینا دروست نەکران.

حەنەفیەتی ئیبراهیم بڕێ شتی مابوو کە تا سەردەمی پێغەمبەرایەتی موحەممەدی مابوون بەڵکو شتێ لە شەریعەتی پێغەمبەر شوعەیب لەنێویاندا مابوویەوە.

بتپەرستی عەرەب جەختی دەکردەوە سـەر هـاوەڵ دانـان بـۆ خـواو پەرسـتنی بتـەکان و پەرستنی هێزە سروشتیەکان (خۆرو مانگ و ئەستێرەکان) و پەرستنی ئاژەڵ و پەیکەری مرۆڤ (ئەساف و نائیلەو لات و عوززا).

(ئیبنولکەلبی) لە کتێبەکەیدا (الأصنام) دەڵێت: ئەوەی عەرەب بەرەو پەرسـتنی بتـەکان برد ئەوەبوو هەر کەس دەهاتە مەککە بەردێکی حەرەمی پێ بوو وەك بـەرزڕاگرتنی حـەرەم، دەگەیشتنە هەر کوێ دایاندەناو وەك تەوافی کەعبە تەوافیان لەدەور دەکـرد، دواتـر لەمـەوە کەوتنە پەرستشی هەڵکۆڵراوەکەیان و ئەو بارەی پێشتریان لەبیرکردو لە بری ئایینی ئیبراهیمو ئیسماعیل ڕێی تریان گرتەبەر و بتەکانیان دەپەرستن و وەك بـاری گـەلانی پێـشوویان تـووش بووو ئەو پێنج بتەیان کردنە خـوا کـە هۆزەکـەی پێغەمبـەر نـوح دەیانپەرسـتن و ئـەمانیش کەوتنە پەرستنیان، لەگەڵ ئەوەشدا پاشماوەی سـەردەمی ئیـبراهیم و ئیـسماعیل لەنێویانـدا

مابوو، ئەو پێنج بتە بریتی بوون لە (ود) لە شێوەی پیاوێکدا، (سواع) لە شێوەی ژنێکدا، (یەغووس) لە شێوەی شێردا، (یەعوق) لە شێوەی ئەسپدا، (نەسر) لە شێوەی هەڵۆدا.

عەرەب کاهینی و فاڵچیەتی و باڵەفڕێ (باڵندە فڕاندن) و هێڵکاری لم و جادوو شتانی لەو شێوەیان دەزانی، ئەمەشیان لە بیروباوەڕی گەلانی دراوسێوە وەرگرتبوو و ناوی جاهیلیەتیشی لێ نرابوو، مەبەست بە جاهیلیەت نەمانی یەکخواپەرستی پەتی بوو، ئەو یەکخواپەرستیەی کە ئیبراهیم و ئیسماعیل پێغەمبەر هێنایان.

لێکۆڵەران سەردەمی جاهیلی بۆ دوو بەش دابەش دەکەن: جاهلیەتی فیترەت و جاهلیەتی لەدەست چوو (ئەویش ئەوەیە ئوممەت ژیارێکی لەدەستداوە و ژیانی داڕماوە) جاهلیەتی عەرەب جاهلیەتی لەدەست چووی تەوقیت کراوبوو کە چەند شوێنەوارێکی بەهێزی ژیارێ یان چەند ژیارێکی وەرگرتبوو.

قورئان شایەتی ئەوە دەدات عەرەب پێشتر لەسەر ئایینی ئیبراهیمی چەند ژیارێکیان هەبوون و خوا چەند پێغەمبەرێکی ناردووە بۆ عەرەب لەوانە (هود و صالح و شوعەیب)، هەر پەیامێکی ئایینی و هەر ئایینێ ژیارێکی هەبووە،[1] جاهلیەت واتای نەزانی دژ بە زانست نەبووە بەڵکو مەبەست بوونی بتپەرستی بووە لەلایەکەوەو واتای ئەو جەهلەش کە دژی ژیرییە نەك دژی زانست،[2] دیارترین مەشخەڵەکانی بتپەرستی عەرەبی بریتی بوون لە:

یەکەم: سوو کە لە جوولەکەوە وەریانگرت، لە نیمچە دوورگەی عەرەبیدا ئایینی جوولەکەیی و مەسیحی بوونیان هەبوو و بازرگانی نێوان باکوورو باشووریش هەبوو، لە نیمچە دوورگەی عەرەبیدا دراوی فارس و دراوی ڕۆمی هەبوون کە بەپێی سەرکەوتن یان شکستی ئەو دوو ئیمپراتۆریەتە دراوەکانیان سەروخواریان دەکرد،[3] لە نیمچە دوورگەی

---

١- إبراهيم مصطفى من بحث عن العصر الجاهلي.

٢- د.يحيى الجبوري: الجاهلية.

٣- نفس المصدر.

سەرمیشدا کۆمەڵگەی سووخۆری بە هەموو خراپی و لادان و شوێنەوارەکانیەوە بوونی هەبوو.

**دووەم:** زیندەبەچاڵ کردنی کچ و کوشتنی منداڵ، هەندێ هۆز کاتێ دەیانزانی کچیان دەبێ یەکسەر دوای لەدایکبوونی زیندەبەچاڵیان دەکرد، ئەوان بڕوایان وابوو کچ پیسە و لە شەیتانەوەیە، هەروەها نەریتی (ئیماء) هەبوو، هەروەها بەهاوسەرگرتنی دوو خوشك بەجارێ هەبوو.

**سێیەم:** بتپەرستی کە بت و بەردو داریان دەپەرست، (ئیبنولکەلبی) باس دەکات لەنێو ئەو بتانەدا کە عەرەب دەیپەرستن هەیانبوو لە شێوەی مرۆڤدا بوو وەك (هوبەل) کە لە عەقیقی سوور لەسەر شێوەی مرۆڤێ دروستیان کردبوو کە دەستی ڕاستی شکابوو، وا گمیشتبووە دەست قورەیش و ئەوانیش لە زێڕ دەستێکیان بۆ دروست کردبوو، هەروەها بتی (ئەساف) و بتی (نائیلە)، لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا سێ سەدو شەست بت لە کەعبەدا هەبوون، هەروەها (المقه)خواوەندی گەورەی سەبەء بوو کە لە شانشینی سەبەئدا زیاد لە هەزار ساڵ دەپەرستراو پەرستگای گەورەی بۆ دروست دەکرا، ئەوان لەو پەیکەرو بتانە لە بەرد پەیکەریان دادەناو خوێنی قوربانییان بەسەردا دەکرد، زیاتر (صنم) لە زێڕو و زیو و بەردو لەسەر شێوەی مرۆڤ دروست دەکرا، بەڵام (وثن) لە بەرد دروست دەکرا، هەروەها پەرستشی گەورەکانی هۆزەکانیش هەبوو.

هاوەڵ دانان بریتی بوو لەوەی لەگەڵ خوادا خواوەندی تریان دەپەرست ﴿الَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاء مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى﴾ لەوانەیە جوولەکایەتی و مەسیحیەت کاریگەرییان هەبووبێ لە بڵاوبوونەوەی ئەو بیرۆکەدا بیرۆکەی بوونی نێوەندێ تا لە خوا نزیکیان بکاتەوە، ئەمەش لای یەکخواپەرستی تەواو قبوڵ نەکراوە.

**چوارەم:** جیهانی جادوو و ڕۆح و ئەفسانەو جادووگەری و جنۆکەو کاهینی و ئەستێرەو هەسارە پەرستی کە ئەمەشیان لە سائیبەوە وەرگرتبوو وەك چۆن بتپەرستییان لە مەجوسی جیابووەوەی تەمیم و عومان و بەحرەینەوە وەرگرتبوو، جادوو و کاهینی کاری پیاوانی ئایینی

بوو، زۆربەی جادووگەرەکان جوولەکە بوون، جادوو بارێکی عەقڵی جاهلی بوو، یەکێ لە دیارترین جادووگەرە جوولەکەکان بریتی بوو لە (لوبەیدی کوڕی عاصم).

**پێنجەم:** مەی خۆری و کاری سێکسی و قومارکردن، مەی قسەو کاری زارەکان بوو و لە دێرەکانیشدا هەبوو و جوولەکەو مەسیحیەکان بازرگانییان پێوە دەکرد، لێرەدا پەیوەندییەك هەبوو لەنێوان مەی خۆری و کاری سێکسی و قوماردا، ئەوان لە هەندێ گوندا چادریان هەڵدەداو لەسەری ئالآیەکیان هەڵدەکرد تا خەڵکی بزانن و تیایدا مەی و گۆرانی و سەما بوو.

**شەشەم:** تۆڵەو خواردنی ماڵی هەتیوو و ستەمی دەسەڵاتدارانی خۆسەپێن و بەکۆیلە کردنی هەژاران.

کۆمەڵگەی جاهلی لە نیمچە دوورگەی عەرەبیدا بڕێ خورافەو ئەفسانەو جادوو و باڵندەفڕی و ڕەشبینی کاری تێدابوو، لێرەوە فاڵچێتی دەرکەوت کە دەرگایەك بوو بەڕووی کاهینیەتێکدا کە کاری پێشبینی غەیب بوو، لەکاتێکدا عەرافی ڕابردووی ئاشکرا دەکرد، لەو بارەی ژیاندا کاری جادووی پەیوەست بە ڕێگری و بێزراندن و شوێن پێ گرتن و دەست خوێندنەوە بەریەك دەکەوتن، وێنەی جادووگەر لەپاڵ وێنەی کاهیندا بوو، خەڵکی پەنایان دەبردە بەر ئەوانەو ئەوانیش بەدوای غەیبدا دەگەڕان.

کاهینی و جادووگەری پێگەیەکی باڵاو کاریگەریەکی گەورەی هەبوو لە ئەندێشەو کێشە دەروونی و ڕۆحیەکانیاندا، ئەوان کاهینەکانیان بە پزیشکی ڕۆحی خۆیان دەزانین، کاتێ کەسێ خەوێکی ترسناکی دەدی ڕایدەکرد بۆلای کاهینێ تا واتای بکات بۆی، جادووگەرانیش پەیوەندییان بە جنۆکەوە هەبوو، جادوویش کاری جوولەکەکان بوو، پەیوەندی نێوان شەیتانەکان و جادووگەران پەیوەندی مامۆستاو فێرخواز بوو، جادووگەران دەیانتوانی ژن و مێرد لەیەك بکەن، ئەوان جادوو و باڵندەفڕی و کاری جادوویان هەبوو، باڵندەفڕی ئەوە بوو باڵندەیان بە بەردێ هەڵدەفڕاند ئەگەر بەلای ڕاستدا بفڕیایە ئەوە باش بوو، سەبارەت بە

ئەزلام ئەوە بوو لەسەر دوو وەرەقە دەیاننوسی کردارو ڕێگری لەکار، هـەرکامیان دەربــچوایە ئەوەیان پێدەوت.

خەڵکی بەردەوام بڕوایان هەبوو بە کاهینان و فاڵچییان تا ئیسلام هەموو ئەوانەی پووچەڵ کردەوەو ساختەکانی ئاشکرا کردو ڕێگری کرد لە جادووگەری و کاهینی و بە تاوانی گـەورەی دانان و دەروونی مرۆیی لە ئەفسانە ڕزگارکرد.

# بەشی دووەم

# (ئیسلام و جیهان)

## باسی یەکەم

## (فتوحاتی ئیسلامی)

ئارنۆلد توینبی دەڵێت: (ئیسلام لە نێوان و مەسیحیەت هیندۆسیدا دروشمی یەکخواپەستی هەڵگرت، ئەو بیروباوەڕی یەکخواپەرستیەی ئیسلام هێنای جوانترین نموونەی بیرۆکەی یەکخواپەرستی جیهان بوو، مانەوەی ئیسلام هیوایەك بوو بۆ هەموو جیهان).

بەڵێ ئیسلام کاتێ هات مرۆڤایەتی نغرۆی ئەفسانەو ستەم و هەڵە ببوو، ئیسلام هات تا بەرەو ڕووناکی ببات و لەو لادانەی بیروباوەڕو کۆیلایەتی ناو کۆمەڵگاوە بیگێڕێتەوەو ڕاستی بکاتەوەو گەندەڵی ئاکاری نەهێڵێ، وەك نوێگەری بانگەوازی حەقی خوای تەنها هات تا پەیامی پێغەمبەران هەر لە ئادەمەوە نوێ بکاتەوە، چونکە پەیام دوای پەیام و بانگەواز دوای بانگەواز هاتوون تا بانگەوازەکەی موحەممەدی کوڕی عوبدوڵلا بوو بە کۆتای پەیامەکانو نوێگەری بانگەواز بۆ ئایینی حەق بۆ هەموو خەڵك.

ئیسلام دژ بە بتپەرستی وملهوڕی پەیامی یەکخواپەرستی و برایەتی جیهانی بەرامبەر بە کۆیلایەتی و ستەم هێنا، لووتکەی ڕەوشتی دژ بە بێڕەوشتی و خراپەکاری هێنا، بەمە ئیسلام ئایینێکی تەواو بوو لەڕووی بیروباوەڕو ڕەوشت و شەریعەتەوە، بەشبەشەکی و لەتبوونی لەڕووی ئاین و ڕێبازی ژیان و نیزام و کۆمەڵگەوە نیەو هەموو لایەنەکانی لەیەك قەوارەدا بەیەك دەگەن کە ئەویش ئەو مرۆڤەیە کە خوا لەسەر زەویدا دایناوە تا لە نەوەکانیەوە کۆمەڵگەی مرۆیی پێکبهێنێ.

ئیسلام بەرامبەر چەمك و واتاکانی بیری مرۆیی وەستا، ئەو بیرەی بەرامبەر بە دابەزینی ئیسلام وەستابوو، ئیسلام ڕاشکاوانە وەستاو ڕاست و ساختەکانی ئاشکرا کردو پێوانێکی حەقی بۆ دانا و هەڵەو گومان و ڕاڤە جیاجیاکانی لادانی مرۆڤی لە چەمك و واتای ئایینی

حەق خستەڕوو و هەموو مەسەلەکانی گێڕایەوە بۆ بنەڕەتی خۆی، ئەو بنەڕەتەی کە پێغەمبەران هێنابوویان بۆ خەڵکی، ئەوەشی ئاشکرا کرد ئایینی خوا یەکەو ئەو جیاوازیەی ڕوویداوە لادان و دەربڕینی مرۆڤەکانە و پەیامی خواش بۆ مرۆڤ هەر لە ئادەمەوە تا موحەممەدی کۆتای پێغەمبەران یەك پەیام بووە.

لەو کاتەوەی پەیامی ئیسلام دابەزیوە تا ئەمڕۆ کاریگەرییەکی ڕوونی هەبووە لە ژیارو شەریعەتەکانو کۆمەڵگەو ڕووداوەکانی مێژوودا، مرۆڤایەتی ئاکارو ڕەوشتێکی نوێی هێناو بە شێوەیەکی بەرنامەی خوایی بیری مرۆیی دارشتەوەو سنورێکی یەکلاکەرەوەی نێوان دوو سەردەمی مێژوو و نێوان دوو بیری عەقڵ و دەروونی دانا و کۆمەڵگەیەکی نوێی لەسەر بنەمای بیری ئیسلام دامەزراند کە هێندەی نەبرد جێپێی چەسپاوو چوارچێوەی فراوان بوو تا سێ کیشوەری جیاوازی گرتەوە تا سنوری چین لە ڕۆژهەڵات و سنوری فەرەنسا لە ڕۆژئاوا، ئەمەش لە ماوەی کەمتر لە حەفتا ساڵدا کە لەو ماوەدا ڕۆح و چەمك و واتای بیروباوەڕی خۆی گواستەوە بۆ مرۆڤایەتی و هەموو ئەو گەلانەی لە نیزامی کۆیلایەتی ڕزگارکرد، ئەو نیزامە کۆیلایەتیەی کە مرۆڤ لە پەرستشی فیرعەون و ئیمپراتۆرو قەیسەردا سەختی زۆری لێ چەشتبوو، هێندەی نەبرد ئەو گەلانە چوونە ناو ئایینی حەقی خواوە.

ئیسلام ئەو کشانە هزری و دەروونی و کۆمەڵایەتیەی نێوان ئەو گەلانەی بڕی کە لە پێش ئیسلام و دواتردا پەیوەندییان پێوە هەبوو، لەگەڵ پەرستشی بت لە نیمچە دوورگەی عەرەبیدا ڕێی بڕی و هێندەی نەبرد ڕێی هەموو بتپەرستی لە هەموو جیهاندا پچڕاندو بتەکانی شکاندو پەرستگا ئاگرینەکانی کوژاندەوەو ئایینە زەردەشتیەکانی وەك زەردەشتی و هیندۆکیو بوزی بەتەواوەی بەرتەسك کردەوەو تەنها ژمارەیەکی کەمی شوێنکەوتەیان مایەوە.

بێگومان ئایینی ئیبراهیم و پێغەمبەرە نەوەکانی بنەڕەتی بیری خواپەرستی مۆرکپێدەری مرۆیی هەبوو کە ئامانجی دابەزیوی لە ئاسمانەوە بوو و لەلای خواوە دابەزیون و لەسەر حەق و دادپەروەری بوون، بەڵام هێندەی نەبرد شوێنکەوتەکان بە ویستی خۆیان ڕاڤەی جیاوازیان بۆ

کردن، بوزاو زەردەشت و مەسیح بڕوایان وانەبوو دوای مردنیان بەرزبکرێنەوە بۆ پلەی خوایەتی، لێرەوە ئیسلام سوور بوو لەسەر ئەوەی جەخت بکاتەوە لە جیاوازیە قووڵەکانی نێوان خوایەتی و پێغەمبەرایەتی و نێوان خواو پەیوەندی بە جیهان و بوون و مرۆڤەوە، ئەمەش لە قورئاندا بەڕوونی هاتووە کە جەخت دەکاتەوە لە مرۆڤ بوونی موحەممەد ﴿قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ﴾.

جوولەکایەتی بەرەو ماددیگەری سەرسەختی لارێ بوو و ژیانی لەسەر دەمارگیری و سووخۆری دامەزراند، دواتر مەسیحیەت هات و بەرەو ڕۆحیەتی ڕەها لایداو ڕقی لە ژیانی دنیا بوو و خۆی لێ دوور دەگرت، ئینجا ئیسلام هات و بڕیاری حەقیقەتی بنەڕەتی پەیوەست بە فیترەت و عەقڵ و زانستی دا تا ئوممەتێکی میانڕەو دروست بکات کە تیایدا تاك لەگەڵ گەلدا کارلێك بکات بێ ئەوەی دنیا پشتگوێ بخات یان تاو بداتە ماددیگەری توندو سەخت.

کاتێ ئیسلام هات دەوڵەتی ڕۆمانی زاڵ بوو بەسەر شام و میسرو مەغریبدا لە ئەفریقاو ماوەی نزیکەی هەزار ساڵێ بوو دەسەڵاتی هەبوو هەر لە شالاوی ئەسکەندەرەوە تا هاتنی ئیسلام، بەڵام ئیسلام ئەو دەستڕۆییەی ئاواکردو ئەو بەشانەی ئازاد کردو گێڕایەوە بۆ بنەڕەتی عەرەبی خۆی و دژ بە مەجوسی فارسیش وەستاو دەسەڵاتە سیاسییەکەی لەناو بردو بتپەرستی و غەنوصی لەناوبردو دەیان ئایینی گومڕاکەرو پەرستشی لاڕێبووی نەهێشت وەك پەرستشی ئاژەڵەکان لە میسرو هیند (مانگاو گوێرەکەو بەران و قاز) یان پەرستشی هێزە سروشتیەکان و ڕەگەزو کاکێشانە ئاسمانییەکان، یان پەرستشی نیل و فیرعەون و شەیتانەکانو پەرستشی فریشتەکان و خواوەندانی ڕووناکی و تاریکی و فرە خودایی یۆنانی و هیندی و میسری و پەرستشی ئاگر لای فارس و کۆئەندامی زاووزێ و دەیان پەیکەرو سەدان بت، ئیسلام هات هەموو ئەمانەی لەناوبرد و ئەو بانگەوازە گومڕاکەرانەی ڕاوەدوونا و تەنها ژمارەیەکی کەم شوێنکەوتەی بۆ هێشتنەوە. ماڵەکانی ئاگر کوژانەوەو ڕووخان، ئیسلام بیری مرۆیی و نەفسی مرۆیی لە بیری ساختەی مرۆیی سەبارەت بە قسەی دەهریەکانی لەناوبرد چونکە ئەوان دەیانوت جیهان خواو دروستکەری نیە، یان قسەی سروشتیەکان کە دەڵێن خۆڵو

ئاوو ئاگرو هەوا بنەڕەتی هەموو شتێکن، یان قسەی فەیلەسوفان و جوولەکە کە نکوڵی دەکەن لە زیندووبوونەوەی جەستەکان.

بەدرێژایی ماوەی دەسەڵاتی دەوڵەتی ساسانی لە فارسدا ئایینی زەردەشتی زاڵ بوو، کاتێ ملی کەچ کرد کە ئیسلام هێرشی بردە سەر ئیتر وەك شەکر لە ئاودا بتوێتەوە (بەپێی دەربڕینی یەکێ لە نووسەرە فەرەنسییەکان) لەبەردەم ئیسلامدا توایەوە.[1]

کاتێ بووزیەت بوو بە ئایینێکی نهێنی پڕ لە شاراوەی سەرسوڕهێنەری وەك ئەوەی دەیوت خودا لە بوزادا خۆی دەنوێنێ تا مرۆڤایەتی ڕزگار بکات و ئەرکی تاوانە کۆنەکانی لە ئەستۆ بگرێ و نەهێڵێ تاوانی نوێ بکات، بووزیەت لە ئەنجامی ئەمەدا بوو بە هێمایەك بۆ خواوەندی ڕزگارکەر کە ساتە و ناسات دێتە سەر زەوی و خۆی لە شێوەی پیاوێکدا نیشان دەدات تا مرۆڤایەتی ڕزگار بکات، بەڵام ئیسلام ئەو خەیاڵاتە پڕو پووچ و سەرلێشێوێنەرانەی تەفروتونا کرد، خەیاڵاتی حلوول و ئیتیحادو تەناسوخی ڕۆحەکان، بەڵکو ئیسلام ساختەی ئەو خەیاڵانەی ئاشکرا کرد بۆ مرۆڤایەتی و پەرستشی فیرعەون و ئیمپراتۆر قەیسەریشی لەناوبرد، ئیسلام کاتێ هات ئەو نیمچە ماوەی بوزیەت و بەرهەمی لەناو برد ئیتر بوزیەت بە باکوورو باشوردا پەرتەوازە بوو کاتێ بەرامبەر ئیسلام وەستا بە تایبەت لە جاوەو سۆمەترە کە گورزێکی کوشندەی وای بەرکەوت جارێکی تر توانای سەرپێ کەوتنەوەی نەما هەرچەندە ملکەچی حەزو ویستی گەلانی شوێنکەوتەی بوو بوو و لەبەردەم داب و نەریتیاندا بە تەواوەتی شکستی خواردبوو بەجۆرێ دوای ماوەیەك بوو بە کاریگەری لەسەری.[2]

هەروەها ئیسلام بە شێوەیەکی بەرچاو ئایینی زەردەشتی کونجگیر کردو لە وڵاتی فارسدا تەنها نزیکەی دە هەزار شوێنکەوتەو لە وڵاتی هینددا تەنها سەد هەزار شوێنکەوتەی بۆ هێشتەوە، ئەوان تا ئێستاش تەرمی مردووەکانیان دەخەنە بەردەم ئاژەڵە دڕندەکان.

---

١- د.محمد غلاب: الفلسفة الشرقية.

٢- نفس المصدر

بێگومان کاتێ ئیسلام زەردەشتی لەناوبرد بەهاوسەرگرتنی دایکان و دوو خوشك پێکەوە بە هاوسەرگرتنی نەهێشت، یەعقوبی لە مێژووەکەیدا باس لەوە دەکات مەجوسیەکان بەهاوسەرگرتنی کەسە مەحرەمەکانی وەك کچ و دایکیان لا ڕەوا بوو و پێیان ڕەوا بوو کەسێ بەیەکجار دوو خوشك بەهاوسەر بگرێ، هەروەها دەڵێت فارسەکان (دایك و کچیان بەهاوسەر دەگرت و بە پەیوەندییان دەزانی بەرامبەریان و دەیانوت بەوە چاکەیان لەگەڵ دەکەن و بەوەش لەخوا نزیك دەبنەوە، کاتێ ئیسلام هات ڕایگەیاند پیاو بۆی حەڵاڵ نیە دایك و خوشك و کچ و دوو خوشك پێکەوە بەهاوسەر بگرێ، هەروەها ئیسلام نەریت و باوی بتپەرستی و نیازی گومڕاکەریانی لەنێو برد، عەرەب لە سەردەمی نەفامیدا دایك یان زڕدایکیان بەهاوسەر دەگرت و هاوسەرگیری قوماریان هەبوو و ژمارەیەك پیاو لە دە کەس کەمتر دەچوونە لای یەك ژن.

ئیسلام هێرشی بردە سەر سلبیەتی بەرهەمی کە ئارەزوو و بستەکانی دەکوشتن و نکوڵی لە هەر خۆشیەکی ژیان دەکرد، ئیسلام ئەو قسانەی تێکشکاند کە دەڵێن جەستە هیچ خێرێکی نیە یان دەڵێن هیچ بەهایەك بۆ خۆشیەکان و سامان و شکۆو دەسەڵات نیەو نکوڵی لە خۆشی ژیان دەکەن و بانگەواز دەکەن تا لە دارستاندا بژین و گەرمی تیشکی خۆر بیانسوتێنێ یان بڕوایان وابوو ژیان سەختیەکی بەردەوام و ناڕەحەتیەکی نەپچڕاوە.

بە ڕاستی بیری هیندی هەر لە سەرەتاوە بڕوای بە وەحدەتولوجود هەبوو و خەیاڵاتی کەشف و زەوق پەکی خستبوو، ئەگەر فەلسەفەی هیندیان وەرگێڕایەتە سەر زمانێ دەمانوت بڕوای بە بوون و واقیع و کەسایەتی مرۆیی نیە، بە کورتیەکەی بیرکردنەوەی هیندی تێکشکاندی مرۆڤەو داوای بەخوا کردنی مرۆڤی هەیە، وەك چۆن بانگەوازێکی درۆی (مانی) هەیە کە داوا دەکات مرۆڤ واز بهێنێ و دنیای نەوێ و زوو هەوڵی فەنابوون بدات، بەڵام ئیسلام بڕیاریدا مرۆڤ وا هەوڵ بدات بۆ دنیا وەك ئەوەی هەمیشە تیایدا دەژی و وایش بۆ ڕۆژی دوایی هەوڵ بدات وەك ئەوەی سبەینێ دەمرێ، قورئان پرسیار دەکات ﴿قُلْ مَنْ حَرَّمَ

زِينَةَ اللّهِ الَّتِيَ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالْطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزْقِ﴾ لە وەلامیشدا دەفەرمویت ﴿قُلْ هِي لِلَّذِينَ آمَنُواْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾.

هەروەك ئیسلام هێرش دەکاتە سەر بانگەوازەکانی سەرکوتکردنی ئارەزووەکان و دامالینی نەفس بێ ئەوەی پەیوەستی بیروباوەڕی خواناسی بێ، هەروەها دژی بیرەوشتیە کە ئەوەش لایەنی دووەمی ڕەهبانیەتە، هەروەها ساختەی بانگەوازی مەزدەکی و چەمك و واتای حەلال کردنی حەرامەکان و بانگەواز بۆ هاوبەشەکی ژنان و سامان و خۆشۆردن بە میزو سەرنەبڕینی ئاژەڵ و نەڕشتنی خوێنی ئاژەڵ ئاشکرا دەکات.

ئیسلام ئەو کۆمەڵگانەی لەناو برد کە لەسەر زێدەڕۆیی ئارەزووبازی دامەزرابوون کە لە ولاتی فارس و یۆنان و ڕۆماندا دامەزرابوون.

لەپێش دەرکەوتنی ئیسلامدا ژیاری فیرعەون و یۆنان و ڕۆمانەکان لەناوچوو، بەلام ئیسلام پاشماوەی زانستەکانی زیندوو و نوێی ڕاست کردەوەو لەوێوە بەرەو بەرنامەی ئەزموونی برد. ئیسلام توانی چەند ناوچەیەکی بەرفراوانی عەرەبی ئازاد بکات کە ماوەی هەزا سالێ بوو ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی بیروباوەڕو زمانی خۆی بەسەردا زاڵ کردبوو و داگیری کردبوو، بەلام ئیسلام ئەو دەسەلاتەی نەهێشت و بە تەواوەتی ئازادی کرد.

یەکێ لە لێکۆڵەرە ڕۆژئاواییەکان دەڵێت: لەپێش لەدایك بوونی مەسیحدا ڕۆما ولاتانی عەرەبی گرت و لە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوایاندا چەندین سەدە مایەوەو زیاد لە داگیرکاری فەرەنسیەکان خاکی داگیر کردو قەلای زیاتر لە فەرەنسیەکان دروست کردو چەندین شاری عەرەبی کردە نشینگەو ناوی ڕۆمانی لێنان وەك چۆن فەرەنسا وایکرد، قەڵەمڕەو و زمان و یاسا و ئەدەبی خۆیشی بلاوکردەوە وەك چۆن فەرەنسیەکان وایانکرد، دواتر گەردەلوول ڕۆمای لابردو ڕەشەبای ڕۆژهەلاتی لە دژی هەڵیکردو پاش ماوەیەك وەك نەبووی لێکرد، ئیسلام قەڵەمڕەوی پاشاو قەیسەرو فیرعەونەکانی لەناوبردو بەرەو ئیمپراتۆریەتی فارس کشاو لە پەرستنی ئاك و بت و سیستمی کۆیلایەتی ڕزگاری کرد، ئەو سیستمە کۆیلایەتیەی کۆمەڵە گەورەکانی ملکەچ و زەلیلی کەمینەی کیسراو سەرکردەکان دەکرد، بەمە ئیسلام جیهانێکی

فراوانی لەدەست بیروباوەڕی ساختەو نیزامی ستەمکاری کۆمەڵایەتی ڕزگارکرد، ئەمەش نهێنی پێشوازی خەڵك بوو لە ئیسلام، چونکە ئیسلام بیروباوەڕی خۆی نەسەپاند بەسەریاندا بەڵکو ئازادی تەواوی پێدان و لە سنوری یاسای بنەڕەتی خۆیدا ئازادیەکەی پاراستن ﴿لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ﴾ ئەگەر دوای ئەوە دەستە بە دەستە موسڵمان دەبوون ئەوە بە ویستی خۆیان بوو دوای ئەوەی دادپەروەری و لێبوردەیی و کراوەیی ئیسلامیان بینی.[١]

موسڵمانان بەرەو ئاسۆکان هەنگاویان دەنا تا سپاردەی (گشتێتی پەیامەکە)ی سەرشانیان کە لە پێغەمبەرەوە وەریانگرتبوو بەدیبهێنن و بەربەستە ماددیەکانی فەرمانڕەواو پاشاو سەرکردەکان بشکێنن تا لەنێوان ئەو گەلە ژێردەستانەو نێوان پەیامی خوادا بەیەك گەیشتن و لێکگەیشتن بەدی بهێنن و ستەمی کۆمەڵایەتی و بتپەرستی لەناوبەرن، ئەو گەلانەش بەوپەڕی ڕێزو دڵخۆشییەوە پێشوازیان کرد لە ئیسلام چونکە ئەو بەزۆر بیروباوەڕی خۆی نەچەسپاند بەڵکو توانای ڕوانین و ئازادی بیروباوەڕی لەژێر ئاڵای ئیسلامدا پێدان و ڕێکخستنو دێرو کڵێساو مافەکانی هەموویانی پاراست بێ ئەوەی شتێ بسەپێنێ بەسەریاندا، دەرفەتیشی پێدان تا زیاتر دڵنیابن لە پەیڕەوی کرداری چۆنێتی بەدیهێنانی دادپەروەری و یەکسانی لەلایەن ئیسلامەوە، لێرەوە ئەو خەڵکە بەویستی ئازادی خۆیان بەرەو ئاڵای ئیسلام چوون و بە قەناعەتی عەقڵی و نەفسی تەواوەوە چوون، بڕوای قووڵ بە خواو متمانە بە سەرکەوتنی و داوای مەرگی ڕێی پەیڕەوی دینی خواو گەیاندنی بە جیهانییان بوویە هۆکاری گەورەو یەکەم، بەڵێ موسڵمانان کە دەگەیشتنە ناوچەیەك خەڵکەکەیان لە ستەم ڕزگار دەکردو لەنێوانیاندا دادپەروەرییان پەیڕەو دەکردو ئیسلامیان بەسەریاندا نەدەسەپاند، بەڵکو دڵنیاییان لەسەر سامان و موڵکیان پێدەدان و ئازادی ئایینییان پێدەدان، بەڵکو ئامادەبوون خاکەکەشیان بۆ جێبهێڵن بەرامبەر بەوەی خەراجەکەی بدەن، لەکاتێکدا کیسراو قەیسەرەکان خۆیان بە خاوەنی موڵك و زەوی خەڵك دەزانی و خەڵکیشیان دەکرد بە کرێکار لەو زەویانەدا.

---

١- الأسلام وحركة التأريخ.

نیشانەیەکی ئەو دادپەروەرییەی کە مرۆڤایەتی لەپێش ئیسلامدا نەیدیبوو ئەم وێنەیەیە (کاتێ موسڵمانە ڕزگارکەرەکان هەستیان کرد ڕۆمەکان لە باکورەوە خۆیان کۆدەکەنەوەو سەربازگەی عەرەب حیمص ناتوانێ بەریان پێبگرێ بڕیاری پاشەکشەیان دا، پێش ئەوەی پاشەکشە بکەن خەڵکە بەرچاوەکەی شارو پیاوانی ئایینییان بانگ کران و سەرکردەی موسڵمانان داوای لێکردن چی سەرانەیان لێ وەرگیراوە بیبەنەوە، ئەو کەسانەش وتیان سوێند بەخوا ئەگەر ڕۆمەکان سامانی ئێمەیان بە سەرانە وەربگرتایە و باریان وەك باری ئێوە بوایە یەك دیناریشیان بۆ نەدەگێڕاینەوە هەرچەندە ئایینمان یەکە، حکومەت دەبێ ڕەحمەتی وای تێدا بێ و ئامادە نین شتێ لەبری ئەم بەویژدانیە وەربگرین و هەموو ئامادەین بێینە ڕیزی سەرباز و بەربگرین بە شالاوی ڕۆم و هەر کەسێمان چەکی پێ هەڵبگیرێ بێتە ڕیزتان).

موحەممەد عەبدە دەڵێت: ئیسلام جەنگی تەنها هێندە دەکات زەویە فەتحکراوەکان دەخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی و دواتر واز لە ئایین و باری خەڵك دێنێ تا بیروباوەڕی خۆیان بە ویستی خۆیان پەیڕەو بکەن، تەنها سەرانەیەکیان لەسەر دادەنێ یا پشکێ بۆ پاراستنیان لە خاك و وڵاتی خۆیانداو بیروباوەڕو پەرستگاو نەریتیان پارێزراو بن، ئیتر ئازاد دەبن و لە کاردا زۆریان لەسەر نابێ، بەڵکو وەسیەتی سەرکردەکانیان ئەوەیە ڕێزی ئەو پەرستشکارانە بگرن لە پەرستگاکاندا لێبڕاون بۆ پەرستش و ڕێزی خوێنی ژن و منداڵ بگرن و هەرکەس جەنگ نەکات ڕێزی خوێنی بگرن، لە سوننەتی موتەواتردا هاتووە ڕێگری دەکات لە ئازاردانی ئەهلی زیممەو مافیان لەلایەن موسڵمانانەوە تۆمارو پارێزراو بێ، ئەرك و مافیان وەك هی موسڵمانان پارێزراو بێ، هەرکەس زیممی ئازار بدات لە ئێمە نییە.

دەی دەبینی ئیسلام بە بڕێ سامانی کەم ئازادی و مافی ئەو گەلانە دەپارێزێ کە ئیسلام خاکیان دەگرێ، ئەو بڕەش کەمترە لەو بڕەی لەپێش دەسەڵاتی ئیسلامیدا لێیان دەسەنرێ، هەروەها بۆیان هەیە ئارامی و دوور لە سەختیەکان لەناو دەوڵەتی ئیسلامیدا بژین.

لەلایەکی ترەوە ڕێ دەگرێ لە تاکی باوەڕدار لەوەی پەیوەندی خزمایەتی لەگەڵ خزمە بێباوەڕەکانی بپچڕێنێ، بەڵکو داوا لە بڕواداران دەکات لەگەڵ خزمە بێباوەڕەکانیان بە

ڕەفتاری جوان و چاك هەڵسوكەوت بكەن، بەڕاستی فراوانخوازی ئیسلام موعجیزەیەك بوو بـۆ هەموو توێژەران، سور ئەستروب دەڵێت: (هەركات زیاتر لێكۆڵەران بەدوای نهێنـی پێـشڕەوی ئیسلامیدا دەچن زیاتر سەرمان سـوڕدەمێنێ و دەستەوسـان ڕادەمێـنین تـا دەزانـین هـەموو ئایینە گەورەكان لەسەرخۆو بە هێواشی سەریانهەڵداوەو گەشەیان سەندووەو ڕێیان بڕیوەو هەر سەختیەكیان تووش بووە تا ئەوەی خوای گەورە بۆ هەر ئایینێ بـە ویـستی خـۆی پاشـایەكی سەرخەرو دەسـەڵاتدارێكی بـەتوانای خـستووەتە كـار و ئـەو ئایینـەی سەرخـستووەو دواتـر پشتگیری بووە و تیایدا تواوەتەوە تا پایەكانی چەسـپاون و لاكـانی بـەهێز كـرد، قوسـتەنتین نەسرانیەتی بەهێزكردو ئەسۆكا بووزیەتی بەهێزكرد، هەركام لەوانە دەسـەڵاتداری بـەهێزبوون كە بەپێی هەموو هێزو توانایان پاڵپشتی ئەو ئایینەیان كـردووە كـە لەسـەری بـوون، بـەڵام مەسەلەكە سەبارەت بە ئیسلام جیاوازە، ئیسلام كـە لـە وڵاتێكـی بیابانیـدا دەژیـاو تیایـدا هەموو شتێ دەمردو هۆزی كۆچەری وا بووە كە پایەی بەرزو پێگەی مێژوویـیان نەبوو، كەچی زۆر خێرا بڵاودەبوویەوەو ناوچەكەی لـە لاكـانی زەویـەوە فـراوان دەبـوون و زیـاترین مـاوەی دەبڕیو سەختترین بەربەستی لادەبرد بێ ئەوەی گەلێكی وا هـەبێ پـشتگیرو هاریكـار بـێ و لەسەر سەختیەكان یارمەتی بدات، ئیسلام سەركەوتنێكی ڕوون و قوڵی وای بەخۆیەوە دی كە دوو سەدەی نەخایاند تا ئاڵای ئیسلام لە برانسەوە تا هیمالایا شەكاوە بـوو، لـە بیابانـەكانی ناوەڕاستی ئاسیاوە تا بیابانەكانی ناوەڕاستی ئەفریقیا ئاڵای ئیسلام گەشاوە بوو).

لۆبۆن دەڵێت: (موسڵمانان خەڵكیان بە ئـازادی ئـایینی خۆیانـەوە هێـشتەوەو پاسـەوانی قەشەكانی ڕۆم و پاراستنی لاتینیان دەكردو بارو دڵنیاییەكیان پێدان كە ئـەوان پێـشتر شـتی وایان بەخۆوە نەدیبوو، عومەر دوای ئەوەی چوویە قودس خەڵكی دڵنیـا كـرد سـەبارەت بـە سامان و ئایینیان).

لۆبۆن دەڵێت: (لەوانەیە فتوحاتی یەكەمی عەرەب بۆ ئەوە بگونجایە چاویان نەبینێ و وەك داگیركەران بكەونە ستەمكاری و بە خراپی لەگەڵ شكـست خـواردوان بجووڵێنـەوەو ناچـاریان بكەن ئایینی ئەمان وەربگرن، ئەگەر وایان بكردایە هەموو گەلان لە دژیان داخ لەدڵ دەبوون،

بەڵام خەلیفە یەکەمینەکان کە لێهاتوویی کەم وێنەیان هەبوو لە بانگخوازی ئایینە نوێکانـ نموونەی وا کەم بوو، ئەو خەلیفانە زانییان ئایین و ڕێکخستنەکان بـەزۆر ناسـەپێنرێن، بۆیـ بەوپەڕی سۆزەوە لەگەڵ خەڵکی شام و میـسرو ئیـسپانیاو هـەر بەشـێکی تـر دەجووڵانـەوە نەریت و ڕێکخـستن و بیروباوەڕەکـەیان بـۆ جێدەهێـشتن، بەڕاسـتی ئـەو گەلانـە فـەتحخوازێ بەسۆزومیهری وەك عەرەبیان نەدیبوو، ئەمە هۆکار بوو تا زۆرێك لە گەلان ئایین و سیـستم و زمانی ئەوان وەرگرن، ئەو ئایین و زمانەی جێپێـی چەسـپاندو بەرامبـەر هـەموو شـاڵاوەکان مایەوە دوای ئەوەی دەسەڵاتی سیاسی لە شانۆی جیهاندا لەبەرچاو نەما).

هەروەها لۆبۆن دەڵێت: (نەرمونیانی موسڵمانان و عەرەب هێندە بوو هێشتا ئەوروپا بەوە نەگەیشتووە هەرچەندە نزیکەی دوو هـەزار سـاڵە جـەنگی سـەختی بـەخۆوە دیـوەو کینـەی ڕیشەیی و قەسابخانەی توندی بەخۆوە دیوە).

میسر بەناچاری ئایینی مەسیحی وەرگرت، بەڵام بەو هۆیەوە بـەرەو داکـەوتنێ چـوو کـە تەنها فتوحاتی ئیسلامی توانی ڕێکی بکاتەوە، میسر هێشتا پڕە لە داروپـەردووی ڕووخـاوی سەردەمی تیۆدۆر لـە سـاڵی ٣٨٩ز.دا. ئـەو قەیـسەرە مەسـیحیە وێرانکـەرە دەمـارگیرەی میسری کاول کرد، موسڵمانەکان ڕێـزی خـەڵکی وڵاتـە فـەتحکراوەکانیان دەگـرت و ئـازادی ئایینییان دەپاراستن، عەمری کوڕی عاص لەگەڵ میسریەکاندا دادپەروەری و ویـژدانێکی وای نواند کە میسریەکان شتی وایان نەدیبوو، ڕێزی نەریت و سیستم و بیروبـاوەڕی میـسریەکانی دەگرت و ئایینی مەسیحیش کەوتە بەر سۆزو پاسەوانی ئەو دەسەڵاتە ئیسلامیە، عەمر ڕێی دا قیبتیەکان خۆیان بەتریکی خۆیان هەڵبژێرن، ڕێگر نەبوو لەوەی مەسـیحیەکان لـەو شـارە ئیسلامیەدا کە موسڵمانان دروستیان کردبوو کڵێسا دروست بکەن، ڕێنماییـە ئیـسلامیەکان بەهێزو شمشێر نەدەسەپێنران بەسەر شوێنکەوتوانی ئایینەکانی تردا بەپێی ئایـەتی ﴿لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ﴾، بۆیە تێکەڵبوونی عەرەب و گەلانی تر زۆر بەهێز بوو و خۆشەویستی ئەوانیش بۆ عەرەب زۆر دڵسۆزانە بوو بەڵکو گەیشتە ئاستی پیرۆزی.

هەموو شانازییەکان بۆ ئیسلام دەبن کە یەکەم ئایینە پەیامی پوخت و تەواوی یەکخواپەرستی هەیەو یەکەم ئایینە شوێنکەوتەکانی ئەو یەکخواپەرستیەیان بە جیهاندا بڵاوکردوەتەوەو هەندێ گەلی نەسرانی بوون بە مەسیحی و زمانی عەرەبییان کرد بە زمانی خۆیان بەهۆی ئەو نموونە دادپەروەرییانەی موسڵمانە عەرەبەکانەوە کە پێشتر نموونەی وایان نەدیبوو، هەروەها بەهۆی ئەو ئاسانکاریەی ئیسلامی لەسەر بوو و لە ئایینەکانی تردا نەبینرا بوو.

لە ڕاستیدا ئیسلام ئاشتی کردە بنەڕەت و جەنگی کرد بە پێویستی، لەبەر نکوولی بیروباوەڕیان سەپاندنی بیروباوەڕ لەگەڵ بێباوەڕاندا نەدەگونجا بەڵکو کاتێ لەگەڵیان دەجەنگا کە لە ڕێی بانگەوازەکەیدا بوەستنایەو دژی بیرەکەی بوەستنایەو ئازاری موسڵمانانیان بدایە لەو ڕێیەشدا ڕێگر نەبوو لەوەی ئەگەر دژ بە ئیسلام و موسڵمانان نەجەنگن پەیوەندی لەگەڵ موسڵماناندا ببەستن، بۆیە ئیسلام کوشتنی ژن و منداڵ و پیرو بێتواناو ڕوهبانی حەرام کردووە مەگەر ئەوەی بەشداری جەنگ بکەن و زیان بە موسڵمانان بگەیەنن.

ئیسلام بانگەوازەکەی خۆی ئاراستەی هەموو گەلان کرد بێ ئەوەی ڕەگەزو بنەڕەتەکان جیابکاتەوە، ئارنۆڵد توینبی دەڵێت:

(ئیسلام کەناراوی دەریای سپی ناوەڕاستی لەدەست دەسەڵاتی ئیغریقی ڕۆمانی مەسیحی ڕزگار کرد هەر لە سوریاوە تا ئیسپانیاو بە درێژایی باکوری ئەفریقا هەمووی ڕزگار کرد، نزیکەی هەزار ساڵ هەر لە فەتحی ئەسکەندەری گەورەوە کە ئیمپراتۆریەتی فارسی داگیر کردو ڕۆمانیەکان قرتاجەیان گرت ئەو ناوچانە لەو ماوەدا لەژێر دەسەڵاتی ئیغریقی ڕۆمانیدا بوون، ئەمەش لەنێوان سەدەی یانزەو شانزەی پێش زاییندا بوو).

سەرچاوەی سەرکەوتنی یەکەم لاوازی دەوڵەتان یان هەنگاونان بۆ سامان نەبوو، بەڵکو سەرچاوەی سەرکەوتنی یەکەم قووڵی چەمك و واتای ئیسلام و سەلامەتی و نزیکی بوو لە فیترەتی مرۆیی و گونجانی لەگەڵ واقیعدا لەپێناو بنیادنانی ژیارێکی نوێ لە چوارچێوەی یەکخواپەرستیدا، هێزی پاڵنەر بریتی بوو لە ئیمانی قووڵی ئەو کۆمەڵەی کە بە شەهید

بوونی ڕێی خوا بەرزکردنەوەی ئالأی ئیسلامیان گەیاند بە هەموو خاکێ، سەبارەت بە دەسەلأت و سامان و دەستکەوت ئەوا لە پلەی یەکەمدا نەهاتووە، پێناوە جەنگیەکانی موسڵمانان لە پێوەرەکانی جەنگ و ئامادەسازی سوپادا سەرچاوەی سەرکەوتنی ئیسلام نەبوون، بەڵکو لە هەموو جەنگەکانیاندا ژمارەیان چەند بەرامبەری دوژمنیان کەمتر بوو، چەند جیاوازییەکی گەورەش لە ژمارەو ئامادەسازیدا لەنێوان سوپای ئیسلام و دوژمندا هەبوون، بەڵکو تاکە سەرچاوەی حەقیقی سەرکەوتن سوور بوون لەسەر مەرگ بوو، موعجیزەی فتوحاتی ئیسلامی لە سایەی پێوەرە ماددیەکانی ڕۆژئاوادا ڕاڤە ناکرێ، یەکێ لە مێژوونووسە بیانیەکان دەڵێت: مێژوو هەرگیز سپاردەیەکی وەك ئەو دیاردەی لەپێشتردا بەخۆوە نەدیبوو، سەختە پێشبینی ئەو خێراییە بکەیت کە ئیسلام فتوحاتی پێ ئەنجام داو بوو بە ئایینێ کە لە دەستەیەکی ناو کۆمەڵگەی دەوری پێغەمبەرەوە بوو بە ئایینی ملیۆنەها کەس، هێشتا عەقڵی مرۆیی دەستەوسانە و نازانێ چۆن ئەو هێزە نهێنیانە ئاشکرا بکات کە دەستەیەکی جەنگاوەری پێ پەتی توانییان بەسەر گەلانێکی وادا سەرکەون کە لە ڕووی سامان و ژیارو ئەزموون و توانای بەرپاکردنی جەنگەوە لەوان بەهێزترو لەپێشتر بوون( ئەوەی زیاتر سەرسامی دێنێ ئەوەیە ئەو کەسانە چۆن توانییان ئەو هەموو ناوچانە بگرن و دوای ئەوەش بەجۆرێ فتواحاتەکەیان بچەسپێنن و ڕابگرن کە سەدە دوای سەدە نەدەتوانرا دەرکرێن، چۆن توانییان ئەو خەڵکە هان بدەن تا ئەو گوڕو تینە بالأیەیان هەبێ و زیندوێتیەکی بالأی وا بهێڵنەوە کە ئایینەکانی تر بەخۆیانەوە نەدیوە بەجۆرێ دوای دوو سەدە لە مردنی موحەممەد هەر زیندوویی پەیامەکەی ماوەتەوە، شانزە ساڵ دوای کۆچکردن ئیمپراتۆریەتی فارسی بە یەکجارەکی دارما، لە کاتێکدا ئەو ئیمپراتۆریەتە بەرامبەر بە ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی دەجەنگاو هەر جارەو یەکێکیان سەردەکەوت، ئیسلام دوو ژیاری نەهێشت و دوو ئایینی لەرزاندو شنەیەکی نوێی ژیانێکی بالأی سەروو ڕیشەی ئەو گەلە فرە هێزانەی هێناو لەبەرچاوی خەڵکی جیهاندا ئایینی نوێ و ساکارو ئاسان بە نەرمی هەموو

عەقڵ و دڵەکانی دەدواند، ئەو زێڕەی لەژێر خاکدا شاراوە بوو کەوتە دەست هەژاران و نیزامێکی ئاڵوگۆڕی ئاشتیانە جارێکی تر دەستی پێکرد.

لێرەدا هەوڵێك هەیە بۆ ڕاڤەی فتوحاتی ئیسلامی بەم پێیە دەڵێت دوو ئیمپراتۆریەتی فارس و ڕۆمانی لە بارێکی لاوازی و داڕووخاندا بوون، لە ڕاستیدا ئەم گومانە نیازی کەمکردنەوەی گرنگی فتوحاتە.

دکتۆر شوکری فەیسەڵ دەڵێت: ئەوەی دەڵێ ئیمپراتۆریەتی ساسانی لە پەککەوتەییدا بووە زۆر لە هەڵەوە نزیکەو دوورە لە ڕاستی چونکە ئیمپراتۆریەتی ساسانی لاواز و بێتوانا نەبووە بە بەڵگەی ئەو بەرگریکاریە بەهێزەی توانی بەرامبەر سوپای ئیسلامی بینوێنێ و لاوازو پەککەوتە نەبووە چونکە ئەنوشیروان پێش دەیەیەکی کەمدا گەنجێتی خۆی نوێکردەوەو سووربوونی خۆی نیشانداو ڕۆحی ژیان و گەنجێتی بە بەردا کرد، گونجانێکی سەرسوڕهێنەر هەیە لەنێوان لەدایك بوونی پێغەمبەر ﷺو حوکمی ئەنوشیرواندا وەك ئەوەی بڵێی پەیامی پێغەمبەر ﷺلەسەر زەویدا بە ئاسنی ڕێ نابڕێ و بەرگریکاریش لەچاوکردنەوەی پێغەمبەرەوە ﷺ لە ڕوویدا وەستاوە، بەڵام هەڵوێستی دەستەیەکی کەمی ئەو فارسانەی بەدەم بانگەوازەکەوە چوون ئەوە بوو موسڵمان بوون و بەشداربوون لە بزاڤی فتوحاتی قادسیەداو لە ڕزگارکردنی سوپای ئیسلامی لەدەست فیلەکان ڕۆڵیان بینی چونکە سەعد پرسیاری کرد لەسەر فیلەکەو ئەوانیش پێیان وت شفرەکەو لوت و چاوی کامەیەو ئەەر ئەو شفرەو چاوی نەمێنێ ئیتر سوودی نابێ.

فارسەکان سەرسەختانە بەرگرییان کرد، ئەو سەرکەوتنەی موسڵمانان بەدییان هێنا پەیوەستی باری ژیانی ناوخۆی فارس و نیازی ئیمپراتۆریەت نەبوو، بەڵکو زادەی باری ژیانی ناوخۆیی موسڵمانان بوو کە هێزی پاڵنەرو ئیمانیان بەهێز بوو و سووربوون لەسەر بەشداری کردنی خەڵك لە بەخشینی ئەو ئیمانە نوێیەو بڵاوکردنەوەی لەسەر زەویدا تا بیسەلمێنن بەندەی چاکی خوان.

مەسەلەکە سەبارەت بە ڕۆم هەروا هەستیار بوو و سەرکەوتنەکە ئاسان نەبوو، ڕۆمەکان بە ئاسانی وازیان لە شام نەهێنا، بەڵکو بەوپەڕی توانای سوپاییانەوە خۆیان ئامادەکردو چی توانایان هەبوو جەنگان و چییان پێ کرا کردیان و خەڵکی عەرەب و ئەرمینیاو بیزەنتی و دانیشتوانی ناوچەکانیان کردن بە سەرباز دژ بە موسڵمانان و توانییان سەد هەزار یان بەلایەنی کەمەوە پەنجا هەزار سەرباز بۆ جەنگی یەرمووك کۆبکەنەوە، هاوکات موسڵمانەکان هیچکات شێوەی بەهێزی جەنگییان نەدەزانی جگە لە باوەڕو دلێرییان و حەرامی پشت هەڵکردن جگە لە هەنگاونان بۆ جەنگ، ئیتر لەگەڵ ئەو ڕۆمانەدا جەنگان کە بەباشی و بە ئەزموون و لێزانی و پەیڕەوی چەندین سەدەوە شارەزای ئەو خاکە بوون، بەڕاستی ڕۆمەکان ئەو بارە قووڵە دەروونیەی ئایینی نوێی عەرەبیان پشتگوێ خست و هۆشیاریەکی ڕوونیان نەبوو سەبارەت بە حەقیقەتی بەهێزی ئەو ئایینەی کە عەرەب باوەڕیان پێهێنابوو و ئەو ئایینەش ژیانێکی ناوخۆیی وای پێدابوون کە هەموو باری ژیانی ئەوانی گۆڕاو ئەوانیش کەوتنە بانگەواز کردنی خەڵکی تر بۆ ئەو نیزام و ئایینەو لەو پێناوەشدا کە خێری دنیاو ئاخیرەتی تیایە بۆیان تاویان دایە دەرەوە، بۆیە نەزانی ڕۆمەکان لەئاست ڕەچاوکردنی هێزی موسڵماناندا کوێری کردبوون و نەیاندەتوانی ئەو بیروباوەڕە بەهێزە لەبەرچاو بگرن، ئیتر نەیانتوانی زیاد لە کۆچی جاران کۆچێکی تر (سوپایەکی زیاتر) بهێنن و ئەو هاتنەی موسڵمانانیان بە شالاو دەزانی، بەڵام خێرا دەرکەوتن، بۆیە بەردەوام نەوینە جەنگ و درێژەیان پێدا بەهیوای بێزارکردن و بێتوانا کردنی عەرەبەکان، بەڵام ئەمجارەیان عەرەبەکان نەدەکشانەوە چونکە ئەمجار موسڵمان و بانگخوازانی کۆچخوازبوون، نەك ئەو هۆزانە بن کە بیریان لای بەرژەوەندی بێ و بە دەستکەوتێ هەڵگەڕێنەوە، ئەمجار لە نیمچە دوورگەوە هاتبوون و چاویان لە دوو چاکەکە بوو، بۆیە دوژمنیشیان دەبوو یەکێ لەم سێ پێشنیارە هەڵبژێرن (موسڵمان بوون، یان ئازادی، یان سەرانە) ئیتر ڕۆمەکان بێئاگا بوون لەوەی پێغەمبەرێ بیست و سێ ساڵ سەرقاڵی پەروەردەی ئەو کەسانە بووە بۆ ئەو بانگەوازە، ئەم ئامادەسازیە بوو ڕۆمی شکاندو سوپای موسڵمانانی پێشڕەوی پێکرد، هەوڵێکی تر هەیە بۆ

ڕاڤەی فتوحاتی ئیسلامی کە هەندێ ڕۆژهەلاّتناس دەیلّێن و هەندێ ئەدیبیش هاوڕایان دەبن، ئەویش ئەوەیە دەلّێن عەرەبەکان لە پلەیەکی بەرزی پێشکەوتندا بوون کە دەرفەتی ڕاپەڕینێکی ئەدەبی بۆ دابین کردبوون، کاتێ پێغەمبەر ﷺ هات ڕاپەڕاندن و ئەوانیش ڕاپەڕین.

بەڕاستی ئەمە فێلّ و پیلانێکی سەر شێوێن و گومانێکی درۆیە و زانا موحەممەد فەرید وەجدی بەم وتەیە تێکی دەشکێنێ: هەندێ ڕۆژهەلاّتناس کاتێ سەرکەوتنی پێغەمبەر لەو ئەرکەدا کە خوا پێی ڕاسپاردو لەسەرسەختترین کەشدا باسی دەکەن بانگەشەی ئەوە دەکەن قوڕەیش لەپێش پەیامی پێغەمبەر ﷺ لە قۆناغی ڕاپەڕینێکی کۆمەلاّیەتی و ئەدەبیدا بوون‌و بانگەوازەکەی ئەویش هاوکاتی ئەو قۆناغە بووە بۆیە سەرکەوتنێکی بێوێنەی بەدەست هێناوە، بەلّگەیەکی بەرچاو ناڕاستی ئەم قسەیە دەخاتە ڕوو کە ئەویش کۆچکردنە، چونکە گەلێ کە چاکسازە کۆمەلاّیەتیەکان سیانزە سالّ لەنێویاندا بانگیان بکات بۆ ڕاوەستان لەسەر سوننەتە حەقەکان کەچی وەرینەگرن و بایەخی پێ نەدەن، گەلێکی وا چەقبەستوو لەسەر باوی کۆن و پووچی تەواو هەر شیاوی ئەوەن قۆناغی ئەدەبی یان کۆمەلاّیەتییان بۆ نەبێ، کۆمەلّگەیەك بەو ڕەقیە توندە بەرامبەر بانگخواز بوەستێ و دوای بیست سالّ بەریەککەوتن دواجار بەناچاری ملکەچی ئەو پێغەمبەرە بێ چۆن دەکرێ بلّێین ئامادەی بنیادنانی دەولّەت بووە، ئەگەر وازیان لێ بهێنرایە هەروەك خۆیان دەمانەوە، ئەگەر قوڕەیش لەناو عەرەبدا لە هەمووان نزیکتر بووبێ لە شارستانیەت بەو جۆرە ڕەقە بەرامبەر بانگەوازەکەی موحەممەد بوەستێ دەبوو قوڕەیش بە سنگ فراوانی بانگەوازەکەی قبولّ بکردایەو نرخی پێبدایە و بۆ یەکخستنی هۆزەکان و پوچەلّکردنەوەی ئایینیان لەژێر سەرکردایەتی موحەممەددا ڕاپەڕینایە ئەوکات دەکرا بوترێ موحەممەد تەنها کارێکی بیناسازی کردووە، بەردی ئامادەو کەرەستەی ئامادەی بەردەست بووەو کۆشکێکی گەورەی پێ دروست کردووە، بەلاّم ویستی خوا وابوو بنکەی بانگەوازی موحەممەد یەسریب بێ کە تیایدا ئەوس و خەزرەج هەبوون کە هەردووکیان کۆچەری یەمەن بوون و هیچ تایبەتمەندیەکی زالّیان بەسەر عەرەبدا نەبوو و شێوەزاریان ڕێك و

بەهێز نەبوو و بەرەشیان بەهێزو پتەو نەبوو، بەڵکو باریان لەوپەڕی دژایەتی و خراپەدا بـوو و ڕکەبەری مانەوەیان هـەبوو، خـوا ویـستی ئـەو دوو هـۆزە بکاتـە پـشتیوانی ئایینەکـەی و شارەکەیان بکاتە پایتەختی دەوڵەتی ئیـسلام دوای ئـەوەی زمانپـاراوترینی عـەرەب پـشتی پێغەمبەریان بەرداو لە دژی وەستان لە کاتێکدا دەبوو لە هەمووان لەپێشتر بـن بـۆ ڕاپـەڕین هەموو کەسێکی بینا دەتوانێ گەورەیی ڕۆحی باڵای لەبەرچاو بگرێ کاتێ بوو بە سـەرکردەی هۆزانێ کە کەس هیوای هیچی پێیان نەبوو کەچی بنەڕەتێکی وای لێ دروست کـردن کـە بـۆ ئەوە دەبوو کەرەسـتەی گەشـەو کـامڵی لەسـەر بنیـاد دابنـرێ و زینـدووی بکاتـەوە و لـەو چەقبەستوویە کۆنەی دەریبکات و کۆمەڵگەیەکی پڕ لە هێزو ژیانی وای لێدروست بکات کە بۆ ئەوە ببێ بە تەنها ڕاپەڕێ و گەورەترین ڕووداو لە جیهاندا بنێتەوە.

گەورەترین بەڵگە لەسەر گەورەیی موعجیزەکەو ڕاستی بەرهەمبوونی بیروباوەڕی دروسـت ئەوەیە قورەیش کە لەناو عەرەبـدا پێـشکەوتوترین هۆزبـوون لـەڕووی زمـان و تێگەیـشتن و پلەوپایەوە، کەچی بانگەوازەکەی پێغەمبەریان قبوڵ نەکرد، تەنها چەند ژن و پیاوێکیان نەبێ کە ژمارەیان نەدەگەیشتە سەد کەس، شوێنکەوتوانی یەکەمی پێغەمبەر ﷺ زۆر بە سـەختی دەچەوسێنرانەوە تا ئەوەی بەرەو وڵاتی حەبەشە کۆچیان کـرد، نـەزانان گاڵتـەیان دەکـرد بـە بانگەواز بۆ ئایین و بـانگخوازانی، پێغەمبـەر ﷺ لـەو بـاری چەوسـاندنەوەدا سـیانزە سـاڵ مایەوە، کاتێ قورەیش زانییـان پێغەمبـەر ﷺ نیـازی کۆچـی هەیـە بڕیاریانـدا بیکـوژن و قەرەوڵیان بۆ گرت، کاتێ خەڵکی مەککە زانییان دەرچووە کەوتنە شـوێنی، هـەموو ئەمانـە ڕاشکاوانە پێمان دەڵێن قورەیش کە نیازی هیوای ئەو سەردەمەی عەرەبیان لێ بـەدی دەکـرا دوای چەندین گۆڕانکاری هێشتا ئامادەی دەسـەڵاتدارانی نـەبوون، چـونکە ئـەو کۆمەڵگـەی بەرامبەر بانگخوازی نوێگەری و ڕاپەڕین بەو سەختیە ڕابوەستێ و بیـست و سـێ سـاڵ تـەنها ڕق و ملەجێڕییان زیاد بکـات، ئـەوە ئـەو کۆمەڵگەیـە دواکـەوتووە، دەی ئـیتر نهێنـی ئـەو موعجیزەیە چیە؟ بە دڵنیاییەوە ڕاڤەی ماددی بۆ مێژوو شـیاوی ئـەوە نیـە ڕاڤـەی ئیـسلام بکات و شتی وای پێ ناکرێ.

مێژوونووس و لێکۆڵەران لەسەر ئەوە یەکدەنگن مرۆڤایەتی لەسەردەمی ئەسکەندەرەوە تا سەردەمی ناپلیۆن فتوحاتێکی فراوانترو خێراتر لە فتوحاتی ئیسلامی بەخۆوە نەدیوە بەجۆرێ لە ماوەی کەمتر لە هەشتا ساڵدا لە چینەوە تا فەرەنسا سنوری بوو، تایبەتمەندیەکی تر سەرەڕای فراوانی و خێراییەکەی ئەوەیە فتوحاتەکەی هەمیشەیی بوو، نەبینراوە موسڵمانان چوونە وڵاتێك و چۆڵیان کردبێ جگە لە ئەندەلوس، هاوکات سەرەڕای مەسیحی بوون و ئیسپانی بوونی ئەندەلوس کەچی گیانی موسڵمانێتی لە ئەندەلوسدا مایەوە، چونکە موسڵمانان بە شمشێرەکانیان وڵاتیان فەتح نەدەکرد بەڵکو بە دادپەروەری و زانستیان دڵ و عەقڵەکانیان فەتح دەکردن، بنەمای گشتی هەموو فتوحاتێك ئەوەیە وڵاتانی فەتحکراو بدرێنە پاڵ خاکی داگیرکەران کەچی تەنها فتوحاتی ئیسلامی لەمە بەدەربوو کە نیازی بەتەنها بڵاوکردنەوەی ئیسلام و هەوڵی بەرزڕاگرتنی هەموو پەیامی خوا بوو و زۆریشیان لەکەس نەکردووە تا موسڵمان بێ.

گەورەترین شتی فتوحاتی ئیسلامی پێدانی ژیارو بنیاد بوو بە مرۆڤایەتی و خزمەتکردنی عەقڵی مرۆیی و پێدانی پێناوی هێزو ژیان، سەرەڕای زانستی پاڵەوانێتیەکی کەم وێنە لە ڕووداوی مێژووییدا.

فتوحاتی ئیسلامی لەبواری زانست و ڕۆشنبیری دا گەورەترین ڕووداوی زانستی بوو چونکە زانستی ئاسمان و زەویشی برد بۆ وڵاتانی فەتحکراو و بە یەکخواپەرستی عەقڵی ئازاد کردن و لە بەندایەتی دارو بەردوو جادوو و قەشەو خانەدانەوە ڕزگاری کردن و قورئانی دایە دەستیان قورئانیش فەرمان دەکات تا بیربکەنەوە لە دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی و بکەونە لێکۆڵینەوە و بەڵگەخوازی و ڕوانین و زانستخوازی کردووە بە فەرزی سەرشانی هەموو موسڵمانێ ئەگەر فتوحاتی ئیسلامی نەبووایە عەقڵی سەدەی بیستەم بوونی نەدەبوو. چونکە فتوحات گەورەترین ڕووداوی پاڵەوانێتی و بیرو هزرو بنیاد بوو. ئەم فتوحاتەش کەسی ناچار نەکردووە یان بیروباوەڕی بەسەردا نەسەپاندووە یان بەقەناعەت تێیگەیاندووە ﴿ادْعُ إِلى سَبِيلِ

رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾ ئەمەش لە سنوری بەرفراوانی ﴿لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ﴾دا.

ئەمە لەکوێ بەرامبەر بەو ئسلوبەی ئارنۆلدتوینبی سەبارەت بە موژدەبەری و بانگەوازی رۆژئاواییەکان لە دێرەکاندا باسی دەکات و دەڵێت (لە هەندێ مێژووی دەستە مەسیحیەکاندا بە سروشتی حاڵ هەرکەسێ دڵگران دەبێ بەرامبەر بەو کارەی قەشە لیودجر و قەشە ویلهاد کە زیاد لە تەعمیدی مەسیحی بتپەرستی پێوە دیارە ئەو کات شارلەمان بە زۆری شمشێر تەعمید کردنی مەسیحی سەپاندووە، دواتر بە فەرمانی ئەو گەلانی ژێردەستەی ملکەچی یاسای مەسیحی کردووە دوای ئەوە لە جەنگێکی سەختدا لەگەڵ دەسەڵاتە بەربەریەکاندا پێکیدادا و تاسەی بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕ بەرەو ئەوەی بردووە، سەرەڕای سەرکەوتنی بە مەسیحی کردنی برۆسیە بتپەرستیەکان لەلایەن قەشە جونفریدو ئوسقوف کرستیانەوە سەرکەوتنەکەیان زۆر کەمتر بوو لەوانەی پێش ئەوان هاتبوون و هەوڵی بڵاوکردنەوەی بانگەوازەکەیان لەدەستەی برایانی شمشێرو خاچپەرستانی تر لەبەرچاوتر بوو، ئەوانەی بە شمشێرو ئاگر پەیامی خۆیان گەیاند، سوارچاکانی مەسیحیەت بەزۆرەملێ مەسیحیەتیان سەپاند بەسەر گەلی لیفۆنیادا).

ئارنۆلد ئاماژە دەدات بە پاشا ئولاف تراتجنسۆن کە ئەو کەسانەی سەردەبڕی کە ئامادە نەبوون ببن بە مەسیحی یان دەست و قاچی دەبڕین.[١]

زۆرێ لە لێکۆڵەران ئاماژە بەوە دەدەن مەسیحیەت لە هەموو ئایینەکانی تر زیاتر زۆری لە خەڵك کردووە تا ببن بە مەسیحی و بەناوی سەید مەسیحەوە ئەو شەرمەزاریانەیان ئەنجام داوە دژ بەو وتەی لە وتاری شاخدا وتویەتی (دوژمنانی خۆتان خۆش بوێن و پیرۆزیایی لە نەفرین لێکەرانتان بکەن).[٢]

---

١- توماس ارنولد: الدعوة الأسلام ص٣٠-٣٢.

٢- توفيق الطويل: قصة الأضطهاد الديني.

بەڵام ئیسلام لە کاتەدا کە بە چاکی بانگەوازی دەکرد بۆ بیروباوەڕی خۆی هاوکات ئایینەکانی تری پاراستووە و ڕێزی پێغەمبەرەکانی گرتووە، تۆماس ئارنۆلد دەڵێت: (کلێسای مەسیحی لە سایەی چاودێری و دەسەڵاتی موسڵماناندا بەهێز بوو و پێشکەوت، هەموو مەزهەبە مەسیحیەکان لەسایەی دەسەڵاتی ئیسلامیدا وەك یەك چاودێری و لێبووردەییان بۆ هەبوو، بەڵکو ئەو فەرمانڕەوا موسڵمانانە ڕێیان نەدەدا مەسیحیەکان لەناوخۆدا یەکتر بچەوسێننەوەو ئازادی ئایینییان بۆ هەمووان دابین دەکرد) ئەی هەڵوێستی ئەوروپای مەسیحی بەرامبەر بە موسڵمانانی ئەندەلوس و بەلقان و ناوچەکانی تر چۆن بوو؟

ئەب متشون بەراوردکاری وای تۆمار کردووە و دەڵێت: بەداخەوە دەبێ گەلانی مەسیحی ناچار بن لە ئیسلامەوە لێبووردەیی ئایینی فێربن.

رینان لە کتێبەکەیدا (ژیانی یەسوع) دەڵێت: مەسیحیەت لێبووردەیی ئایینی نەزانیوە و نەبووە.

بیبرۆ ڕۆندۆ لەسەر ئەو جیاوازیە قووڵەی نێوان هەڵوێستی ڕۆژئاوا بەرامبەر بە ئیسلام و هەڵوێستی ئیسلام بەرامبەر بە ڕۆژئاوا قسە دەکات: (ئیسلام توانای هەیە لە ڕۆژهەڵاتدا کێشەکان چارەسەر بکات و بەیەکجار کێشەی مەسیحیەت نەهێڵێ بەڵام واینەکرد چونکە بانگەوازەکەی لە بنەڕەتدا لەسەر فتوحات نیەو زۆرکردنی لە ئاییندا نییە بۆیە دژی مەسیحی‌و جوولەکە نەجوڵاوەتەوەو هەڵبژاردنی مەرگ یان بڕواهێنان بە ئایینی نوێ بۆ دانەناون بەڵکو وازی هێناوە بێ ئەوەی ملکەچی شەریعەتی ئیسلام بن پەیڕەوی بۆنە و ئایینی خۆیان بکەن).

# باسی دووەم

## ( سەردەمی پرشنگداری سەدەکانی ناوەڕاست )

کاریگەری ئیسلام لە هەموو مێژووی مرۆڤایەتی و مێژووی ئەورووپاو جیهانی ڕۆژئاوایی و مەسیحیەتدا شتێکی ڕوون و حاشا هەڵنەگرە، چونکە بە ڕاستی بەخششەکانی ئیسلام سەرچاوەی ئەو گۆڕانە بەرچاو و گەورە بوون کە جیهان دوای ئیسلام بەخۆیەوە دی، نەك تەنها لەو بەشانەدا کە ئیسلام تیایاندا دەسەڵاتدار بوو، بەڵکو لە هەموو شوێنێکدا تیشکی بیرو ڕۆشنبیری ئیسلامی پێگەیشت و ئەورووپیەکان ماوەیەکی زۆر نکوڵیان لەو کەریگەرییە دەکردو خۆیان لێ بێئاگا دەکرد تا لە سالآنی سەدەی کۆتاییدا چەند پێنوسێکی بەویژدان کەوتنە کارو زۆرێ لەو ڕاستیانەیان ئاشکرا کردن، لەوانە پێنووسەکەی گۆستاف لۆبۆن و تۆماس کارلیل و چەندین کەسی تر.

مامۆستا هینری بیرۆن نووسەری کتێبی (محمد و شارلمان) پێی وایە خاڵی گرنگی وەرچەرخانی ناو ڕێڕەوی مێژووی ئەوروپا بریتیە لە ئیسلام و لەوەوە سەردەمی ناوەڕاست و ڕێنیسانسی نوێ دەرکەوتن کە هەردووکیان بەرهەمی دەرکەوتنی ئیسلام بوون، بەمەش بەرپەرچی ئەو ساختەییە دەداتەوە کە ماوەیەکی زۆر زاڵ بوو بەسەر مێژووی ڕۆژئاواییدا و دەیوت ڕووداوی کشانی گەلانی جەرمانی بۆ دەوڵەتی ڕۆمای ڕۆژئاوایی جیاکەرەوەی نێوان سەردەمی کۆن و سەدەکانی ناوەڕاستە.

هەروەها دەڵێت دەمارگیری نەتەوەیی ناخیان لە نێوەندی ڕێنیسانسیاندا ڕێگربوو دان بەوەدا بنێن دەرکەوتنی ئیسلام ئەو ڕووداوە گەورە مرۆییە بوو کە ڕێکردەی مێژووی گۆڕی و بوویە سنوری جیاکەرەوەی نێوان سەدە یەکەمیەکان و سەدەکانی ناوەڕاست، (بیریە) و چەندین کەسی تریش هەمان ڕایان هەیە کە کشانی گەلانی جەرمانی بۆ سنوری ڕۆمان خاڵی وەرچەرخانی نێو مێژووی ئەوروپا نیەو ئەو گەلانە ئاست نزم و ژیان بەرتەنگ بوون و بە چاوی

کۆیلە بۆ گەورە سەیری ڕۆمانیەکانیان دەکرد، ئیتر چۆن نیازو خەیاڵی ئەوەیان هەبێ ڕۆما بگرن و دەسەڵاتی لەناوبەرن.

بەڵام موسڵمانەکان خۆیان بە پێشکەوتووتری هەموو بوارەکانی ژیان دەزانی لەبەرامبەر ڕۆمانەکاندا بەتایبەت لە ڕوانگەی ئاینیەوە کە سەرچاوەی هێزو تەشریعیان بوو، ئیتر بەرامبەر ڕۆمانەکان دەستەوسان نەوەستان تا دەسەڵاتیان لەناوبەرن، هۆزە جەرمانیەکان خۆیان بە خاوەنی پێناوەکانی ژیارو خاوەن بیروباوەڕی باڵای ئایینی دەزانی ئیتر ژیارو ئایینی ڕۆمانییان بە خۆچواندن و تەقلید دادەنا.

بەڵام گەلانی ئیسلامی خۆیان بە شیاو دەزانی تا ئایینێکی نوێ ببەخشن بە ڕۆمانەکان و بەرەو شارستانیەتێکی تر ڕێنموونیان بکەن، بۆیە دەوڵەتی ڕۆمانی دوای ئەوەی لەلایەن جەرمانەکانەوە سنوری بەزێنراو لە خاکیدا نیشتەجێ بوون وەك خۆی مایەوەو تەنها پایتەختی لە ڕۆماوە گوازرایەوە بۆ بیزەنتەو باری ماددی و عەقڵیش تووشی وەستان و گەندەڵی بوو، بەڵام کە شۆڕشی ئیسلام هەڵیکردو دەستەکانی خۆی نارد بۆ خاکی ڕۆمان چی شوێنەوارو باریان بوو لێکهەڵوەشاو نەماو دەوڵەتێکی نوێ و ژیارێکی نوێ هاتە کایە، ئەوروپا لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوە گەمارۆ دراو پاشاکانی ناچار بوون ڕوویکەنە بەشی باکووری ئەوروپاو جەنگ و ڕووداوی گەورەی وا ڕوویاندا کە مێژووی ئەوروپایان لە سەدەکانی ناوەڕاستدا داگیرکرد.

بەشی باشووری ئەوروپاش لەو سەردەمەدا تەنها جەنگی (بەواتیە) تیایدا ڕوویدا کە تیایدا (شارل مارتل) سەرکەوت بەسەر سوپای ئەندەلوسدا، ئەگەر دەرکەوتنی ئیسلام نەبوایە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی دەمایەوەو ئەو شۆڕشە نەتەوەییانە ڕوویان نەدەدا کە دەوڵەتانی نوێی ئەوروپایان دروست کرد، ئەو شۆڕشە هزریانە ڕوویان نەدەدا کە ژیاری پێشوو تیایاندا توایەوەو ژیاری نوێ دەرکەوت.[١]

---

١- الهلال م ١٩٤٠ والفتح.

کشانی ئیسلامی تا نزیك بەواتیە لە باشوری فەرەنسا چوو، ئەمەش لە ساڵی ١١٤ کۆچی بەرامبەر بە ٧٣٢ز.دا بوو، دواتر کشان بە شێوە سەربازیە جەنگیەکەی لە سنوری ئیسپانیادا وەستاو هەشت سەد ساڵ ئیسلام لە ئیسپانیادا سەقامگیر بوو، موسڵمانان لە حەوزی دەریای ناوەڕاستدا بڵاوبوونەوەو دەستیان گرت بەسەر زۆربەی دوورگەکانیداو چوونە باشووری ئیتاڵیا، کشانی سەربازی وەستاو کشانی هزری مایەوە کە لە ڕێی زانست و زانکۆی ئیسلامی ناو ئیسپانیا هەمووی چوویە ناو ئەوروپا، وەستان لە بەواتیە سەرکەوتن نەبوو بۆ ئەوروپا بەڵکو بە پێچەوانەوە بە شایەتی خودی بیریارانیان شکستێ بوو بۆ ئەوروپا.

(جیمس بریستد) دەڵێت: سەردەمی ئیسلامی ئیسپانیا گەورەترین هۆکاری مەدەنیەت بوو لە ئەوروپا، شکستی موسڵمانان لە ئیسپانیا واتای شکستی شارستانیەت بوو بەرامبەر بە شاخاوی و ناشارستانی.

(کلۆدفاریر) دەگاتە قوڵایی ڕاستیەکان کاتێ دەڵێ: ساڵی ٧٣٢ز. کارەساتێکی بۆ مرۆڤایەتی هێنا کە خراپترین کارەساتی سەدەکانی ناوەڕاست بوو، کارەساتێ بوو لەوانەیە شووم ترین کارەساتێ بێ کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا مرۆڤایەتی لەناویردبێ، ئەوە بوو جیهانی ڕۆژئاوایی بۆ ماوەی حەوت یان هەشت سەدە گرتەوە، ئەویش جەنگی بەواتیە بوو، بەربەریە جەنگاوەرە فرەنجەکان بە سەرکردایەتی شارل مارتل ئەنجامیان داو سەرکەوتنی هرکاسە دڕندەکان بوو بەسەر دەستەیەکی عەرەبدا، لە ڕۆژێکی شووماوی وادا ئەوروپا ماوەی هەشت سەد ساڵ شکا، دەکرا بگاتە فەرەنسا ئەگەر ئیسلامی چالاك و حوکم دروست و نەرمونیان -ئیسلام هەمووی ئەو سیفەتە چاکانەیە- دەیتوانی فەرەنسای نیشتیمانمان لە چەند کارەساتێ ڕزگار بکات کە ناوەکەی دانەڕمێ، شکستی عەرەب شارستانیەتی دواخست، ئەگەر موسڵمانان سەربکەوتنایە بە دڵنیاییەوە شارستانیەتی خۆیان دەهێنا بۆ ڕۆژئاواو سەردەمی نەزانی و تاریکی چەسپاوی ڕۆژئاواش درێژەی نەدەکێشا.

(هنری دی شامبون) دەڵێت: ئەگەر شارل مارتلی شاڵاوبەری خێڵەکی پێشکەوتنی موسڵمانانی لە فەرەنسا نەوەستاندایە فەرەنسا نەدەکەوتە تاریکی سەدەکانی ناوەڕاست و

تووشی کارەسات نەدەبوو، ئەگەر ئەو سەرکەوتنە بەربەریە بەسەر موسڵمانانا نەبوایە بە دڵنیاییەوە ئیسپانیا لە جەنگی دادگاکانی پشکنین ڕزگاری دەبوو و هەشت سەدە شارستانیەتی مرۆڤایەتی دوا نەدەکەوت.

بێگومان شایەتی ئەو سێ زاناو مێژوونووسە ڕۆژئاواییە بەسە تا کاریگەری ئیسلام لەسەر ئەوروپا و ئاستی پێشکەشکردنی بەهای نوێ بە مرۆڤایەتی لەلایەن ئیسلامەوە وێنا بکەین.

ئیسلام ویستی خەڵاتی ئیمان و زانست پێکەوە بە ئەوروپا ببەخشێ، بەڵام ئەوروپا خەڵاتی زانستەکانی قبوڵ کردو ئیمانەکەی بەرپەرچ دایەوە، ئەوەش سەرچاوەی نەگبەتی و سەختیەکانی بوو، بەپێی لەبەرچاو گرتن و مەزەندەی خودی زانایانی ئەوروپا ڕۆژئاوا لە ساڵی ٧٣٢ز. تا ساڵی ١٥٠٠ز. نزیکەی هەشت سەد ساڵ دواکەوت و ئەو سەردەمەش بە سەردەمی ڕێنیسانس ناونراو تیایدا ئەوروپا لەڕێی بیزەنتەوە دژایەتی و ڕکەبەری ئیسلامی دەکرد تا ئەوەی شاڵاوە خاچپەرستیەکان هاتن کە لە ١٠٩٩ز.دا و دوای سێ سەدەو نیو دەستیانپێکرد، ئەوروپا لەو ڕوانگەوە دژ بە ئیسلام وەستا، دواتر ویستی شاڵاوە بەردەوامەکانی خۆی لەڕێی شانشینی خاچی ناو شامەوە درێژە پێبدات کە دوو سەدەی تەواو بەردەوام بوو.

ئەوروپیەکان بە ماوەی نێوان ڕووخانی ڕۆما (٤٥٠)و سەردەمی ڕێنیسانس دەڵێن (سەدەکانی ناوەڕاست) بەڕاستی ئەو سەردەمە سەردەمی تاریکی ئەوروپا بوو، تاریکی ئەوروپا بە تەنها، لە کاتێکدا لە بەشەکانی جیهانی ئیسلامیدا تا خودی سنوری فەرەنسا سەردەمی پرشنگدار بوو، ئیسپانیا لەو ماوەیەدا بە تیشکی ئیسلام درەوشاوە بوو.

ئەوروپا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا هەزار ساڵی تەواو دواکەوت لە کاتێکدا سەدەی پێنج و سەدەی یانزەهەمی زانینی ماوەی گەشەسەندنی ژیارو شارستانیەتی ئیسلامیو فراوانبوونی ئاسۆکانی و پێشڕەوی تیشکی بوو بەرەو زۆرترین و گەورەترین ناوچەی هەموو جیهان هەر لە سنوری چینەوە تا سنوری فەرەنسا.

ئەوروپا دوای ئەوەی مەسیحیەتی وەرگرت بۆ دوو سەدە دارِماو دواتر بەهۆی پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە بیری ئیسلامیەوە لە جەنگە خاچیەکاندا کە سێ سەدەی خایاند چوویە قۆناغی ڕێنیسانسەوە، سەدەکانی ناوەڕاستی ئەوروپا دوو بواری گرتەوە: دەستڕۆیی کلێساو پیاوانی ئایینی، دەستڕۆییەکە ماوەی تایبەتی بۆ ژیان و هەستە سۆزداریەکانی تاکی تێپەڕاند بۆ بواری گشتی ژیان بەدیاردە گەورەکانی لایەنی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیەوە بەجۆرێ پیاوی ئایینی بوو بەو چوارچێوەی کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لەناوخۆوە دەجووڵا.

دووەمیان چەوساندنەوەی سیاسی و دیکتاتۆریەتی فەرمانڕەوایە کە هیچ نرخێکی دانەدەنا بۆ ویستی جەماوەر لە مەسەلەکانی پەیوەست بە ڕووداوە گەورەکاندا بەتایبەت ڕووداوە ناوخۆییەکان چونکە بەپێی مافی شەرعی پاشاو سەرکردەو دەرەبەگەکان کەس بۆی نیە ململانێیان لەگەڵدا بکات.

(ڕۆب)ی مێژوونووس لە کتێبەکەیدا (مێژووی ژیاری فەرەنسی) دەڵێت: لەو کاتەدا مەسیحیەت بۆ هەموان ئایینێکی ساردو سڕبوو و هیچ خۆشەویستیەکی برایەتی نەبوو، بەڵکو تەنها هەڵەو ترسی سزای هەبوو، لای زۆرینە کۆمەڵێ بۆنەو نەریتی پەرستش هەبوون کە لە دەوری بیروباوەڕی سەرەتایی و خزمەتی پێشخستنی ڕۆحی پاکدا دەسوڕانەوە تا لەدەست هێزە شەیتانیەکان بیپارێزێ، ئەمەش پەیوەندی هەیە بە ئاستی بڵاوبوونەوەی جادووو هێزە لەسنوور دەرچووەکان، ئەو هێزانەی لە شوێنەواری قەشەو پاشماوەکانیانەوە دەردەچوون و پلەو ئاستی وێنەو هێزە شاراوەکانی ناو بیروباوەڕی خەڵکیان دەگرتەوە.

لە ساڵی هەزاردا ئەگەری پیری دنیاو پێشبینی کۆتایی پێهاتنی دەبینراو ئیمان بەهێزی جادوو و تەنگپێدانی هەموو شتێ بە برێ بۆ ئەو مەراسیمی پیرۆزو پەرستشی مردوو و جەختکردنەوە لە ڕەشبینی و توندی و دڕندەیی ژیان دادەنرا، وێنەکە لەو ماوەدا لە ئەوروپادا تاریك و بکوژ بوو، بەڵام ئیسلام دەستی بۆ ئەوروپا ڕاکێشا کەچی ئەوروپا ئامادەیی نەبوو و دەمارگیریەکەی خۆی بە ڕووداوی (جەنگی) بەواتیە لە ساڵی ١١٤ك و ٧٣٢ز. بە هێمایەکی

وەستان بەرامبەر بە ئیسلام نیشاندا تا دزە نەکاتە ناو ئەوروپا، بەپێی دەربڕینی لێکۆڵەرو مێژوونووسان ئەوروپا توانی دوو سەدە دەرگا بەڕووی ئیسلامدا داخات.

وێنەکە تەواو جیاوازو جۆرێکی تر بوو تەنانەت لەناو خودی ئەوروپادا، چونکە ئەو ناوچانەی کە ئیسلامیان پێگەیشت بوو لە ئەوروپادا وەك ئەندەلوس (ئیسپانیا) و دورگەی صقلیە پرشنگداربوون کەچی هەموو ئەوروپا بە تاریکی مایەوە.

(لۆنجی رینالد) دەڵێت: لەکاتێکدا لە ئەندەلوسدا هەموو تاکێ خوێندەواری و توانای خوێندنەوەو نووسینی هەبوو لە ئەوروپادا هەموو مەسیحیەکان تەنانەت خانەدانەکانیان بیریان لە خوێندەواری نەدەکردەوە، ئاماژەش دەکات بە بڕێ کتێبخانەی ئەندەلوس کە حەفتا کتێبخانەی تێدابووە، تەنها لە کتێبخانەی قورتوبەدا زیاد لە شەش سەد هەزار بەرگ کتێب هەبووە لەکاتێدا لە ئەوروپادا بەدەر لە کتێبخانە پیرۆزەکانی ناو کڵێساکان یەك کتێبی تر نەدەبینرا.

(رینالدی) دەڵێت: لە ڕۆژانی ڕووخاندا زانست لە سایەی دێرەکانی ڕێنمونیدا ڕزگاری بوو، قەشە هەژارەکان لاپەڕە کۆنەکانیان دەسڕینەوە تا بنەڕەتی ژیانی خۆیانی لەسەر بنووسنەوە.

شارستانیەتی ئیسلامی لە سەدەی نۆ و دە لە ئەندەلوس و صقلیەدا گەیشتە لووتکەی کەمال، (کاتێ هەستمان کرد پێویستە ئەو نەزانیە پاڵ پێوەبنێین کە باری سەرشانی قورس کردبووین ڕوومان کردە موسڵمانان و دەستمان بەرەو لایان درێژ کرد چونکە ئەوان تاکە مامۆستاکانی جیهان بوون). دواتر زانست لە ئیسپانیا و صقلیەوە دزەی کرد بۆ وڵاتی ئەوروپا، (جیهانی مەسیحی لە نزیکەی ساڵی هەزاری زایینیدا شالاوێکی نوێی ئیسلامی بەخۆوە دی کە وەك لافاو دەچوو و هیچ بەربەستێکیش لەبەردەمیدا خۆی ڕانەدەگرت، بەڵام ئەمجارەیان پێچەوانەی شالاوی نوێ بوو چونکە فشارەکەی لەسەر جەستەکان نەبوو بەڵکو لەسەر عەقڵەکان بوو، ئەو شالاوە هی شارستانیەتی ئیسلامی بوو چونکە گەلی بیابانی گەورە دوای ڕووخانی دوو شارستانیەتی ڕۆمانی و یۆنانی‌و کوژانەوەی موشخەڵیان دەرکەوت،

بەمە ئەو گەلە تاریکی بەربەریەتی سەدەکانی ناوەڕاستی سرپەوە بەهۆی گێڕانەوەی تیشکی ئەو ژیارو شارستانیەتەی کە لە هەموو ولاتانی ڕۆژئاواو ڕۆژهەلات و تەنانەت قوستەنتینیەشدا کوژاوە بوو).

بەوجۆرە ئەوروپا لە سالی ١١٤ك و ٧٣٢زدا فتوحاتی ئیسلامی بەرپەرچدایەوە بەلام گەڕایەوەو دواتر موسلمانان بە چەندین سەدە پێشکەوتن و ڕۆژئاواش داوای زانستی جیهانی ئیسلامیان دەکرد.

رینالدی دەلێت: (گولبرت) کە لە سالی ٩٩٩ز.دا پاپا بوو لەژێر ناوی (سلفستری دووەم)دا هەموو زانستەکانی لە خوێندنگەکانی ئەندەلوسدا وەرگرت، کاتێ گەڕایەوە بۆ ئەوروپاو ویستی چی زانستی وەرگرتووە لەناو هاولاتیانیدا بلاوی بکاتەوە، خەلکەکە بۆیان دەرکەوت ئەوەی ئەو بلاوی دەکاتەوە زۆر نامۆیە تا ئەوەی بەوە تۆمەتباریان دەکرد کە ئەو گیانی خۆی فرۆشتووە بە جنۆکە، لە سالی (١١٣٠)ەوە لە شاری (تولەیتلە) وەرگێڕانی هزری ئیسلامی دەستی پێکرد.

رینالدی دەلێت (لەو کاتەدا جیهانی مەسیحی لە ململانێدا بوو لەگەل جیهانی ئیسلامیدا، نێردراوانی خاچپەرستان بە ژمارەو ئامادەسازییانەوە کاریان دەکرد بۆ لێسەندنی شوێنە پیرۆزەکانی ڕۆژهەلات لەدەست موسلمانان، ئەوان لە ڕۆژئاوادا خەلکی زانست و عیرفانیان لێ دادەمالین).

ئێمەش دەلێین بەلێ، دوای ئەوەی ئەوان لە ئەندەلوس زانستی ئیسلامی و ڕێبازی زانستی ئەزموونییان لە موسلمانان وەرگرت ئەو پەیوەندیەیان پچڕاندو هەموو موسلمانانیان دەرکردنو ئەوروپایان تا شاخی تاریق گێڕایەوە دواتر ڕایانگەیاند هیچ شتێکیان لە موسلمانان وەرنەگرتووەو موسلمانان زانستیان لا نەبووە بەلکو تەنها فەرهەنگی کۆنی یۆنانیان گواستوەتەوە.

ئەمە وێنەکەیە لە دوو لاوە: موسلمانان ئالای ژیارو تیشکی زانستییان هەلدەگرت و ئەوروپاش دەستی نەبرد بەرەو ئیسلام و دەیویست بەرهەمی موسلمانان وەرگرێ کە ئیسلام

پێی بەخشیبوون دواتر لەناویان بەرن، ئەوانە بۆ یەکەمجار لە مێژووی جیهاندا لە ئەوروپادا دەرکەوتن و ڕایانگەیاند زانستیان لای موسڵمانان وەرگرتووەو لایەنەکانی ڕێبازی زانستی ئەزموونییان لێوەرگرتوون، ڕاستتر بۆ ئەمەش شایەتیەکەی (ڕۆگەر بیکۆن) بوو کە شایەتی دەدات زانستی لای چەند خەلیفەیەکی مامۆستای ئەندەلوس لە زانکۆی ئۆکسفۆرد وەرگرتووە وەك زانا (بریفۆلت) لە کتێبەکەیدا (بنیادی مرۆڤایەتی) بڕیاردەدات (قەرزاری زانستی ئێمە بۆ زانستی عەرەبی لەبەرئەوە نیە ئاشکراکاری سەرسوڕهێنەری چەند بیردۆزەیەکیان پێشکەشی ئێمە کردبێ و ئێمەش نکوڵیمان لێ کردبێ، بەڵکو ئەم زانستە زیاتر لەوە قەرزاری ڕۆشنبیری عەرەبیە، هەر خودی خۆی قەرزاریەتی) بریفۆلت دەڵێت (ئەوەی ئێمە دەیڵێین ئەوەیە لە ئەنجامی گیانی توێژینەوەدا سەر لەنوێ زانست لە ئەوروپادا دەرکەوت ئەویش بەرێی تازە داهێنەری هونەری ئەزموون و تێبینی و پێوەرەکان و بۆ گەشەسەندنی بیرکاری بۆ چەند وێنەیەك کە یۆنان نەیزانیوە، ئەو ڕۆح و ئەو ڕێبازانە لەلایەن موسڵمانانەوە هێنرانە جیهانی ئەوروپی)، ئەمە بەخششی ئیسلامە بۆ ئەوروپا کە سەرچاوەی ڕێنیسانسی نوێی سەدەی پانزەهەمیشە.

لە جەنگە خاچپەرستیەکاندا ڕۆژئاواییەکان لەژێر ئاڵای دوژمنایەتی و کینەو دەمارگیری و بەناوی گێڕانەوەی بەیتولمەقدیسەوە بەرەو جیهانی ئیسلامی کشان و بەلایەنی کەمەوە لە ماوەی سەد و پەنجا ساڵدا (١٠٩٩-١٢٤٩) شاڵاوە خاچپەرستیەکان کە لە ئەوروپاوە بەرەو جەرگەی جیهانی ئیسلامی لە فەلەستین و شام و کەناراوی دەریای سپی (لەنێوان حەیفاو یافاد تونس و دمیاتدا) دەکشان نەوەستان، هەندێ لەو شاڵاوانە بە ڕێبەری چەند پاشایەکی ئەوروپا بوون، هێزی بەهێزی پاڵنەری بانگەوازو هاندانیان مۆرکی شاڵاو و ڕق و دەمارگیری لەخۆگرتبوو.

کڵێسا مۆرکی بەرفراوانی سیاسی و دەسەڵاتی بەهێزی بەسەر ژیانی گشتیدا هەبوو، پاپا (گریگۆری حەوتەم) و (پاپا ئۆربانی دووەم) لە هەڵمەتی دژ بە ئیسلامدا کاریگەری زۆریان هەبوو.

یەکەم: ڕۆڵی کارایان لە گۆڕینی جەنگی نێوان موسڵمانان و مەسیحیەکان لـە ئیـسپانیادا بۆ جەنگی گشتگیری خاچپەرستی کـە ناوچـە جیاجیاکـانی ئـەوروپا تیایـدا بەشـداربوون و کاریگەری قووڵی هەبوو لە ژیانی ئیسپانیای ئیسلامیدا.

دووەم: تالآی خاچپەرستیەکان و تالآی هاندانی دژ بە جـەنگی موسـڵمانان کـە لـە مـاڵی خۆیاندا هەڵگیرتبوو.

هەڵمەتی یەکەمی خاچپەرستی دڕاندانەترین قەسابخانەی دژ بە موسـڵمانانی لـە مێـژوودا لێکەوتەوە کە حەفتا هەزار کەسی دانیشتووی موسڵمانی شاری قودسیان کوشت و لە ماوەی هەشت ڕۆژدا لەناویان بردن و جیاوازییان نەدەکرد لەنێوان ژن و کوڕو منداڵ و پیردا.

(ئورین أ. کالڤبرالی) دەڵێت: بێگومان ئەو سـەدانەی تیایانـدا جەنگـە خاچپەرسـتیەکان هەڵگیرسـان بـە گـەورەترین مـاوەی شـەرمەزاری مەسـیحیەت لـە هـەموو سـەردەمەکاندا دادەنرێن، نزیکەی پێنج سەد ساڵە ئەو جەنگانە کۆتاییان پێ هـاتووە بـەڵام ئـەو سـەردەمە دوورو درێژە هێشتا ئەو ساختە و درۆیانەی نەسڕیوەتەوە کە خاچپەرستان لە وڵاتی ڕۆژئـاوادا جێیان هێشتبوون.

بـەڵام ئـەی پـاش گێڕانـەوەی توانایـان و ئـازادکردنی قـودس موسـڵمانان چییان کـرد. صەلاحەدین کە بە سەرکەوتوویی چوویە بەیتولمەقدیس هیچ خوێنی نەڕشت و سوپاکەشی هیچ ماڵێکیان تالآن نەکرد و هەمووانی لە ماڵ و سامان و شمەکیان دڵنیـا کـرد، پێیـان وت ئایـا بەسەر دوژمنانتدا سەرنەکەوتیت ئیتر بۆ تۆڵەیان لێ ناکەیتەوە کاتێ دەزانی ئەوان چی کـاری دڕندانەیان ئەنجامدا؟ صەلاحەدین وتی: ئەوە ئاین و ویژدانم ڕێ نادات وا بکەم، وتیـان ئایـا ئایینەکەت ڕێت نادات تۆڵە لەو کەسانە بکەیتەوە کە ئەوان لە دوژمنایەتیـدا دەستپێـشخەر بوون و لەناوبردن و سزایان بەرامبەر کەس و کەلت بەکارهێنا؟ وتی: بـەڵێ ئـایینی ئێمـە ڕێ نادات لە ملەجیری دوژمنماندا سنووربەزێنی بکەین و فـەرمانمان پـێ دەکـات بـۆ بـەڵێنمان بەوەفابین و لێبووردە بین بەرامبەر ئەوانەی خراپەمان لەگەڵ دەکەن.

کاتێ دەستکەوتەکانی جەنگ دابەش کران صەلاحەدین بەشەکەی خۆی دا بە هەژاران و دیلەکانی ئازاد کرد، کاتێ فرەنجەکان کۆچیان دەکرد شارەکەی بۆ خاچپەرستان جێهێشت تا هەستیان بریندار نەبێ وو بانگکەرەکانی لە بەرەبەیانەوە تا ئێوارە هاواریان دەکرد ئایا هەژارێ هەیە تا دەستی بگرین یان بێتوانایەك هەیە کە نەتوانێ سەرانە بدات تا یارمەتی بدەین؟ باجی لەسەر حەوت هەزار بێتوانا لابرد و لە گیرفانی تایبەتی خۆی هەندێکی دا، کاتێ بەتریکی بەیتولمەقدیس لەشار چوویە دەر ڕێی نەدا دەست بگیرێ بەسەر سامانیدا، دەرفەتی دا بە فەرەنجە مەدەنیەکان ئەگەر دەیانەوێ لەوێ بژین، بەڵام جەنگاوەرەکانیان دەبێ بە ژن و منداڵیانەوە بچنە دەر، کاهینەکان کۆگا زێڕینەکانیان لەگەڵ خۆیاندا بردو کەس هیچ ئازارێکی نەدان بەڵکو ئاژەڵی زۆر درا بە زۆربەی ئەوانەی ئاژەڵیان نەبوو بۆ سواربوون.

مێژوونووسە ڕۆژئاواییەکان -لەوانەیە وەك یەکدەنگییان لەسەر سیفەتی صەلاحەدین دا لەسەر حەق یەکدەنگ بووبن- شایەتی دەدەن کە صەلاحەدین چەند ڕەوشت و ئاکاری بەرز بووەو لێبوردەیی هەبووە و زۆر بە ڕێزەوە لەگەڵ ژنە خاچپەرستەکان جووڵاوەتەوەو ڕێی پێداون بە ڕێزەوە لە بەیتولمەقدیس بچنەدەرو سامان و شوێنکەوتەو دەوروبەری خۆیان لەگەڵ خۆیاندا ببەن، لەگەڵ شاژنە دیلەکاندا بەوپەڕی ڕێزەوە جووڵایەوەو ڕێی پێدان دیلەکانیان ئازاد بکەن، ئیتر بە ڕوونی جیاوازی نێوان ڕەوشتی ئیسلام و خاچپەرستان دەبینرێ، صەلاحەدین وەك وێنەیەکی موسڵمانان کاتێ لە ساڵی ١١٨٧ز. دا قودسی گێڕایەوە، خاچپەرستانیش کاتێ لە ساڵی ١٠٩٩ز.دا قودسیان گرت و حەفتا هەزار موسڵمانیان کوشت.

موسڵمانان لە هەموو ماوەکانی جەنگە خاچپەرستیەکاندا لە سنوری چەمك و واتای ئیسلامیدا بە نەرمونیانی و دادپەروەری لەکاتی جەنگ و ئاشتیدا هەڵسوکەوتیان کردووە، خاچپەرستان لە شاڵاوی یەکەمیاندا لە مزگەوتی ئەقسادا هێندە خوێنی موسڵمانانیان ڕشت کە سواری وا هەبوو خوێنی موسڵمانان دەگەیشتە لای قولەپێکانی (ئەمە بە دەربڕینی ئەفسو رامبۆ لە کتێبی (التأريخ العام)دا) لەوەش زیاتر دەچوون تا ئاستێ زانا میشۆل لە کتێبەکەیدا (تأريخ الحروب الصلبية) دەڵێت لە جەنگی نوعماندا چی موسڵمانی پەنابەری ناو

مزگەوتەکە هەبوو و لەژێر خانەکاندا خۆیان داشاردبوو هەموویان کوشتن و زیاتر لە هەزارو سەد موسڵمانیش بەبێ جەنگ لە هیلاکەتدا مردن.

(میشۆ) دەڵێت: خاچپەرستان لە قودسدا ئەو دەمارگیریە کوێرانەیان هەبوو کە نمونەی پێشتری نەبوو تا ئەوەی مێژوونوسە بەویژدانەکانیان سکاڵای ئەو حاڵەیان کردووە، خاچپەرستان موسڵمانەکانیان ناچار دەکردن لە بەرزایی بورج و ماڵەکانەوە خۆیان بخەنە خوارەوەو دەیانکردنە خۆراکی ئاگرو لە قووڵایی زەویەوە دەریان دەکردنە مەیدانەکان و لەسەر جەستەی مرۆڤەکان دەیانکوشتن، سەربڕینی موسڵمانان یەك هەفتە بەردەوام بوو تا ئەوەی بە یەکدەنگی گێڕانەوەی مێژوونوسانی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا حەفتا هەزار موسڵمانیان کوشتن، دارولحیکمەی تەرابلوسیان سووتاند کە نزیکەی سەد هەزار بەرگ کتێبی بیری ئیسلامی تێدابوو.

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ لای صەلاحەدین ئەوە دوای ئەوەی قودسی فەتح کرد سەد هەزار فرەنجەو خاچپەرستی لە قودسدا بوون -لەوانە شەست هەزار پیادەو سوارە- جگە لە ئافرەت و منداڵ، دەی بینیمان چۆن ئیسلام لێبووردەیی لەڕوویاندا نواند، هەڵوێستی صەلاحەدینیش بەرامبەر پاشاکانی فرەنجەکان بەڵگەیەکی تری لێبووردەیی ئیسلامە، کاتێ (ریکاردۆس)ی پاشای ئینگلتەرا ئەسپەکەی لەدەستدا صەلاحەدین لەبری ئەوە دوو ئەسپی بۆ نارد، کاتێ نەخۆش کەوت و تووشی تا بوو صەلاحەدین سەهۆڵ و میوەی بۆ نارد.

مامۆستا (ئیورکا)ی مێژوونووس دەڵێت: نمونەی وەك صەلاحەدین لە بەرزی ئاکاردا نابینرێ بەڵکو لە خودی خاچپەرستان چاکتر بوو لەگەڵیان تا ئەوەی کەشتیوانانی پاسەوانی کۆمارە ئیتاڵیەکان هەڕەشەی ئەوەیان کرد ڕێ نەدەن ئەو خاچپەرستە بێهیوایانە بگەڕێنەوە.

مێژوونووس (مسرۆ) دەڵێت: صەلاحەدین لە ڕۆژئاوادا خۆشەویستە چونکە لێهاتوو و بەرێزو مەرد بوو کاتێ دەستی گرت بەسەر ئۆرشەلیمدا و هەڵوێستی وەك خاچپەرستەکان نەبوو بەجۆرێ سەرسامی و سەرسوڕمانی خاچیەکانی لێکەوتەوە، وەك نەریتی موسڵمانان صەلاحەدینیش زۆر لێبووردە بوو و بەوە ناسراوە.

جەنگە خاچپەرستیەکان کاریگەری زۆر و درێژماوەیان هەبوو، گرنگترینیان ئەوە بوو ئەوانەی دەگەڕانەوە گەندەڵی بانگەشەی دەمارگیربوونی دژبە موسڵمانانیان بۆ کەسوکارو هاوڵاتیانیان ئاشکرا دەکردو بە ڕێزو سەرسوڕمانەوە باسی لێبووردەیی موسڵمانانیان دەکرد، ئەمەش کاریگەری زۆری هەبوو تا کڵێسا سزایان بدات و زۆرێك لەوانەشی کوشت، ئەوەی زیاتر گرنگتر بوو ئەوە بوو ڕۆژئاوا لەگەڵ ئەوەدا سوارچاکی و زانستی بردو بەرەو شارستانیەت و مرۆڤێتی ئیسلامی چوو.

لێرەدا پرسیارێکی گرنگ دێ کە مێژوونووسان کردویانە: ئایا ژیاری ڕۆژئاوا بەرهەمی ئەو مەسیحیەتە ڕۆژئاواییەیە کە لە سەردەمی ڕێنیسانسدا هەزارو پێنج سەد ساڵی بەسەردا تێپەڕیبوو یان ئەو ژیارە بەخششێکی ئیسلام بوو؟.

بۆچی مەسیحیەت سەرچاوەی ژیاری ڕۆژئاوا نیە؟

(لیۆپۆلدفلیس) دەڵێت: لە نەسرانیەتدا مەرج نیە پەیکەری ڕۆحی مەدەنیەتی ڕۆژئاوا بیروباوەڕێ بێ کە لەسەر ئەخلاقی تەواو دامەزرا بێ وەك ئەوەی کە لە ئیسلامدا هەیە، بێگومان وایە، بەڵام هاوکات دروست نیە کەسێ ئەو هەڵە گەورەیە بکات کە بڵێ شارستانیەتی نوێی ڕۆژئاوا بەرهەمی نەسرانیەتە، چەندین سەدە گیانی ئەورووپی لەژێر باری نیزامێکی ئایینیدا دەشێلرا کە لەناو خۆیدا کەمگرتنی ژیان و سروشتی لەخۆ دەگرت، نیزامی وا ناتوانێ کەس هان بدات لەسەر چالاکی هەوڵەکانی پەیوەست بە مەعریفە دنیاییەکان و هەست ناکات بە باری ژیان لەسەر زەویدا،

پوختەی قسەکە ئەوەیە شارستانیەتی ئەورووپا لە بنەڕەتدا لەسەر بنەمای شارستانیەتی بتپەرستی ڕۆمانی دامەزراوە و لەبەر هۆکاری زاڵی سیاسی تەنها ڕووکەشکاری لە مەسیحیەت وەرگرتووە، دواتر شارستانیەتی ئەورووپا هێشتا بتپەرستی ماددیەو تەنها بڕوای بەهێز هەیە، لێرەوە جیاوازیەکی گەورەی نێوان مەسیحیەت و ئیسلام بەدیدەکەین.

زانا (مسمر) دەڵێت: ئایینی مەسیحی لە سەردەمی ئیمپراتۆر (ئۆگەستسدل) دەرکەوت کاتێ کە شارستانیەتی ڕۆمانی لە لووتکەدا بوو، سەرهەڵدانیشی لە کەشوهەوای جوولەکەدا

بوو، مەسیحیەت نەیتوانی لە ولاتی ئیغریقی ڕۆمانیدا بلاّوبێتەوە کە گەورەترین ولاّتی خاوەن شارستانی ئەو کات بوو، هەروەها دەبوو ئەو مەعریفەو پێشکەوتنەی هەیبوو بیپارێزێ و لەسەری بەردەوام بێ، بەلاّم ئایینی ئیسلام لە سەردەمێکدا دەرکەوت کە ئەو شارستانیەتە ڕۆمانیە شوێنەواری نەمابوو، لانکەی ئیسلامیش لە نیمچە دوورگەی عەرەبیدا بوو کە لەو سەردەمەدا ناوچەیەکی هەژارو دواکەوتوو بوو، خەلکەکەی سەرقالّی خەیالّ و خورافەو بتپەرستی بوون و نەزان بوون و عەقلّیان ئامادەسازی بۆ ئەو ژیارە ڕۆمانیە ئیغریقیە نەبوو و تەنها لە شیعردا بەهێزبوون، لەگەلّ ئەمەشدا دەبینی ئایینی مەسیحیەت ئەو چرایەی کوژاندەوە کە بتپەرستان هەلّیانکردبوو، کاتێ ئایینی ئیسلام هات دنیای ڕووناك و ڕۆشن کردەوە، ئەمەش بەدیهاتنی ئەو یاسا شارستانیەیە کە پوختەکەی ئەوەیە سروشت ناکەوێ و ناوەستێ.

بنەڕەتی ئایینی ئیسلامی بەپێی بنەڕەتەکانی زانست زۆر بالاّترە لە بنەڕەتی ئایینی مەسیحی بە جۆرێ بڕوابوون بەیەك خوا پێچەوانەی ڕووداوەکان و بڕوابوون بە خوایەکی سیانە خوایی لەیەك جیا دەکاتەوە، گوایە ئەو سێ خوایە لەسەر زەویدا لەشێوەی مرۆڤدا دەرکەوتوون، بەلکو بنەمای ئیسلام بۆ هەلگرانی بەهێزتر و بەسوودترە، ئایینی ئیسلام هاتووە تا دەستەیەکی گەورەی مرۆڤایەتی یەکبخات کە پێشتر بەهۆی ئایینەکانی پێشووەوە دژ بە یەك دەجەنگان، ئیسلام لەنێو گەلاندا زانست بلاّودەکاتەوە، لەنێو ئەو گەلانەدا کە لە پێش هاتنی ئیسلامدا نغرۆی نەزانی بوو بوون.

لەو کاتەدا کە موحەممەد ﷺ دەرکەوت دنیا پێویستی بە ڕزگارکەرێ هەبوو تا لەدەست سەختی و ناڕەحەتیەکان ڕزگاری بکات، هەر کەسێ هەبێ بلّێ موحەممەد درۆزن بووە ئەوە خۆیەخۆ قسەی لە مەسەلەکەدا کردووە و نەیتوانیوە شرۆڤەی بارەکە بکات و هۆکارەکانی سەرکەوتنی موحەممەد دیاری بکات، بەلاّم ئێمەی فەیلەسوفانی توێژەر دەلّێین کەسە گەورەکان کە کارەکانیان بە درێژایی سەردەمەکان بە نەمری دەمێننەوە ئەوانە کەسی هەلکەوتەن و دێن بۆ چاکسازی جیهان و چارەسەر کردنی سەردەمی خۆیان.

هەرکەس لە قورئان ڕامێنێ دەبینێ میحوەری ئیسلام یەکخواپەرستیەو دوو جەمسەرکەشی برایەتی و باشکردنی هەنگاو بە هەنگاوی باری جیهانە لەڕێی زانستەوە، ئەمە ڕاستی سەرکەوتنی ئیسلامە، لە ساڵی (٧٤٣ز) واتە دوای سەدو یانزە ساڵ لە وەفاتی موحەممەد ﷺ دەوڵەتی ئیسلام گەورەتربوو لە دەوڵەتەکەی ئەسکەندەری مەقدۆنی و هێندەی دەسەڵاتەکەی قەیسەر دەبوو، لە ساڵی ١٥٦٦دا لە کاتی مردنی سوڵتان سەلیمدا گەورەتربوو لە دەسەڵاتی ڕۆمانیەکان، بەمە دەردەکەوێ گەورەیی ئیسلام هەزار ساڵ مایەوە، مێژوو دوو ڕاستیمان پێ دەڵێت:

**یەکەم:** پێشکەوتنی زانستەکان لەم سەردەمەی ئێمەدا بەدەر لە ئایینی مەسیحیەت و لەڕقی ئەودا بووە، بەڵام بە پێچەوانەوە ئیسلام سەرچاوەی بووە واتە ناکرێ تا لەسەر ژیان بێ زانست بلاَودەکاتەوەو پێشدەکەوێ چونکە لەنێوان ئیسلام و زانستەکاندا پەیوەندیەکی گشتگیر هەیە.

**دووەم:** کەسی مەسیحی ئەگەر ببێ بە زانا وازدێنێ لە ئایینەکەی، بەڵام موسڵمان تەنها کاتێ واز لە ئاییەنەکەی دێنێ کە ببێتە نەزان، دەی ئیتر چۆن شارستانیەتی ئێستا بدەینەوە پاڵ ئایینی مەسیحی، لە کاتێکدا دوای پانزە سەدە لە دەرکەوتنی ئەو ئایینە ئینجا هات.

زۆر کەس چارەسەری ئەو خالاَنەیان کردووە جگە لە (میسر)، ئەو کەسانە جیاوازی زەمەنی نێوان ژیاری ڕۆژئاواو مەسیحیەتیان ئاشکرا کردووەو بڕێ ڕووداوی مێژوو دەکەنە بنەمای ئەو ڕایە کە ئەوە دەسەلمێنن سەدەکانی ناوەڕاستی ئەورووپا ماوەی پێش دەرکەوتنی ئیسلامی و ژیاری ئیسلامی لە سەدەی حەوتەمی زایینیەوە دەرکەوت و جیهانی ڕووناك کردەوە، ئەورووپاش لە سەدەی پانزەدا شارستانیەتی دەستی پێکرد دوای ئەوەی هەموو بەرهەمەکانی شارستانیەتی ئیسلامی و جیهانی ئیسلامی لە ئیسپانیادا دەست بەسەر کردو ئیسلام و موسڵمانانی لەو وڵاتەدا دەرکرد.

لێرەوە دەرکەوێ بەهیچ جۆرێ پەیوەندی نیە لەنێوان نەسرانیەت و پێشکەوتنی ئەورووپادا بەڵکو هەموو پەیوەندیەکەی لەگەڵ ئیسلامدایە، سەرهەڵدانی ژیاری ڕۆژئاواو دەرکەوتنی

مەسیحیەت هەزارو پێنج سەد ساڵیان نێوان بووە، مەسیحیەت ڕەهبانیەت و دوورگرتن لە ژیانی پێشکەشی ڕۆژئاوا کرد، بەڵام بەپێی دەربڕینی (لیۆپۆلدفلیس) ئیسلام زانستی پێشکەش کرد، یەکدەنگیەك لەسەر ئەوە هەیە ئەوروپا دوای هەستانی دژ بە دەسەڵاتی کڵێساو ڕزگاربوونی لە بزاڤی چاکسازی مەسیحیدا ڕۆڵی خۆی بینی.

بێگومان ئەو بزاڤی چاکسازیە ئایینیەی ڕاوەستا بوو لەسەر پێدانی مافی حوکمی شەخسی لە خوێندنەوەی ئینجیل و پەیوەندی بێ نێوەند لەگەڵ خواو ڕزگارکردنی عەقڵ لە کۆیلایەتی ژێر دەستی پیاوانی ئایینی هەمووی دەگەڕێتەوە بە بنەماو واتاکانی ئیسلام کە خستنیەڕوو بۆ ئەوروپا.

بێگومان ئیسلام ئەوروپای بەرەو بزاڤی چاکسازی ئایینی برد، ئەو چاکسازیەی کە (لۆسەر)و (کالڤن) ئاڵاکەیان هەڵگرت، دواتر ڕێبازی زانستی ئەزموونی پێبەخشی کە (فرەنسیس بیکۆن) بوو بە ئاڵا هەڵگری، بەڵکو ئیسلام لە بەرامبەر بەشاخاوی بوون و هەمەجیەت مەدەنیەتی پێشکەشی ئەوروپا کرد.

(بارتلمی سانهیار) دەڵێت: بازرگانی موسڵمانان و نەریتیان بوویە هۆی پاککردنەوەی مۆرکی ڕەقی دەرەبەگەکان لەسەدەکانی ناوەڕاستداو سوارچاکانمان ئەوپەڕی سۆزو هەست فێربوون بێ ئەوەی شتێ لە دلێرییان لەدەست بدەن، گومانم هەیە تەنها مەسیحیەت توانیبێتی ئەوە بکات با ڕێزو ئاستی لەهەر ئاستێکدا بێت.

شارستانیەتی ئیسلامی لە جیهاندا کاریگەریەکی گەورەی هەبووەو ئەو کاریگەریەش بە تەنها تایبەتە بە عەرەب و ئەو گەلانەی تر کە ئایینی عەرەبییان وەرگرتووە بەشداری ئەوە نەبوون،[1] عەرەب بوون ئەو بەربەرانەیان ڕێکخستن کە دەوڵەتی ڕۆمانییان بە کاریگەری

---

١- لە ڕاستیدا ئەمە وتەی ناڕاستی ئەو ڕۆژهەڵاتناسەیە نەك وتەی مامۆستا ئەنوەر جوندی، ئەو قسەشی زۆر دوورە لە ڕاستیەوە چونکە پرشنگی ئیسلام بە فەزڵی خوا بووەو هۆکارەکەشی هەموو گەلان بوون، ماوەیەك عەرەب و ماوەیەك فارس و ماوەیەك کوردو ماوەیەك تورك و هەر ماوەو گەلانێ بوون، هەموو گەلان لە لایەنە جۆربەجۆرەکانەوە ڕۆڵیان هەبووە لە بڵاوکردنەوەی ئیسلامدا، بۆ نموونە دەتوانن بروانن کتێبی (الموالي و دورهم في الدعوة إلى الله) لە نوسینی د.عماد علي عبدالسميع حسين کە دارالکتب العلمية لە لوبنان چاپی کردووەو چاپی یەکەمی لە ساڵی ٢٠٠٤دا کراوە. (وەرگێڕ).

ڕەوشتی موسڵمانان لەناوبرد، عەرەب بوون جیهانی مەعریفەی زانستی و ئەدەبی و فەلسەفییان بۆ ئەوروپا خستەڕوو بەهۆی کاریگەری ڕۆشنبیریانەوە، بۆیە بوون بە شارستانیکەری ئەوروپا).

کڵێسا هاواری ئەوەی دەکرد کە ئەو تاکە نێوەندەی نێوان خواو مرۆڤە و هیچ نزا یان نوێژێ یان داوای لێخۆشبوونێ ناگات بە خوا تەنها لەڕێی کڵێساو پیاوانی کڵێساوە نەبێ، ئیتر لۆسەرو کالڤن لە ئیسلامەوە ئەو چەمك و واتایانەیان وەرگرتن کە دەڵێت: پەیوەندی نێوان خواو مرۆڤ ڕاستەوخۆیەو هیچ ڕایەکی مرۆیی نیە بۆ حەرامکردنی پیرۆزی، بەیەك ڕوانین بۆ نووسینەکانی لۆسەر چەمك و واتای ڕاشکاوو ڕوونی ئیسلامی لە نوسینەکانیدا بەدیدەکەیت، بێگومان ئەو ڕێنماییانەی ئیسلام کە لە ئەوروپادا بڵاوبوونەوە هاریکاری گەیشتنی ئەو تیشکە بوون بە لۆسەر کە بانگەوازەکەی بەوە پێ زامن کرد دەیوت وێنەو پەیکەر کردن بە خواو سوجدە بۆ بردنیان لە بتپەرستیەوە نزیکترە، کتێبی پیرۆزیش تاکە سەرچاوەی ئایینە، هەموو کەسێ دەتوانێ کتێبی پیرۆز بخوێنێتەوەو لە بانگەوازەکەی تێبگات، هەروەها بانگەوازەکەی هەڵوەشاندنەوەی بەڵێنی هاوسەرگرتنی کاهینان ڕوون دەکاتەوەو پسووڵەی لێخۆشبوون پووچەڵ دەکاتەوە، هەروەها دەڵێت پاپا ناتوانێ تۆڵەی تاوانو هەڵە لەسەر شانی مرۆڤ لاببات، بێگومان ئیسلام دان دەنێ بە عیسای پێغەمبەرو موعجیزەی لەدایك بوونیداو ڕێزی هەموو پێغەمبەران و کتێبەکان دەگرێ بەمە مەسیحیەت لە پاکترین شێوەیدا پاراستووە.

# باسی سێیەم

## (موسڵمانان و دەریای ناوەڕاست)

ئیسلام هات و دوو سەردەمی مێژووی مرۆڤایەتی جیاکردەوە، بەخششەکانی ئیسلامیش جیابوون لە هەموو ئەوانەی پێش خۆی، ئیسلام هەموو چەمك و واتاکانی یەکخواپەرستی و ڕەوشت و کۆمەڵایەتی ڕێککردەوەو لە وێنەو باری کۆتاییدا داینان لە چەمك و واتایەکی بنەڕەتیدا کە ئەویش بەرهەمی مەعریفەی حەقی مرۆڤایەتیە، ئایینە ئاسمانیە دابەزیوەکانیش هەر ئەوەیان هێناوە، هەرچەندە تێکەڵ بوون بە فەلسەفەو ڕاڤە مرۆییەکان و چەمك و واتای بتپەرستی و فرە خودایی و ڕەگەزپەرستی و جەستەپەرستی و پاڵەوان پەرستی، بەڵام ئیسلام جارێکی تر گێڕانیەوە بۆ باری ڕاستی خۆیان و ئەو بەرنامە خواییەی نواند کە مرۆڤایەتی بەرەو مرۆڤێتی و یەکخواپەرستی حەق ڕێنمونی دەکات و جیهان لە ساختەی بیردۆزەکانی بیری مرۆیی و بارشێواوی و خراپییان ڕزگار دەکات.

کاتێ ئیسلام هات مێژوو هەڵوێستەیەکی یەکلاکەرەوەی کردو سنورێکی جیاکەرەوەی لە نێوان پێشترو سەردەمی نوێدا دانا، لەدایکبوونی ئیسلام بوو بە جیاکەرەوەی قووڵی نێوان دوو شارستانیەت: شارستانیەتی بتپەرستی و شارستانیەتی یەکخواپەرستی، دواتر دەریای سپی ناوەڕاست بۆ دوو بەش دابەش بوو، شارستانیەتێکی خاوەن مۆرك و خودێتی و پێکهاتەی ڕۆحی و هزری و کۆمەڵایەتی و دەروونی سەربەخۆ دروست بوو، شارستانیەتێك کە کرۆکی کۆمەڵایەتی و بیردۆزەو دیدی تایبەتی خۆی هەبوو، لە مەعریفەو ڕێبازی زانستی ئەزموونیدا ئسلوبی تایبەتی خۆی هەبوو، هەموو ئەمانەشی پێشکەشی هەموو مرۆڤایەتی کردو شارستانیەتی نوێش لەسەر ڕێبازی زانستی ئەزموونی موسڵمانان دامەزرا.

گەورەترین بەخششی ژیاری ئیسلام بریتی بوو لە بەشارستانی کردنی مرۆڤ و ڕزگارکردنی لە کۆیلایەتی بیرو جەستەو کۆتی ستەم و بەکۆیلەگرتنی کە لە چوار شارستانیەتدا تووشی بوو بوون: شارستانیەتی فیرعەونی، شارستانیەتی ڕۆمانی، شارستانیەتی فارسی،

شارستانیەتی هیندی، شارستانیەتی ئیسلام لەسەر یەکبوونی ئەو بەهایانە دامەزرا کە لە یەکخواپەرستیەوە هاتوون و یەکبوونی پێوەری ئاکاری بە مرۆڤ دەبەخشن، مەبەستم بەوە یەکبوونی پێوەری نێوان خەڵکە جیاوازەکانە بەچاو پۆشی لە ڕەگەزو ڕەنگیان.

(کرۆکی ئەم پەیامە ئەوەیە خوا هەیەو تاکە، بوونەکەی واتای لای عەقڵی ئیسلامی ئەوەیە بوونی بەهاکانە سەربەخۆ لە مرۆڤ بوونی، واتە لە دەستکردی مرۆڤ نیە تا بەپێی باری ژیانی خۆی دروستی بکات، هەروەها واتە ژیانی مرۆڤ لەسەر ئەم زەویە هەر لەخۆوەو بێ واتا نیە، بوونی تەنهایی خوا لە عەقڵی موسڵماندا واتای ئەوەیە بەهاکان یەك پێوەر لەخۆ دەگرن کە بەپێی شوێن و کات کاریگەری لەسەری نابێ، پێوەرەکە بۆ هەموو کەسێ یەکە، لە هەر کوێ بێ و هەر کاتێ بێ. کۆمەڵێکی خەڵك پێوەری ڕەوشتی تایبەتی خۆیان نیە، لە ڕاستیدا بۆ هەموو مرۆڤایەتی و بۆ هەموو خەڵك ئەو پێوەرەی ئیسلام باشە).

ئیتر قسەی بوون و تەنهایی خوا لە جەرگەی داننانە بە مەوزوعیەتی بەهاکان و ڕزگارکردنیان لە کۆتی (ڕێژەیی)یەك کە دان بەوەدا دەنێ بەپێی جیاوازی بارەکان پێوەرەکانیش جیا دەبن، مرۆڤ لەبەردەم خوادا هەر مرۆڤەو هیچ جیاوازیەك لەنێوان دوو مرۆڤدا نیە ئەگەر بەپێی پێوەری حەقی ئەخلاقی پێوەر بکرێ، ئەمە ببوویە هۆی گۆڕینی عەرەبچێتی لەسەر زەویدا و لای هەموو گەلان بەو بڕوایەی وایان دەزانی بەها ئەخلاقیەکان ڕاستیەکن لە ئاسمانەوە بۆ عەرەب نێردراون تا ڕێنمونی ڕێی بن، ئەو بەهایانە بەیەك جار نەهاتوون، بەڵکو بە چەندین قۆناغ هاتوون هەر لە ئادەمەوە تا موحەممەد هەموو پێغەمبەران تیایدا بەشدار بوون، لە ڕاستیشدا ئەو پەیامە ئەخلاقیە ڕۆژ بە ڕۆژ بەهێزتر و بەرچاوتر بووەو عەرەبیش بەوە بەرچاوڕوونی زیادی کرد، ئەمە جیاکاری ڕوونی نێوان ئەو بیرەیە کە ئیسلام پێشکەشی کرد لەگەڵ ئەو بیرە مرۆییەی کە بەرەو بتپەرستی و ڕەگەزپەرستی و ئارەزووبازی هەنگاو دەنێ.

ئەمە واتای ئەوەیە شارستانیەتی ئیسلامی بەشێ نەبووە لە شارستانیەتێکی پێشوو و تەنها گوێزەرەوەی زانستەکانی یۆنان نەبووە، بەڵکو دوای ئەوەی بەها بنەڕەتیەکانی خۆی

پێشکەش کردو ڕێبازێکی سەربەخۆو قەوارەیەکی خۆیی دامەزراند بڵاوبوویەوەو لە هەموو بەخششەکانیشیدا جیا بوو لە پێشنیارەکانی پێشووی بیری مرۆیی، بەڵکو هەندێ لێکۆڵەر لەوە زیاتر دەچن، زانا (علال فاسی) بڕوای وایە چالاکیە مێژووییەکانی پێش هاتنی پێغەمبەر ﷺ ئامادەکاری بوون تا لەڕێی تەواوکاری ئایینیەوە ڕێنوێنی بە مرۆڤ بگەیەنرێت، پێش موحەممەدیش پێغەمبەران و چەندین پەیامی خودایی هاتوون و چەندین بانگەوازی چاکسازیش هەبوون کە هەموو بەشەکانی جیهانیان گرتوەتەوە، بەڵام توانای مانەوەیان نەبووەو تووشی ئەو لاڕێکردنە بوون کە پێویستی نوێگەری و چاکسازی هەبووە تا ئاسۆی پێشکەوتنی مرۆیی بکەنەوە، بۆیە هەر دەبوو کۆتا پێغەمبەر بنێردرێ تا مرۆڤ بخاتە کەشی ڕوشدو پێگەیشتنێ کە لەسەر عەقڵ و ڕۆح و دڵ و جەستە دامەزرابێ، چی چالاکی پێشتری مێژوو هەبوون یەك ئامانجیان هەبووە کە ئەویش بوونی خودی پێغەمبەرەکەیە، بەمە بووە بە ڕابردووی ئوممەت و پێش مێژوویی دەنوێنێ، بەڵام مێژووی ڕاست و دروست لە کۆمەڵگەی ئیسلامیەوە دەست پێدەکات.

لێرەوە دەتوانین بڵێین بانگەشەی یەکبوونی شارستانیەت لە حەوزی دەریای ناوەڕاستدا کە هەندێ نووسەر هەوڵدەدەن باسی بکەن و ئیسلام دەکەن بە بەشێ لەو شارستانیەتە بانگەشەیەکی ساختەیە، هەروەك دەتوانین بڕیاری هەڵەبوونی ئەو قسەیە بدەین کە دەڵێت شارستانیەتی ئیسلامی درێژەپێدەری کۆمەڵگەی سریانیە وەك چۆن توینبی مێژوونووس هەوڵ دەدات وا بڵێ، ئیسلام زیادەیەکی نوێ و ڕوون و خاوەن ڕێبازێکی خاوەن تایبەتمەندی خۆییەو دواتر هەموو شتەکانی گۆڕی و کاریگەری گەورەی هەبوو لە ڕێکردەی مێژوو و شارستانیەتدا. شوێنەواریشی گەیشتە جەرگەی ئەورووپاو جەرگەی بیری ڕۆژئاوای مەسیحی، کاریگەری قووڵیشی هەبوو لەسەر شارستانیەتەکانی هیندو ئایین و مەزهەبەکان، ڕۆڵ و کاریگەری ڕوونی هەبوو لەو ناوچانەشدا کە موسڵمان نەبوو بوون، بەڵکو زۆربەی ئاراستەکانی ڕێککردەوەو خەڵکێکی زۆری بردە ناوی، گەورەترین بەڵگەش کاریگەری بوو لە ئیسپانیاو

باشووری فەرەنساو باشوری ئیتالیادا کە تا ئەمڕۆش ئـەو کاریگەریـە لـە زمـان و چـەمك و واتاو کۆمەڵگەکاندا ماوە.

زۆرێ لە مێژوونووسە ئەوروپیەکان دانیان ناوە بەو کاریگەریـەدا، لەوانـە (هنـری بیریـن) مێژوونووسی بەلجیکی کە دەڵێت: دەریای سپی ناوەڕاست ئەڵقەی پەیوەندی بەردەوامی نێـوان ئەو شارستانیەتانە بوو کە لە دەوری کەناراوەکانیدا هەر لە سەردەمە کۆنەکانەوە دەرکەوتوون تا ئەو شارستانیەتە مۆرکێکی وای وەرگرتووە دەکرێ ناوی بنێین مۆرکی دەریـای ناوەڕاسـت، بەڵام ئەو ڕووداوە گەورەی کە بارودۆخەکانی سەروخوار پێ کرد دەرکەوتنی کتـوپڕی ئیـسلام بوو لە سەدەی حەوتەمی زایینی لەسەر شانۆی ڕووداوەکان و دەستگرتنی بەسەر بەندەرەکانی باشوری ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای دەریاچەی ئەوروپیدا.

لەو کاتەوە دەریای سپی ناوەڕاست بوو بە بەربەستێ لـەنێوان ڕۆژئـاواو ڕۆژهەڵاتـدا دوای ئـەوەی پێـشتر پردێـك و پێنـاوێکی پەیوەنـدی بـوو هەرچـەندە دەوڵـەتی بیزەنتـی بـەهۆی کەشتیگەلیەوە توانی موسڵمانان لە دەریای ئیجەو ئەدریاتیك و کـەناراوی باشـوری ئیتاڵیـا پاشەکشە پێبکات بەڵام دەریای سپی ناوەڕاست هێنـدەی نـەبرد بەتـەواوەتی کەوتـە دەسـت موسڵمانان و لە باشورو ڕۆژئاواوە بە گرتنی مەغریب و ئیـسپانیاو دەسـتگیرکردنیان بەسـەر دورگەکانی بلیارو کۆرسیکاو سـەردینیاو صـقلیەدا گـەمارۆیان دا. بـەم پێیـە لـە سـەدەی هەشتەمی زایینیەوە بڕیاری مەرگی سەپاند بەسەر بازرگانی ئەوروپیدا لـەو ناوچـەداو بزاڤـی چالاکی بازرگانیش یەکجار گوازرایەوە بۆ بەغدادی پایتەختی ئیمپراتۆریەتی ئیسلامی.

پاشان ئەو کەناراوانەی ڕۆژێ لە ڕۆژان لەسەر یەکبونی نەریت و پێویستی و هزر لەسـەری بوون دوو شارستانیەتیان تێدا دەرکەوت، بەڵکو بـا بڵـێین دوو جیهـانی نـەیاری یـەکتر، ئـەو هاوسەنگیە ئابووریەی کە لـە سـەدە کۆنەکانـەوە هـەبوو و تـا دوای شـاڵاوە جەرمانیـەکان بەردەوام بوو لە ڕۆژانی هەڵمەتی ئیسلامیدا کۆتایی پێهات.

لەم ڕاستیەوە بە ناچاری نیزامێکی نوێی ئابووری دەرکەوت، لەوانەشە ئـەوە نهێنـی ئـەو هاوارە پـڕ لـە کینانـەی ڕۆژئـاوا بـێ کـە بـەرزیان دەکردنـەوەو بوونـە سەرچـاوەی شـاڵاوە

خاچپەرستیەکانی دژ بە فەلەستین و بەیتولمەقدیس و میسر، ئەمە لـە هـەمان ئـەو کاتەیـدا شالاوە فرەنجەکان لـەژێر چـەند بانگەشـەیەکی پووچـدا ڕوویـانکردە ئەنـدەلوس و مـەغریبی ئیسلامی تا موسڵمانان بگێڕنەوە بۆ نیمچە دوورگەی عـەرەبی و ئـەو بەشـانەی مـەغریب و سوریاو میسر کە پێشتر لەدەستیاندا بوون بیگێڕنەوە.

بێگومان بە گەڕانەوەیەکی ڕاست و دروست بۆ مێژوو دەردەکەوێت ئەو بەشانە بە مـاوەی نزیکەی دوو هەزار ساڵ پێش داگیرکاری ڕۆمانی ناوچەی عـەرەبی بـوون و مـوڵکی ئـەوروپا نەبوون هەرچەندە لەسایەی ستەمی ئیمپراتۆریەتی خۆسەپێنی ڕۆمانیدا بەزۆر داگیری کـردن، بەڵکو دوورتر لەوەش بڕۆین ئەو داگیرکاریەی ماوەیەکی دوورودرێـژ بـەردەوام بـوو نـەیتوانی زمان و بیری ڕۆمان بەسەر ئەو ناوچانەدا بسەپێنێ و خێـرا ئـەو ناوچـانە گەڕانـەوە بـۆ ئـەو بنەڕەتەی خۆیان کە لە ڕووی زمان و ئایین و هزرەوە پەیوەستی ئیسلامیان دەکات.

میسر هەر لە هاتنی ئەسکەندەرەوە تا هاتنی موسڵمانان زیاد لە دوو هـەزار سـاڵ لـەژێر قەڵەمڕەوی ڕۆمانەکاندا مایەوە یان پەیوەندی بە ڕۆشنبیری ئیغریقیەوە هەبوو، کەچـی خێـرا هەموو ئەمانە وەك بەفر توانەوە، ئیسلام ڕۆشـنبیریەکی خۆسـەپێنی بلاوکـار نـەبوو بـەڵکو فیترەت و سروشتی بوو، نوێگەری حەنەفیەتی پاك (ئایینی ئیبراهیمی) بوو کـە مـاوەی سـێ هەزار ساڵ بوو دەژیا، بێگومان یەکخواپەرستی پوخـت ئـەو تیـشکە ئاشـکراکەرە بـوو کـە لەبەردەمیدا هەموو ڕۆشنبیری و فەلسەفەکان ئاوا دەبوون، ئـەوە ئـەو فیترەتەیـە کـە خـوای گەورە خەڵکی لەسەر دروست کردووە.

بەڵام ئەو ڕۆشنبیریانەی تر دژ بە فیترەت و یەکخواپەرستی بوون و لەگەڵ سیـستمی ڕەق و توندی کۆیلایەتیدا خۆیان سەپاند، ئەگینا بە سەختی بەرپەرچ دەدرانەوە، کاتێ ئیسلام هـات ئەو هەزار ساڵەی ئەو ڕۆشنبیریانە بە فەرهەنگیانەوە بوونە هەڵم و بوونیان نەما، ئەو پەڕانـە بەتەواوەتی پێـچرانەوە، پـەڕەی بتپەرسـتی و کۆیلایـەتی و فرەخـودایی و ئـاگر پەرسـتی و فیرعـەون پەرسـتی و مەجوسـیەت، ئەمانـە هـەموو توانـەوەو چـوار ئیمپراتۆریەتەکـەش پێچرانەوەو لە ژێـر گـورزی یەکخواپەرستیدا لەناوچـوون، زمـانی عـەرەبی بەسـەر هـەموو

زمانەکاندا زاڵ بوو، بیری ئیسلامی کشا بەسەر هەموو بیرەکانی تردا، ناوچەکە جارێکی تر پەیامی خوای تێدا چەسپا.

چی دەوترێ سەبارەت بەوەی موسڵمانان شتیان لە بیزەنتی و مەسیحی و جولەکەو صائیبەکانی حەران وەرگرتووە هەموو ئەوانە بێ بنەمان، چونکە هەمووی تەنها لە چوارچێوەی ئەو وێنەیەدا بوو کە لەسەر یەکخواپەرستی و دادپەروەری و بڕوابوون بە غەیب دامەزرابوو و بەرەو ڕێبازی ئەزموونی برد، بۆیە تەنها چەند زیادەیەك نەبێ چی لە شارستانیەتی کۆنی دەریای ناوەڕاست وەرگرت؟ کەچی ئیسلام نوێگەری بەخشی و لە ڕێبازو بەرنامەی ئەو شارستانیەتە کۆنە دەرچوو.

لە ڕاستیدا ڕۆڵی موسڵمانان وەك ڕۆڵی ئیجی و فینیقی و یۆنانی و ڕۆمانیەکان نەبوو، بەڵکو ڕۆڵی ئەمان زۆر گەورە بوو، بەخششی ئیسلامیش کاریگەری زۆر گەورەی هەبوو بەجۆرێ پایەو بنەڕەتەکانی هەموو بیرو شارستانیەتی ئەوێی لەرزاندو بیروباوەڕی نوێ کردەوەو دەروونی مرۆڤایەتی ڕزگارکردو ئوممەتێکی میانڕەوی دروست کرد (جیهانی ئیسلام) تا هەڵگری پەیامی خوا بێ.

(گۆستاف فۆن گرۆنیام) شێوازی کاریگەری ئیسلام لە ئەوروپادا دەخاتە ڕوو و دەڵێت: (ئیسلام بەردەوام لە زۆربەی مەسەلەکاندا کاری دەکردە سەر باری ئەوروپی هەر لەو کاتەوەی لە بەرگی بەختی بەردەوامدا دەرکەوت و وێنەیەکی سەرسوڕهێنەری نواند کە جیهانێکی جیاوازی نیشان دەدا کە حەقیقەتی بەرچاوی لێ دروست دەکرد، کاتێ ئەوروپا بە تەواوەتی دەستبەرداری چوون بەرەو ڕۆژهەڵات و باشور نەبوو لەو کاتەدا بوونی ئیسلام و خۆنواندنی بەهێزی لە ئەندێشەکاندا لەبەرچاوی ئەوروپیەکاندا بە گەورەترین حەقیقەتی بەردەوام بەرچاو دەکەوت و بەدرێژایی سەدەکانیش ڕاستیەکی تەنها نەبووە لە بواری پەیوەندیە نێو دەوڵەتیەکانی سەدەکانی ناوەڕاستدا ڕۆڵێکی گەورەتر لەو ڕۆڵە ببینێ کە بوونی دەوڵەتێکی

بەهێزی نارِوون دەینواند کە ناکرێ گاڵتە بە حەقیقەتی بکرێ، ئەو دەوڵەتـەی لەلاکـەی تـری ئەم دەریایەدا بوو (موسڵمانەکان) کە ئەوان بەم دەریایە دەڵێن دەریای ناوەراست.[١]

دواتر گرۆنیام ئاماژە دەدات بە نهێنی گەورەیی ئیسلام و دەیگێرێتەوە بـۆ سەرچـاوەکەی کە هەستکردنی موسڵمانە بەوەی ئیسلام ئایینی سەرمۆری ئایینەکانەو ئەو حەقەیە کە جگە لەو حەقێکی تر نیەو لەرێی رزگاری و بەختەوەری هەتا هەتاییدا رێ دەبرێ.

گرۆنیام دەگاتە ئەوەی دەڵێ جیهانی مەسیحی گرنگیەکی بێـشومار دەدات بـە ئیـسلام، ئەو گرنگیەی کـە چـەندین وێنـەی دوژمنکـاری بـەردەوامی رۆژئـاوا بـوو بـۆ لـەناوبردن و ریشکەکێش کردنی ئیسلام لە هەمان ئەو کاتەیدا کە ئیسلام بەهیچ جۆرێ دوژمن نەبوو.

زۆرێك جەخت لەو واتایە دەکەنـەوە تـوینبی لـە کتێبەکەیـدا (الحضارة في فـترة اختيـار) دەڵێت: ئیسلام لەگـەڵ پەیامەکـەی عیـسادا دوژمنایـەتی نەنوانـد بـەڵکو لەگـەڵ کڵێـسای مەسیحیدا کە دەستی گرتبـوو بەسـەر عـەقڵی رۆمـدا و خـۆی دابـوو بەدەسـت بانگـەوازی بتپەرسـتی ئیغریقـی و شـیرك و بتپەرسـتیەوە، ئیـسلام دژی ئـەو شـیرك و بتپەرسـتیەیەو پەرستشی تاکە خوایی دەخوازێ، ئـەو پەرستـشەی پێـشر ئیـبراهیم بانگـەوازی بـۆ دەکـرد، بەوجۆرە ئیسلام لە لایەکەوە لەنێو مەسیحیە موشریکەکاندا چرای یەکخواپەرستی هـەڵکرد، لە لایەکی ترەوە لەنێو هیندۆسە موشریکەکاندا ئەو چرایەی هەڵکرد، بێگومان ئیسلام دیدی رەگەزپەرستی و ململانێی چینایەتی لەسەر دانانی بنـەمای برایـەتی ئیـسلامی و یەکـسانی رەهای نێوان موسڵمانان لەناوبرد.

بێگومان ئیسلام عەرەبی بردە ناو مێژووی جیهانەوە کاتێ کردنی بە ئاڵاهەڵگری پـەیامی خواو بردنی بۆ ئەوپـەری ناوچـەکانی سـەرزەوی، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا رۆژانـە پێـنج جـار روودەکەنـە قیبلەکـەیان کـە بەیتولحەرامـە، هـەرگیز ئـەوە لەبیرناکـەن کـە پەیوەندیـەك دەیانبەستێتەوە بە هەر کەسێکی هەر ناوچەیەکی سەرزەویەوە کـە بڵـێ لا إلـه إلا الله، هـەر هەنگاوێ دەنێن بۆ تەوافی کەعبەو بە شانازیەوە روودەکەنە کەعبە، خۆشیان دەبەستنەوە بەو

١- جوستاف فون: حضارة الأسلام.

مێژووەوە کە لە جەرگەی بیابانەوە دەستی پێکرد، ئەو قسە ڕاست نیــە کــە هەنــدێ دەڵــێن گوایە موسڵمانان ڕوویانکردوەتە دەریای سپی ناوەڕاست و هەرگیز ڕوویان نەکردوەتە بیابان.

# باسی چوارەم

## ( مێژووی ئیسلامی )

بێگومان ئیسلام لە تێگەیشتن و ڕاڤەی مێژوودا ڕێبازی تایبەتی خۆی هەیە، ئەو بەرنامەو ڕێبازەی کە لە خودی کرۆکی ئیسلامەوە هاتووە، هەر هەولێکی ڕاڤە کردنیشی بەپێی ڕێبازێکی تر لە بنەڕەت و حەقیقەتی خۆی دەریدەکات، مێژووی ئیسلامی وەك بەشێکی جیا نەبووە بەشێکە لە ئیسلام و مێژووی ئیسلامی پێش ئەوەی مێژووی کۆمەڵێ ڕووداوو بیرو هزر بێ مێژووی بیروباوەڕێکی گشتگیری خاوەن سیفەت و تایبەتمەندی خۆیەتی.

لەو پێناوەدا پێویستە بە دیدێکی تەواو لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێ بێ ئەوەی پارچە پارچە بکرێ، هەر هەولێکی پارچە پارچە کردنیشی هەڵەو کەموکورتی ڕوانینەکەی لێدەکەوێتەوە، پێویستە بەپێی چەمك و واتای خودی ئیسلامیش سەیربکرێ بەبێ پشت بەستن بە ڕێبازە هاوردەکان، چونکە بۆ تێگەیشتن لە بنەڕەتەکانی ئیسلام ئاستی پەیڕەوییان لە مێژوودا زەرورەتێکی گەورە هەیە بەتایبەت لە سێ بنەڕتدا:

**یەکەم:** بانگەوازی ئیسلامی پەیامێکی خوایی ئاسمانیە نەك دەسەلاتێکی زەمینی کە چەمك و واتای دەوڵەتان و پاشایان و بەهاکانیان بەسەریدا پەیڕەو بن.

**دووەم:** چەمکی جیهاد بنەڕەتی لێکۆڵینەوە لە جەنگ و فتوحاتەکانە، لێرەوە هەر دەبێ لە بڕوابوون بە شەهیدبوونی لەڕێی خوادا تێبگەیت تا بزانیت بۆچی موسڵمانان سەرکەوتوون و مەسەلەی دەستکەوت و شتەکانی تر لە پلەی دوای شەهیدیدا دابنێین.

**سێیەم:** بڕوابوون بەوەی موسڵمان پێی وایە ئەرکی سەرشانیەتی بانگەواز بکات لەڕێی خواداو کۆمەڵگەی خواپەرستی لەسەر زەویدا دامەزرێنێ و بۆ جێگیرایەتی لەسەر زەویدا دروست کراوە.

چەندین توێژەری ڕۆژئاوایی توانیویانە لەو هێڵە بنەڕەتیانە تێبگەن، لەوانە (ولفرێد کانتول سیمس) کە دەڵێت: (موسڵمان هەستێکی گەورەی بۆ مێژوو هەیە، ئەو بڕوای هەیە بەوەی

مەلەکوتی خوا لەسەر زەویدا بێتە دی، بڕوای وایە خوا نیزامێکی واقعی کردەیی داناوە کە مرۆڤ لەسەر زەویدا بەو پێیە ڕێ دەبڕێ، موسڵمانان هەمیشە هەوڵ دەدەن واقعی زەوی لەو چوارچێوەیدا داڕێژن، پاشان هەمیشە موسڵمان لەگەڵ هەر کارێکی تاکەکەسی یان کۆمەڵایەتیدا دەژی و بەپێی دووری و نزیکی لەو نیزامەی خوا دایناوە لە واقعی سەر زەویدا بێتە دی چونکە شیاوی جێبەجێکردنە، لە دیدی موسڵماندا مێژوو تۆماری هەوڵی مرۆڤایەتیە بۆ بەدیهێنانی مەلەکوتی خوا لەسەر زەویدا، پاشان هەموو کارو هەموو هەستێکی تاکەکەسی یان بەکۆمەڵ گرنگیەکی زۆری هەیە چونکە ئێستا بەرهەمی ڕابردوو و داهاتوویش لەسەر ئێستا ڕاوەستاوە).

سمیس بەراوردێ دەکات لە تێگەیشتنی مێژوو لە ئیسلام و هیندۆسی و مەسیحی و مارکسیداو دەڵێت: کەسی هیندی گرنگی بە مێژوو نادات و هەست بە بوونی ناکات چونکە مێژوو لای ئەو تۆماری کاری مرۆڤە لە جیهانی ماددەو هەست پێکراودا، کەسی هیندیش هەمیشە سەرقاڵە بە جیهانی ڕۆحەوە کە جیهانی بێکۆتایە، دواتر هەموو شتێ لە جیهانی فەنابوونی سنورداردا لای ئەو هیچ بەهاو کێشێکی نیە، بۆیە لای ئەو مێژوو شتێکی لە حساب دەرچوو و بێ نرخە، بەڵام کەسی مەسیحی کەسیاتیەکی دوو فاقی یان دوو جیهانی لە یەك جیای هەیە کە هیچ شتێ پێکەوەیان نابەستێتەوە، نموونەی باڵا لای موسڵمان بۆ جێبەجێکردن نابێ، واقعی مرۆیی کە لە واقعی سەرزەویدا جێبەجێ دەبێ لە نموونەی باڵای خوازراو جیایە، ئەم دوو هێڵە جیا یان دوور لەیەك و بێ هیچ پەیوەندیەك ڕێ دەبڕن، لە دیدی کەسی مەسیحیدا مێژوو خاڵی لاوازی و داکەوتن و لادانی مرۆڤە، سەبارەت بە دیدی مارکسی بۆ مێژوو بڕوا بوونە بە حەتمیەتی مێژوو بەو واتایەی هەموو هەنگاوێ کە بەرەو هەنگاوی دواتر بڕوا بەڕێگەیەکی حەتمی، بەڵام تەنها بڕوای بە جیهانی هەستپێکراو هەیە، بەڵکو لە جیهاندا تەنها بڕوای بە مەزهەبی مارکسی هەیە و جگە لەوە هەموو شتێ پووچ و بەتاڵە، کەسی مارکسی بەدوای عەرەبانەی مێژوودا دەڕوات بەڵام ئاراستەی ناکات و بەهیچ

پێوەرێکی بەدەر لە پێوەری مارکسی پێوەری ناکات، بەڵام کەسی موسڵمان تەواو لەمانە جیاوازە.

بێگومان بە یەك ڕوانین بۆ قورئان لە بواری ڕاڤەی مێژوودا ڕێبازی ڕوون و دانراوی ئیسلامی بەدیدەکەیت کە چەند یاسایەکی دیاریکراو هەن کە بەو پێیە گەلان پێشدەکەون و دادەڕمێن، دارمانی گەلانیش لە ئەنجامی گەندەڵی و سەرکەشی و دارمانەوەیە، قورئانی پیرۆز چواردە سەدەیە ئەو یاسایەی داناوەو نموونەی ئەزموونی تەواوی لەبەردەم خەڵکدا خستوەتەڕوو وەك نموونەی ژیاری عاد و ثەموود و گەلی توبەع و ئیمپراتۆریەتی فیرعەون و ڕاستی ئەو یاسایەشی خستوەتەڕوو ﴿سُنَّةَ اللَّهِ فِي الَّذِينَ خَلَوْا مِن قَبْلُ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلاً﴾ ﴿ذَلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ لَمْ يَكُ مُغَيِّراً نِّعْمَةً أَنْعَمَهَا عَلَى قَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمْ﴾.

قورئانی پیرۆز ئاماژە بەوە دەکات ژیاری مرۆیی واتادارەو مرۆڤ میحوەری فەلسەفەی مێژووە، قورئان زەوی بە شوێنی سزا یان بەندیخانەی مرۆڤە تاوانبارەکان دانانێ لەبەر بنەڕەتی پێکهاتەیان ئەگەر هاتوو تاوانێکی بنەڕەتییان ئەنجامدا چونکە بنەڕەتی تاوان بۆ مرۆڤ دانەنراوەو هەڵەکەی ئادەمیش خوا لێی خۆش بوو و کەسیش باری تاوانی کەسی تر هەڵناگرێ.

ماوەی ژیانی کورتی ئەم سەرزەویە ماوەی تاقیکردنەوەی مرۆڤە و مرۆڤیش سپاردەکەی هەڵگرتووەو بەرەو ڕووی تەحەددا بووەتەوەو لەسەر شانیەتی تواناى خۆی بۆ هەڵبژاردنی ڕێی ڕاست بسەلمێنێ ﴿وَهَدَيْنَاهُ النَّجْدَيْنِ﴾ ژیان تاقیکردنەوەی خەڵکە لەسەر ئەو سپاردەو جێگیرایەتیە ﴿وَهُوَ الَّذِي جَعَلَكُمْ خَلاَئِفَ الأَرْضِ وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَاتٍ لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُمْ﴾ ئەمە هەمووی پەندی مێژوو و مەسەلەی مرۆڤە.

(روزنتال) شارەزای دیدی ئیسلام بووە سەبارەت بە ڕاڤەی مێژوو بەڕوونی دەربڕیوەو دەڵێت:[1] (تایبەتمەندی بیری ئایینی لەم ئاڕاستەیەدا ئەو هۆشیاریەیە کە دەڵێت مێژوو کۆتاییەکی هەیە کە ئەویش ڕۆژی دوایيە کاتێ هەموو کەسێ سەبارەت بە کاری لە دنیادا

---

١- علم التأريخ عند المسلمين.

پرسیاری لێدەکرێ، ڕۆژی دوایی سەرەتای مێژوویەکی ترە کە قورئان بەوردی وەسفی کردووە بە جۆرێ وەك ئەوەی بڵێی لە ڕابردوودا بووە).

(علال فاسی) جەخت لەو واتایە دەکاتەوەو دەڵێت: جەبریەت لە ئیسلامدا بوونی نیە چونکە مرۆڤ لە دەرەوەی مێژوودا نیە، بەڵکو خودی مرۆڤ هۆکارێکی کاراو کارتێکراوی ناوخۆیی مێژووە، چالاکیەکانی مێژووش بێ ئامانج نین.

هەروەها دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ زۆر بە تەواوی هەستی کردووە بە بوونی مێژوویی، بەڵام خۆی ڕانەسپاردووە بەوەی بێتە مێژوونووس یان تۆمارکەری مێژوو، بەڵکو چوارچێوەی پێویستی بۆ داناوین و لەسەر شانی ئێمەیە بە ئاشکراکردنی ڕووداوەکان و ئەنجامدانی چالاکیەکانمان ئەو چوارچێوەیە پڕبکەینەوە، لە قورئان و فەرموودەشدا وشەی (التأریخ) نەهاتووە، ئەگەریش قورئان چیرۆکی پێشینانی بۆ هێنابین بۆ ئەوە نیە بە مێژوویەکی کات و بارەکەی بزانین، بەڵکو تا پەند وەربگرین لەو شتانەی تیایەتی چونکە پەندی تیایە بۆ کەسی ژیر).

**لە دیدی ئیسلامدا مێژوو دوو قۆناغە و دەبێ لەبەردەمیاندا هەڵوێستە بکەین:**

**یەکەم:** قۆناغی چالاکیە مێژووییەکانی پێش پێغەمبەرایەتی، ئەمە تەنها ڕێخۆشکەری بووە تا لە ڕێی تەواوکاری ئایینی یەوە مرۆڤایەتی بگەیەنێت بە پێگەیشتوویی بەوەی موحەممەد بکاتە کۆتا و سەرمۆری پێغەمبەران، لەپێش موحەممەددا چەندین پێغەمبەر و پەیام هاتوون و چەند پەیامێکی چاکسازیش لە هەموو بەشەکانی سەرزەویدا هەبوون بەڵام توانای مانەوەیان نەبووەو تووشی لاڕێکردنێ بوون کە پێویستیان بە نوێگەری و چاکسازە بووە تا ئاسۆی پێشکەوتنی مرۆیی بکەنەوە، بۆیە هەر دەبوو خوا کۆتا پێغەمبەر بنێرێ تا مرۆڤ بخاتە ئەو کەشی ڕوشدو تەواویەی کە لەسەر ڕۆح و عەقڵ و دڵ و جەستە دامەزراوە.

چی چالاکی مێژوو پێشتر هەبوون بۆ یەك ئامانج بوون کە ئەویش بوونی خودی پێغەمبەرە، بەمە ڕابردووی ئوممەت وەك ئەوەی لێ دێ کە پێش مێژوو بێ.

**دووەم:** کۆتایی مێژووی دنیاو گەیشتن بە جیهانێ کە تیایدا مرۆڤ لەسەر چاکەو خراپەی پێشوەختی موحاسەبە دەکرێ، بەم ڕێگە مێژووییەکە دەگاتە دوای مردن هەموو نەگونجانێ نامێنێ کە دەگونجێ لە نێوان ئامانجی مێژوو و هۆکارو پێناوەکانی چالاکیەکانیدا هەبێ.

بێگومان ئەم واتایە بۆ مێژوو ئەم ڕێبازە بۆ ڕاڤەکردنی جیاوازیەکی ڕیشەیی هەیە لەگەڵ چەمك و واتای ئاین و فەلسەفەکانی تردا.

لایەنێکی تریش هەیە دەبێ ئاماژەی پێ بکەین کە ئەویش بیردۆزەی ڕاڤەی ماددیە بۆ مێژوو کە لە شرۆڤەی هەندێ ڕووداو و دیاردەی گەورەی مێژوویی یان هۆکاری دامەزران و ڕووخانی دەوڵەتاندا گونجاو نیە، وەك (تریتۆن) دەڵێت ئەم ڕێبازە لە مەسەلەی یەکبوونی عەرەب و سەرکەوتنیان بەسەر کەسانی ترو دامەزرانی شارستانیەتیان و فراوانبوونی سنووری پێ چەسپاویاندا شکستێکی تەواوی تووش دەبێ، مێژوونووسان هەر دەبێ بڕواننە هۆکاری دروستی ئەو دیاردە کەم وێنەیە، دواتر سەیریان کرد شتێ لەو نێوەندەدا نوێ بووە کە ئەویش ئیسلامە، سەیریان کرد ئیسلام هێزێکی گەورەیە کە زیندوێتیەکی پاڵنەرو میکانیکی زیندووی هەیە کە ئەوەش هۆکاری بنیادو پێناوی شارستانیەت و ڕێی یەکدەنگی و بڵاوکردنەوەی ئیسلام و بەدیهێنانی دادپەروەری بووە کە بەمە دڵەکانی یەکخستووەو گەلانی پەیوەستی یەك کردووە.

بێگومان ڕۆحی ئیسلام لە بەهێزیدا بووە بەجۆرێ خەڵکی بە یەکجارەکی لە ڕابردوویان دوور خستوەتەوە ئەوەش یارمەتیدەر بوو، ئەوەیە ئیسلام تەنها ئایینێ نیە بەڵکو نیزامێکی کۆمەڵایەتیشە، بۆیە موسڵمانبوونیان چوونە ناو نیزامێکی نوێ بووە کە ئەو پەیوەندیە دەپچڕێنێ کە دەیانبەستێتەوە بە ڕابردووەوە، مێژوونووسە بەویژدانەکان شایەتی ئەوە دەدەن تاکێ یان گەلێ چوویە ناو ئیسلام هەرگیز لێی ناگەڕێتەوە، چونکە ئیسلام ئایین و بگرە لە ئایینێك زیاترە.

# باسی پێنجەم

## (قورئان و ئایینەکان)

قورئان وەك کۆتایی پەیامەکانی ئاسمان و تەواوکەری کتێبە دابەزیوەکانی پێش خۆی و زاڵ بەسەریاندا هات، لەپاڵ ئەمەشدا تایبەتمەندیەکی تری هەبووە کە خوای گەورە بەڵێنی داوە بیپارێزێ لە کاتێکدا بۆ کتێبەکانی تر ئەوەی ڕاسپاردووە بەو کەسانەی بۆیان دابەزیوە.

لێرەوە قورئان تاکە کتێبی هەموو جیهانە کە لە لارێکردن و دەستکاری کردن پارێزراوەو دەقی دڵنیاو چەسپاوی نەگۆڕاوە (ئەو قورئانەی لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا لەبەر دەستی موسڵماناندایە لە سەرەتای قورئانەوە کە فاتیحەیە تا کۆتایی سورەتی ناس هەمووی فەرمایشتی خوایە و دایبەزاندووەتە سەر دڵی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای پێغەمبەری).

دابەزینی قورئان بۆ سەر موحەممەد ﷺ لە دیدی لێکۆڵەران و مێژوونووساندا گەورەترین ڕووداوی ناو مێژووی مرۆڤایەتی[1] بوو، بۆ یەکەمجار لەنێو کتێبە ئاسمانیەکانی تردا لەسەر زەویدا کتێبێکی خاوەن وشەو پیتی خوایی دادەبەزێ کە مرۆڤ یەك دێڕیشی تیا نەنووسیوەو هیچ مرۆڤێ یەك پیتی لێ نەگۆڕیوە، کتێبی خوایی بە ڕاشکاوانە ڕایاگەیاندووە کە ئەوە کۆتا سروشە لە ئاسمانەوەو پەیامی ئاسمان بە قورئان بەتەواوەتی کامڵ بووە و ئەو بازنە خواییەش کە لەوح و پەڕاوو کتێبە خواییەکانی تری لێوە دابەزیون بە یەکجارەکی قوفڵ کرا.

قورئان بنەڕەت و پایەی شەریعەتی ئیسلامیەو نموونەی باڵای ڕەوانبێژیەتی، عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتتاب دەڵێت: قورئان پەرێز و پارێزەری زمانی عەرەبیە، بیریارانی عەرەب و موسڵمانانی تریش سەرقاڵ بوون بە بەیان و ڕەوانبێژی قورئان، چونکە بە زمانی قورەیش دابەزیوە، ئاساییشە قورئان بە زمانی قورەیش دابەزێ چونکە پێغەمبەری خوا قورەیشی بوو و ئەو شێوە دەربڕینەش دەبێتە ڕێبەری هەموو زمانەکان.

---

١- د.سامي النشار.

ئیمامی شافعی دەڵێت: خوا بەڵگەی خۆی بەوە چەسپاند کە هەموو قورئان بە عەرەبیە، دواتر ئەوەی ڕاگەیاندووە لە قورئانەکەیدا بە دوو ئایەتیش بەرپەرچی داوەتەوە هیچ زمانێکی تر جگە لە زمانی عەرەبی هەبێ، وەك دەفەرموێت ﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُ بَشَرٌ لِّسَانُ الَّذِي يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِيٌّ وَهَـذَا لِسَانٌ عَرَبِيٌّ مُّبِينٌ﴾ هەروەها ﴿وَلَوْ جَعَلْنَاهُ قُرْآناً أَعْجَمِيّاً لَّقَالُوا لَوْلَا فُصِّلَتْ آيَاتُهُ أَأَعْجَمِيٌّ وَعَرَبِيٌّ﴾، قورئان نەبوایە ئەو یەکدەنگیەی زمانی عەرەبی نەدەبوو و فرەشێوەزارییان تووش دەبوو بەڵام قورئان ڕێی بەوە نەداو لە لەناوچوون و پەرتبوون پاراستی.

باقەلانی دەڵێت: هەموو وشەیەکی بەکارهاتووی ناو قورئان عەرەبیەو عەجەمەکان لە عەرەبەکانیان وەرگرتووەو دەستکارییان کردووە.

قورئان ئیعجازی خۆی ئاشکرا دەکات و تەحەدا لە هەموو مرۆڤ و جنۆکەش دەکات نمونەی وا بهێنن، زۆرێك هەوڵیانداوە وەك قورئان بڵێن کەچی نەیانتوانی تا ئەوەی بێهیوابوونو خۆیان بەدەستەوەدا، قورئان پایەیەکی نوێی بەخشی بە زمانی عەرەبی و لە پاشکۆیەتی دووری خستنەوە.

شافعی دەڵێت: لە زماندا دەبێ چ زمانێ لەپێشتر بێ لە زمانی پێغەمبەر ﷺ ناشبێ شوێنکەوتوانی زمانی ئەو پێغەمبەرە لە یەك پیتیشدا شوێنکەوتەی زمانی تر بن، بەڵکو دەبێ هەموو زمانێ شوێنکەوتەی زمانی پێغەمبەری خوا بن، هەموو ئەوانەش ئایینی قیبلەیان هەیە دەبێ شوێن ئایینی پێغەمبەر ﷺ بکەون، ئیعجازی قورئان لە وردەکاری و ئیعجازی ڕەوانبێژیدا بەرتەسك نابێتەوە، بەڵکو دەچێتە بواری زانستی و کۆمەڵایەتیشەوە، ئەمەش بەڵگەی گەورەی قورئانەو بەردەوامیش ڕۆژ دوای ڕۆژ ئیعجازی قورئان زیاتر دەردەکەوێ.

تایبەتمەندی قورئان ئەوەیە کە ڕێبازێکی تەواوی کۆمەڵایەتیە کە بنەڕەتە بیروباوەڕی و تەشریعی و ئەخلاقیەکانی نیزامی ئیسلامی لەخۆدەگرێ و بە شێوەو ڕێگەی جیاجیای

قەناعەت پێکردن و بەڵگەهێنانەوەی عەقڵی و ویژدانی و مێژوویی پێشکەشی دەکات، لە هەموو ئەمانەشدا هەموو جیهان دەدوێنێ نەك تەنها عەرەب.

لەبەرئەوەی قورئان ڕاست و دروست و زاڵ هاتووە بۆیە ئەم بنەڕەتانەی تێدا هاتوونەتە دی:

**یەکەم:** چی لە کتێبەکانی پێشووتردا هاتووە پوختی کردوەتەوەو هەڵیبژاردووە بەتایبەت لە بنەڕەتەکانی بیروباوەڕدا.

**دووەم:** موناقەشەی ئەو ڕاڤە پڕوپووچە جیاوازانەی کردووە کە هەڵگرانی ئایینەکان زیادیان کردون و کەم و زیادیان تێدا کردوون بەتایبەت لە بنەڕەتەکان و ئەو بەڵێنەدا کە موژدەی هاتنی موحەممەدی کۆتا پێغەمبەرە.

**سێیەم:** جیاکردنەوەی باری گەلان لە ماوەی دوای پەیامی عیساوە تا هاتنی ئیسلام کە چیرۆکی یارانی ئەشکەوت و ئەسحابولئوخدودو شالاوی ئەبرەهە بۆ سەر مەککەی باسکردووە.

**چوارەم:** هەواڵی شتانێکی داوە کە لە تەورات و ئینجیلدا نەهاتوون.

**پێنجەم:** وەلامی چەند پرسیارێکی داوەتەوە کە پرسیارکەرەکان ئەوەیان بە تەحەددا دادەنا، لەوانە چیرۆکی زولقەرنەین و چەندین باسی تر.

**شەشەم:** زۆربەی باس و مەسەلەکانی خستە بەرچاوو بە ڕوونی دیاری کردن.

قورئان بەرامبەر هەر بیرکردنەوەیەکی یۆنانی جگە لە بیری بوونی خوا، تەنهایی خوای ڕاگەیاند ئیتر دروستکەربێ یان بزواو بێ، وەك چۆن بیرۆکەی خەلقی ڕاگەیاند (خوا دروستکەرەو لە هیچەوە شتی دروست کردووەو لە نەبوو و عەدەمەوە جیهانی هێناوەتە بوون).

بەمە بیرۆکەی عەدەمیەتی ماددەی تێکشکاند، هەروەك سەرەتای زەمان و کۆتاییەکەشی ڕاگەیاند، بەمە نکوڵی کرد لە هەتایی بوونی ماددەو لەناونەچوونی، ئەگەر قورئان نکوولی دەکات لە قەدەمیەتی ماددە لەگەڵ ئەوەدا هاتنە بوونی ماددەو جیهان ڕادەگەیەنێ،

بەوجۆرەش قورئان میتافیزیقیەکی تەواوی بۆ ئەودیو سروشت داناوەو بوون و گەردوونی لە وێنەی کۆتاییدا وێنا کردووە، بۆیە ڕێبازی کۆمەڵگە (شەریعەت)ی لەگەڵ ڕێبازی ئاکاری مرۆیی (ئەخلاق)دا داناوە و هیچ لایەنێکی بیرو کرداری پشتگوێ نەخستووە، بە کورتی بڵێین هێڵە سەرەکیەکانی بۆ هەموو بوون داناوە، ئیتر قورئان کتێبی بوونە هەر لە سەرەتاوە تا لەناوچوونی.

قورئان ڕاستیەکانی بوون و مرۆڤی ڕاگەیاندووەو بانگەواز بۆ ئەوە دەکات بەسەر ژیاندا زاڵ بیت و بەرپرسیارێتی تاکەکەس هەبێ و مرۆڤ بۆ بەرزی ئاسۆ کەونیەکان بەرزبێتەوەو بە بەرپرسی داناوە لە هەموو کردارێکی ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْراً يَرَهُ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرّاً يَرَهُ﴾ مرۆڤ تەنها کاری خۆی سودی پێدەگەیەنێ نەك قوربانیدانی لە برێتی پێغەمبەرێ، بۆیە قورئان لەخاچدانی مەسیح وەك خۆفیداکردن بۆ هەموان بەرپەرچ دەداتەوە، بەمە تەرازووی ژیان دادەنێت و ڕێ دەدات تا مرۆڤ بەوپەڕی ویستی خۆی لەنێوان چاکەو خراپەدا یەکێکیان هەڵبژێرێ.[1]

لە سەردەمی ژیانی پێغەمبەردا ﷺ قورئان کۆکرایەوەو پارێزرا، دواتریش دەستەیەکی نووسەرەوەکانی سروش کە پێغەمبەر ﷺ هەڵیبژاردبوون قورئانیان نووسیەوەو چەندین نوسخەی لێ پارێزرا، دواتر موسڵمانان لەیەك پەڕاودا کۆیان کردەوە، ڕاستەوخۆ کە قورئان دابەزی نوسرایەوە و ئایەت بە ئایەتی و وشە بە وشەی لە هەمان کاتی دابەزینیدا نووسرایەوەو شێوەی نووسینەوەکەی زانایانی سەرسامکردووە، چونکە تاکە ڕێگەی دڵنیای زانستی ئەوەیە، جیهانیش شایەتە تا ئێستا لەسەر زەویدا جگە لە قورئان کتێبێکی تر نیە هێندە دڵنیایی تێدا بێ، هەموو زانایانی بەشەکانی سەر زەویش شایەتی ئەوە دەدەن هیچ کتێبێ وەك قورئان نەنوسراوەتەوە.

لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ چوار کەس تایبەتمەند بوون بەوەی هەر ئایەتێ دابەزی خێرا بە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ کە پەیامی لە خواوە وەردەگرت لە شوێنی تایبەتی خۆیدا

---

١- پوختەی توێژینەوەکەی د.سامی النشار.

بنووسرێ وەك چۆن لە قورئانی بەردەستماندا دەیبینین، سەدان هاوەڵی تریش قورئانیان لەو نوسەرەوانەی سروش وەردەگرت و چەندیان بویستایە لێیان دەنووسیەوە بۆ خۆیان.

قورئان کە بە تەواتور نەقڵ کراوە لە نەقلکردنیدا پشت نەبەستراوە بە لەبەرگرتنەوەی نوسراوەکان، بەمە ئەو دەقە قورئانیەمان بە تەواوی و دوور لە هەر دەستکاری و گۆڕینێك بە ساغ و سەلامەتی و بێ نەگونجان و لادان گەیشتووتە دەست و وەك کتێبە پێشووە پیرۆزەکانی تەورات و ئینجیلی لێ نەهات چونکە لەو کتێبانەدا فەرمایشتی خوا لەگەڵ چیرۆکەکان مرۆڤو وتەو خەیاڵاتی کاهین و ئارەزووبازاندا بەجۆرێ تێکەڵ بووە کە دەدرێتەوە پاڵ پەیامی پێغەمبەران و خوایەتی و پێغەمبەرایەتی پێکەوە تێکەڵ دەکەن.[1]

ئەوانەی قورئانیان لەبەرکردبوو لەبەرکەرانێکی زۆر بەهێزی وابوون کە چەمك و ڕۆشنبیریەکانیان نەدەگۆڕین، لە دیدی لێکۆڵەراندا ئەوە کارێکی گەورەی وابوو کە مێژوو و پیتەکانی پیرۆز ڕاگرت، بە نووسینەوەی قورئان بە زمانی عەرەبی بنەماکانی تێگەیشتن بەبێ ترس پەرتبوون یان بە ڕۆمی کردن یان بە فارسی کردن یان بە هیندی کردن یان بە ئینگلیزی کردن یان بە ئەڵمانی کردن یان بە فەڕەنسی کردنی ئاین نەما،[2] ئەمە وایکرد بە (لۆرد سالزپوری) بڵێت: قورئانی ئەمڕۆ تاکە بەڵگەی یەکبوونی موسڵمانان و تاکە سەرچاوەی هەموو گەلانی ئیسلامە، ئەمە ئەو بەهێزیەیە کە قورئانی لەڕووی وەرگێڕانەوەو ئیعجازەوە چەسپاوو ڕاوەستاو هێشتۆتەوە بەرامبەرهەموو ڕەخنەو تانەیەك، کەچی لە کتێبی (العهد القديم) و ((العهد الجديد)دا شتانێکی زۆر هەن کە عەقڵ قبووڵیان ناکات و زیاتر لە بتپەرستیەوە نزیکن و زۆربەیان لە ئایینە بتپەرستیەکانی پێشوودا هاتوون، بەڵام قورئان دوورە لە هەموو ئەوانە، سەرەڕای ئەوەی کتێبە پیرۆزەکانی پێغەمبەران فەوتان و بە ڕێگەیەکی موتەواتری گومان هەڵنەگەر نەگێڕدرانەوەو نەقڵ نەکران، لێرەوە قورئانی نوسراوەی ئێستای بەردەستمان هەمان ئەو قورئانەیە کە موحەممەد ﷺ و هاوەڵانی

---

١- عبدالصبور شاهين.

٢- د.إسماعيل راجي الفاروقي.

دەیانخوێندو یەك پیتیشی لێ کەم نەکراوە یان بۆ زیاد نەکراوە، زانستێکیشی بۆ دانـراوە کـە شێوەی خوێندنەوەو دەربڕینی وەك هی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ دەپارێزرێ، بەڵام تـەوارات و ئینجیل ئەم شتانەیان نین.[١]

مەسەلەی زمانیش یەکێ بوو لە گرنگترین بنەڕەتەکانی پاراستنی قورئان، چونکە قورئـان لە ڕووی زمان و بەیانەوە عەرەبی بوو، بەڵام ئینجیل زمـانی دیـاریکراوی نـەبوو و بەهـەزار شێوەزار نووسرایەوە، کڵێسای کاسۆلیکی ویستی زمانی بنەڕەتی ئینجیـل بکاتـە زمـانێکی دووەمی پیرۆزکراو کە ئەویش زمانی لاتینی بوو، کاتێ قورئان بانگەوازی دەکرد بۆ زانست و ڕوانینە ئاسۆکانی ئاسمانەکان و زەوی، پیاوانی ئایینی دەیانوت: کتێبە پیرۆزەکـان بەسـن بـۆ هەموو پێویستیەکی دنیاو دوارۆژی مرۆڤ و دەیانوت بنەڕەتی هەموو زانستێ کتێبـی پـیرۆزو نەریتی کڵێسایە، کتێبی پیرۆز هێندەی پێویـستی مـرۆڤ عیرفـانیش لـەخۆدەگرێ، سـەرەڕای پێویستی تەسلیم بوون بەو بڕە باسەی لەسەر وەسـفی ئاسمـان و زەوی و مێـژووی گـەلان لـە کتێبی پیرۆزدا هاتووە کە لەگەڵ عەقڵیـشدا یـان لەگـەڵ شـایەتی هەسـتپێکراودا پێـچەوانە بوون).[٢]

ئەگەر ئەوەمان خستەڕوو کە چۆن قورئان بـە وردەکـاری و بێداریـەوە هـەر لـە سـەرەتای دابەزینیەوە نووسراوەتەوە دەبینین (نولدکە) لە کتێبی پیرۆزی سامیدا دەڵێـت: تـەورات دوای حەوت سەد ساڵ پاش مووسا نوسرایەوە، لەبەر زۆر خایاندنی نووسین و کۆکردنـەوەی تووشـی کەم و زیادکردن بوو و سەختە دێرێکی تەواوی تەورات وەك کاتی دابەزینی بـۆ سـەر مووسـا ببینین، چونکە لە سەردەمی موساو نەوەی دوای خۆیشیدا تەورات نەنوسرایەوە.

ئینسکلۆپیدیای فەرەنسی لەژێر باسی (تەورات) دا دەڵێت: (زانستی هاوچەرخ بە تایبـەت ڕەخنەی ئەڵمانی دوای چەندین لێکۆڵینەوە لە شوێنەوارە کۆنەکان و مێژوو و زانـستی زمـان ئەوەی سەلماندووە کە تەورات لەلایەن موساوە نەنوسراوەتەوە بـەڵکو کـاری پیـاوانی ئـایینی

---

١- عبدالجليل شلبي.

٢- محمد عبده.

جوولەکەیە کە ناوی خۆیان لەسەر نەنوسیوەو یەك دوای یەك نووسیویانەو لە نووسینیدا پشتیان بەستووە بە چەند گێڕانەوەیەکی بیستراوی سەر زاری پێش دیلگیری بابل).

دکتۆر (ئیسماعیل راجی فاروقی) لە کتێبەکەیدا (أصول الصهيونيه في الدين اليهودي) جەخت لەوە دەکاتەوە ئەو تەوراتەی ئێستا لەبەردەستە ئەو کتێبەیە کە عەزرا لە دەوروبەری ساڵی ٤٢٥ پێش مەسیحدا کۆیکردەوە، تەورات کتێبێکی گەورەی خوایی بوو بەڵام جوولەکە دەستکارییان کردو لە ئامانجە خواییەکانی خۆی و تایبەتمەندیە ئەخلاقیە جیهانیەکانی دەریانکردو کردیان بە کتێبێکی دەمارگیری ڕەگەزپەرستی تەنانەت ناوی خوایان گۆڕی و لەبری ئەوەی بەناوی حەق ناوی ببرێ کە پەروەردگای جیهانیان و پەروەردگاری مرۆڤەکانە ناوی ڕەگەزپەرستی جوولەکانی لێنرا (خوای ئیبراهیم و یەعقوب و ئیسرائیل بە تەنها)، عزرا رق و کینەو تۆڵەسەندنەوەی بردە ناو تەورات و تیایدا کاری توندو تیژی و کوشتن و وێرانکاری تۆمار کرد، بەڵکو بۆ بەرزراگرتنی ڕەگەزپەرستی جوولەکایەتی چیرۆکی دروست کرد نەك بۆ پیرۆزراگرتنی خوا، بەڵکو عەزرا دەڵێت چونکە ئێوە لە ئوردنەوە دەچن بۆ خاکی کەنعان و هەموو دانیشتوانی سەر ڕێتان ڕاوەدوو دەنێن و چی وێنەیان هەیە دەیسڕنەوەو چی بەرزییان هەیە دەیسوتێنن و زەوی دەگرنە دەست و تیایدا نیشتەجێ دەبن چونکە من زەویم پێداون تا ئێوە ببنە خاوەنی).

دکتۆر فاروقی دەگاتە ئەوەی دەڵێت عەزرا بە هەموو حەقێ دامەزرێنەری ئایینی جوولەکەیە کە تا ئێستا زانیبێتمان، جێی سەرسوڕمانیش نیە جوولەکە بە کوڕی خوای دابنێن، چونکە ئەو بە چالاکی سڕینەوەی وەسیقەو بەڵگەنامەیی تەوراتی تەواو کرد و بەو کارەی پێناسەی جوولەکەیی زیندووکردەوە.

(جان ملز)ی کاسۆلیکی لە کتێبەکەیدا کە لە ساڵی ١٨٤٣دا چاپکراوە لە لاپەڕە (١١٥)دا ئاماژە بەوە دەدات زانایان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی لەبەرگرتنەوەی تەوراتی ئەسڵی هەموو کتێبەکانی عەهدی قەدیم بە دەستی سەربازگەی (بختنصر) لەدەست چوون، (موشیر

عیزەت پاشا) لە کتێبەکەیدا (الدين والعلم) دەڵێت: (موساییەکان دان بەوەدا دەنێن کە تەورات فەوتاوە).

فاروقی دەڵێت: تەوراتی مووسەوی لە کۆمەڵگەی جوولەکەدا چەندین سەدەیە لەدەست چوو و فەوتاە و ئەگەری هەیە ئەو دەقە بێ کە عەزرا (عەزیز) جیا لە دابەزیوی سەر مووسا نووسیبێتیەوە، دەی نزیکەی هەزار ساڵ ماوەی نێوان عەزرا (عوزەیر) بووە، مەسەلەکە سەبارەت بە ئینجیل وەك تەورات نیە، یەکدەنگیەك لەسەر ئەوە هەیە کە ئینجیل نوسراوەی نێردراوانە، بەڵام ئەو کتێبە نیە کە لە خواوە دابەزی بۆ سەر سەید مەسیح، ئینجیل وشەیەکی یۆنانی بەعەرەبی کراوە بە واتای (مزگێنی) ئەمە ناوێکە بەو کتێبە دەوترێ کە دوای سەردەمی مەسیح دانراو بارو حاڵ و کارو گوفتارو موعجیزەکانی مەسیحی تیایدایە، ئینجیل بە عەهدی جەدید ناسراوە وەك جیاکردنەوە لە تەورات یان عەهدی قەدیم، چەند خوێندکارێکی مەسیح لەگەڵ خوێندکارانی ئەو خوێندکارانەو ئەوانی دواتریش ئەو ئینجیلەیان نووسینەوە تەنانەت دەوترێ ژمارەی ئینجیلەکان گەیشتە نزیکەی سەد و ئەوەندە ئینجیل، بەڵام کلێسای مەسیحی تەنها دان دەنێت بە چوار ئینجیلیانداو ئەوانی تر بەرپەرچ دەداتەوە، ئەو چوارەش بریتین لە (مەتا، مرقس، لۆقا، یوحەننا) ئینجیلی مەتا کۆنترینیانە کە لە ئۆرشەلیم و سی ساڵ دوای عیسا بە زمانی عیبری نوسرایەوە، ئینجیلی مرقص لە ڕۆماو دوای ئینجیلی مەتا بە زمانی یۆنانی نوسرایەوەو لەساڵی ٦٦دا بڵاوکرایەوە، ئینجیلی یوحەننا شەست ساڵ دوای مەرگی مەسیح نووسرایەوە)[١].

هەموو مادەی چوار ئینجیلەکە مێژووی ژیانی مەسیحە، (ئیبن حەزم) لە کتێبەکەیدا (الفصل) پێی وایە ئەهلی ئینجیلەکان هەموو بێ جیاکاری لەسەر ئەوە یەکن کە ئینجیل لە خواو لە مەسیحیشەوە نیەو لە سەردەمی ژیانی مەسیحدا تەنها سەدو بیست کەس باوەڕیان پێ هێناوە...).

---

١- دائرة المعارف الفرنسية للقرن ١٩.

ئینجیلەکەی عیسا فەوتاو ئینجیلی نێردراوەکانی شتێ لە قسەکانی ئەویان پاراست، بەڵام هەموویان نەپاراست، هەروەها ئەوان لە زاری خۆیانەوە قسەکانیان لە مەسیحەوە نەدەگێڕایەوە چونکە مەسیحیان نەدیبوو بەڵکو لە کەسانێکی تری نەناسراوەوە کە پلەی لەبەرکردنیان نەزانراوە ئەو قسانەیان گێڕاونەتەوە، بۆیە ئەوانە گێڕانەوەی ئاحادن، ئینجیلەکان کتێبی ژیاننامەن نەك کتێبی ئاسمانی، قورئان بە ئیعجازو ڕاستی گێڕانەوەیەوە دەقی ناو تەورات و ئینجیلی پاراستووەو چاکەی نواندووە لەگەڵ جوولەکایەتی و نەسرانیەت و شوێنکەوتوانیاندا، چی درۆی داهێنەرەکانی هەیە ڕاستی کردوەتەوەو قورئان بڕیاری وایە ئینجیلەکان تووشی گۆڕین و لاڕێکردن بوون و ئەو ئینجیلەی مەسیح کە قورئان باسی کردووە و گەیشتووەتە دەست خوێندکارەکانی و فەرمانی پێ کردوون بەوە مزگێنی بدەن نەماوە، بەڵکو چیرۆکی دانراوی خوێندکاران و کەسانی ترە، تەوراتی ئەصلی و ئینجیلی ئەصلی لە پێش هاتنی موحەممەد ﷺ فەوتاون و ئێستا وەك دوو کتێبی ژیاننامە وان کە گێڕانەوەی ڕاست و درۆیان تێدا کۆکراوەتەوە، ئەو گێڕانەوانە ئەگەر قورئان بەڕاستیان دابنێ لای موسڵمانان قبوڵن، بەڵام ئەگەر قورئان بە درۆیان دابنێ ئەوە بە دڵنیاییەوە بەرپەرچ دراوەن).[١]

لێرەوە دەگەینە ئەوەی دەقی قورئانی بە تەواوی گەیشتووەتە دەستمان و کتێبە دابەزیوەکانی تر تووشی لاڕێکردن بوون، ئەوەش ئێستا لەبەردەستدان ئەو ئەسڵە نین کە لەلایەن خواوە دابەزێنران، زۆرێ لە توێژینەوەو ئینسکلۆپیدیاکان مەسەلەی ئەو لاڕێکردنەیان باسکردووە کە بنەڕەتی یەکەمی ناکۆکی نێوان قورئان و ڕاڤە ئایینەکانە لە مەسەلە یەکلاکەرەوەکانی ئایینی حەق و تاکی خوادا.

بێگومان تۆمەتی قورئان بۆ جوولەکە لەبەر فرەیی کتێبە دابەزیوەکان بۆیان بەتایبەت تەورات و چەندین و دەیان لێکۆڵینەوەی هاوچەرخی زانستیدا دەرکەوتووەو ئاماژە بەوە دەکەن و پشتگیری هەڵوێستەکەی قورئان دەکەن، پێغەمبەر ﷺ کاتێ پەیوەندی کرد بە

---

١- الأديان في القرآن: د.محمود بن الشريف.

جوولەکەو مەسیحیەکانی مەککەو مەدینەوە -دەیتوانی لەبەر ڕازی کردنی ئەوان ئایینی خوا بگۆڕێت- بەڵام توانای ئەوەی هەبوو هەموو ڕاستیەکان بڵێت، جوولەکەو مەسیحیەکان پێش هاتنی پێغەمبەر ﷺ دەیانزانی ئەو پەیامە دێت چونکە لە تەورات و ئینجیلدا مژدەی هاتنی درابوو بەڵام تەنها کەمێکیان ئەو ڕاستیەیان نەشاردبوویەوە.

لە ڕاستیدا موحەممەد هەڵوەشێنەری پەیامی ناو کتێبە پیرۆزە کۆنەکان نەبوو، بەڵام خەڵکی ئەو کتێبەیان دەستکاری کردبوون، بۆیە ئەو کتێبەی ئەوکات لەبەردەستیاندا بوو ئەو کتێبە دابەزیوە نەبوو کە خوا ناردبووی بەڵکو دەستکاری و کەم و زیادی تێدا ئەنجام درابوو، ئەوەی کە موحەممەد دەیوت لە قورئاندا هەبوو و بە حەق لای خواوە دابەزی بوو، بەڵام ئەوەی لای ئەهلی کیتاب هەبوو تەنها دەستکاری کراوێ بوو، ئەوەی پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو و جوولەکە دەستکاری تەوراتیان کردووە تەنها بانگەشەیەك نەبوو بەڵکو ئەو ڕاستیە بوو کە هیچ نهێنیەکی تێدا نەبوو، هێندە لەو لارێکردنە ڕۆچووبوون کە نکوڵییان دەکرد لە هاتن و بانگەوازەکەی موحەممەد ﷺ لە کاتێکدا ئەوان ئەوەیان دەزانی، بەڵکو پێش هاتنی پێغەمبەر ﷺ لای خەڵك ئەوەیان باس دەکردو گوێ قوڵاخ بوون بۆ هەواڵی هاتنی وەك لە قورئاندا هاتووە ﴿الرَّسُولَ النَّبِيَّ الأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوباً عِندَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالإِنْجِيلِ﴾ چەندین ئایەتی قورئان ئاماژە دەدەن بەو لارێکردنە ﴿فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ يَكْتُبُونَ الْكِتَابَ بِأَيْدِيهِمْ ثُمَّ يَقُولُونَ هَـذَا مِنْ عِندِ اللّهِ﴾ ﴿وَإِنَّ مِنْهُمْ لَفَرِيقاً يَلْوُونَ أَلْسِنَتَهُم بِالْكِتَابِ لِتَحْسَبُوهُ مِنَ الْكِتَابِ وَمَا هُوَ مِنَ الْكِتَابِ وَيَقُولُونَ هُوَ مِنْ عِندِ اللّهِ وَمَا هُوَ مِنْ عِندِ اللّهِ﴾ ﴿قُلْ مَنْ أَنزَلَ الْكِتَابَ الَّذِي جَاء بِهِ مُوسَى نُوراً وَهُدًى لِّلنَّاسِ تَجْعَلُونَهُ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيراً﴾ بەوجۆرە قورئان بە ڕوونی بڕیاری ئەوە دەدات تەوراتی دەستاو دەستکردو توشی دەستکاری و گۆڕین و لەبیرکردن و داشاردن بووەو ئەو تەوراتە نیە کە خوا بە ڕێنمونی پیرۆزو شەریعەتی خواوە دایبەزاند ﴿فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَاقَهُمْ لَعنَّاهُمْ وَجَعَلْنَا قُلُوبَهُمْ قَاسِيَةً يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِ وَنَسُواْ حَظّاً مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِ﴾.

دکتۆر (هەریری لوی) جوولەکە نووسەری کتێبی (أدیان العالم الکبری) جەخت لەوە دەکاتەوە چەند بیرو باوەڕێ براونەتە ناو جولەکایەتیەوە لەڕێی فارس و بابل و ئیغریقیەوە وەرگیراون و لە جولەکایەتیدا هیچ سەرچاوەیەکیان نیە، پشتگیری ئەم قسە ئەوەیە کە زۆربەی توێژەران هێناویانەو دەڵێن لە ساڵی ٨٥٠ پێش زایینیدا نووسەرێ یان گێڕەرەوەیەکی عیبری هەوڵیدا لەڕێی (فلکلونی کەنعانی)ەوە چیرۆك و ئەفسانەی سەرزاری خەڵك بنوسێتەوەو گێرانەوەی پەیوەست بە خواوەندان (ابل و مروك و بعل) بنوسێتەوەو ئەو ئەفسانە بداتەوە پاڵ یەهوا، دواتر هەوڵیداوە مێژووی گەلەکەی لە چیرۆکی دروستبوونەوە بنووسێتەوە بەپێی ئەو باسەی لای بابلیەکان هەبووە، ئەم نووسەرە پێش ئیغریقیەکان کەوتووە بۆ نووسینەوەی داستانیانەی مێژوو و بنەماو رەگەزی هێلینی بلاوکردوەتەوە.

دکتۆر (یەعقوب صەروف) دەڵێت[1]: نازانرێ کێ یەکەم جار تەوراتی نوسیوەتەوەو ئەو سەردەمەی یەکەمجاریش کەیە کە تیایدا تەورات نوسراوەتەوە.

سەبارەت بە ئینجیل وەك ئەوە دەردەکەوێ کە قەشە (بابیاس) لە نیوەی یەکەمی سەدەی دووەمی کۆچیدا دەڵێت: مرقص گێڕانەوەیەکی پوترسی دەنووسیەوەو بەوردەکاریەوە هەرچیەکی دەنووسیەوە کە پوترس بیری وایە مەسیح و تێبینییان کردبێت بێ ئەوەی لەو کارەدا ریزبەندی مێژوویی رەچاو بکات، ئەمەشی بە زمانی ئارامی نووسیوەو دواتر وەرگێردرایە سەر زمانی یۆنانی، لەمەوە چوار ئینجیلەکە دروست بوون، دیارە لە سەردەمی نێردراواندا نوسراوەتەوەو ئەو کات نووسینی (پردی) باو بووەو یۆنانیەکان بە زمانی خۆیان نەمەری نووسیویانە.

دیارترین شتێ کە ئینجیل دەیخاتە ڕوو نەگونجان و ڕاجیاییە لە مێژووی لەدایکبوون و رەچەڵەك و سیفەت و مردنی مەسیح، ئەمەش لە ناکۆکیە لەنێوان تەوراتی سەبعینی و تەوراتی سامریدا، هەروەها ناکۆکی نێوان چوار ئینجیلەکەیە،[2] ئەمە وێڕای ئەوەی تەورات و

---

١- المتطف: ١٩٢٤

٢- الأدیان في القرآن.

ئینجیل لە چەندین زمانەوە وەرگێڕان بۆ سەر چەند زمانی تر و دوای ماوەیەك لە دابەزینیان نووسراونەتەوە، بۆیە دەقی فەرمایشتی خواو فەرموودەی پێغەمبەران نین، بەڵکو شوێنکەوتوانی پێغەمبەران ماوەیەکی زۆر دوای ئەوە ئەو پەیامانەیان نووسیوەتەوە، لەم بوارەدا ئینجیلەکان لە چەند ڕوویەکەوە لە قورئان جیاوازن:

**یەکەم:** قورئان یەك پەڕاوە بەڵام ئینجیلەکان چەند ئینجیلێکی جیاجیان.

**دووەم:** ئینجیلەکان دەدرێنەوە پاڵ نووسەرەوە مرۆڤەکان (لۆقا، یوحەننا، مرقص، مەتا) ئەو چوارەش هیچکامیان حەواری نەبوون، بەڵام قورئان دەدرێتەوە پاڵ خوای گەورە.

**سێیەم:** ئەو تێکەڵی و جیاوازییە زۆرانەی لە نێوان مۆرکی تەورات و ئینجیل و وەرگێڕانەکانیاندا هەن لەوانە ئەو هەڵانەی لە نەبوونی وردەکاری وەرگێڕان یان چاپەوە هەبوون یان هەیانە هەڵەو دەربڕینی دەست ئەنقەست لادەرو تەئویل کەرن، هەیانە ناکۆکی لەڕێی دەربڕینی پیتە نووسراوەکانەوەیە، ئیبن تەیمیەو چەندێکی تر بڕیاری ئەوە دەدەن وەرگێڕانی کتێبی پیرۆز لە عیبریەوە بۆ لاتینی کە بە نەسخ دەری دەبڕێ بووەتە هۆی ناکۆکی نانەوە، لە کاتێکدا لە قورئاندا هیچ جۆرە تێکەڵی یان هەڵە یان ناکۆکی و جیاوازییەك نیە) خوا دەفەرموێ ﴿وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ اللّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ اخْتِلاَفاً كَثِيراً﴾.

**چوارەم:** ئینجیل بە یەکدەنگی هەموو جیهان فەرمایشتی خوانیە، بەڵام قورئان فەرمایشتی خوایە، بەڵکو ئینجیلەکان فەرموودەی گەورەمان عیسا نین، لێرەوە ناکرێ بەراوردی ئینجیلەکان لەگەڵ قورئان و کتێبەکانی فەرموودەشدا بکەین.[١]

**پێنجەم:** نووسەرەوەکانی ئینجیل لە ئاستی پەیامە دابەزیوەکەدا نەبوون، (ئەرنست رینان) لە کتێبەکەیدا (تأريخ المسيح) دەڵێت: نووسەرەوەکانی ئینجیل کە وێنەی یەسوعیان بۆ کێشاوین لە ئاست خاوەن وەرگێڕاوەکەدا نەبوون و بەچەند قۆناغێ لەو دوور بوون تا ئاستێ کە کاتێ نەگەیشتە بەرزی ئەو زۆرجار بە جوانی بیروڕاکانی ئەویان دەرنەبڕی، نووسینەوەکانیان هەڵەو ناتەبایی زۆریان تێدایە، هەر دێڕێکی نووسینیان خوێنەر هەست بەوە

---

١- ئەم بەراوردکاریانەم بە پوختی لە کتێبی (الأديان في القرآن) وەرگرتووە.

دەکات جەمالێکی خوایی هەیەو نووسەر بەجوانی وەرینەگێراوەو نەیهێناوە چونکە لێی تێنەگەیشتووە، بۆیە گۆڕیویەتی بە بیری تایبەتی خۆی، بە کورتی خوێنەرەکانی یەسووع جوانی وێنەکەیان لاوازکردووە لەبری ئەوەی جوانتری بکەن، زۆرجار ئەو جوانیەیان دەست لێ داوەو لەبەردەستیاندا جوانیەکەیان لاواز کردووە.

(لاردنر) لە توێژینەوەکەیدا سەبارەت بە ئینجیلەکان دەڵێت: (بەهۆی نەزانی هەڵگرانی ئینجیلەکان) ئینجیلە پیرۆزەکان باش نەبوون سەبارەت بە باری دەسەڵاتی ئوگەستینۆس کاتێ لە قوستەنتینیە فەرمانڕەوا بوو، ئەم بڕوای وایە مەسیحیەکان بڕوایان وا نیە کە ئەو ئینجیلانە لە مەسیحەوە بن و بە نووسراوی حەواریەکانیشی نازانن، چونکە ئەگەر لە مەسیحەوە بوونایە دروست نەبوو ڕاستکردنەوەیان بۆ بەکاربێت.

(کهوف) بە وەرگرتن لە زمانی (سالیسوس) کە لە سەدەی دووەمی زاینیدا ژیاوە دەڵێت: مەسیحیەکان سێ یان چوار جار ئینجیلەکانیان گۆڕیون بەڵکو زیاتر لەوەش دەڵێم گۆڕانێک کە هەموو کرۆکی ئینجیلەکانی گۆڕیوە، زۆرێ لە مێژوونووسان ئاماژە بەوە دەدەن نوسخەی ئینجیلە ئەسڵیەکان لە سەدەی چوارەمدا فەوتا بوون و هیچ شوێنەوارێکیان نەما بوو چونکە لە سەردەمی قەیسەر دیقلیدیانوسدا لەگەڵ کتێبەکانی مەسیحییەکاندا سووتێنران.

لێرەدا دەردەکەوێ تا ئاماژە بدەین بە دیاردەی ناتەبایی ڕوونی نێوان عەهدی قەدیم و عەهدی جەدیدا لە ڕوانگەی خودی ئایینی چوار ئینجیلەکەوە کە لە زۆر مەسەلە و پرسی بنەڕەتیدا ناتەباو پێکەوە نەگونجاون، دیارترین ناکۆکی و جیاوازی نێوان ئەو دوو کتێبەش ئەوەیە کە خوای جوولەکەکان گۆڕاوە بۆ خوای مەسیحیەکان.

یەکێ لە گەورەترین ئەو شتانەی کە قورئان ئاماژەی پێکردووە ناکۆکی نێوان پەیامی ئیسلامە سەبارەت بە خوای گەورە کە بە خوای جیهانیانی دادەنێت لەگەڵ چەمك و پەیامی جوولەکایەتی کە بە خوای تایبەت خوای جەنگ و خوای بەنی ئیسرائیل بە تەنها و خوا یەهوە ناوی دەبەن وەك چۆن تەورات وەسفی کردووە خوایەکی توندو خراپ و وێرانکەرو خراپکارو خوێن ڕێژە (یەهوە خوای سەربازان) (ول.دیورانت) دەڵێت: جوولەکەکان یەکێ لە

خواکانی کەنعانیان لەو شێوەدا داناوە کە خۆیان لەسەری بوون و کردیان بە خوایەکی توندی خاوەن دیدی جەنگی و رەق، ئەم خوایە داوا لە خەڵك ناکات بڕوا بەوە بهێنن کە ئەو هەموو شتێ دەزانێ، هەروەها خۆی بەدوور لە تاوان نازانێ، بەدوای ئەو گۆڕینەدا لاڕێکردنێکی تر هات بەڵکو مەبەست لەم لاڕێکردنە لەپێناو ساختەکردنی پەیوەندی نێوان ئیبراهیم و موحەممەد بوو و هەوڵدان بوو بۆ ئەوەی ئیبراهیم تەنها لە جوولەکەدا کورت بکەنەوەو تەورات لە حەنەفیەتەوە بگۆڕن بۆ ڕەگەزپەرستی و ڕووداوە مێژووییەکان بەجۆرێ بگۆڕێ کە عەرەب و ئیسماعیل و کۆچی ئیبراهیم بۆ مەککە و بنیادنانی کەعبە بسڕنەوە، هاوکات مژدەی هاتنی موحەممەد ﷺ بسڕنەوەو میراتی ئیبراهیم تەنها بۆ یەك لق کورت بکەنەوە کە لقی ئیسحاق و یەعقوبە، هەوڵ بدەن ئەو دەسەڵات و ناوچە گەورەی خوا بە ئیبراهیم و نەوەکانی بەخشی وا ڕاڤە بکەن کە تەنها بۆ جوولەکەیە نەك بۆ هەموو نەوەکانی ئیبراهیم.

دکتۆر ئیسماعیل راجی فاروقی لە بەراوردێکی ڕوونی نێوان تەورات و قورئاندا ئەو لاڕێکردنە دەخاتەڕوو و دەڵێت: تەورات لە بازنەیەکی ڕەگەزپەرستیدا ڕاستیە مێژووییەکان دەخاتەڕوو بەڵام قورئانی پیرۆز لە بازنەی حەنەفیەتدا ڕاستیە مێژووییەکان دەخاتە ڕوو، بەڵام مەسەلەکە تەنها مەسەلەی جیاوازی دیدی حەنەفی نیە بەڵکو پاش ڕۆژگارێ گۆڕا، ئەمە واتای ئەوەیە کە حەنەفیەت ئەو حەقیقەتەیە کە قورئان ئاماژەی پێدەکات، بوونی حەنەفیەت لە تەوراتدا بە شێوەیەکی لاڕێکردوو بەڵگەیەکی دەرەکیە لەسەر ڕاستی هەواڵی قورئان.

ڕەگەزپەرستی وێنەی حیزبێ یان هۆزێکی خودی کۆچەران دەنوێنێ وەك ئەوەی خۆیان بە چاکترین دروستکراو بزانن و شوێن نیزامێکی ئەخلاقی وا دەکەون کە پاراستنی زنجیرەی ڕەگەزییان و تێکەڵنەبوون لەگەڵ هەر هۆز یان گەل یان نەتەوەیەکی تر بەجێدەگەیەنێت.

حەنەفیەت خودی کۆچەرانی خاوەن پەیامێ دەنوێنێ کە پەیامەکەیان بۆ هەموو مرۆڤایەتی هێناوەو بە تێکەڵ بوون لەگەڵ لەگەڵ جەستەی مرۆڤایەتیداو لەڕێی خزمایەتی دروست کردن و برایەتیەوە زمان و ڕۆشنبیری و پەیامی خۆیان خەڵات دەکەن و بڵاویدەکەنەوە، بەڵام کاتێ تەورات مۆرکی ڕەگەزپەرستی بەسەردا درا دەیوت: ئیبراهیم بۆیە

کۆچی کرد چونکە یەهوا (خوای جەنگ) فەرمانی ئەوەی پێکرد، بەڵام ئەو دەست ئەنقەست لەو فەرمانەی یەهوا بێدەنگ بووە، تەورات دەڵێ ئەوە بارێکی هەروایی عورفی بێ هۆکار بووە.

لە دیدی تەوراتدا خوا فەزڵداری کردووە چونکە خودی خۆیەتی، نەوەکانیشی فەزڵدار کردووە چونکە نەوەی ئەون، بەڵکو عەهدێ (نەم میثاق)ەی بۆ بڕیوەتەوە، (جیاوازی نێوان عەهد و میثاق ئەوەیە عەهد بۆ یەك ئاراستەیە، واتە بۆ یەك لایەن دەبێ) بەو پێیە ئەو عەهدەی لەسەرخۆی داناوە فەزڵی خۆی و نەوەکانی بدات بەسەر هەموانـدا و هەتا هەتایە وابێ تا ئەوەی خواکەشی وەك خوای تایبەتی ئەو ڕەگەزو جیا لە خوای خەڵك نیشان دەدات.

بەڵام قورئانی پیرۆز ڕایگەیاند خوا خوای هەموانە و زۆرو ستەمی نیە بەڵکو خۆشەویستی‌و سۆزی هەیە، جەخت لەوە دەکاتەوە کۆچی ئیبراهیم لەبەر یەکخواپەرستی بووەو خواش میساقێکی پێداوە کە لەسەر ئەوە باشترین پاداشتی دەکات ئەگەر خۆی و گەلەکەی سپاردەی ئاسمان بەجێ بگەیەنن، ئەگەریش ئەو سپاردەیە بەجێ نەگەیەنن خوا سەختترین سزای خۆی و گەلەکەی دەدات.

لەبەر تیشکی ئەو چەمکە ڕەگەزپەرستیەوە جوولەکە لە تەوراتیان نووسیوەو کردیان بە سەرچاوەیەك بۆ هەنگاونان بۆ ئامانجی خۆیان هەروەها دەڵێت ڕووداوە مێژووییەکان لە کۆچی ئیبراهیم و منداڵەکانی لە عێراقەوە بۆ شام و لەوێوە بۆ مەککەو تاقیکردنەوەیان لەمیسرو چەوسانەوەیان بەدەستی فیرعەون، پێنج سیفرەکە ئەم مێژووانەمان بە دیدێکی ڕەگەزپەرستی بۆ دەخەنەڕوو و پێگەی قورسایییان بۆ خۆیان داناوە، بەڵام قورئانی پیرۆز کە دەنگی حەقە ئەو ڕووداوانە لە دیدی حەنەفیەتەوە سەیر دەکات.

هەریەك لە (جادوماك) و (ماری لورا) کە دوو نووسەری فەرەنسین ئاماژە دەدەن بە وادەکەی ئیبراهیم و دەڵێن: ئەگەر ئایەتەکەی تەورات سەبارەت بەو وادەیە ڕاست بێ ئەوا ئەوە دەدەنەوە پاڵ ئیبراهیم (کە ئیسماعیل هی عەرەبە) توێژینەوەکان ئاماژە بەوە دەدەن ئەو شتانەی تەورات باسی کردوون لە کۆچپێکردنی و گواستنەوەو ڕیشەکێش کردنی دانیشتوان لە

فەلەستین ئەمانە درۆن و ڕەنگدانەوەی گیـانی ڕەگەزپەرسـتی بـەرزڕاگیری سـەدە یـەك دوای یەکەکانن، بێگومان هەڵەی جوولەکایەتی لـە خواپەرسـتیدا زۆرن و لاڕێکـاری نـاو تـەورات قووڵە بەتایبەت سەبارەت بە جەستەپێدانی خواو قسەکردن دژ بە پلەو پایـەی پێغەمبـەران و وێنا کردنی زاتی خوایی لە وێنەیەکی لاوازی مرۆییدا.

قورئان بە پەیامی خۆی ئەو ساختەیان تەفروتونا دەکات کە دەڵێن گوایە خوا دوای ئەوەی بە شەش ڕۆژ بوونی دروست کرد لە حەوتەم ڕۆژدا حەسـایەوە، قورئـان لـە چـەندین شـوێندا ئاماژە دەکات بەو درۆیەیان ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِـي سِـتَّةِ أَيَّـامٍ وَمَـا مَسَّنَا مِن لُّغُـوبٍ﴾ جوولەکە وا وەسفی خوایان دەکرد کە ماندوێتی پـەکی خـستووەو هـیلاك بووە، هەروەها ساختەی ئەو بانگەشەیان لەناو دەبات کە دەڵێن خوایەکی تایبەت بـە خۆیـان هەیەو گەلانی تریش خوای تریان هەیە، خوای بەنی ئیـسرائیل وەك خـوای گـەلانی تـر نیـەو ئەوان کوڕو خۆشەویستی خوای خۆیانن.

هەروەك قورئان ساختەکاری ئەوەیان ئاشکرا دەکات کە ڕوهبان و حیبرەکانیان دەکردن بـە خواو لەبری خوا دەیانپەرستن﴿اتَّخَذُواْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَاباً مِّن دُونِ اللّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَمَا أُمِرُواْ إِلاَّ لِيَعْبُدُواْ إِلَـهاً وَاحِداً لاَّ إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ ئەمە وێڕای چـەندین درۆیان دەخستە پاڵ ئیبراهیم و یـەعقوب و لـووط و مەسـیح و داود و سـاختەو لاڕێکردنـی مێژوویان، ئەوەی سەبارەت بە پێغەمبەران هێناویانە لەگـەڵ ئـەو پـاکێتی و عیـسمەتەیاندا ناگونجێ کە خوای گەورە بۆی پاراستبوون.

پێغەمبەران بەدوورن لەو هەموو خراپەو تۆمەتانەی کە تەورات داویەتیە پاڵیان بەتایبەت چیرۆکی لووط و کچەکانی و چیرۆکی سولەیمان و چیرۆکی داود و چـیرۆکی ئیـبراهیم وسـارەی خێزانی.[1]

یەکێ لەو باسانەی کە قورئـان وروژاندویـەتی بانگەشـەی خوایـەتی عیـسایە و بـە وردی لەگەڵ ئەو دەستە جیاجیایانەی مەسیحیەتدا مشتومڕ دەکات[2] کـە چـەند دیـدێکی جیایـان هەیە بەتایبەت بۆ سروشتی سەید مەسیح، ئەوە ڕوون دەکاتەوە سیانە خـوایی لاڕێکردنێکـە

١- الأديان في القرآن، محمود بن شريف.

٢- بگەڕێوە بۆ توێژینەوەکەی د.عرفان عبدالحميد مجلة كلية آداب، بغداد سنة ١٩٧٠.

تووشی بانگەوازی حەقی عیسا بووەو بانگەوازە ڕاست و حەقەکەی داننانە بە یەکخواپەرستی تەواو و ڕەهادا ﴿لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَآلُواْ إِنَّ اللّهَ هُوَ الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ﴾ ﴿لَّقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُواْ إِنَّ اللّهَ ثَالِثُ ثَلاَثَةٍ وَمَا مِنْ إِلَـهٍ إِلاَّ إِلَـهٌ وَاحِدٌ﴾.

قورئان ئەوە ئاشکرا دەکات عیسا پێغەمبەری خوایەو خوا ئینجیلی بەڕاستدانەری تەورات بۆ ناردووەتە خوار، وەك پێغەمبەر ناردویەتی بۆ بەنی ئیسرائیل ﴿وَآتَيْنَاهُ الإِنجِيلَ فِيهِ هُدًى وَنُورٌ وَمُصَدِّقاً لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ التَّوْرَاةِ﴾ هەروەها عیسا ئالای بانگەواز بۆ پەرستشی خوای تەنهای هەلگرتووەو مزدەی داوە بە هاتنی پێغەمبەری نەخوێندەوار، عیسا ڕایدەگەیاند هاتووە تا هەندێ شت حەڵاڵ بکات کە جولەکە لەسەر خۆیان حەرامیان کردبوو.

قورئانی پیرۆز بڕیاری ئەوە دەدات ئینجیل تووشی دەستکاری و گۆڕین بووە لە چەند مەسەلەی سیانە خوایی و ڕزگاری و خاچ و خوایەتی عیساو مەسەلەی تریشدا، مەسیح لە خاچ نەدراو بەڵکو هاوشێوەکەی مەسیحیان لێ بوو بە مەسیح، هەڵەی ئادەم هەڵەی هەموو مرۆڤایەتی نیە، بەڵکو لای پەروەردگاری چەند پەیامێکی پێگەیشت و تەوبەی کردو گەڕایەوە بۆ لای خواو ڕێنمونی خوای پێ بەخشرا.

مەسیحیەت ئایینێکی جیهانی نیە، بەڵکو کۆتا پەیامی ئاسمان بۆ بەنی ئیسرائیل بە تایبەت ئەو سەربڕاوەش کە ئیبراهیمی خەلیل بۆ فیداکردن پێشکەشی کرد ئیسماعیل بوو نەك ئیسحاق وەك ئەوەی لە تەوراتدا باسکراوەو مەسیحیەکان بڕوایان پێیە (گوایە ئیسحاق بووە)، مەسیح بەندەو پێغەمبەری خوا بووەو دایکیشی ڕاستگۆ بووەو مەسیح خوا نەبووە، بەڵکو خواردنی خواردووەو بە بازاڕدا هاتوچۆی کردووە، قورئان ئەوەش ڕوون دەکاتەوە دروست کردنی ئادەم زۆر سەرسوڕهێنەر ترە لە دروستکردنی عیسا، ئیسلام هەڵەی بیروباوەڕی سیانە خوایی ڕوون دەکاتەوە ﴿لَّقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُواْ إِنَّ اللّهَ ثَالِثُ ثَلاَثَةٍ﴾.

قورئان نکوڵی دەکات لە بیروباوەڕی لەخاچدان و دەفەرموێت عیسا لەخاچ نەدراوەو نەکوژراوە، قورئان گەورەترین ساختەی تەورات ئاشکرا دەکات کە نکوڵی کردنە لە زیندووبوونەوەو پاداشت وەرگرتن و دانانی دنیا بە هەموو شتێ و هەوڵدان بۆ دنیا کە بە

باڵاترین ئامانجی دەزانێ و ئاماژە ناکات بە ژیانی دوای مردن و باسی هەتاهەتایی و خلوود بەهیچ جۆرێ نەهاتووە، دەرفەتی جوولەکایەتی تەنها ئەم جیهانەیە بێ ڕوانینە ئەودیو ئەوەش، لە کاتێکدا مەسیحیەت تەنها جیهانی ئەودیو دەناسێ (مەملەکەتی من لەم جیهانەدا نیە) جوولەکایەتی باسی مانەوەی هەتایی ڕۆح لەدوای مردن ناکات یان باسی زیندووبوونەوەو موحاسەبەو سزا ناکات و پێی وایە زیندوو بوونەوەو پاداشت هەر لە دنیادا هەیە، قورئان هەموو ئەم ساختانە ئاشکرا دەکات.

سیفری جامعە دەڵێت (مرۆڤ تایبەتمەندی بەسەر ئاژەڵدا نیە چونکە هەردووکیان بەتاڵ و پووچن هەردووکیان بۆ یەك شوێن دەچن، هەردووکیان لەخۆڵ بوون و بۆ خۆڵ دەگەڕێنەوە).

قورئان لەگەڵ دەستەو ئایینە جیاجیاکاندا چەندین مەسەلەی جیاواز مشتومڕ دەکات، لەگەڵ ئایینە بتپەرستیەکانی مەجوس وەك زەردەشتی و مانەویدا مشتومڕ دەکات و بەرامبەر ئەو بانگەشەیان دەوەستێ کە دەڵێن دوو خوای دروستکەر هەن: یەکێکیان چاکە دروست دەکات و دەیشارێتەوە، ئەوی تر خراپە دروست دەکات و دەیشارێتەوە، خوا دەفەرموێت ﴿لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلَّا اللَّهُ لَفَسَدَتَا فَسُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾ هەروەها ﴿مَا اتَّخَذَ اللَّهُ مِن وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُ مِنْ إِلَهٍ إِذاً لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَهٍ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾.

هەروەك قورئان ڕاستی ئایینی کۆنی میسرییەکان ڕوون دەکاتەوە کاتێ فیرعەون وەك خوا لە دیدی میسریەکانەوە سەیرکراوەو پەرستراوە ﴿فَحَشَرَ فَنَادَى فَقَالَ أَنَا رَبُّكُمُ الْأَعْلَى﴾ ئەمە هەمان شتە کە مێژووش دەیڵێت پاش ئەوەی لە دوو سەدەی کۆتاییدا پەردەی لەسەر هەڵدەماڵێت چونکە میسرییەکان پاشایان پیرۆز ڕاگرتووەو بە گەورەی خواکانیان داناوەو ناویان ناوە (حۆرسی زیندوو)، قورئان لە سوورەتی شوعەرائدا ئاماژە دەدات بە دەقی پەیامی فیرعەون بۆ مووسا ﴿قَالَ لَئِنِ اتَّخَذْتَ إِلَهاً غَيْرِي لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ الْمَسْجُونِينَ﴾ لە سوورەتی القصص دا گوتاری فیرعەون بۆ گەلەکەی دێنێ ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَهٍ غَيْرِي﴾ هەروەك لەسەر زمانی یووسف پێغەمبەر وەسفی ئایینی میسرییەکان دەکات ﴿يَا

صَاحِبَيِ السِّجْنِ أَأَرْبَابٌ مُّتَفَرِّقُونَ خَيْرٌ أَمِ اللّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ﴾ چونکە میسریەکان چەندین خواوەندیان دەپەرستن تا ئاستێ هەر شارێ خواوەندی تایبەتی خۆی هەبوو.

قورئانی پیرۆز مەسەلەی نەسخ باس دەکات کە جوولەکە نکوولی لێ دەکەن و بانگەشەی ئەوە دەکەن شەریعەت تەنها یەك شەریعەتەو بە مووسا دەستی پێکردووەو بە مووسایش کۆتایی پێ دێ، ئیتر پێش ئەوە هیچ شەریعەتێ نەبوو و نابێ دوای ئەویش شەریعەتێکی تر هەبێ،[1] قورئان بەم دەقە مشتومڕیان لەگەڵ دەکات ﴿مَا نَنسَخْ مِنْ آيَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَا أَوْ مِثْلِهَا﴾ هەروەها ﴿وَإِذَا بَدَّلْنَا آيَةً مَّكَانَ آيَةٍ وَاللّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ قَالُواْ إِنَّمَا أَنتَ مُفْتَرٍ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ﴾.

قورئان ساختەی فەلسەفەی یۆنانی ئاشکرا دەکات و بەرامبەر ئەو بیرۆکەیە ڕادەوەستێ کە دەڵێت خوا تەنها شتە گشتیەکان دەزانێ و وردەکاریەکان نازانێ، لەوانە ئەرستۆ نکوولی دەکات لە ویست و بەڕێوەبردن و زانستی وردەکاری خوا، قورئان ڕاماندەچڵەکێنێ کە خوای گەورە هیچی دروست نەکردووەو پشتگوێی بخات و چاودێری بۆ نەبێ یان زانستی تەواوی پێی نەبێ، بەڵکو زانستی خوا بەسەر هەموو شتێکدا زاڵە ﴿أَلاَ لَهُ الْخَلْقُ وَالأَمْرُ تَبَارَكَ اللّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾ ﴿يُدَبِّرُ الأَمْرَ يُفَصِّلُ الآيَاتِ﴾ ﴿يُدَبِّرُ الْأَمْرَ مِنَ السَّمَاءِ إِلَى الْأَرْضِ ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ﴾ ﴿وَعِندَهُ مَفَاتِحُ الْغَيْبِ لاَ يَعْلَمُهَا إِلاَّ هُوَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ﴾.

(بارکلی) دەڵێت: هەندێ فەیلەسووف لەگەڵ قەناعەتیان بە حیکمەت و توانای خوا کە لەو شتانەدا دەردەکەوێ کە گونجاوو ڕێکخراون و نیزامێ دادەنێ کە حوکمی جیهان بکات کەچی پێیان وایە دوای زامنکردنی نیزامەکەی و زیندوکردنەوەی جوولە و بزاڤ تیایدا وازی لەم جیهانە هێناوە وەك چۆن دروستکەری کاتژمێرێ دوای دروست کردنی واز لە کاتژمێرەکە دێنێ، بەڵام ئەو زمانەی کە خوا ئێمەی پێ دەدوێنێ بەڵگەکەی تەنها بۆ ئەوە نیە کە ئەم بوونە دروستکەرێکی هەیە بەڵکو پلاندانەرو بەڕێوەبەرێکی هەیەو گرنگی پێدەدات و ڕاستەوخۆ ئاگادارە بە دەرو ناخی و هیچ ویستێ یان جووڵەیەکی ئێمەی لێ ون نابێ،

---

۱- لە توێژینەوەکەی د.عرفان عبدالحميد مجلة كلية آداب، بغداد سنة ۱۹۷۰.

هەمیشە گرنگی هەیە بۆ کـەمترین کارمـان و بەدرێـژایی هـەموو ژیانمـان پـرۆژەو کارمـان دەزانێو زاڵە بەسەر بارو حاڵماندا.[1]

گرنگترین تایبەتمەندی قورئان لە بواری ڕوانینە کتێبە ئاسمانیەکانی تردا ئەوەیە کە خـودی قورئان دەربڕیوەو باسی دەکات کە قورئان هەژموونی مێـژوویی و زانـستی هەیـە ﴿وَأَنزَلْنَـا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقاً لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِناً عَلَيْهِ﴾ قورئـان لـە مێـژوودا مۆرکی تایبەتی خۆی هەیەو ڕووداوەکان بەجۆرێ دێنێ سەربەخۆیی زانستی نیـشان دەدات و لەو نێوەندەدا ئسلوبی تایبەتی خۆی هەیە کە بەڵگەی سەربەخۆییەتی،[2] شتانێ باس دەکـات کە تەورات و ئینجیل باسیان نەکردوون.

**یەکەم:** یەکخواپەرسـتی ئیـبراهیم و شـکاندنی ئـەو بتانـەی کـە بـاوکی و کەسـوکاری و گەلەکەی بەپیرۆزیان دەزانین، ئەمانـە لـەپێش قورئانـدا هـیچ زانیـاری و باسـێکیان لەسـەر نەهاتووە.

**دووەم:** تـەورات باسـی ژیـانی ئیـبراهیم لـەنێو کلدانیەکانـدا و هەوڵـەکانی ناکـات کـە هەوڵیداوە قەناعەتیان پێ بکات یەك خـوا هەیـەو هەوڵیـداوە بانگەوازەکـەی بڵاوبکاتـەوەو بتەکانیان تێکبشکێنێ و باسی ئەوەی ئیبراهیمیان خستوەتە ناو ئاگرو خوا ڕزگاری کـردووە، باسی پەیوەندی لەگەڵ باوکی و باسوخواسی نێوانیـان ناکـات، باسـی بنیادنانـەوەی کەعبـە لەلایەن ئیبراهیم و ئیسماعیلەوە ناکات لەکاتێدا قورئان هەموو ئەم باسانەی هێناوە.

**سێیەم:** تەورات باسی چۆنێتی پاکێتی یووسف ناکـات سـەبارەت بـەو بوختانـەی لەسـەر ژنەکەی عەزیزی میسر بۆی کرا لە کاتێکدا قورئان زۆر بە وردی باسی کردووە کە یـەکێ لـە کەسوکاری ژنەکە شایەتی حەقی داوەو خواش شایەتیەکەی لەسەر زمانی یەکێ لـە کەسـانی ژنەکە دەرخستووە تا بەڵگەی پاکی و بێتاوانی یووسف بەهێزترو دڵنیاتر بێ.

---

١- د.يحيى هويدي.

٢- محمود بن الشريف: الأديان في القرآن.

**چوارم:** قورئان باسی سەرسامی خەڵکی کردووە بەرامبەر ئەو ئسلوبەی کە یووسف بۆ حەوت ساڵ گەنمی لە خراپ بوون پاراست.

**پێنجەم:** قورئان چەندین مەسەلەی هێناوە کە تەورات نەیهێناون، لەوانە مەسەلەی مووسا:

١- ئەو مەرجەی کە شوعەیب لەسەر مووسای دانا تا یەکێ لە دوو کچەکەی خۆی لێ مارە بکات و بردنە سەری ئەو ماوەیە لەلایەن مووساوە.

٢- بڕواهێنانی ئەو جادووگەرانەی بەرامبەر مووسا وەستابوون و سوجدەبردنیان بۆ خواو سزاو لەخاچدانیان لەلایەن فیرعەونەوە.

٣- ژنەکەی فیرعەون و بڕواهێنانی بە نهێنی، فەرمانی فیرعەون بە هامان تا بۆ دروست بکات تا بگاتە لای خواکەی مووسا.

٤- مانەوەی جەستەی فیرعەون دوای خنکانی.

٥- ئەو باوەڕدارەی بنەماڵەی فیرعەون کە گەلی ڕێنموونی دەکرد.

هەژموونی قورئان تەنها هەژموونێکی مێژوویی نییە بەڵکو هەژموونە لە بوارە جیاجیاکانی تەشریعی و ئەخلاقی و پەروەردەیی و کۆمەڵایەتیدا، وێڕای زانستە زانستی و گەردوونی و پزیشکیەکان کە بەردەوام ڕۆژ دوای ڕۆژ نهێنیەکانی ئاشکرا دەبن، لەوانە باسی پێستی بێباوەڕان کە قورئان باسی کردووە ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ بِآيَاتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَاراً كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُمْ بَدَّلْنَاهُمْ جُلُوداً غَيْرَهَا لِيَذُوقُواْ الْعَذَابَ﴾.

دکتۆر (عەبدولعەزیز ئیسماعیل) لە کتێبەکەیدا (الأسلام و الطب الحديث) دەڵێت: حیکمەتی گۆڕینی پێستی بێباوەڕان ئەوەیە دەمارەکانی ئازار لە چینی پێستدان، بەڵام جازوو بەشەکانی ناوەوە هەستیان لاوازە، بۆیە ئەو سوتانە ساکارەی کە تەنها لە پێستدایە ئازارێکی زۆر سەختی هەیە بە پێچەوانەی ئەو سووتانە زۆرەی کە لە پێست دەردەچێ چونکە هەرچەندە زۆرتر و مەترسیدارترە بەڵام ئازارێکی زۆری نیە.[1]

١- الأديان في القرآن.

ئیسلام سوورە لەسەر ئەوەی نەهێڵێ موحەممەد ببرێتە ئاستی خوایەتی و ڕاشکاوانە ڕایدەگەیەنێت موحەممەد مرۆڤێکی ئاساییەو بەندەو نێردراوی خوایەو هیچ هەژموونێکی بەسەر خەڵکدا نیە ﴿لَستَ عَلَيْهِم بِمُسَيطرٍ﴾ هەروەها موحەممەد غەیب نازانێ و هیچ سوود و زیانێکی بۆ خۆی بەدەست نیە، بەڵکو زۆرجار لە قورئاندا سەرکۆنەی پێغەمبەر ﷺ کراوە.

بەڵام مەسیحیەکان دروستکەرو دروستکراویان تێکەڵ کردووەو عەقڵ و فیترەتیان داون بەیەکدا، لەدایکبوونی عیسا بەبێ باوك جێی ناکۆکییەکی بەرفراوانی نێوان ئەو جوولەکانە بوو کە ئەوبەریان گرتبوو و بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە (زۆڵە) و دایکی یاخی بووە، ئەمانە ناکۆکن لەگەڵ ئەو مەسیحیانەدا کە لاکەی ترلایان گرتووەو دەڵێن مەسیح خوایەکە لە شێوەی مرۆڤدا.[1]

بەڵام موسڵمانان میانڕەون و حاشا دەکەن لەوەی دایکی زینای کردبێ بەوە پێچەوانەی جوولەکە دەڵێن، نکوولی دەکەن لە خوایەتی عیسا، بەمە پێچەوانەی مەسیحییەکان دەڵێن، موسڵمانان دروستکەرو دروستکراو و خوایەتی و پێغەمبەرایەتی لەیەك جیادەکەنەوە.

ئیسلام دان دەنێ بە هەموو ئایینە دابەزیوەکاندا و دان دەنێ بە هەموو پێغەمبەراندا بەڵام جوولەکایەتی و مەسیحیەت دان نانێن بە ئیسلامدا، لە کاتێکدا ئیسلام سیستمی پێکەوە ژیان لەگەڵ ئایینەکانی داناوەو بە تەواوەتی بەرپەرچی ئەوە دەداتەوە هیچ زۆرێ لە هەر کەسێ بکرێ بۆ وازهێنان لە ئایینی خۆی، بەڵام لە ئینجیلدا هاتووە (ناچاریان بکەن ئایینەکەی ئێوە وەرگرن)، موسڵمانان سوورن لەسەر پاراستنی پەرستگاکانی مەسیحی و جوولەکەکان و ئیسلام ڕێگری لێ کردوون ڕوهبان و منداڵ و ژنیان بکوژرێن، بەڵکو بەجێگەیاندنی بۆنە ئایینیەکانی بۆ پاراستون، بەڵام جوولەکەو مەسیحییەکان لەو جۆرە باس‌و خواس و بوارانەدا بەوپەڕی دڵڕەقیەوە لەگەڵ موسڵماناندا جووڵاونەتەوە.

---

١- من بحث الأستاذ عبدالحى الغمراوى عن الفكر الأسلامي.

# بەشی سێیەم
# (ئیسلام و ئایینەکان)

## باسی یەکەم
## (مەشخەڵەکانی ئیسلام)

### (١)

* یەکخواپەرستی:

١-بڕوابوون بەخوای تاك و تەنها بێ ئەوەی هاوەڵی بۆ دابنرێ یان بکرێ بە دوو خـوا یـان فرەخوایی.

٢- بڕوابـوون بـە پـەیامی هـەموو پێغەمبـەران و کتێبـە دابـەزیوەکان کـە لای خـواوە دابەزیون.

٣- داننان بە یەکبوونی مرۆڤایەتی و یەکبوونی ئاین و یەکبوون و چەسـپاوی ئەخلاقـداو نکوڵی لە چەمك و واتای حلول و ئیتیحادو داننان بە تاك و تەنهایی خواداو بە تەنها دانانی بەوەی یەکەمینەو پێش ئەو هیچ نەبووەو کۆتاییەو دوای ئەو هـیچ نـەبووەو نابـێ و هـەموو بوون دروستکراوی خوایە.

ئیسلام پەیوەندی نێوان مرۆڤ و پەروەردگاری بـە پەیوەندیـەکی ڕاسـتەوخۆی بـێ نێوەنـد داناوەو یەکخواپەرستیشی بە یەکەم پێناو داناوە کە هەستی عیزەت و ڕێزداری و سـەرکەوتن بەسەر ڕووداو و مەترسیەکانی پێدەبەخشێت.

**(٢)**

کۆکردنەوەی بیروباوەڕو تەشریع و ئەخلاق لەگشتیەکی تەواو و کامڵداو پەیوەست کردنیان بەجۆرێ ئەو سێ لایەنە لەیەك جیا نەکرێنەوە، بۆیە ئیسلام جیاوازی ناکات لەنێوان بیروباوەڕدا وەك عیبادەت و شەریعەت وەك یاسا و ئەخلاق وەك پەرژینێکی تەواو کە تیایدا هەموو بەهاکان ببزوێن، هەروەها فەرزەکانی ئیسلام لە توانای مرۆڤ زیاتر نین و ئیسلامیش زێدەڕۆیی و پیسکەییش بەرپەرچ دەداتەوە.

**(٣)**

ئازادی بیر: بنەمای ئازادی ڕادەربڕین لە ئیسلامدا دیارو بەرچاوە ﴿لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ﴾ گەورەترین ئازادی بۆ بیرو هزر لە ئیسلامدا ئازادکردنیەتی لە بتپەرستی و ماددیگەرایی، ئیسلامیش یەکەم ئایین بوو جیهانی فێرکرد چۆن ئازادی ڕادەربڕین لەگەڵ ڕاوەستاوی ئایینداو بگونجێنێ و موسڵمانێتی ئیسلامەتی دروست بێ و لەهەمان کاتیشدا بیر ئازاد بێ.

**(٤)**

کەس باری تاوانی کەس هەڵناگرێ:

مرۆڤ بەرپرسیار نیە لە تاوانی کەس، تاوانێ هەر چۆن و چەندە بێ هی هەرکەس بێ ناکرێ بەسەر هەموو خەڵکدا یان هەموو مرۆڤایەتیدا بسەپێنرێ، بەڵکو ئیسلام بۆ هەر مرۆڤێك بەپێی کارو کردارو هەڵسوکەوتی خۆی لەگەڵیدا دەجووڵێتەوە، ئیسلام ئازادی ڕادەربڕین و پەیڕەوی کاری داناوەو بڕیاری ئەوەی داوە بنەڕەتی مرۆڤ کاری چاکەیە بە پێچەوانەی وتەی چەند ئایینێکی تر کە دەڵێن مرۆڤ بە هەڵەو تاوانەوە دروست کراوە یان لە سەرەتاوە لەبیر کراوبووە، لە کاتێکدا قورئان بڕیاری ئەوە دەدات مرۆڤ بە بەرچاوی و بەتەواوی دروست کراوەو هیچ تاوانێ نیە پێش لەدایکبوونی مرۆڤ بۆ کەس بە میراتی بێنێتەوەو پێویست ناکات لەبری کەسی تر تەوبەی لەسەر بکات.

(گۆستاف گرۆنیام) دەڵێت: مرۆڤی ئیسلامی جیا لە کەسانی تر لەژێرباری تاوانی بنەڕەتیدا ناناڵێنێ، ئەو تاوانە بنەڕەتیەی لای کەسی تر حوکمی خراپەو لاری بەسەر کەسەکاندا دەدات.

( ٥ )

لە ئیسلامدا گونجاویەك هەیە لە نێوان بیروباوەڕو ئەخلاقداو ئەخلاق لە بیروباوەڕ جیاناکاتەوەو تەنها لە بازنەی بڕوابوون بە خوادا بڕیاری ئەخلاق دەدات.

## ( ٦ ) جیهاد

جیهاد کرۆکی ئیسلام و بەرزترین بڕیارو فەرزی ئیسلامە، لە ئیسلامدا جەنگی ڕێی خوا جیهادێکی پیرۆزە لەڕێی ئایین و حەقدا و بانگەوازە بۆ ڕێزگرتنی بەڵێن و وەفاداریە بۆ بەڵێننامەکان، لە ئیسلامدا هێز تەنها بۆ لابردنی ستەم یان ڕێککردنەوەی لاریەکان بەکاردێت.

لە ئیسلامدا ئاشتی بنەماو بنەڕەتەو جەنگ تەنها بۆ زەروورەتە، ئیسلام کاتێ لەگەڵ ناموسڵماناندا دەجەنگێ کە دژی بانگەوازەکەی بوەستن و ڕێ بە بیری بگرن و هێرش بکەنە سەر خاکی و بیانەوێ ئازاری موسڵمانان بدەن، ئەگەر ئەوان دژ بە ئیسلام و موسڵمانان نەجەنگن ئەوا ئیسلام ڕێ دەدات پەیوەندییان لەگەڵدا ببەسترێ.

## ( ٧ ) ( بڕوا بوون بە ڕۆژی دوایی )

بڕوا بوون بە ڕۆژی دوایی و زیندووبوونەوەو پاداشت وەرگرتن و بڕوابوون بەوەی ئەم دنیایە شوێنی ئەزموون و کاروکردارە، بڕوابوون بە پەیوەندی نێوان دنیاو ڕۆژی دوایی.

## ( ٨ ) ( بەرپرسیارێتی تاکەکەسی و پەیوەستی ئەخلاقی )

داننان بە بەرپرسیارێتی تاکە کەسی و پەیوەستی ئەخلاقیدا کە ئەمانەش جێی حسابکردنن هەروەك ئیسلام بەرپرسیارێتی تەواو بۆ چینی لاواز دادەنێ تا وەرگرتن و دانەوەیان بۆ هەبێ، لە ئیسلامدا چاودێری کەس بەسەر کەس و دەستە بەسەر دەستەوە نیە

بەڵکو چاودێری خوایە بۆ بەندەکەی و موسڵمان دەبێ چاودێری پەیوەندی خۆی و پەروەردگاری بێ.

(٩)

کۆکردنەوەی پەیوەندی نێوان چەسپاو و گەشەسەندوو، هەندێ چەسپاو هەن کە گۆڕاویان نیە، ئەوە ئەو بنەڕەتانەن کە بزاڤی بەشەکانی لەسەر وەستاوە.

(١٠)

شەریعەتی ئیسلامی شەریعەتێکی جیهانیە کە بۆ هەموو سەردەم و شوێنێ گونجاوە و چوارچێوەیەکی پایە چەسپاو و نەرم و خاوەن بنەڕەتی گشتیە و چەند بنەڕەتێکی گشتی هەن کە جێی گۆڕان و گەشەو دەستکاری نین، ئەمانە بڕێ دەدەن بە ئازادی بزاڤ و جموجوڵ و شێوە وەرگرتن لەناوخۆدا بەجۆرێ گونجاو بێ دەکرێ بەپێی سەردەم و کەش و بارودۆخ ئیجتیهادیان تێدا بکرێ.

ئیسلام دەرگای ئیجتیهادی بۆ خەڵك کردووەتەوە تا لە ڕاستیەکان تێبگەن، شەریعەتی ئیسلامی پاداشتی سزای تەنها بۆ خودی کەسی تاوانبار داناوەو وەك جوولەکە نیە توندی بنوێنێ و وەك مەسیحی جڵەوی شل نەکردووە، بەڵکو لەو نێوەندەدا هەڵوێستی میانەڕەوی گرتوەتەبەرو شتە بەسوودەکانی ڕەواکردووەو زیانبەخشیەکانی حەرام کردووە.

(١١)

مەعریفە دوو بەشی هەیە: ڕۆح و عەقڵ یان سروش و هزر، سروش بنەڕەت و عەقڵ لە سنوری ئەرك و توانای خۆیدا خزمەتکاری سروشە، بنەڕەتی ڕێبازی مەعریفە چەمك و واتای قورئانیە نەك ڕێبازی فەلسەفە، ئیسلام بانگەواز دەکات تا داوای بەڵگە بکەین و ڕێگری کردووە لە زاڵبوونی ئارەزوو یان دەمارگیری لە خستنەڕووی حەقیقەتدا، ئیسلام دەرگای ئیجتیهادی لە تێگەیشتنی ڕاستیەکاندا کردووەتەوەو کورتی نەکردووەتەوە بەسەر دەستەیەکی تایبەتی خەڵکدا.

دەستوری زانستی داناوەو بانگەواز دەکات بۆ هەڵنەخەڵەتان بە خەیاڵ و وەهم و تاونەدانە گومان و بانگەواز دەکات تا پرسیار لە شارەزایان بکەن و بەبێ بەڵگە هیچ نەڵێن و عەقڵیان بخەنەکارو تەقلیدی کەس نەکەنەوەو لە ڕوانیندا ئازاد بن و هیچ شتێ ڕێی ئەو ئازادیەیان لێ نەگرێ، بڕیاری ئەوەشی داوە شاردنەوەی زانست بەهیچ جۆرێ دروست نیەو دەبێ لەناو خەڵکدا بڵاوبکرێتەوە و سزای ئەوەش دەدات کە زانست دەشارێتەوە، ئازادی توێژینەوەی دانەخستووە بەڵکو ئازادی کردووەو دەسەڵات و زاڵی بۆ بەڵگە هێشتوەتەوەو بانگەواز دەکات بۆ ڕزگاربوون لە پاشکۆیی و تەقلید.

(١٢)

جیهان هەتا هەتایی و ئەزەلی نییە بەڵکو هاتووەتە بوون و هەموو شتێ تیایدا ماوەیەکی دیاری کراوی هەیە.

(١٣)

ئیسلام خوایەتی و مرۆڤ بوون لەیەك جیا دەکاتەوە وەك چۆن خواو جیهان لەیەك جیادەکاتەوەو شەریك دانان بۆ خواو تەناسوخ یان توانەوە (حلول) و ئیتیحاد بەرپەرچ دەداتەوە، هیچ کەسێ نیە ئەرکی لەسەرشان نەمێنێ با لەوپەڕی پلەو ئاستی پەرستشدا بێت.

(١٤)

ئیسلام بنەڕەتی برایەتی جیهانی داناوە کە لەسەر پەیوەندی و یەکسانی دامەزراوەو بەندایەتی و نیزامی بەرزڕاگرتنی چینی تایبەت لەناو دەبات و کۆیلایەتی و سوخرە هەڵدەوەشێنێتەوەو کۆیلە ئازاد دەکات و بەچەندین شێوە لە چوارچێوەی برایەتی مرۆییدا دەستیان پێوە دەگرێ، ئیسلام لەسەر بنەمای ڕەنگ یان ڕەگەز یان زمان جیاوازی نێوان کۆمەڵ و دەستەکان ناکات و یەکسانی لەنێوان هەموو ڕەگەزەکاندا چەسپاندووە، ئیتر فەزڵی سپی بەسەر ڕەشدا نابینێ تەنها بە لەخواترسی نەبێ، یەکبوونێکی جیهانیشی داناوە کە ڕەگەزو گەل و نەتەوە جیاجیاکان کۆدەکاتەوە بە چاوپۆشی لە جیاوازی ڕەنگ یان ئایین یان زمان.

هەروەها ئیسلام دژی ئەوەیە دەستەیەکی دیاری کراو هەبن بە ئایینی خوا بەڵێنێکی تایبەت بۆ خۆیان دابنێن تا ببنە گەورەی جیهان بەڵکو بەڵێنی خوا بۆ خەڵك لەخواترسانە، بەمە ئیسلام ئەو بانگەوازەو ڕەگەزپەرستیە لەناو دەبات کە لەسەر بنەمای ڕەگەز و خوێن دامەزراوەو ڕێ نادات کەسیان فەزڵی خۆی بەسەر ئەوی تردا بدات، ڕەگەزو خوێنی نەکردووە بە پێوەری ئاستی خەڵك بەڵکو لە ئیسلامدا گونجان و ڕێزگیری خوێن و سامانی خەڵك لەنێو خۆیاندا هەیە.

**(١٥)**

ئیسلام دان دەنێت بە ویستەکانی مرۆڤایەتیداو لە چوارچێوەی ڕێسا شەرعی و ئەخلاقیەکاندا ڕێیان پێدەدات و دان دەنێت بە هەڵەداو ئاستی تواناکان ڕەچاو دەکات بەوە خوای گەورە تەنها هێندەی توانای کەسەکە ئەرکی لەسەر دادەنێ.

هەروەها لە ئیسلامدا لێخۆشبوون و تەوبەکردن هەیە ﴿فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلاَ عَادٍ فَلا إِثْمَ عَلَيْهِ﴾ لە هەمان کاتدا کە ئیسلام دان دەنێت بە ویست و حەزە مرۆییەکاندا مرۆڤی لە ئارەزووپەرستی یان جەستە پەرستی یان پەرستشی جگە لە خوای تاك و تەنهای حەق ڕزگارکردووە، بەڵکو ئیسلام داوا دەکات سەرچاوەو جووڵەی ئەو ئارەزووانە پوخت ڕاگیرێ و لەو سنوورەدا کە زیان بەتاك و کۆمەڵگە نەگەیەنێت دەیوەستێنێ، بەشێکی مامناوەندی خۆشی و کەیفی لەناو بازنەی ڕێساکاندا ڕەوا کردووە، ئەو ڕێسایانەی ناهێڵن کەسێتی مرۆیی لەناو بچێ.

**(١٦)**

بانگەواز کردن بۆ بەخشین.

**(١٧)**

جیاکاریەکی ڕوونی نێوان کڕین و فرۆش و سوو، بە تەواوەتی سوو حەرام دەکات ﴿وَأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا﴾.

(١٨)

ئیسلام بڕیاری ئەوە دەدات کۆمەڵگاکان چەند بنەماو یاسایەکی تایبەتیان هەیەو بوونی مرۆییش چەند ڕێسایەکی هەن کە سوننەتەکانی خوان لە بووندا، ئەو سوننەتانەی کە هیچ گۆڕانێکیان نیەو حوکمی ژیارو شارستانیەتەکان دەکەن، لە قورئاندا پێش بە هەستپێکردنی مرۆڤەکان هاتووە ﴿سُنَّةَ اللَّهِ فِي الَّذِينَ خَلَوْا مِن قَبْلُ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلاً﴾.

(١٩)

ئیسلام دان دەنێت بە پێویستی پێشکەوتندا کە پێشکەوتنێکی گشتگیر بێ بەلایەنە ماددی و مەعنەویەکەی پێکەوە نەك تەنها پێشکەوتنی ماددی، خوا دەفەرموێت ﴿تِلْكَ الدَّارُ الْآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوّاً فِي الْأَرْضِ وَلَا فَسَاداً ﴾، سەرکەوتنی ماددی لای ئیسلام قبووڵە، بەڵام ئیسلام بە خودی ئامانجی دانانێ بەڵکو پەیوەستە بە پاشکۆیی ئەدەبیەوەو ئامانج لە هەمە جۆرەی سەرکەوتن ئەوەیە ئاکاری بێ.

ئیسلام دژی پێشکەوتن نیە بەڵکو هاندەرو پاڵنەریەتی، داوای تایبەتمەندی زانستی و عەقڵی دەکات و بچێتە مەلەکوتی ئاسمان، دژ بە نەزانی و خورافەو کاهین و جادووگەران هەڵمەت دەبات و هەوڵی لەناوبردنیان دەدات.

(٢٠)

لێرەدا ئەندێشەیەکی خەیاڵی نیە بەڵکو واقیعێکی پەیوەست بە سروشتی مرۆڤ هەیە کە بەرەو دنیانەویستی و کەنارگیری دەبات و بەرەو زێدەڕۆیی و تەحەلولی نابات، لە ئیسلامدا نەگونجاوی نیە لەنێوان نموونەی باڵاو واقعی کردەیی خەڵکدا، یان بەریەککەوتن لەگەڵ عەقڵی مرۆیی یان لەگەڵ زەوق و حەز یان فیترەت یان زانست لە ئیسلامدا نابینرێ.

(٢١)

پەیوەندییەکی ڕوون لەنێوان خاك و ئوممەت و نەتەوەو ئیسلامدا هەیە، ئەو یەکبوونی هزرە هەیە کە هەموو موسڵمانان یەك دەخات و بەیەك ئاڕاستەیان دەبات کە لەسەر تەواوێتی و دادپەروەری و حەق و ڕاستی دامەزراوە.

(٢٢)

ئیسلام دان نانێ بە دنیانەویستی و ڕوهبانیەتدا بەو واتایەی لە ژیان کەنارگری، دنیانەویستی حەرامکردنی حەڵاڵ نیە بەڵکو لە ئیسلامدا زوهد ئەوەیە زیاتر لەوەی لەدەستی خۆتدایە لەوە دڵنیا بیت کە لای خوایە، بەهێزترین نموونەی زوهد قوربانیدانە بە گیان لەپێناو کۆمەڵدا، ئیسلام هەموو ڕۆڵەکانی بانگ دەکات بۆ تێکەڵبوون لە کۆمەڵگەداو ناچاریان دەکات پشکێ لە خۆشی و سودەکانی ژیانی دنیا وەربگرن، هەر وەستانێ لە ژیان لەپێناو زوهدو پەرستشدا بە ڕاشکاوی پێچەوانەی چەمك و واتای ئیسلامە چونکە ئەوە دوورکەوتنەوەیە لەو ژیانە کردەییەی کە کرۆکی سەرەکی و وردی زانینی ئاستی بڕوابوونی مرۆڤە بە ئیسلام، ئیسلام مرۆڤ بانگهێشت دەکات بۆ زوهد و لە نێوەندی لەخشتەبەریەکانی ژیاندا نەك کەنارگرتن لە ژیانی دنیا، ئیسلام بانگەواز دەکات بۆ پاراستنی دنیاو گەشەپێدانی لە چوارچێوەی لەخواترسی و ئاڕاستەکردنی بەرەو لای خوا.

(٢٣)

ئیسلام لایەنی ماددی و مەعنەوی بەیەکەوە دەبەستێتەوەو لەپێناو لایەنی مەعنەویدا لایەنی ماددی لەبیر ناکات، لەپێناو بەرزڕاگرتنی لایەنە ڕۆحیەکاندا لایەنە دنیاییەکان بەکەم ناگرێ و بەکەم سەیریان ناکات، بەڵکو ڕێبازێکی کۆکەرەوەی دین و دنیای پێیە دوور لە سوودویستی و ڕوهبانیەت (وا هەوڵ بدە بۆ دنیات وەك ئەوەی هەمیشە بژیت، وا هەوڵ بدە بۆ ڕۆژی دواییت وەك ئەوەی سبەینێ بمریت).

(٢٤)

تاك بەشێکە لە کۆمەڵگەو کۆمەڵگەش پێکهاتەی هەموو تاکەکانە، بۆیە کۆمەڵگە بۆ تاکەو تاکیش بۆ کۆمەڵگەیە، ئیسلام لەپێناو کۆمەڵگەدا قوربانی نادات بە تاك، لەپێناو تاکیشدا قوربانی نادات بە کۆمەڵگە، بەڵکو نیزامێکی تەواو و یەکخەرو گونجێنەر لەنێوانیاندا دەخاتە کار کە کامڵی و هاوسەنگیەکی ڕوون تیایدا بەیەك دەگات.

ئیسلام یەکانگیری کۆمەڵگە لە بەرپرسیاریتی سەبارەت بە هەموو تاکەکانی دادەنێت و چاوی لە هەژاران و لاوازانەو دادوەری کۆمەڵایەتی لەسەر بنەڕەتی تەزامون و یەکسانی و برایەتی دادەنێ، کەفالەتی هاوبەشی نێوان کۆمەڵگە دەچەسپێنێ و پیروپەککەوتە و هەژارو نەدارە لاوازەکانیش جێی ڕێزێکی زۆرن و داوا ناکات لەناو ببرێن بەڵکو بە پێچەوانەوە داوا دەکات بپارێزرێن و پێویستییان دابین بکرێ و بەهۆکاری ڕزق و ڕۆزییان دەزانێ.

(٢٥)

لە ئیسلامدا ئایین و زانست بەیەك دەگەن، ئیسلام موسڵمانان هان دەدات تا لە بازنەی ڕێبازی پێوەری یۆنانی دەربچن و بنەونە بنیادی ڕێبازێکی ئەزموونی، بۆیە موسڵمانان ڕێبازی زانستی ئەزموونییان دامەزراند، هەروەها ئیسلام داوا دەکات بروانینە بوون و لە گەردوون ڕامێنین و نهێنیەکانی بوون بزانین.

ئیسلام زانستخوازی لەسەر هەموو موسڵمانێ بە فەرز داناوەو بە ئەرکی سەرشانی ئوممەتی داناوە تا دەستە گەلێك هەبن بۆ فێرکردنی خەڵك و گرنگی بدرێ بە گەشەسەندنی عەقڵی مرۆیی، خوای گەورە فەزڵی زانست دەدات بەسەر پەرستشدا کە مەبەست پێی هەموو زانستە (زانستی دین و دنیایی) لێرەوە ئیسلام ڕاستیەکی گرنگ ئاشکرا دەکات کە بریتیە لەوەی ناکۆکی نیە لەنێوان ئازادی بیرو ئاییندار بوونی کەسی بیریاردا.

موسڵمانان لەبواری زانست و ڕۆشنبیری دا گەیشتنە لووتکەو بەردەوام ڕێکردەی عەقڵیشیان لەسەر بنەمای بڕوان بوون بەخوا بوو، لە ئیسلامدا زانست دەبێ ببەخشرێ، خوا بەڵێنی وەرگرتووە لەوانەی زانستیان لایە دەبێ زانست و ڕاستیەکان بۆ خەڵك ڕوون بکەنەوە، هاوکات ڕێی داوە بە ئازادی توێژینەوەو هانمان دەدات لەسەر ئیجتیهادو بڕیاری ئەوەی داوە کەسی موجتەهید ئەگەر هەڵەی کرد پاداشتێکی بۆ هەیەو ئەگەر پێکای دوو پاداشتی بۆ هەیە، بەمەش تەقلیدی حەرام کردووە، هەروەها هەڵخەڵەتان بە خەیاڵات و قبوڵکردنی گومان یان قسە وەرگرتن بەبێ بەڵگە بەربەرچ دەداتەوەو داوا دەکات عەقڵ بخرێتەکارو

پرسیار لە کەسی شارەزا بکرێ ئیتر با کەس تەقلیدی کەس نەکات و هەمووان لە ڕوانینیاندا ئازاد بن و هیچ شتێ ڕێی ئەو ئازادییەیان لێ نەگرێ.

( ٢٦ )

ئیسلام دان دەنێ بە بنەماو یاسای پێشکەوتنداو داوا دەکات کەسێتی مرۆڤ پێشکەوێ و شارەزای بارو مۆرکی گەلان بێ و لێکۆڵینەوە بکات لەوەی لەسەریەتی، پێی وایە مرۆڤ بەرەو ئامانجی باڵای شارستانی وا دەڕوات کە تا ئەمڕۆش پێی نەگەیشتووەو بۆ کەسانی کاراو دڵسۆز پاداشتی داناوە وەك لە فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە: (من سنّ في الأسلام سنة حسنة فله أجرها و أجر من عمل بها) (هەرکەسێ لە ئیسلامدا سوننەتێکی چاك دابهێنێ ئەوە پاداشتی خۆی و پاداشتی ئەو کەسەشی بۆ هەیە کە کاری پێ دەکات). هەروەك ئیسلام بانگەواز دەکات تا سەرزەوی ئاوەدان بکرێتەوەو کۆگاو مرواریو شتە گرنگەکانی زەوی دەربهێنێ و لەسەر پیشەسازیەکان و زانستە سوودبەخشەکان کێبڕکێ بکەین.

( ٢٧ )

ئیسلام فیترەتی داناوەو بانگەواز دەکات بۆ پاك ڕاگرتنی فیترەت و بە توندی دوورەپەرێزی دەکات لەوەی بە ڕێنمایی زیان بەخش ئەو فیترەتە پیس بکرێ و هۆشیاری دەدات لەسەر زیانی تەقلیدی کوێرانە بۆ باوك و سەرکردەکان و فەرمان دەکات بۆ هەر بیروباوەڕێ کە کەسێ دەیخاتە ڕوو و بانگەوازی بۆ دەکات داوای بەڵگەی قەناعەتپێکەر بکەین.

( ٢٨ )

ئیسلام داوا دەکات تا لە مەسەلەی حەقدا بگەڕێن و کاتێ لایەنی ڕاستییان بۆ دەرکەوت ڕای خۆیان بگۆڕن و موسڵمان گوێی لەوە نەبێ ڕاستی لای کێیە لە هەرکەسێ ڕاستی بەدیکرد لێی وەربگرێ با لە ئاین و زمانیدا جیاواز بێ، نابێ موسڵمان دەمارگیرێ هەبێ بۆ ڕاو مەزهەبێ و ئەوە چاوی کوێر بکات لەوەی هەڵەیەك ببینێ کە تیایەتی.

( ٢٩ )

ئیسلام لە بنەڕەتدا ڕێساو بنەماکانی خۆی بە ئامانج داناوە تا مرۆڤ تواناو وزەی جەستەیی و ماددی خۆی بە زیادەڕەوی بەخەرج نەدات بەڵکو بە ئامانجەوە ئەو توانا و زانستە سەرف بکات.

( ٣٠ )

ئیسلام جەخت دەکاتەوە لە دامەزراندنی پەیوەندی نێوان مرۆڤ و خوا بێ ئەوەی کەس لەنێوانیاندابێ.

( ٣١ )

ئیسلام جەخت لەوە دەکاتەوە ئیسلام نهێنی و نەگونجانی تیا نیەو شتێ نیە کەسێ بەجیا لە هەموو موسڵمانانی تر بیزانێ یان تایبەت بێ بەوەوە.

( ٣٢ )

لە ئیسلامدا پیاوی ئایینی نیە تا مافی زیاتر لە مافی ئاسایی خەڵکی هەبێ یان ئیسلام ئەو مافە نادات بە دەستەیەکی ناو ئوممەتی ئیسلامی تا مافی دەسترۆیی بیروباوەڕی و هەڵسوکەوتییان بەسەر ئوممەتدا هەبێ.

( ٣٣ )

ئیسلام ڕێز لە مرۆڤ دەنێ و لە کۆیلایەتی و بەندایەتی ڕزگاری دەکات و بەرزی دەکاتەوە بۆ پلەیەك کە شیاوی ئەو وەسفە بێ کە خوا پێیداوە کە ئەویش جێگیرایەتیە لەسەر زەویدا.

( ٣٤ )

ئیسلام بڕیاری ئەوە دەدات سامان پێناوە نەك ئامانج، ڕێگەیە نەك مەبەست، مرۆڤ لەسەر زەوی دانراوەو سامانی دراوەتە دەست تا سوودی لێ وەربگرێ و لەڕێی خوادا و بۆ بەرژەوەندی کۆمەڵگە بەکاری بهێنێ، ئیسلام ڕێزی کارو بەخشین و سامانێ دەگرێ کە بەخێرو صەدەقە پاك بکرێتەوە، زەکات پلەیەکی ئیسلامەو نیزامێکە بۆ تەزامونی کۆمەلایەتی، ئیسلام بانگەواز دەکات بۆ دەستاودەستکردنی سامان لەنێو خەڵکدا تا لەنێو

دەستەیەکی تایبەتدا مۆڵ نەکرێ، شەرع مافی هەڵسوکەوت بە خەرجی سنوردار کردووەو نابێ پیسکەیی و چرووکی و زیادەڕەوی بکرێ.

گەشەپێدانی سامانی سنوردار کردووە بەوەی نابێ ناپاکی و سوو و قومارو قۆرخکاری بەکاربهێنرێ هەروەك دەبێ دەوڵەت ببێتە زامنی ئەوانەی کارو سامانیان نیە، دەبێ سەرپەرشتی پەککەوتەو بێتواناکان بگرێتە ئەستۆ، ئیسلام نکوڵی لەوە دەکات سامان لەیەك چیندا قۆرخ بکرێ و نابێ لە بازاڕی گشتیدا بازرگانی قۆرخ بکرێ، نابێ زێڕو زیو خەزن بکرێو هەڵبگیرێ، خواردنی سامانی خەڵك بە ناحەق و ناڕەوا حەرام دەکات.

(٣٥)

دیارترین بەخششی ئیسلام بریتیە لە ئەرێنی گەشبینی بە ڕەحمەتی خوا، لە ئیسلامدا مۆرکی داڕمان یان بێهیوایی یان ئەو ڕەشبینیە نیە کە لەبیری ڕۆژئاواییدا دەیبینین.

(٣٦)

ئیسلام بانگەواز بۆ ئەوە دەکات کرداو گوفتار وەك یەك بن، ئیمان و کردار هاوشێوە بن، بیروباوەڕو زانست پێکەوە پەیوەست بن و زانست دەکاتە هەنگاوی ڕێی خواناسین.

باسی ئیمان لە قورئاندا پەیوەستە بە باسی ئیشی چاکەوەو لە زیاتر لە پەنجا شوێندا ئەو نمونەیە بەدیدەکەین ﴿آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ﴾ بێگومان مەترسیدارترین شت جیاکردنەوەی زانستە لە کارو مانەوەی زانست بەبێ پەیڕەو لە پەرستش یان کڕین و فرۆش یان گۆڕانی ئیمان بۆ ئیمانێکی زوهدو دنیانەویستی نەك ئیمانێکی کۆمەڵایەتی، ئیسلام بیرو چەمك و واتاکانی جیا لە کردارو پەیڕەو ناوێ، بەڵکو وەك هێزی پاڵنەر بۆ بنیادی ژیانێکی تەواو لە بازنەو سنوری شەریعەتدا ئەو چەمك و واتاو بیرانەی دەوێت.

(٣٧)

ئیسلام ماف و پلەوپایەی ئیسلامی تایبەتی خۆی بە ئافرەت بەخشیوە تا ببێتە خاوەن موڵك و بازرگانی بکات و بەڵێننامە بنووسێ و ڕێککەوتن ببەستێ و هەموو جۆرە خاوەن موڵکیەکانی هەبێت و بۆی هەیە گەشە بدات بە سامانی، ئافرەت ڕێگری مافی خۆی

لێناکرێ مەگەر کاتێ سەلما کە زیان دەگەیەنێ بە کۆمەڵگە، ئیسلام چەندین مەترسی لە ئافرەت دوورخستووەتەوەو بڕیاری داوە کەسی فاسق شیاو نیە بۆ هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتی پاکدا، ئیسلام سوورە لەسەر ئەوەی بە بڕیارەکانی ئافرەت بکاتە قەڵایەك بۆ ئیسلام قەڵایەك کە دەستی ناحەزی پێ نەگات، لەبەرئەوەی ئافرەت زامنی بەردەوامی جۆرو وەچەیە، بۆیە بەهێزترین بەربەستە کە پایەکانی ئیسلام لە لێکهەڵوەشان و داڕمان دەپارێزێ.

(٣٨)

لە ئیسلامدا مرۆڤ گەورەیە، گەورەییەکەشی لە جەستەو سامانیدا نیە بەڵکو لە بەها مرۆییەکانیدایە.

(٣٩)

ئیسلام سزای تەنها بۆ تاوان داناوەو شێوازەکانی ستەمی کۆنی نەهێشتووەو لە جەنگیشدا کوشتنی پیرو منداڵ و ژن و کەسانی دوور لە جەنگی حەرام کردووە.

(٤٠)

ئیسلام داوا دەکات پێناو و هۆکارەکان بگرینە بەر چونکە خوا هۆکارو ڕووداوەکانی پەیوەستی یەك کردووە.

(٤١)

لە ئیسلامدا چینی پیاوانی ئایینی نیە کە لەبەر پەیوەندییان بە ئیسلامەوە کۆمەڵێ مافیان هەبن کە بۆ کەسانی تر نەبن، بەڵکو لە ئیسلامدا زانای تایبەتمەندو شارەزای بواری ئایینی هەن.

(٤٢)

ئیسلام لەسەر بیرۆکەی قوربانیدان و لەخواترسان وەستاوە لە کاتێکدا بیری بتپەرستی لەسەر بیرۆکەی خۆشگوزەرانی وەستاوەو بە نموونەی باڵای دەزانێ، ئەمەش لەگەڵ خۆبەخت کردن و فیداکاریدا ناگونجێ.

(٤٣)

لە ئیسلامدا پێکهاتەی تاکەکەسی بنەمای پێشکەوتنە نەك پێشکەوتنی زانستی.

(٤٤)

ئیسلام توانای زۆری هەیە لەسەر بەخشینی چەمك و واتای بزاڤ و جوولەو پێشکەوتن و گەشەسەندن و بەرهەمهێنان و وەرگرتن و بەخشین و ڕاکێشانی هەموو شتێ کە هێزی زیاتر دەکات و فڕێدانی هەموو شتێ کەلەگەڵ مۆرکیدا ناگونجێ.

(٤٥)

ئیسلام لەسەر چەند بنەمایەکی نوێ یەکبوونی مرۆیی دامەزراندووە کە لووتکەکەی برایەتی جیهانی و یەکسانی نێوان خەڵکە بە جیاوازی زمان و ڕەنگیانەوە لە ئەرك و مافدا یەکسانن، ئیسلام دەمارگیری نیشتمانی دەسڕێتەوەو دەمارگیری ڕەگەزی دەکوژێ و سەفەری حەج بە پێناوێکی بەهێزی پەیڕەوی بنەمای یەکبوونی مرۆیی دادەنێت.

(٤٦)

ئیسلام بۆ هەر لایەنێکی ژیان ڕێژەی دیاریکراوی داناوەو بڕیاریداوە بەپێی گرنگییان ڕێکیان بخات و بۆ هەریەك لە پەرستش و جیهادو زەکات و دەستکەوت ڕێژەو پشکی داناوەو بۆ جەستەو عەقڵ و چێژو ماددەو کارو ئارەزوو پشك و ڕێژەیەکی داناوە.

(٤٧)

ئیسلام بانگەواز دەکات بۆ بەویژدانی وتنی حەق لەئاست دوورو نزیکداو شەریعەتی لەبەردەم ئەمیرو هاوەڵانیدا بەیەك چاو سەیربکات ﴿وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلاَّ تَعْدِلُواْ اعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى﴾ لەمەشدا بەرامبەر ئەو هەڵانەی شارستانیەتەکان دەبێتەوە کە ئەنجامیان دەدەن و ئیسلام بە ویژدانەوە لەگەڵیدا دەجووڵێتەوەو ئایین و ژیارەکانی تر ئەو ویژدانە بەکارناهێنن، پێغەمبەر ﷺ ئەوەی دەربڕیوە کاتێ کەسێ هات بۆ داوای سووککردنی سزای ئەو ئافرەتە مەخزومیەی کە دزی کردو پێغەمبەر ﷺ حوکمیدا بە بڕینی دەستی ئەو ئافرەتە، لە وەڵامی ئەو داواکاریەدا فەرمووی: (إنما أهلك الذين من قبلكم إنهم كانوا إذا

سرق الشريف تركوه وإذا سرق الضعيف أقاموا عليه الحد وايم الله لو ان فاطمة بن محمد سرق لقطع محمد يدها) (بەڕاستی ئەوانەی پێش ئێوە بەوە بەخەسارەتا چوون ئەوە دەبوو ئەگەر کەسی خانەدانیان دزی بکردایە وازیان لێدەهێنا، ئەگەر لاواز دزی بکردایە حەدیان لەسەر پەیڕەو دەکرد، سوێند بەخوا ئەگەر فاتمەی کچی موحەممەد دزی بکات موحەممەد دەستی دەبڕێت).

# باسی دووەم

# ( یەکخوا پەرستی )

سەر لەنوێ ئیسلام ئەو پەیامە یەکخواپەرستیەی هێنا کە وتەی یەکەمی هەموو ئایینەکانی ئاسمان و بنەڕەتی چەسپاوی هەموو ئایینەکان بوو، ئەوە ئەو ڕاستیە هەمیشەییە بوو کە ڕاڤەکاری ئایین لە چەند ئایینێکدا لاڕێیان کردو لە بنەڕەتی سەرەکی خۆی دەریانکرد.

مرۆڤایەتی هەر لە کۆنەوە لەسەر یەکخواپەرستی تەواو بووەو بتپەرستیش نەیارێکی پەیوەستی بووە، نەك وەك هەندێ بیردۆزەی ئەمڕۆ دەیانەوێ لە بەراوردی ئایینەکاندا بڵێن لە گەشەسەندنی بتپەرستیەوە یەکخواپەرستی هاتوەتە دی.

توێژینەوە مێژوویی و زانستی و ئەنسرۆپۆلۆجیەکان بیردۆزەی یەکخواپەرستییان چەسپاندووە، وەك توێژینەوەکەی دکتۆر (ماکس مۆلەر) کە زمانی سنسکریتی ئاشکرا دەکات و دەڵێت (خەڵکی هەر لە کۆنەوە لەسەر یەکخواپەرستی پوخت بوون، بتپەرستی بەهۆی سەرکەشی و لاری سەرۆکە ئایینیەکانەوە لەنێو خەڵکدا بڵاوکرایەوە، ئەمەش تێکشکاندنی ئەو بیرۆکەی گەشەسەندنەیە کە پێی وایە مرۆڤەکان سەرەتا بتیان پەرستووەو لەم کۆتاییانەدا گەیشتوون بە یەکخواپەرستی.

بێگومان بیروباوەڕی یەکخواپەرستی بالاترین پلەیە کە مرۆڤ پێی گەیشتووە، (لانگ) جەخت لەم واتایە دەکاتەوەو سەبارەت بە ڕای لەسەر یەکخواپەرستی پشت دەبەستێ بە ئاشکراکاریەکەی (هویت) سەبارەت بە بوونی بالا لە هۆزەکانی ئوستورالیای باشوری ڕۆژهەلاتی و ئوستورالیادا، خوای بالا لای هۆزەکانی ئەفریقا، هویت دەڵێت: هەموو مرۆڤێ لە ناخیدا بیرێکی بالای هەلگرتووەو ئەو بیرەش بەسە بۆ پێکهێنانی بیروباوەڕ کە خوایەك هەیە بوونی دروست کردبێ، هەموو مرۆڤێ سەبارەت بە دروستکردنی شتەکان بیرێکی هەیە کە بڕوای بە بوونی دروستکەرێ هەیە کە توانای هەیە بەلام مرۆڤ ئەو توانایەی نیە، ئەم بیرە لای خەڵکانی کۆن دەبینین کە بەو جۆرە بڕوایان بە خوا هەبووە، ڕاستی ئەو یەکخواپەرستیەی

کە ئایینە دابەزیوەکان هێناویانە و ئیسلام جەختی لێ دەکاتەوە ئەو بیرو ڕوانینە دەخات کە سەبارەت بە خوا هەبووە (خوایەکی تۆقێنەری خۆسەپێن کە لەبەردەمیدا هەست بە لاوازی و زەلیلی و ترس بە توورەییەکەی دەکات) بەڵکو ئیسلام چەمك و واتای حەقیقی سەبارەت بە خوای میهرەبان داناوە، ئەو خوایەی تەوبە وەردەگرێ و بانگەواز دەکات بۆ لێخۆشبوون و بەپێی توانای کەسەکان ئەرکیان لەسەر دادەنێ ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْساً إِلاَّ وُسْعَهَا﴾. هەروەك ئیسلام مرۆڤایەتی لەبیری خوای توندو خوای جەنگ و فرە خودایی ڕزگار کردو لەبریدا بیری ئەو خوا تاك و تەنهایەی هێنا کە منداڵی لێ نەبووەو لە کەس نەبووەو هاوشان و هاوەڵی نیە.

توینبی مێژوونووس ئاماژە دەکات بەو شتەو پێی وایە خوای مەسیحیەت بەوە وەسف دەکرێ خوایەکی دڵسۆزەو قوربانی بەخۆی دەدات لەپێناو مرۆڤدا، کەچی ئیسلام بەرامبەر لاوازی پەیوەستی مەسیحیەت بە حەقیقەتی جەوهەری یەکخواپەرستی جەخت دەکاتەوە لە یەکخواپەرستی، ئاماژەش بەوە دەدات مەسیحیەت خێرا کەوتە بەر کاریگەری بیرۆکەی جوولەکایەتی کە باس لە توندو ڕەقی خوا دەکات، ئەمە مەسیحیەتی بەرەو دەمارگیری کوێرانە برد، ئەو پەرچە کردارە گورزێکی کوشندەی ڕۆحی و جەستەیی بوو بۆ مەسیحیەت واتە مەسیحیەتی نوێ لەنێوان دوو بیری دژ بەیەکدا داماو کەوت، یەکەم بیرۆکەی توندو تیژیو نەبوونی لێبووردەیی کە سیفەتی خوای جوولەکە (یەهوا)یەو توڕەیی و ڕەقی و توندی هەیە، دووەم بیرۆکەی لێبوردەیی و خۆشەویستی کە پایەکانی مەسیحیەتی لەسەر وەستاوە.

توێژەران ئاماژە بەوە دەدەن ئەو لاڕێکردنەی تووشی مرۆڤایەتی بوو بەرەو فرەخودایی برد تا ئەوەی ئەو فرەخوداییە هەموو ڕۆشنبیرییە کۆنەکانی گرتەوە، میسریە کۆنەکان و ئاشوریو بابلی و فارس و هیند و چین و یۆنانیەکان ڕای فرەخوداییان هەبوو بەپێی جیاوازی ژمارە و شوێنی خواوەندەکانیان و چۆنێتی پەیوەندی خواوەندەکان لەگەڵ یەکتردا یان لەگەڵ مرۆڤدا.[1]

---

١- د.إبراهيم بيومي مدكور في بحث عن الفلسفة الإسلامية.

فەلسەفەی یۆنانی بتپەرستی فرەخودایی بوو، سەبارەت بە خوا بیرێکی تەواو شێواوی هەبوو، هیچ سیفەتێکی چەسپاوی تواناو خوایەتی و بەخشش و سۆزو ڕەحمەتی نەدەدا بە خوداو بە دروستکەری یەکەمی دانەدەناو سیفەتی ویست و زانست و هەڵبژاردنی پێ نەدەدا، باسی لەوە دەکرد خوا تواناو زانایی بەسەر شتە گشتیەکاندا هەیە، چەمك و دیدی ئەرستۆ خوا لە بازنەی بەڕێوەبردنی جیهان و تەنانەت لە بوونی زانیاری لەسەر جیهان دەباتە دەرەوە.

جوولەکایەتی لەو دیدەی خۆپەرستیە لایدا کە مووسا هێنابووی و دیدێکی جیای بۆ خۆی دروست کرد، جوولەکایەتی خوا تەنها بە بیرێك و هێزێکی تۆقێنەری لەتوانا بەدەر دادەنێت تەنانەت کاتێ دەقی سەبارەت بە ترس و تۆفان دێنێ ناوی (یەهوا) ناهێنێ بەڵکو ناوی (ئەدونای) دێنێ.

مەسیحیەتیش پێی وایە خوا لە جەستەی مەسیحدا خۆی نیشانداوە و لە شێوەی مرۆڤدا دابەزیوەتە سەر زەوی، بەوە لە داماڵین دەردەچێ و خوایەتی دەخاتە شێوەی جەستەی مرۆڤەوە، چەند ئایینێ هەبوون پێغەمبەرو بانگخوازە ئایینەکەیان لەدوای مردنی کردووە بە خواو پەرستوویانە، وەك بوزا و زەردەشت و مەسیح، لێرەوە ئیسلام سوور بوو لەسەر ئەوەی نە دیدی داماڵین بەکاربهێنێ نە دیدی بەجەستە نواندنی خوا، بەڵکو جەخت دەکاتەوە لە جیاوازیەکانی نێوان خوایەتی و پێغەمبەرایەتی، بۆیە بەردەوام قورئان و خودی پێغەمبەریش ﷺ جەختیان کردووەتەوە لەوەی موحەممەد ﷺ مرۆڤێکەو سروشی لای خواوە بۆ دابەزیوە.[1]

بتپەرستی بەرفراوانترین[2] جۆری شیرکەو قورئانی پیرۆزیش زیاتر لە هەر شیرکێکی تر باسی کردووە چونکە لەپێش ئیسلامدا بڵاوبووەوەو ئەوپەڕی ملکەچکەرانی مرۆڤ و بەندایەتی گومڕایانە بۆ بتپەرستی لەخۆگرتووە بەجۆرێ باوەڕیان وابووە سوودو زیانیان بەدەست بتەکانەو بۆ زامنی پێویستیەکان دەبێت بچنەوە بۆلای بتەکان، دیارترین وێنەی بتپەرستی

---

۱- د.ئیسحاق موسا الحسینی.

۲- مولای محمد علی (الدین الإسلامی ج۱).

ئەوەیە خوا تیایدا مەجووسە، سروشتی مەجووسیش وایە ژمارەی زۆرو گۆڕاو بێ و سوودو زیانی بەردەوام نەبێ.[١]

لێرەوە گەلە بتپەرستەکان بەوە وەسف دەکرێن کە دەرکیان لاوازو سەرەتایی بێ، خواکانی فرە خودایی چەندین خوا بوون، لێرەوە ئیسلام هێرش دەکاتە سەر فرەخودایی و بانگەواز بۆ ئەوە دەکات مرۆڤ یەك خوا بپەرستێ کە شەخسی خۆی نازانێ و حەقیقەتی تەواوی سنووردارو زانراو نەبێ چونکە خوا لەسەروو سروشتەوەیە، گوێڕایەڵی بۆ خوایەك کە گۆڕان و لەناوچوونی بۆ نەبێ، بێگومان شێوەپێدانی خوا کەمکردنەوەی پیرۆزیەتی، ئیسلام مرۆڤ لە پەرستشی شەخسی سنوردارو لەناوچووەوە بەرزدەکاتەوە بۆ پەرستشی خوای تەنها کە ئەمەش ڕێزداری مرۆڤ دەنوێنێ، هەروەها فرەخودایی پەیوەندی هەیە بە پەرستشی پاڵەوانەکانەوە کە هەر لە کۆنەوە هەبووە.

فرە ودایی زیاتر لەنێوان دوو خودایی و سێ خوداییدا خۆی دیوەتەوە، پەیوەندی پەرستشی پاڵەوانەکان بە سیانە خواییەوە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە جەماوەر پاڵەوانێکیان پەرستووە کە کارێکی کردووە دواتر ڕۆحەکەی دەچێتە پایەی خوایەتیەوە، پاشان پاڵەوانیەتەکە دەگوازرێتەوە بۆ گەورە کوڕەکەی ئیتر بەوە سیانە خوایی دروست دەبوو.

بابلیەکان یەکەم گەلێ بوون لە هەزارەی چوارەمی پێش زاییندا باسی سیانە خواییان کرد، هاوکات بابلیەکان ئایینی فرە خواییان هەبوو، بەوجۆرە مرۆڤایەتی سەرقاڵی پەرستشی فرەخودایی بوو تا ئیسلام گێڕایەوە بۆ یەکخواپەرستی، لێرەوە ئیسلام بالاترین قۆناغی گەشەپێدانی مرۆیی بۆ پێگەیشتن دەنوێنێ، قورئان بەڕوونی هەڵوێستی خۆی بەرامبەر هەموو جۆرە فرەخودایی و بتپەرستیەك نیشان داوەو حەقیقەتی گەورەو باڵای هێناوەو بڕیاری تاك و تەنهایی خوای داوەو نکوڵی لە هەر فرەخواییەك دەکات، جەخت لەوەش دەکاتەوە خوا نموونەو هاوشێوەی نیەو کەماڵی هەموو شتەکانی هەیەو دوورە لە هەموو کەم و کورتیەك، عەقڵی مرۆڤیش ناتوانێت شارەزای زاتی خواو حەقیقەتی سیفەتەکانی بێت، هەموو

---

١- د.محمد البهي.

گومانەکانی پەیوەست کراو بە خوایەتی نێو گەلانی پێشووی هێناوەو کە کەم و کورتی و ساختەی ئەو گومانانەی ئاشکرا کردووە و بە بەڵگەی بەهێز ڕای خۆی پاڵپشت کردووەو جەختی لەو ڕاستیەش کردوەتەوە کە فیترەت سەبارەت بە پەیوەندی مرۆڤ بە خواوە دەیڵێ، جەخت لەوە دەکاتەوە مرۆڤ بەندەی خوایەو خوا لە هەموو شوێنێکدا لەگەڵ مرۆڤەکانەو هەر خواشە ڕەحم و ڕێنمونی هەیە بۆ مرۆڤەکان.

بیروباوەڕی بتپەرستی لە دوو مەسەلەدا بەرتەسك دەبێتەوە، یەکەمیان بەخوا کردنی سروشت یان بەشێکی سروشتە وەك خۆرو مانگ یان جۆرێکی ئاژەڵ، دووەمیان بەخواکردنی مرۆڤە (تاك یان خێزان یان گروپ) وەك پەرستشی پاشاو سەرکردەو پێغەمبەرو پاڵەوان و ئەولیاکان ﴿اتَّخَذُواْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَاباً مِّن دُونِ اللّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ﴾.

ڕۆمان و یۆنان و میسری و فارس و هیندەکان پاڵەوان و پاشاکانیان دەپەرستن. فیرعەون و قەیسەرو ئیمپراتۆرو کەسی بەرهەمییان دەپەرست، بە خودا دانانی هەندێ دروستکراوی نادیاریش هەبووە وەك بەخودا دانانی فریشتەو ڕۆح و جنۆکە، یان ئایدۆلۆژیا نوێکان هەندێکیان دەوڵەت یان عەقڵ دەکەن بە خوا، شیرك هەنگاوێکی لادانی بتپەرستیەو واتە کەسێ[1] دانانی هاوەڵە بۆ خوا لە پەرستش یان بڕوای دروستکردن و ڕبوبیەت و ئاڕاستەو بۆنەی پەرستش و داننان بە خوایەتیدا یان داننان بەوەی خوایەکی گەورەتر هەیە و لەگەڵیدا فریشتە وەك سکاڵاکار بپەرستن و بتەکان بکەنە هێمای ماددی بۆیان، بتپەرستی پەیوەندی هەیە بەو بت و پەیکەر دروستکردنانەی لە میسرو ئەسیوبیاو بابل و شامدا هەبوون و فیرعەون و ئاشوری و یۆنان و ڕۆمانەکان گرتبوویانە بەر، ئاشوریەکان بۆ هەر هەسارەیەك بتێکیان هەبوو، میسریەکانیش هەرچییان بدیایە دەیانکرد بە خوا.

(ئەلفریدموس) لە کتێبەکەیدا (ct jessus، yahve،Ei ) (ئیل-یەهوا- یەسوع) دەڵێت: یەسوع ئیعتیباری جوولەکەی هەڵوەشاندەوەو ئیعتیباری (ئیلی کەنعانی) فینیقی گێڕایەوە کە عیبرانیەکان دوای هاتنیان بۆ خاکی کەنعان پەیڕەویان دەکرد.

---

١- دروز: عصر النبی

یەهوا ئەو خواوەندە ئاسۆ بەرتەنگە بیابانیە بوو کە ڕەقی و دەمارگیری هۆزەکەی هەبوو، ئیلی کەنعانی فینیقی لەسەردەمی یەسوعدا زیندوو بوو ئەو ڕێنماییانەی کە جوولەکە ڕێنماییەکانی داپۆشی بوون سەرلەنوێ لەسەر دەستی یەسوع دەرکەوتنەوە، ئەمە واتا پەیام و ڕێنمایی و بیری یەسوع سەبارەت بە خواو مرۆڤ بەهۆی پەیوەندی بە ئایینی جوولەکەوە نەمردبوو.

دیدو واتاکەی ئەلفرید موز هەرچی هەبێت لەگەڵ مێژووی ئایینەکاندا دەگونجێ چونکە جوولەکایەتی چەمك و واتای خوایەتی گۆڕی و سەید مەسیحیش بۆ ڕاستکردنەوەی ئەو گۆڕین و لادانە هات کە ئیبراهیم و موسا بەڕاستی هێنابوویان و لاڕێ کرابوو (خوا تاك و تەنهایە) بەڵام ڕاڤەکانی مەسیحیەت بۆ خواو یەکخواپەرستی خێرا گۆڕا، جوولەکە خوای تایبەتی نەتەوەیی بۆ خۆی داناو مەسیحیەتیش خوای خاوەن جەستەی بۆ خۆی دانا، لێرەوە ئیسلام بۆ ڕاستکردنەوەی ئەو دوو لادانە هات، ئیسلام هات تا ئەو لاڕێکردنانە ڕاست بکاتەوە کە لە بنەڕەتەکانی ئایینی حەقدا کرابوون، ئیسلام ئەو بتپەرستیەی لەناوبرد کەلە کەش و هەوای خۆیدا زاڵ بوو، ڕێی گرت لە جوولەکەو مەسیحیەت و بنەڕەتەکانی گەڕاندەوە بۆ حەقیقەتی خۆیان، دیدی ئەوانەی بەهێز کرد کە وەریانگرتبوو و ئەوەی سڕیەوە کە پێویست نەبوو، هەموو جیهانی بانگ کرد بۆ یەکبوونی ئاین و دیدو ئامانج و بانگەوازەکەی لەسەر بنەڕەتێکی چەسپاو دامەزراند: خوا تاك و تەنهایەو ئایینەکەی بۆ هەموو دروستکراوان یەکە، ئەمە واتا ئایینەکان هاوپەیمانن، بەڵام بەهۆی کاری سەرکردەو شرۆڤەکارانیەوە لاڕێکراون، بۆیە ئیسلام لێنەویەوە تا بیانگێڕێتەوە بۆ بنەڕەتی خۆیان، ئەو بنەڕەتەی کە بە سروش نێرراوە بۆ هەموو پێغەمبەرانی پێشوو و کۆتا کەسیان موحەممەد بوو، بۆ ئەو بەیانە یەکلاکەرەوەوەش نیزامێکی پتەوی کۆمەڵایەتی هێنا کە لەسەر فیترەت و عەقڵ دامەزراوەو کتێبێکی هێناوە کە هیچ پوچیەکی تیا نیەو هەمووی حەق و ڕاستە.

قورئان ئەوەی سەلماندووە سەید مەسیح عیسای کوڕی مەریەم مرۆڤەو پێغەمبەرێکی خوایە کە سروشی بۆ دابەزیوەو بانگەوازی کردووە بۆ بیروباوەڕی یەکخواپەرستی، بانگەوازی

کردووە بۆ پەرستشی خوای تاك و تەنهای بێ هاوەڵ کە لەکەس نەبووە و کەسی لێ نابێ و هاوشان و هاوتای نیە، بڕیاری ئەوەش دەدات عیسا نەکوژراوەو لەخاچ نەدراوە بەڵکو خوا پاراستوویەتی، قورئان ساختەی بیروباوەڕی سیانە خوایی بە تەواوەتی خستوەتە ڕوو و بەرپەرچی داوەتەوەو نکوولّی دەکات لەوەی بانگەواز بکرێت بۆ خوایەتی مەسیح یان ئەوەی مەسیح کوڕی خوابێت.

چەمك و دیدی بەندایەتی ڕاگەیاندووە، بەندایەتی خەڵك و پێغەمبەران بۆ خوای گەورە، بیردۆزەی باوکایەتی بانگەشە بۆ کراو بە ساختە دەزانێ ﴿لَّقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَآلُواْ إِنَّ اللّهَ هُوَ الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ﴾﴿ لَّقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُواْ إِنَّ اللّهَ ثَالِثُ ثَلاَثَةٍ وَمَا مِنْ إِلَـهٍ إِلاَّ إِلَـهٌ وَاحِدٌ﴾﴿ مَّا الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ إِلاَّ رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ وَأُمُّهُ صِدِّيقَةٌ كَانَا يَأْكُلاَنِ الطَّعَامَ﴾﴿ لَّقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَآلُواْ إِنَّ اللّهَ هُوَ الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ قُلْ فَمَن يَمْلِكُ مِنَ اللّهِ شَيْئاً إِنْ أَرَادَ أَن يُهْلِكَ الْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُ وَمَن فِي الأَرْضِ جَمِيعاً﴾.

دەیان توێژەر کە لەسەر ئەو بیروباوەڕانە لێکۆڵینەوەیان کردووە ئەوەیان سەلماندووە کە لە کتێبەکانی جوولەکەدا شتێ نیە بەڵگەی ئەوەبێ مەسیح شتێ لەسەر سیانە وتبێ، بەڵکو بانگەواز لەو نووسینانەدا هەیە کە مرۆڤبوون و بەندەبوونی عیسا دەسەلمێنێ و یەکخواپەرستی مەسیح نیشان دەدات، ئەوەی سەیری ئینجیل بکات چەند دەقێکی ڕاشکاوو ڕوونی ئەوە دەبینێ کە خوا تەنهایەو عیسا نێردراوی خوایە و کوڕی مرۆڤە نەك کوڕی خوا.

ئینسکلۆپیدیای سەدەی نۆزدەی فەرەنسی لە باسی (ثالوث) (سیانە)دا ئەوەی هێناوە بیروباوەڕی سیانە خوایی ئەگەر چی لە عەهدی جەدیددا (ئینجیل) و لە کاری ئەبە نێردراوەکانداو لای خوێندکارە نزیکەکانیشیان بوونی نییە، بەلاّم کلێسای کاسۆلیکی و مەزهەبی پرۆتستانتی پێیان وایە بیروباوەڕی سیانەخوایی لە هەموو سەردەمێکدا لای مەسیحیەت قبووڵ بووە هەرچەندە بەڵگەی مێژوویی نیشانمان دەدات چۆن ئەو بیروباوەڕە دەرکەوت و بلاّوبوویەوەو دواتر خۆی لکاند بە کلێساوە، بەڵێ نەریتی تەعمید وابوو ناوی باوك و کوڕو ڕۆحی پیرۆز ببرێ، بەلاّم ئەو سێ وشەیە واتای جیا لەوەیان هەبووە کە

مەسیحیەکانی ئەمڕۆ لێی تێدەگەن، خوێندکارە یەکەمینەکانی مەسیحیش کە کەسایەتی ئەویان ناسیوەو قسەیان بیستووە لە هەموو کەس زیاتر دوور بوون لە سیانەخواپەرستی، بوترس کە حەواریەکی عیسایەو عیسای بە مرۆڤێ دەزانی کە لای خواوە سروشتی بۆ دابەزیوە. باوی ئەو سەردەمانە وابوو بیروباوەڕی مرۆڤبوونی عیسا زیاتر لە کڵێسایەی یەکەمەوە هەبوو لەو جوولەکانەی کە ببوون بە مەسیحی چونکە ناسری و ئەسیوبی و هەموو دەستە نەسرانیەکان کە لە جوولەکەییەوە ببوون بە مەسیحی بڕوایان وابوو عیسا تەنها مرۆڤێکە کە بە ڕۆحی پیرۆزی پاڵپشتی کراوە، کەسیش نیە بەوە تۆمەتباریان بکات داهێنەر یان موحید بوون.

سیانەخوایی[1] لە بیروباوەڕی مەسیحیەتدا ڕەنگێکی پەرستشی شیرك و بتپەرستیەو شتێکی کتوپڕ نیە بەسەر بیروباوەڕی مەسیحیدا هاتبێ بەڵکو ڕیشەی قووڵی لە خاکی بتپەرستیدایەو دەگەڕێتەوە بۆ بتپەرستی کۆنی جیهانی و ئەوپەڕی پەیوەندی لەگەڵیدا هەیە، بیروباوەڕی مەسیحی کە بڕوای وایە خوا سیانەیە (باوك و کوڕو ڕۆحی پیرۆز) هەمان ئەو بیروباوەڕەیە کە میسریە کۆنەکان لە سیانە خوایی خۆیاندا (ئیزیس، ئۆزۆریس، حۆرس) گرتبوویانە بەر، هەروەها هەمان سیانە خوایی جاهلیەتی عەرەبیە (لات ، عوززا، مەنات)، هەمان سیانە خوایی بەرهەمییە لە ئایینی هیندیدا (براهاما، سیفا، فشنۆ)، هەمان سیانە خوایی هۆزەکانی بانتۆی ئەفریقیە (میزیمۆ، بیبۆ، مۆلنجۆ).

(سیر ئارسەر فندلای) دەڵێت: هەمان ئەو دەستەواژانەی بە ئۆزۆریس دەوتران دەدرانە پاڵ سەید مەسیح کاتێ ناوی عیسا برایە ڕیزی خواوەندە دڵسۆزەکان هەموو ئەو چیرۆکانەی سەبارەت بە خواوەندە بتپەرستیەکان دەوتران بەهەمان شێوە بۆ سەید مەسیحیش دەوتران، لەوانە چیرۆکی لەدایك بوون لە کچ (العذراء) چیرۆکی دادگایی پێش مەرگ، شێوەی لەسێدارەدان، ڕێی قیامەت، ڕێی سەرکەوتن.

١- محمود بن الشریف: الأدیان في القرآن.

ئیسلام نکوولّی لەوە دەکات سەید مەسیح لەخاچ درابێ و بەڕاشکاوی و جەخت کردنەوە بڕیاری ئەوە دەدات مەسیح نەکوژراوە و لەخاچ نەدراوە وەك لە قورئاندا هاتووە ﴿وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا الْمَسِيحَ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ اللّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَـكِن شُبِّهَ لَهُمْ وَإِنَّ الَّذِينَ اخْتَلَفُواْ فِيهِ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ مَا لَهُم بِهِ مِنْ عِلْمٍ إِلاَّ اتِّبَاعَ الظَّنِّ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِيناً بَل رَّفَعَهُ اللّهُ إِلَيْهِ﴾.

کۆتایی مەسیحی بەو شێوەیە هێناوە تا لەگەڵ بیرۆکەی فیداکاری و هەڵەدا بگونجێ، ئیسلام لە بنەڕەتدا نکوولّی لەو دیدو چەمکە دەکاتەوە، ئەو دیدو چەمکەی دەڵێ دابەزیوە تا خۆی بکاتە فیدای مرۆڤ و ڕازی بووە لەخاچ بدرێ و سزا بدرێ تا ببێتە فیدا لەبری هەڵە مرۆییەکان، زۆربەی عەقڵە ئازادیخوازە مەسیحیەکان نکوولّی دەکەن لە لەخاچدانی مەسیح وەك (مرقیون و ستروس و رینان) کە دەڵێن سەمعانی قیروانی ڕازی بوو لەبری مەسیح لەخاچ بدرێ بۆیە خوا شێوەی ئەوی وەك شێوەی مەسیح لێکرد.

توێژەران دەڵێن: بیروباوەڕی فیداکاری لەخاچدان کە لە مەسیحیەتدا هەیە سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ بیروباوەڕی بتپەرستی ناو ئایینی بەرهەمیی کە چەند نەوە پێش مەسیحیەت هاتبوو، بەراوردکاریەکان ئەوە ڕوون دەکەنەوە هیندیەکان بڕوایان وایە کرشنا لەخاچ دراوەو لەسەر خاچ مردووە وەك چۆن مەسیحیەکان وا دەڵێن، هیندیە بتپەرستیەکان بە بوزا دەڵێن کوڕی خوایەو لەڕێی توانەوەی ڕۆحی پیرۆزەوە لە عەزرا ماریادا خوا خۆی نیشان داوە، مەسیحیەکانیش هەمان شت بۆ مەسیح دەڵێن کە لە ڕێی توانەوەی ڕۆحی پیرۆزەوە لە عەزرا مەریەمدا خۆی نیشان داوە.

بیروباوەڕی حلولی مەسیحیەت لە بیروباوەڕی صائیبیەکانەوە دێ کە بڕوایان بە حلول هەبووە، ئەوان بانگەشەی یەکبوونی خوا دەکەن و دەڵێن لە حەوت هەسارەکەدا تواوەتەوەو شێوەیان وەردەگرێ، ئیسلام دان نانێ بە (تاوانی بنەڕەتی)دا کە ئادەم تووشی بووە و بێنێتەوە بۆ مرۆڤەکان بەڵکو بەتەواوەتی نکوولّی لەوە دەکات و عەقڵی مرۆیی لەو خراپانەی ڕزگار دەکات کە چەندین سەدە بەدوای یەکدا هاتوون و لەپێناویدا جەنگی زۆر بەرپا کراوە،

قورئان ئاماژە بەوە دەکات ئادەم لە پـەروەردگاری سـەرکەش بـوو و دواتـر خـوا تەوبەکـەی وەرگرت و دواتر هەڵبژێراو لێیخۆش بوو و ڕێنموونی کرد، بۆیە ئیسلام بڕوای نیە بە میراتـی تاوان و هەڵەو پێی وایـە کـاری بـاوك پەیوەنـدی نیـە بـە کـوڕەوەو هەرکـەس بـەپێی کـارو دەستکەوتی خۆی دەبێ، ئەمەش بە تەواوی ناگونجێ لەگـەڵ ئـەو ڕایانـەی کـە لـە بنـەڕەتی پەیامی مەسیحدا نەبوون و پێیان وایە هەڵەکەی ئادەم کە لە خوا سەرکەش بوو خواش سزای دا بە خستنە سەر زەوی و بەر سزای خوا کەوت و سـزای نەخۆشـی و مـەرگی بەسـەردا درا، دواتر ئەم تووڕەییە هەموو نەوەی ئادەمی گرتووەتەوە، بەوجۆرە هەڵەکەی ئادەم بە میراتی بۆ نەوەکانی ماوەتەوەو هەموو پێغەمبـەرانی پـێش مەسـیحی ئیـشیان ئامادەکـاری بـووە بـۆ ڕزگارکردنی مرۆڤایەتی لەو هەڵە کۆنەو ڕێخۆشکەرە بۆ دەرکەوتنی مەسیح، بەم پێیـە مـرۆڤ کە لەدایك دەبێ باری تاوانی هەڵگرتووەو خاچەکەی مەسیحیش بۆ سڕینەوەی ئـەو تاوانەیـە لەسەر مرۆڤ و خوا ویستویەتی لەسەر ئەو تاوانـە نـەوەکانی ئـادەم سـزا بـدات بـەڵام کـوڕە تاقانەکەی خوا (پەنا بەخوا لە کوفری وا) کەوتوەتە نێوان و ئامادەبووە لە شێوەی مرۆڤێکـدا دەربکەوێ و لەخاچ بدرێ تا ئەو تاوانە لەسەر مرۆڤەکان بسڕێتەوە.

کڵێسا بۆ چالاکی ڕزگابوونەکە پشت دەبەستێ بە چەند هێمایەکی ئایینی کـە دان دەنێـت بە حەوت نهێنیەکەداو لەڕێی پەیڕەوی ئەو نهێنیانەوە کڵێسای مەسیحی لە بێشکەوە تا نـاو گۆڕ دەبات، تەعمید کردن ئەو نهێنیەیە کە مەبەست پێی لابردنی تاوانی یەکەمەو ڕێـی لـە دایکبوونەوەی دووەمـە، ڕاڤـەکانی مەسـیحیەت پێیـان وایـە منـداڵ لـە سروشـتی خۆیـدا خراپەکارەو دنیایەك خراپە بە لەدایکبوونی دێنێ بۆیە دەبێ بە توندو تیـژی ئـەوە سـەرکوت کرێ و لەناوببرێ و ڕێی سزاو ئازاری بۆ بەکار بێت.

ئیسلام ساختەی ئەو دیدانەی ئاشکرا کردووەو ڕایگەیاندووە کە ئەوانـە بنـەڕەتی ئـایینی حەق نین بەڵکو خەیاڵاتی چەند بانگەشەکەرێکن و لەگەڵ فیترەت و عەقڵدا نـاگونجێن، بـەڵکو ئیسلام ئەو ڕاستیەی خستووەتەڕوو هەر منداڵێ لەدایك دەبێ لەسەر فـیترەت لـەدایك دەبـێ ئیتر دایك و باوکی دەیکەن بە مەسیحی یان جوولەکە یان مەجووسی.

(ژان ژاك رۆسۆ) و (جۆن لۆك) ئەو واتایان لە دیدی ئیسلامەوە وەرگرتووەو رۆسۆ پێچەوانەی راڤەکاریەکانی مەسیحیەت دەڵێت منداڵ بە سروشتی خۆی پاکەو عەقڵی وەك پەڕەی سپی وایە و مرۆڤ چۆن بیەوێ کاری لەسەر دەکات.

ئەو دیدی تاوانباربوونەی مەسیحیەت کاریگەری قووڵی هەبوو لە ئەدەب و بیری رۆژئاواییداو تا ئەمڕۆش بەردەوامە، دیارترین شوێنەواریشی دروستبوونی رەوتی رەشبینیە کە سەرچاوەی رۆحی سلبی و بەکەم سەیرکردنی مرۆڤە.

دکتۆر (موحەممەد مەندور) وێنەی مەسیحیەت بۆ نموونە بالاکان دەکێشێ و دەڵێت: دیدو واتای ئەوان لەسەر ئەو بنەمایە دامەزراوە کە سروشتی مرۆیی پیسەو ئەو تاوانە کۆنە هەر لە دروستبوونیەوە پیسی کردووە، بۆیە ئەرکمان چاککردنی نیە بەڵکو لەناوبردنیەتی بۆ سەرلەنوێ دروستکردنەوەی، پێویستە لە ناخماندا بە سزادانی جەستەی پیاوە کۆنەکە قبوڵ بکرێ مەبەست ئەوەیە بمریت تا سەرلەنوێ بە ژیانێکی ئەخلاقیەوە بنەوینەوە ژیان، پەروەردەی تاك لە وادەی ویستەکانیدا بە گەشەسەندن نیە بەڵکو بە برینی ویستی بنەرەتیەتی و پێدانی ویستێکی نوێیە کە دژی سروشت بێ، سەبارەت بە حەق پێی وایە بیردۆزەکە سروشتی مرۆیی لەسەروو توانیەوە ئەرکی لەسەرە بەجۆرێ ناکرێ بە زۆرینەی مرۆڤەکانیشەوە ئەو بۆشاییە پڕبکرێتەوە.[1]

لێرەوە ئەو ڕوانین و بڕوابوونە بە تاوان و هەڵە کۆنە دەردەکەوێ کە لە بیری هەموو رۆژئاواو فەلسەفەو مەزهەب و ئایدۆلۆژیا نوێکانیشدا شوێنەواری قووڵی هەبووە، چونکە ڕێنماییە ئەخلاقیە مەسیحیەکان لە سایەی ئەو ڕوانینەدا لەسەر بنەمای ڕق بوون لە جەستەو رۆچوون لەسەرکوتکردنی ئارەزووە سروشتیەکانی جەستە وەستاون، ئەمەش دەبنە هۆی خراپبوونی رەوشتی تاکەکان و درۆو دووڕوییان فێردەکات و ناچاریان دەکات کۆمەڵگە هەڵبخەڵەتێنن و لە دیدێکی بالادا خۆیان بخەنە بەرچاو، لێرەوە رەهبانیەت و مەترسیەکانی

---

١- د.مندور: من المواطن القديم.

کاریگەری قووڵیان جێ هێشت، لێرەوە ئەو گۆڕانە مەترسیدارانەی ڕاڤەکانی مەسیحیەت کە دژی فیترەت و عەقڵ بوون شوێنەواری زۆر قووڵ و ماوەدرێژیان جێهێشت.

بەڵام ئیسلام هەموو مەسەلەکان دەگێڕێتەوە بۆ مۆرك و سروشتی بنەڕەتی خۆیان، لە زمانی عەرەبە جاهیلیەکان و دواتریش لە زمانی موسڵماناندا (تاوانە کۆنەکە) هیچ واتایەکی هاوواتای ناو مەسیحیەکانی لەخۆنەدەگرت با دەقەکە یەك بوو بێ و لای موسڵمانان تاوانەکەی ئادەم وەك هەر تاوانێکی تر بە تەوبە سڕاوەتەوەو بە لێخۆشبوون شۆراوە و نەماوە، لێخۆشبوونیش تەنها لای خوایە، ئادەم لای خواوە چەند وشەیەکی نیشانداو خواش لێی خۆش بوو و ڕێنمونی کرد، ئیتر تەوبەکەی ئادەم هەموو تاوانەکەی لە دنیاو دوارۆژدا سڕیەوەو سزای ماوەی بەدوادا نایەت، خوای گەورە لە صحوفەکەی ئیبراهیم و موساشدا فەرموویەتی ﴿لاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾ (کەس باری تاوانی کەسی تر هەڵناگرێ) بۆیە کەسی لەدایکبوو تاوانی باوکی هەڵناگرێ ﴿وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَى﴾ ئەو بیرەی مانەوەی تاوانەش لە بیروباوەڕی موسڵماندا هیچ بنەڕەتێکی نیە بەڵکو ئەوپەڕی دوورەپەرێزی کردووە لە بڕوابوون بە میراتی تاوان و هەڵە.[١]

دیارە بیرۆکەی تاوانە کۆنەکە وتەی پۆلس بوو و خێرا چەند کۆڕبەندێ کردیان بە کرۆکی باوەڕی مەسیحی و لە ڕاڤە مەسیحیەکاندا بیرۆکەی تاوانەکە پەیوەست کرا بە بیرۆکەی ڕزگاربوونەوە (الخلاص)، لێرەوە جیاوازی ڕوونی نێوان دیدی ئیسلام و دیدی مەسیحیەت بۆ مرۆڤ دەردەکەوێ: مەسیحیەت پێی وایە مرۆڤ بە سروشتی خۆی هەڵەکارو تاوانبارەو پێویستی بەوەیە بەفیدابوون ئەو تاوانەی بسڕێتەوە، بەڵام ئیسلام پێی وایە مرۆڤ ویستی ئازادەو لەبەردەم پەروەردگاریشیدا لێی بەرپرسیارەو لەبەردەم خەڵکیشدا لێپرسراوی ئەخلاقی هەیە، هەموو ئەمانەش پەیوەندییان هەیە بە زیندووبوونەوەو پاداشتی ڕۆژی دواییەوە.

ئیسلام بە شێوەیەکی ڕوون جیاوازی دەکات لەنێوان خوایەتی و پێغەمبەرایەتیدا و پەیامی وایە کە خوا دروستکەری هەموو شتێکەو پێغەمبەریش مرۆڤێکەو دروستکراوی

---

١- محمود محمد شاکر: الرسالة ١٩٦٤.

خوایەو خوا خەڵاتێکی تایبەتی لەنێو خەڵکدا پێداوەو سروشی بۆ ناردووە تا پەیامەکەی خوا بگەیەنێت بەخەڵك، قورئان کە پەیامی دابەزیوی خوا و کۆتا کتێبی خواو دەقی دڵنیاو چەسپاوە ئاماژە بەوە دەدات هەموو پێغەمبەران دروستکراوی خوان و توانای ئەوەیان نیە داوای خوایەتی بکەن ﴿مَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُؤْتِيَهُ اللّهُ الْكِتَابَ وَالْحُكْمَ وَالنُّبُوَّةَ ثُمَّ يَقُولَ لِلنَّاسِ كُونُواْ عِبَاداً لِّي مِن دُونِ اللّهِ﴾ خوای گەورە بۆ هەر ئوممەتێ لەنێو خۆیاندا پێغەمبەرێکی بۆ ناردوون و بە بەڵگەو موعجیزە پاڵپشتی کردووە، خوای گەورە لەنێو خەڵکدا پێغەمبەرانی هەڵبژاردووەو ئامادەسازی کردون تا لەبارین بۆ هەڵگرتنی پەیامی گرنگی خوایی کە بانگەوازی خەڵکە بۆ یەکخواپەرستی، چی پێغەمبەرە خوا سروشی بۆ ناردووەو لەگەڵیدا کتێبێ یان پەیامێ یان پەڕاوێکی ناردووە، ئامانجی ناردنی پێغەمبەرانیش ئیقامە حوجەیە لەسەر بەندەکان، تاکە سەرچاوەی سروش خوایە، بۆیە پێغەمبەرایەتی وەك پاڵەوانێتی نیەو سروش وەك ئەو ئیلهامە نیە کە بۆ جگە لە پێغەمبەران هەیە، پەیامی خوایی یان پێغەمبەرایەتی بە وەرزش و هەوڵدان نابێ و پێغەمبەر ڕێبەر یان چاکساز یان هەڵکەوتەیەك نیە کە بیری سەردەمی خۆی وەرگرتبێ و ئاڵای بانگەوازی چاکسازی کۆمەڵگەی هەڵگرتبێ وەك ئەوەی لە چەمك و واتاکانی فەلسەفەی ماددیدا کە بڕوایان بە غەیب نیە چەند جار ئەو قسانە وتراونەتەوە، پێغەمبەران پاك و بەدوورن لە تاوان و لاڕێکردن ئەگەر چی وەك مرۆڤێ دوچاری نەخۆشی و لاوازی و مردن دەبن، لە ئاستیاندا ڕاستی و سپاردەکاری و گەیاندن و شارەزایی هەیەو درۆ و ناپاکی و شاردنەوەو گەمژەییان تەواو لێوە دوورە.

ئیسلام دوور لە هەر گومان و ڕاڕاییەك واتای پێغەمبەرایەتی بە وردی ڕوون کردووەتەوە، قورئان سیفەتی پێغەمبەری خستووەتە ڕوو ﴿بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ﴾ (مرۆڤێکەو سروشی بۆ دادەبەزێ) ئەمەش لەپێناو ڕزگارکردنی عەقڵی مرۆیی لەهەر تێکەڵکردنێکی نێوان خوایەتیو پێغەمبەرایەتی و بۆ فراوانکردنی ماوەی دووری نێوانیان، پێغەمبەر بە مۆڵەت و ویستی خوا سروشی بۆ دێ و موعجیزەی دەبێ، خوا بۆ هیچ مرۆڤێ پێش ئەو نەمری دانەناوە، چی سیفەتی خواردن و خواردنەوەو خەو و بێداری و ژنهێنان و منداڵ بوون کە بۆ

مرۆڤێ گونجاون بۆ پێغەمبەرێکیش گونجاون، چونکە ئەویش مرۆڤێکەو زۆر مەحاڵە خوایەك بێت بەڵام بەوە لە مرۆڤەکانی تر جیادەکرێتەوە کە خوا سپاردەیەکی لەسەر شان داناوە، ئەمەش دوو دیوی هەیە: سروش و موعجیزە، سروش لەڕووی شەرعیەوە مەعریفەیەکە پێغەمبەر لەناخیدا بەدیدەکات و تەواو دڵنیایە کە لەلایەن پەروەردگارەوەیەو بەڕێی بیستن یان ڕێی تر یان بەبێ نێوەند ئەو سروشە وەردەگرێ، موعجیزەش کارێکی لەتوانا بەدەرە کە لەسەر دەستی پێغەمبەر بۆ تەحەددا بەکاردێ بەجۆرێ کەس نەتوانێ نموونەی وا بهێنێ، خوای گەورەش ڕاستەوخۆو بێ نێوەند ئەو موعجیزەیە دروست دەکات تا بۆ خەڵکی ڕوون بکاتەوە کە پێغەمبەرەکانی ڕاستگۆن و دەرگای ڕوانین بۆ ئەوەی کە بۆیان دابەزیوە لەڕوویاندا بکاتەوە و عیسمەت لەئاست پێغەمبەراندایەو خواش ئەو پێغەمبەرانەی ناردووە بۆ پەیامەکەی خۆی و لە گومان و تاوان بەدووری گرتوون.[١]

جیاوازی نێوان پێغەمبەرایەتی و هەڵکەوتەیی ڕوونە، هەڵکەوتەیی جیایە لە پێغەمبەرایەتی و لە زیرەکی و توانای بەدەستهێنانی ڕێبەری و هەڵکەوتەیی بواری هزرییان کراوەیەو لە پێغەمبەرایەتی جیاوازو کەمترە و زیاتر لە ئیلهام و توانای داهێنان و لێزانانە چارەسەرکردنی بارەکانەوە نزیکە، عەرەبەکان دوور لە پێغەمبەرایەتی چەمکی عەبقەریەتیان بۆ ئیلهام بەکارهێناوە.

لە پێغەمبەرەوە گێڕدراوەتەوە دەفەرموێت (پێش ئێوە کەسانێکی ئیلهام پێدراو لە پێکانی حەق و ڕاستی و چارەسەری گرێکانداو داهێنانی نوێدا هەبوون، ئەگەر لە ئوممەتی مندا کەسێکی وا هەبێ ئەوە عومەری کوڕی خەتتابە)(لقد كان فيما قبلكم محدثون في إصابة الحق والصواب وفي حل المعضلات و في إبتداع ما لم يسبقوا إليه فأن يكن في أمتي أحد فأنه عمر بن الخطاب).

لە صەحیحی موسلیمدا دەقی (ملهمون) هاتووە کە ڕاست وتنی بێ پێغەمبەرایەتیە، هەروەها پێغەمبەرﷺ لە چەند بۆنەیەکدا عومەری کوڕی خەتابی (ڕەزای خوای لێبێ) بە

---

١- كمال الدين الطائي: رسالة في التوحيد.

عەبقەریەت (هەڵکەوتەیی) وەسف کردووە (ثم جاء عمر بن الخطاب فاستحالت عزباً فلم أر عبقريا يفري فريه) لێرەوە ئەو عەبقەریەتەی وەسفی عومەری پێ کراوە نابێ بۆ وەسفی پێغەمبەر بەکاربێ، ئیمامی عومەر لە بواری عەبقەریەتدا لوتکەی هەرە باڵایە، بەڵام عەبقەریەت لەکوێ و پێغەمبەرایەتی لەکوێ!

هەروەها جیاوازی نێوان پێغەمبەرایەتی و ئیلهام ڕوونە، چونکە تاکە سەرچاوەی سروش خوایە، بەڵام ئیلهام بەدەستهێنانە بۆ جگە لە پێغەمبەران، ئیلهام وا وەسف کراوە ویژدانێکە نەفس پەردەکاتەوە و نازانێ لە کوێوە بۆی هاتووە، بەڵام سروش دڵنیایی پێغەمبەری لەگەڵە کە دەزانێ لەلایەن خواوە بۆی هاتووە.

هەندێ کەس جیاوازی قووڵی نێوان پێغەمبەرایەتی و پاشایەتییان لێ دیار نیە، لەوانە کاتێ ئەبووسوفیانی کوڕی حەرب شەوی فەتحی مەککە موسڵمان بوو پێغەمبەر ﷺ بە عەبباسی فەرموو ئەبووسوفیان ببەو لە سەرەوەی شاخەکە بیوەستێنە تا سوپای فەتح ببینێ، کاتێ کەتیبەکانی سوپای خوا تێدەپەڕین و لەنێویاندا کەتیبەی خەزرا هات خێرا ئەبووسوفیان خۆی پێ ڕانەگیراو وتی بە ڕاستی برازاکەت سبەینێ دەبێتە پاشایەکی گەورە، عەبباس پێی وت ئەی ئەبووسوفیان ئەوە پێغەمبەرایەتیە، بەڵێ بەخوا ئەوە پێغەمبەرایەتیە بەهەمان شێوەش پاڵەوانێتی شیاوی عەلی (ڕەزای خوای لێ بێت) بوو و ڕێبەری شیاوی موعاویە (ڕەزای خوای لێ بێت) بوو و سەرکردەیی شیاوی خالید (ڕەزای خوای لێ بێت) بوو و هەڵکەوتەیی و عەبقەریەت شیاوی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) بوو، بەڵام پێغەمبەر ﷺ زۆر لە هەموو ئەوانە گەورەتر و باڵاترە، باڵاترە لە هەر چاکساز یان ڕێبەر یان سەرکردە یان عەبقەرییەك.[١]

سەید مەسیح عیسای کوڕی مەریەم مرۆڤ و پێغەمبەرێکە کە قەدەری خوا وابووە بەشێوەیەکی تایبەت لەدایك بێ تا ببێتە بەڵگەیەکی توانای خوا کە چۆن خۆی یاساو

---

١- راجع بحث الدكتور محمد أحمد الغمراوى (مجلة الشبان المسلمين ١٩٦٧).

ڕێساکان دادەنێ و دەتوانێ چۆن بیەوێ دەستکارییان بکات و ئەوەی فێری خەڵك بکـات خـوا بەسەر هەموو شتێکدا زاڵەو ئەوەی فەلسەفەی یۆنانی بڵاوی دەکاتەوە گوایە دنیا لە سـنوری چەند یاسایەکی چەسپاوو یـەکلاو مـەنتیقێکی سـنورداردا دەجووڵـێ، هـەموو ئـەو قـسانە ساختەن و خوای گەورە لەو قسانە بەدەرە.

بە پێداچوونەوەی ڕوونی ئەو جیاوازیـەی نێـوان خوایـەتی و پێغەمبەرایـەتی و جیاکـاری نێوانیان پایەی حەقیقی سەید مەسیحمان بۆ دەردەکەوێ و دەبینین مەسـیحی ئینجیلـەکان و مەسیحی پۆلس دوو کەسی پێکەوە نەگونجاون.

چەندین کەس ئاماژەیان بەوە کردووە، لەپێش هەموویانەوە دکتۆر ڕاشد شەماس کارلیـل دەڵێت: خوێندنەوەی کتێبی پیرۆز ئەوەی سەلماندووە کە سەید مەسیح خوا نەبووەو بانگەوازی خوایەتی نەکردووە، لە ڕاستیدا ژیانی سەید مەسیح لە ئینجیلەکاندا دوای ماوەیەکی زۆر لـە مردنی بووە کە ئەویش بەلایەنی کەمەوە سەد ساڵە، مێژووی لەدایکبوونی مەسـیح چـەندین جار گۆڕاوە تا دواجار بڕیاریدا لـە ڕۆژی ٢٥ دیـسەمبەردا بـوو بـێ و ئـەوەش لـە دەوڵـەتی ڕۆمانیدا یەکێ لە جەژنە کان بوو، کەرەستەی مێژوویی وانیە وێنەیەکی تەواوی ژیانی سـەید مەسیح نیشان بدات و چەند لایەنی ژیانی هێشتا ناڕوون و نـەزانراون، ئـەی ئـەو وردەکاریـە سەرسوڕهێنەرەی بڕیارو ڕوداوەکانی پێغەمبەر موحەممەد لەکوێ بـەجۆرێ دەکـرێ بڵـێین چـی وردەکاری ژیانی پێغەمبەر ﷺ هەیە لە سوننەتدا هاتووە. خـودی نووسـەرانی ڕۆژئـاوا لـەوە سەرسامن و دەکەونە لەسەردوان و بەراوردکاری. (لۆرنـد یاسـورت سمـیس) لـە کتێبەکەیـدا (محمود العبقریە) دەڵێت: لەوانەیە تەنها هەندێ شت لـە ژیـانی پێغەمبـەران بـزانین جگەلـە پێغەمبەری ئیسلام کە باری تەواو ڕوونەو هیچ نهێنیەکی شاراوەی نەماوەو هەموو بۆ مێـژوو باسکراوە، مێژووی ڕاستی ئەو پێغەمبەرە لەبەردەستی خەڵکیدایەو هـەموو مەسـەلەکە وەك ڕۆژی ڕووناك ڕوونەو لەبەر تیشك و ڕووناکیەکەیدا هەموو شتێ ڕوون و دیارە).

سەبارەت بە ژیانی سەید مەسیح مێژوونووسان سێ ڕایان لەسەری هەیە:

١- ڕایەك لەسەر کەمڕەوی دەچن و دەگەنە ئەوەی دەڵێن کەسێکی نامێژوویی‌ەو ئەو وێنەی مەسیح کە کڵێسا دەیەوێت لەبیرو دڵی خەڵکدا وێنەی بکات وێنەیەکی ساختەیەو خەڵکی لە بتپەرستی کۆنەوە بەمیرات بۆیان ماوەتەوەو چی لە مەسیحیەتدا هەیە لە ئایینە بتپەرستیەکانی چەند هەزار ساڵەی پێش مەسیحیەتدا بنەڕەتیان هەیە، (ج.م.ڕۆبرلسۆن) و (جان هارنکتون) و دکتۆر (فریزەر)و (ج.د.یارسونا) و (ئیدوارد کانتیر) ئەم ڕایەیان هەیە.

٢- ڕای دووەم لەسەر زیادەڕەوی بەرامبەر بە مەسیح (علیە السلام) دەچن و دەیبەنە پلەوپایەی خوایەتی.

٣- ڕای سێیەم لەسەر بنەمای دادپەروەری و میانەڕەوی دەڕوات و دان دەنێ بە بوونی مێژوویی مەسیحداو پاکی ڕادەگرێ و دایکیشی بەپاك ڕادەگرێ لە هەر سیفەتێکی گوماناوی‌و ئەو پایەی دەپارێزێ کە خوا بۆی داناوە.

ئیسلام چەمکی بەندایەتی بۆ خوای وەك ڕاستکردنەوە بۆ چەمکی باوکایەتی داناوە، لە ئیسلامدا باوکی گەورەو خوای تایبەت و خوای خۆبەخش و لەپێناو تاواندا بوونی نیە، موسڵمانان بڕوایان هەیە هیچ پەرستراوێ نیە جگە لەخوای تاك و تەنهای بەخشندەو میهرەبان. سیانە خوایی و باوکایەتی و هەڵەو تاوانە کۆنەکە خۆفیداکردن لەگەڵ بیروباوەڕی پوختی یەکخواپەرستیدا ناگونجێن. ئیسلام حەقیقەتێکی بنەڕەتی داناوە کە لە بەراوردی ئایینەکاندا تەنها لە ئیسلامدا دەبینرێ ئەویش ئەوەیە لەنێوان خواو بەندەکانیدا نێوەندێ نییە، بەڵێ ئیسلام شێوەیەکی لاهوتی یان پیاوی ئایینی نیە کە شەفاعەت یان وصایە یان ڕزگاری نێوان خواو بەندەکانیان لەدەستدا بێ، ئیسلام وای گەیاندووە پەیوەندی نێوان خواو بەندە هیچ نێوەندو میانەیەکی نیە بۆیە ئیسلام دان نانێ بە شێوەیەکی کەهەنوتیدا، داننانێ بە دامەزراوەیەك یان حکومەتێکی سیۆقراتیدا بەو جۆرەی کە ئەوروپا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا دانی پێدانا بوو.

لە هەندێ ئاییندا پیاوانی ئاییینی بانگەشەی ئەوە دەکەن خوای گەورە لەنێو بەندەکانیدا هەڵیبژاردوون تا نێوەندبن لەنێوان خواو خەڵکداو داوایان لە خەڵك دەکرد ملکەچی و گوێڕایەڵی کوێرانەیان بۆ نیشان بدەن و نەیاندەهێشت خەڵکی کتێبی پیرۆز بخوێننەوەو ڕوانینە بوون و تێگەیشتن لە ڕووداوەکانی جیهانیان لێ حەرام دەکردو دەمارگیرییان هەبوو بۆ دەقە ئایینیەکان و بەو پێیە هەموو شتێکیان ڕاڤە دەکرد.

لێرەوە ئەو دامەزراوانە بنەڕەت و لقەکانی زانستیان داناو لە هەموو مەسەلە جەوهەریەکاندا جیاکارییان کرد وەك مەسەلەی دروست بوونی مرۆڤ و سروشتی و ئامانج لە ژیانی، لە ئەنجامی ئەمەدا وازیان لە ژیانی دنیا دەهێناو ڕقیان لێی دەبوو و خرافەو کاهینی هەموویانی داگرتبوو. مەترسیدارترین بیردۆزەکانیش کە ئەو فەلسەفەو ڕاڤانە پێشکەشیان کرد بریتیبوو لەوەی دەڵێن: مرۆڤ لە دوو ڕەگەز پێکهاتووە: نەفس و جەستە. ململانێیەکی بەردەوامیش لەنێوان ئەو دوانەدا هەیە، ئەو کەماڵە ڕۆحیەی کە مرۆڤ دەیخوازێ کاتێ دەبێ کە ڕۆح لە جەستە جیابکاتەوە. ئەم بیردۆزەش پەیوەست کرابوو بە بیردۆزەی تاوان و هەڵەوە (الخطیئة) کە هێشتا بەدوای بیری ڕۆژئاواییەوەیەو کاریگەری درێژماوەی لەسەر جێهێشتووە.

بوونی دامەزراوەیی و فیداکردن و حەوت نهێنیەکەو گەورەیی سەرۆکی باڵا پەیوەندییان بە یەکەوە هەیە، دەوترێ کڵێسای ڕۆما بە ڕاسپاردەی خودی مەسیح دانراوە، ئیمپراتۆر لە ساڵی ٤٤٥ز. دا بڕیارێکی دەرکرد کە کە سەرۆکی ئوسقوفەکانی ڕۆمای کردە سەرۆکی گشتی کڵێسا مەسیحیەکان، (گریگۆر)ی سەرۆکی ئوسقوفەکانی ڕۆما (٤٤٠-٤٦١) لە ڕۆما دەستی گرت بەسەر دەسەڵاتی سیاسیدا، لەو ماوەوە کڵێسای ڕۆما لەپاڵ دەسەڵاتی ڕۆحیدا دەستی گرت بەسەر دەسەڵاتی سیاسی ئیمپراتۆریەتدا و بەوەش کڵێسا دەوڵەتێکی دەمەزراندو بانگەشەی ئەوەی کرد مافی هەیە دەسەڵاتی بڵاوبکاتەوەو هەموو مەسیحیەکانی هەموو ناوچەو هەرێمەکان بخاتە ژێر دەسەڵاتی و پایەشی باڵاترە لە پایەی پاشاکان، پاپا دەسەڵاتی باڵای دادوەری و کارگێڕی هەیەو خۆی یاسادانەرو ڕاڤەکاری تەواوی کتێبی پیرۆزە، دواتر کڵێسا دەستی گرت بەسەر دادوەریداو مافی حورمانی وەك گەورەترین سزا بەرامبەر بە

نەیارانی بەکاردەهێنا، ئیتر هەموو کاروباری خێزان وەك هاوسەرگیری و تەلاق کەوتنە دەست کلێسا، پیاوانی کلێسا خۆیان بە نوێنەری خوا دەزانی و مافی ڕێبەری بیرو کاری خەلکیان بۆ خۆیان دانابوو.

کلێسای کاسۆلیکی لە سەدەکانی یەکەمەوە بڕوای وابوو پاپا لە مەسەلەکانی ئیمان و ڕێوڕەسمی ئاییندا بە دوورە لە هەر هەڵەیەك. لە سایەی ئەو سیستمەدا کلێسا ئالای دوو ڕووداوی زۆر گەورەی ناو مێژووی هەڵگرت، جەنگە خاچپەرستیەکان و دادگاکانی پشکنین.

هەر لەسەرەتای دەسەلاتیەوە کلێسا کەوتە چەوساندنەوەی نەیارانی و بەزۆرە ملا و بەیەك جار هەزاران کەسی تەعمید دەکرد. هەروەك چەند زانیاریەکی مرۆیی و بڕیارێکی سەردەمی مێژوویی و جوگرافیایی و زانستە سروشتیەکانی خستە نێو کتێبە پیرۆزەکانەوە، چی لەسەر زار لەنێو خەلکدا بلاوبوایە دەیانخستە ناو کتێبە پیرۆزەکانەوە، هەندێ لە شرۆڤەکارانی تەورات و ئینجیل و ڕاڤەکارانیان هەندێ زانیاری جوگرافی و مێژوویی و سروشتییان باس دەکردو ڕەنگێکی ئایینییان پێدەداو دەیانکرد بە ڕێنمایی و پایەی ئایینی و دەبوو خەلك بڕوای پێبهێنن. دیارترین نارەزاییش لەو ئەنجامەوە ئەوە بوو کاتێ دۆزینەوە زانستیەکان ڕاگەیەنران قیامەتی کلێسا هەستاو کلێسا کەوتە کافرکردنی زانایان و حەلال کردنی خوێن و سامانیان و دادگاکانی پشکنینیان دانان کە وەك پاپا دەیوت تا ئەو ملهوڕو زندقیانە سزا بدەن، ئەوانیش کەوتنە بڕینی هەر ڕیشەیەکی دژە کلێسا لە جیهانی مەسیحیداو عەیبدارکردنی ئەو کەسانە لە هەموو ولاتداو لە ئەنجامی ئەوەدا نزیکەی سێ سەد هەزار کەس لەوانە کوژران کە سی و دوو هەزاریان بەزیندوویی سوتێنران لەوانە زانای سروشتی (برۆنۆ، هەروەها (گالیلۆ) سزای کوشتنی بەسەردا درا لەبەرئەوەی بڕوای بەوە هەبوو زەوی دەخولێتەوە بە دەوری خۆردا.[1]

بەوجۆرە ئەو مۆرکەی ئیسلام دەردەکەوێ کە بێ دیدێکی لاهوتی و پیاوی ئایینی دامەزراو بلاوبوویەوە و لە بنەڕەتدا بڕیاری ئەوەی دا (هیچ نێوەندێ نیە لەنێوان خواو

---

١- أبو الحسن الندوي: ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمين.

بەندەکانیدا) ئەم مۆرکە بەڕوونی و دیاری دەردەکەوێ کە چۆن ئیسلام مرۆڤایەتی بەرزکردەوەو چەندین هەنگاو بەرەو پێشی بردو لە چەندین کۆت و بەند ڕزگاری کرد، ئەگەر یەك چاو بخشێنین بە ململانێی نێوان کلێسای کاسۆلیکی و پرۆتستانتی لە ئەوروپادا وێنەیەکی تاڵ و تاریکی پڕ توندو تیژی دەبینین کە جەنگی (سانت بارتلمی) وێنەیەکی ئەو بزاڤە توندو تیژیەیە و دوو ساڵ درێژەی کێشا، جەنگی سانت بارتلمی لە سەدەی شانزەو لە ساڵی ١٥٧٢ز. دا ڕوویدا و تیایدا فەرەنسا گەورە پیاوانی خاوەن ژیری و عەقڵ و ئازادی و زانست و پیشەسازی خۆی لەدەستدا.

لە ئەنجامی دەرکەوتنی مەزهەبی پرۆتستانتیدا کە لە سەرەتاکانی سەدەی شانزە لە ئەڵمانیادا دەرکەوت و بڵاوبوویەوە بۆ هەموو ناوچەکانی ئەوروپادا ئەوە بوو لە فەرەنسا هەرکەس لە ئاکاری ئەو کاتی کلێسای کاسۆلیکی بێزار بووایە دەیدایە پاڵ مەزهەبی پرۆتستانتی، ئەو کات لەسەر دەستی کلێسای کاسۆلیکی کوشتارێکی بەکۆمەڵ ڕوویدا، کاتێ کلێسا لە شەوی ٢٤ ئۆگەستسی ١٥٧١دا زەنگی لێدا ئەوە سەربازو خۆبەخشانی وروژاند تا بکەونە تەفروتونا کردنی پرۆتستانتەکان و کەوتنە ڕوخاندنیماڵەکانیان و بە مەشخەڵی دەستیانەوە لەو شەوە تاریکەدا ڕێیان دەبینی و دەکەوتنە لەناوبردنی کەسانی بێتاوان و ئەوپەڕی ڕەقی و دڕندەیی کەموێنەی ناو مێژووی مرۆڤایەتییان نیشان دەدا، سکی ئافرەتی سکپڕیان هەڵدەدڕی و کۆرپەکەیان دەردەکردو دەیانخستە بەردەم سەگ و بەراز، ئەو منداڵانەش کە لەبێشکەدا بوون دەیاندانە دەست ئەو منداڵانەی خۆیان کە لەخواروو دە ساڵیەوە بوون و فەرمانیان پێ دەکردن لەناو بازاڕی پاریسدا بە سەربڕین بیانکوژن، بەو جۆرە وازیان نەهێنا تا شەقامەکانی شار جۆگەی خوێنیان لێ هەستاو هاوارەکان گەیشتنە ئاسمان، لە زۆر شاری تری فەرەنسادا ئەمە دووبارە بوویەوە، سەرسوڕهێنەرترین شتێ کە ڕوویدا لە ڕۆژی دووەمدا جارێکی تر زەنگی کلێسا لێدرا شوێنکەوتوانی کینەی ئایینی وایانزانی ئەوە ڕێپێدرانێکی نوێیە تا جەنگ دەست پێبکەنەوەو کەوتنە کوشتن و بڕین و جەستە شێواندنی براکانیان و تا ڕۆژی سێیەم بەو بارەوە قەسابخانەکە بەردەوام بوو، دواتر لە ماوەی مانگی

سێبتێمبەرو ئۆکتۆبەردا لە پاریس و چەند شارێکی تردا ئەو بارە گۆڕا بۆ باری سەربڕینی تاکەکەسی.

ئەمە وێنەیەکی دڕندانەو دڵڕەقانەی کڵێسای مەسیحی بوو، لەپاڵ ئەمانەدا چەندین وێنەی تری ناشرین هەن کە ئاستی گەورەیی ئەو خەلاتەی ئیسلام نیشان دەدەن کە بەهۆی یەکخواپەرستیەوە پێشکەشی مرۆڤایەتی کرد.

هەڵوێستی ئیسلام لە بیروباوەڕی زیندووبوونەوەدا لەگەڵ سروشتی خۆی و ڕێبازی و کەمالیدا دەگونجێ، ڕاڤە جوولەکەییەکان هەوڵ دەدەن نکوڵی بکەن لە زیندووبوونەوەو پاداشتی ڕۆژی دوایی تا بەرپرسیارێتی تاکەکەسی و پەیوەستی ئەخلاقی لەکار بخەن و چەمكو واتای لێکهەڵوەشان و ڕابواردنی ژیان بخەنە ڕوو بێ ئەوەی ئەرکی مرۆڤ لە ژیاندا لەبەرچاو بگرن، یان بەرپرسیارێتی تاك لە کۆمەڵگەو پەیوەندی کاری دنیای بە ڕۆژی دواییەوە کە قۆناغی پاداشتی ڕۆژی دواییە.

بیروباوەڕی زیندووبوونەوە یەکێکە لە چەمکە بنەڕەتیەکانی پەیوەندی ئایین و کۆمەڵگەو بۆ تەواوکاری کەسێتی مرۆیی لە پەیام و ئامانجیدا، ئەمەش لەو پێکهاتەیدا ڕیشەی قووڵی هەیە بەجۆرێ ناکرێ لە ئایینی حەق جیای بکەیتەوە، ئەمەش هێمایەکی ڕوونی واقعیەتی ئیسلام و سەیرکردنیەتی بۆ ژیانی مرۆڤ وەك گشتێکی تەواوکارو تێگەیشتنێکی قووڵ بۆ ئەو ڕاستیانەی ژیانی مرۆڤایەتی لەلایەنە ماددی و ڕۆحیەکان پێکەوە کۆدەکاتەوە.

ئیسلام ڕازی نیە بەو ڕەهبانیەتەی کە مرۆڤ لە ڕۆزی پاك دوور دەگرێ، هاوکات ڕازی نیە بە بێڕەوشتی و لێکهەڵوەشانێ کە قەوارەی مرۆڤ تێکدەشکێنێ. کاتێ ئەوەش دەکات مرۆڤ دەخاتە پایەی حەقی خۆی لەو ڕوانگەوەی مرۆڤێکە خاوەن سپاردەو بەرپرسیارێتی و ویستی ئازادی و حساب و پاداشتی خۆیەتی لەسەر کارەکانی خۆی.

بێگومان هەوڵی گومان خستنە بیروباوەڕی زیندووبوونەوە لەپێناو بانگەواز بۆ لێکهەڵوەشانەوە تا خەڵك بەرەو ئازوەکان بەرن و ئەو ڕێسایانە تێکبشکێنن کە ڕێگری لەبەردەم خراپەو بەد ڕەوشتیدا، ئیتر کەس نەزانێ جگە لەم ژیانە ژیانێکی تر هەیەو وا بزانێ

ئەگەر هەموو ئارەزووەکان بەجێنەگەیەنێ زیانێکی ڕوونی بەردەکەوێ، بۆیە لـە هـەموو لاوە تاو دەداتە ئەو ئارەزووانە، کاتێ مرۆڤ بڕوابوون بە پاداشتی کارەکان لەدەست دەدات ئەوکات چاك و خراپی لایەکسان دەبێ، بڕوای بە زیندووبوونەوە نەماو بڕوای وابوو پاداشت وەرگرتنەوە نیە ئیتر ئارەزووەکانی لە هەموو لایەکەوە بەرەو پەیڕەو دەچن.

بێگومان بڕوابوون بە بیروباوەڕی زیندووبوونەوەو پاداشتی ڕۆژی دوایی هۆکـاری ژیانـەوەو پێناوو هۆکـاری بـەردەوامی بزاڤـی ژیانـە بـەرەو ئامـانج و نیازەکـانی، مـرۆڤ لەگـەڵ ئـەم بیروباوەڕەدا هەمیشە پرپەتی پاداشت وەرگرتنەوە هەیەو دەربازبوون لێی نیە. لێرەوە ئیـسلام زۆر جەخت دەکاتەوە سەر مەسەلەی زیندووبوونەوەو ڕۆژی دوایی و وەرگرتنی پاداشت تیایداو دانانی ئەو باسە لەبەرچاوو عەقڵ و بیرەکاندا بەجۆرێ هـەموو کارەکـانی دنیـا بـەو پێـوەرە ئەنجام بدرێت بەڵکو ئیسلام زیندووبوونەوە بە دروستکرانەوەیەکی تازە دادەنێ کە بـچووکترین جیاوازی نیە لەنێوان دروست بـوونی یەکـەم و زیندووبوونـەوەداو ئـەوەی دەتوانـێ یەکـەمجار دروستی بکات دەتوانێ زیندووی بکاتەوە لە ڕووی جەستەو ڕۆحیشەوە ژیانی ڕۆژی دوایی بـە ڕۆح و جەستەوەیەو خوای گەورە لە ڕۆژێکدا کە ماوەکەی هەزار ساڵە هەموو مرۆڤـەکان لـە سەرەتاوە تا کۆتایی کۆدەکاتەوە.

ئایینی حـەق لـە بیروبـاوەڕی زیندووبوونـەوەو ڕۆژی دواییـدا لەگـەڵ فـیترەت و عەقڵـدا یەکدەگرێتەوە چونکە دەروونی مرۆیی هەستێکی قووڵی هەیە کە پێـی دەڵێـت لەپـشت ئـەم ژیانەوە ژیانێکی تر هەیە کە تیایدا ئەو دادپەروەریە دێتە دی کە لە دنیادا فـەوتاوەو تیایـدا مرۆڤ پاداشتی کارەکانی وەردەگرێ و خوای گەورەش بیەوێ مرۆڤ بە شتێ ڕازی بکـات ئـەوە بیرۆکەی ڕازیکردنی لە ئارەزووەکانیدا دەچێنێ، تاسەی نەمری هەستێکی بڵاوی ناو دەروونـە مرۆییەکانە، ناکرێ ئەو ئامانجەی مرۆڤ کە خوا عەقڵ و زانستی پێـداوەو نهێنـی بـوونی بـۆ خستووەتەڕوو و سـپاردەی هـەڵگرتووە وەك هـەمان ئامـانجی هـەموو ئـاژەڵان بـێ، بـەڵکو

حیکمەتی خوا وا دەخوازێ لەپشت ئەم ژیانەوە ژیانێکی تر هەبێ کە تیایدا بەرهەمی کارەکانی وەربگرێ و پاداشتی خۆی بگاتەوە دەست[١].

ئەمیر عەلی دەڵێت: بیروباوەڕی ژیانی دوای مردن لەسەر ئەو بنەمایە وەستاوە هەموو مرۆڤێ پابەند دەبێ بەوەی بەتەواوی پاداشتی کاری وەرگرێ، بەختەوەری یان نەگبەتی تاکەکان لەسەر ئەو ڕێیە وەستاوە کە فەرزەکانی خوایان پێ بەرێکردووە، کۆتایی جیهان لە هەموو ئایین و ڕەوتەکاندا یەکدەنگی لەسەرەو ژیانی ڕۆژی دواییش دوای لەناوچوونی جیهان دەبێ و ئەمەش لە هەموو کتێبە دابەزیوە ئاسمانیەکاندا یەکدەنگی لەسەرە.

ئیسلام داننانێ بە وەحدەتولوجودو ئیتیحاد یان حلول و تەناسوخدا چونکە وەحدەتولوجود بەرپەرچدانەوەی خوایەتیەو سەلماندنی تەنها بوونە، وەحدەتولوجود دەربڕینی بیردۆزەی مادديبوونی کەونە کە پێی وایە لەپشت ئەم جیهانەوە شتێ نیە بۆیە خواش لەناو ئەم جیهانەدایە، بۆیە ئیسلام نکوڵی لەم بیرۆکەیە دەکاتەوە.

وەحدەتولوجود بیرکردنەوەیەکی کۆنی هیندییەو هەوادارانی پێیان وایە جیهان ئەزەلی و ئەبەدیەو مرۆڤەکان لە جەستەیەکەوە دەردەچن و دەچنە جەستەیەکی ترەوە، هەندێ جار دەچنە جەستەی ئاژەڵەوە، چیرۆکی ژیانیش لەو بازنە بەرتەنگەدا دەخولێتەوەو لە کۆتاییەکەیەوە دەست پێدەکاتەوە، بەڵکو توێژەرانی موسڵمان پێیان وایە وەحدەتولوجود مەزهەبێکە ئەخلاق لە بنەڕەتدا لەناو دەبات چونکە هیچ واتایەك ناهێڵێ بۆ ئەو بەرپرسیارێتیە ئەخلاقیەی و کە جەرگەی پاداشت و سزای لەسەرە، ئەو بیرە چۆن ئەخلاقی بێ کە دەڵێ خوا منی کردووە بە رووخسارێ بۆ خۆی و ڕاستی ئەوەی ئەنجامداوە کە پێی وایە بۆ منی کردووە، دەی چۆن دەکرێ من بەرپرسیارم[٢]، موسڵمانان پێیان وایە واجبولوجود هەیەو مومکینولوجودیش هەیە، واجبولوجود خوای گەورەیە کە هیچی لەپێشدا نەبووەو تاك و

---

١- التصوير الاسلامي.

٢- د.محمد يوسف موسى: فلسفة الأخلاق من الأسلام.

تەنهایەو سنوری کات و شوێنی بۆ نیە، بەڵام مومکینولوجود هەر شتێکە کە پێش ئەو شتی تر بوونی هەبێ.

موسڵمانان پێیان وایە بیرۆکەی حلول پەیامی تاك و تەنهایی خواو دووری لە دروستکران هەڵدەوەشێنێتەوە چونکە بەهۆی بیرۆکەی تەناسوخەوە خوا بە بوویەکی گوزراوە دەزانێ، ئەمەش لەگەڵ چەند سیفەتێکی خوادا ناگونجێ وەك سیفەتی مانەوە، لێرەوە دیدی رۆژئاواییەکان بۆ تەصەوف لە واتای جوزئی مەسیحیەتەوە بەرامبەر بە تەواو و کاملی ئیسلام دەبووژێنێتەوە، وەستان لە صەفای رۆحی تاکدا واتای کامڵ و پێویستی ئیسلام هەڵدەوەشێنێتەوە. بیرۆکەی حلول بیرۆکەی بەخوا دانانی مەسیح بەڕاست دادەنێ چونکە ئەو بیرە جیاکاری ناکات لەنێوان خواو بوون یان خواو پێغەمبەرایەتی یان خواو مرۆڤدا.

هەروەها ئیسلام بەرپەرچی واتای ئیتیحاد دەداتەوە کە مەبەست یەکبوونی مەخلوق و خالقە یان توانەوەی خوایە لەناو دروستکراودا یان خوا شێوە وەرگرێ کە ئەمەش بیروباوەرێکە دژ بە بنەمای یەکخواپەرستیە، لە ئیسلامدا یەکخواپەرستی ئلوهیەت و ربوبیەت هەیە، یەکخواپەرستی ربوبیەت سەبارەت بە کارەکانی خوایە وەك دروستکردن و مراندن و رۆزی دان کە بێباوەڕانی سەردەمی پێغەمبەریش ﷺ دانیان بەمەدا دەنا بەڵام سوودی نەبوو بۆیان، یەکخواپەرستی ئلوهیەت لەکاری مرۆڤە وەك پەرستش بۆ خوا بە هەموو بەشەکانیەوە لەوانەش پشت بەستن و پەنابردن و ئەو پەرستشانەی کە تەنها بۆ خوا دەبن، بێباوەڕانی جاهلیەت دانیان بەمەدا دەناو پەرستشیان بۆ بتەکانیان دەکرد، بۆیە بڕوای یەکخواپەرستی ربوبیەت سوودی پێ نەگەیاندن و زۆرێکیان بەو شیرکەوە مانەوەو لەسەری مردن، بێگومان داننان بە یەکخواپەرستی ربوبیەتدا کارێکی فیترەتیە، شیرك و هاوەڵ دانانیش بۆ خوا کارێکی نارەواو کتوپرە (کە داهێنراوە ئەگەر نا لە بنەڕەتدا یەکخواپەرستی هەبووە). ئیسلام سەبارەت بە چەمکی نمونەی باڵا[1] بەرامبەر بە چەمکە جیاجیاکانی بیروباوەڕەکانی تری ئەو بوارە هەڵوێستێکی روون و جیای هەیە، هەرکەس بڕوای بە ئیسلام هەبێ دڵنیایە نموونەی باڵا

---

١- د.توفيق الطويل: بحث مطول عن المثل الأعلى في الفلسفة الأخلاق.

خوایەو هەرکەس ڕێنموونی وەرگرت بەرەو ئیسلام دەبێ شوێن ڕێی خوا بکەوێ و هەوڵ بدات سیفەتە چاك و بەرزەکانی خوای گەورە بزانێ و خۆی پێ برازێنێتەوە.

بەڵام مەسیحیەت نموونەی باڵا لەو قدیسەدا دەبینێتەوە کە هەموو ژیانی بۆ ئامادەسازی بۆ ڕۆژی دوایی بەسەر دەبات و دوور لە دنیا دەژی یان لە دێرێکدا دوور لە خەڵکی دەگرێ و سیفەتی سوکنایی و نەرمونیانی و خۆڕاگری و نەرمی نواندو سیفەتی لەو جۆرە بە سلبی وەردەگرێ بەڵکو ستەمی خەڵك قبوڵ دەکات و سووکایەتیان قبوڵ دەکات و ڕازی و بەختەوەرە بەوە، بەڵکو بەوە قەناعەت دەکات و خۆی ناچار دەکات تا ئەوانەی خۆش بوێت کە ستەمیان لێ کردووەو دژایەتی دەکەن و دەستدرێژی دەکەنە سەرو لە پێناویاندا لای خوا داوای لێخۆشبوونیان بۆ دەکات[1].

بەڵام ئیسلام نموونەی باڵا لە مرۆڤدا نیشان نادات بەڵکو لە خوای گەورە دا نیشانی دەدات کە هەموو کەماڵی ڕەها کە عەقڵی مرۆڤ بتوانێ تەصەوری بکات لە خوادا هەیە، هەرکەس بەرەو لای نموونەی باڵا بچێ ڕێنمونی خوا وەردەگرێ و دەبێ لە سیفەتەکاندا پێشەنگی بە خواوە بکات، خوا دەفەرموێ ﴿وَلِلّهِ الْمَثَلُ الأَعْلَىَ﴾ ﴿وَلَهُ الْمَثَلُ الْأَعْلَى فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾.

بەڵام فەلسەفەکان هەر یەکەو ڕایەکیان هەیە، دەستەیەك بیرۆکەی واجبییان وەرگرتووە کە لە ڕێی عەقڵەوەیەو ئەمانەش دەستەی میسالیەکانن، دەستەی واقیعیەکان بیرۆکەی سوودبەخشی وەردەگرن کە سودبەخشی ڕێژەیی گۆڕاوەو بەپێی کات و شوێن دەگۆڕێ.

خێرا فەلسەفەی ئەورووپی دژ بە نموونەی باڵای مەسیحیەت ڕاوەستاو بانگەشەی کرد بۆ نموونەیەکی باڵای توندو تیژو ڕەق کە لە چەمك و دیدی خوای جوولەکەییەوە وەرگیرابوو، نیتشە وێنەی ئەو سوپەرمانە نیشان دەدات کە مرۆڤی سەرکەش و خۆسەپێن و توند دەنوێنێ و پشت دەبەستێ بە ستەم و توندو تیژی و خۆسەپێنی و گاڵتە دەکات بە خۆڕاگری و نەرمونیانی و لەسەرخۆیی و داوای دەکات لاوازو نەخۆش و نەدارەکان لەناو ببرێن تا تەنها

---

١- نفس المصدر.

بەهێزەکان بهێننەوە وەك چۆن ئەم نمونەیە لە جیهانی ئاژەڵاندا بەدیدەکەیت. ئەخلاقیش دابەش دەکات بۆ ئەخلاقی کۆیلەکان و ئەخلاقی خانەدانەکان. ئەخلاقی کۆیلەکان بە ئەخلاقی مەسیحیەت دەزانێ کە نەرمونیانی و خۆڕاگری، لێبوردەییە، ئەخلاقی خانەدانەکان بە ویستی هێزو تواناو ڕێزی ستەم و توندو تیژی دەزانێ. لەسەر بنەمای خودگەرایی ئەخلاق دادەنێ، ئەمە خاڵی وەرچەرخانی بیری ڕۆژئاوایی بوو لە چەمك و دیدی مەسیحیەوە بۆ چەمك و دیدی جوولەکەیی تلموودی بتپەرستی کە ئایینەکان بۆ دژایەتی ئەوە دابەزین تا لەناوی بەرن و چەمك و دیدی پێکەوە گونجانی کۆمەڵگە بە هەموو ڕەگەزە لاوازو بەهێزو هەژارو دەوڵەمەندەکەیەوە بچەسپێنن.

بەو جۆرە ئیسلام جارێکی تر چەمکی نمونەی باڵای لەسەر سۆزو ڕەحمەت و پێکەوە گونجان نیشاندایەوە ئەگەر لای مەسیحیەت ڕەحمەت لوتکەی کەماڵ بێ و لای نیتشە هێز لووتکەی چاکەو گەورەییەکان بێ ئەوا خوای گەورە ڕەحمەت و هێزی بە دادپەروەری و هاوسەنگی پێکەوە کۆکردوەتەوە، خوا ڕەحمان و ڕەحیمە، لێبوردەو بەسۆزە، لە هەمان کاتدا بەتواناو قادرو مونتەقیم و قەهارو جەبارە، سیفەتی ڕەحمان و خۆشەویستی لای خوا زاڵ و لەناوبەر نییە بەسەر سیفەتی هێزو توانادا، هەروەك بە پێچەوانەشەوە دروستە. خوای گەورە فەرمان بە بەندەکانی دەکات هێزو توندو تیژی لابەرن، کاتێ کەسێ بانگەواز بۆ هێزو توندی دەکاتو بەشداری ڕەحمەت و سۆزی لەگەڵدا بێ بەپێی پێویستی هەرکامیان بەکاریێن، خوا دەفەرموێت ﴿عَذَابِي أُصِيبُ بِهِ مَنْ أَشَاء وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ﴾ خوا وەسفی بەندەکانی دەکات بە بەرپەرچدانەوەی دوژمن و لەسەریشی حەرام کردون دەست نەکەن بە دەستدرێژی ﴿فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ﴾ ﴿وَقَاتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ وَلاَ تَعْتَدُواْ﴾ خوا بانگەواز دەکات بۆ خۆڕاگری و سەنگەرگیری و ئامادەسازی و پێ چەسپاوی.

خۆڕاگری: سەرکەوتن بەسەر دوژمندا بە خۆڕاگری بەرامبەر ناخۆشیەکانی جەنگ.

سەنگەرنشینی: مانەوە لەسەر سنورداو قەرەوڵ گرتن بۆ دوژمن و ئامادەسازی بۆ غەزا.

ئامادەسازی: خۆ ئامادەکردن بەوپەڕی تواناوە بەرامبەر بە دوژمن.

پێ چەسپاوی: ئەگەر بەرامبەر بە دوژمن جەنگان پێ چەسپاوبن و پشت هەڵنەکەن.

بەم جۆرە ئیسلام سوکایەتی و ملکەچی قبوڵ ناکات، خوای گەورەش بیری تۆڵە (قصاص) لە قورئاندا دێنێ ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالأُنْثَى بِالأُنْثَى﴾ ﴿وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ﴾ بەو جۆرە ئیسلام سۆزو ڕەحمەت و میهرو هێزو تواناو پێکەوە کۆدەکاتەوەو هۆشیاری دەدات بە باوەڕدار تا هێزی خۆی بەدەستدرێژی بۆ سەرکەس بەکارنەهێنێ، ئەگەریش پێویستی کرد دژ بە دوژمنکاریەکان ڕاپەڕێ.[١]

١- د.توفيق الطويل: نفس المصدر

# دواجار

سەرلەنوێ و دوای لارێکردنی ڕێی ڕاست بەرەو بتپەرستی و شیرك و فرەخودایی ئیسلام یەکخواپەرستی پێشکەشی مرۆڤایەتی کردەوە، بێگومان بەوە مرۆڤایەتی لە کۆتی کۆیلایەتی هزری و کۆمەلایەتی ڕزگاری بوو، هەرچەندە هەموو ئایینە ئاسمانیەکان بانگەوازیان بۆ یەکخواپەرستی پوخت بووە ئەوا ئیسلام کەوتە فێرکردنەوەی ئەو بانگەوازە تا ئەوەی (گۆستاف لۆبۆن) دەڵێت: دەکرێ ئیسلام بانگەوازی گەورەیی ئەوە بکات کە یەکەم پەیام بوو یەکخواپەرستی گەیاندە جیهان، (بارتلمنی سانهلێر) پێی وایە بانگەوازی یەکخواپەرستی کە ئیسلام ئاڵاکەی هەڵگرتووە عەقڵی مرۆیی لەو کۆتانەی ڕزگارکرد کە دیلی دەوری پەرستگاو بەردەستی کاهینانی کردبوو و لەو ئاستەوە بەرزی کردەوە بۆ بڕوابوون بە ژیانی پشت ئەم ژیانەو بیری مرۆیی لە بتپەرستی سەدەکانی یەکەم ڕزگارکرد.

جیهان ناچار بوو بگەڕێتەوە بۆ لای خۆی و بە دوای خوای خۆیدا بگەڕێ، (مسمەر) پێی وایە ئەو یەکخواپەرستیەی بنەڕەتی ئایینی ئیسلامە هۆکاری یەکەمی سەرکەوتوویی بانگەوازەکەی موحەممەد بوو، موحەممەد لە سەردەمێکدا ئەو یەکخواپەرستیەی ڕاگەیاند کە گەلان ئالوودەی خورافەی زانستی لاهوت ببوون، موحەممەدیش گەورەترین پەیامی هێناو چاکەی لەگەڵ عەقڵەکان نواند تا ئەوەی لەگەڵ وتنی پەیامی یەکخواپەرستی بانگەوازەکەی هەموو جیهانی گرتەوە، گەورەیی ئیسلام بە دەربڕینەکەی موحەممەد دەرکەوت کە بتەکانی دەوری کەعبەی دەشکاند (جاء الحق و زهق الباطل) هەروەها فەرموودەی (لا فضل لعربي علی أعجمي إلا بالتقوی أو العمل صالح کلکم لادم و آدم من تراب) (هیچ فەزڵێکی عەرەب بەسەر عەجەمیدا نیە تەنها بە لەخواترسان نەبێ یان بەکاری چاك، هەمووتان لە ئادەمن و ئادەمیش لە خۆڵە).

(هاملتۆن جب) پێی وایە: ئەو بیروباوەڕی یەکخواپەرستیەی کە ئیسلام هێناویەتی باڵاترین نموونەی بیری یەکخواپەرستی هەموو جیهانە، مانەوەی ئیسلامیش هیوایەکە بۆ

هەموو جیهان، ڕێوڕەسمی حەج بە پێناوێکی بەهێزی پەیڕەوی بنەمای یەکخواپەرستی جیهان دادەنرێ و هێمای ئەو برایەتیەیە کە موسڵمانان بە جیاوازی ڕەنگ و ڕەگەزیانەوە پێکەوە دەبەستێتەوە، چەمکی یەکخواپەرستی لە ئیسلامدا نیشانەیەکی پاکی و بێگەردیە، خوای گەورە دروستکەری مرۆڤ و دروستکەری بوون و مەوجوداتەکان (خوا لەپشت هەموو مەوجوداتەکان و لەسەروو هەموو جیهانەوەیە، درکی مرۆییش بۆ وێناکردنی چەند هەنگاوێکی ناوە، لەگەڵ ئەمەشدا زات و ڕاستی خۆی وەك خۆی ئاشکرا نەکردووە، خوا تەنهایە، لێرەدا تەنهایی واتای تەواو دەگەیەنێ و جێی نوێگەریی نیە، هەروەك وێنە پێدانی لە بتپەرستیدا هێمای فرەیی و زۆرییە) خوای گەورە ڕێساکانی بوونی دانـاوەو بەتـەنها خۆی توانای هەیە ئەو یاساو ڕێسایانە تێپەڕێنێ و توانای زاڵبوون بەسەر هۆکارەکاندا هەیـە، ئـەو هۆکارانەی لە مرۆڤ شاراوە نین، بالاترین نمونەی وێناکردنی خوا ئەوەیە ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾ لە هەموو ساتێکیشدا ئەو سیستمە پەیوەست و پەیوەندە دەپارێزێ و ئەگەر وازی لێ بهێنێ هەڵدەوەشێ و کۆتایی پێدێ، هەموو جیهان دروستکراوی خوایەو بە ویستی خوا دەخولێتەوە﴿إِنَّ اللَّهَ يُمْسِكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ أَن تَزُولَا﴾ موسڵمانان بڕوایان وایە خوا هەمیشە لە جیهاندا کار دەکات و چی گۆڕاوو نوێکاری کاری هەیە بەردەوامە ﴿وَعِندَهُ مَفَاتِحُ الْغَيْبِ لاَ يَعْلَمُهَا إِلاَّ هُوَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلاَّ يَعْلَمُهَا وَلاَ حَبَّةٍ فِي ظُلُمَاتِ الأَرْضِ وَلاَ رَطْبٍ وَلاَ يَابِسٍ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ﴾. ئەمەش ئەو گومانە تێکدەشکێنێ کە دەڵێ خوا تەنها شتە گشتیەکان دەزانێ (لە ئیسلامدا خوا تاك و تەنهای بێ هاوەڵە و تەنها ئەو دەپەرستین و هیچ هاوەڵێکی بۆ دانانێین، خوا دادپەروەرو حەقەو ئەوەل و ئاخیرە).

بیرۆکەی یەکخواپەرستی پوخت لەپاڵ داننان بەوەدایە کە خوای گەورە دروستکەری ئاسمانەکان و زەویەو دەبێ بڕوامان بە تەنهایی خوا هەبێ و لە ژیانی تاك و کۆمەڵگاکاندا حوکم تەنها بۆ خوایەو دەبێ حەلاڵ و حەرام لە خواوە وەربگرن و حوکم بە شەریعەتەکەی ئەو بکەن، موسڵمانان دەبێ تەنها خواپەرستن و تەنها ئەو بە خوا بزانن، ئیسلام یەکەیەکی

دابەش نەکراوەی پەرستشە (ئیتر پەرستش بێ یان بەشی موعامەلات) پەرستش ژیانی کردەیی مرۆڤ دەگرێتەوە، ئیسلام بڕیاری ئەوەی داوە ئلوهیەت و عبودیەت هەیە، ئلوهیەت تەنها بۆ خوایە بەڵام عبودیەت هەموو زیندوو و هەموو شتێ تیایدا بەشدارە، هەروەك بڕیاری تەنهایی خوای داوە بۆ تایبەتمەندیەکانی عبودیەت و دووری بەندەکان لەو تایبەتمەندیانە، داخوازیەکانی یەکخواپەرستی ئلوهیەت ئەوەن خوا لە تایبەتمەندیەکانی ئلوهیەتدا سەبارەت بە هەڵسوکەوت بە ژیانی مرۆڤەوە بە تەنها دابنرێ وەك چۆن لە بیروباوەڕو وێناو ویژدان و شەعایرەکانیشدا دەبێ تایبەتمەندیەکانی ئلوهیەت بەتەنها بۆ خوا دابنێن.

مرۆڤ لە هەوڵی بیری مرۆیی و بەدەر لە چەمکی ئایینی حەقدا ناتوانێ بەڕاستی و دروستی وێنای ئلوهیەت بکات و دەستەوسانی لەئاست دەربازبوون لە ئارەزووەکان ناهێڵێ وێنای حەقیقی هەبێ، ئەمە مۆرکێکە دەربازبوونی لەدەست نیە، بۆیە هەموو فەلسەفەو مەزهەبەکان ناتوانن بگەنە راستی ئلوهیەت و سەرچاوەکەشی خودی کورتی عەقڵی مرۆیی و ئەو ئارەزووبازیەیە کە مەترسیدارترین تەحەدای رێبازەکانی مەعریفەیە چونکە ئارەزووی مرۆڤ رێ دەگرێ بە وێنای دروستی خوای گەورە، لێرەوە جیاکاری هەیە لە نێوان خوای حەق و خوا یان خواوەندەکانی تردا، بۆیە ئایینەکان هەتاهەتایە پێویستی بەردەوامیان هەیە بەوەی بە شێوەیەکی دروست خوا بناسن، لەبەرئەوەی مرۆڤ ناتوانێ لەدەست ئارەزووەکانی دەربازبێ‌و عەقڵیان ناتوانێ بیر لە زاتی خوا بکاتەوە بۆیە ئیسلام فەرمانمان پێدەکات بیرکردنەوەمان لە دروستکراوەکانی خوا بێت.

بێگومان هەموو ئایینەکانی پێش ئیسلام ئەو یەکخواپەرستیە حەقەیان هێناوە کە بڕوابوون بە خوای جیهانیان بڕوا بووە بە ڕۆژی دوایی و پاداشت و سزای ئەو ڕۆژەی لەخۆگرتووە بەڵام ئەو ڕاڤانەی بۆیان کران ئەو چەمك و واتایەیان گۆڕی.

بێگومــان یەکخواپەرســتییەك کــە ئیــسلام هێناویــەتی لەلایــەن بیروباوەڕەکــانی پــێش ئیسلامەوە نارەزاییەکی زۆری بەرامبــەر نیــشان درا، چــونکە چــەند مەســەلەیەکی گــەورەی یەکلاکردبوویەوە کە پایەو بنەڕەتی ئەو ڕاڤە مەزهەبیانەی لەخۆدەگرت، گرنگترینیان:

**یەکەم:** نکوولّی لە بوونی نێوەند لەنێوان خواو بەندەکاندا.

**دووەم:** نکوولّی بیرۆکەی سزادانی نەفس و دوورەپەرێزی لە خۆشی ژیانی دنیا.

**سێیەم:** جیاکاری ڕوونی نێــوان خوایــەتی و پێغەمبەرایــەتی و نێــوان خــوای دروســتکەرو جیهانی دروستکراوە.

بێگومان یەکخواپەرستی سەرچاوەی یەکــەمی لــەناوبردنی بەندایــەتی و ڕەگەزپەرســتی و بتپەرستیەو ئالاّهەلّگری یەکسانی نێــوان خــەلّك و یەکــسانکەری ئاســتیانە، ئــازادی بــیروڕا دەچەسپێنێ و ئاسۆکانی بــۆ دەکاتــەوەو بانگــەواز دەکــات بــۆ ڕزگــاربوون لــە بتپەرســتی و فیرعەونو قەیسەرو ئیمپراتۆرو بەرهەم و حیبرو ڕوهبان پەرســتی و ڕزگــاربوون لــە ئەفــسانەو جادوو، هەروەك یەکخواپەرستی جوزئیەتی ئایین وەك پــەیامێکی ئــەخلاقی یــان تــەنها وەك پەرستشێ بەرپەرچدەداتەوە چونکە یەکخواپەرستی ئالاّهــەلّگری تــەواوێتی نێــوان بیروبــاوەڕو شەریعەت و ئەخلاق و کۆکەرەوەی ئایین و دەولّەتە پێکەوە.

بیرۆکەی باوکایەتی و و بیرۆکەی ململانێــی نێــوان ڕۆح و جەســتە لــەکار دەخــات تــاك و کۆمەلّگەو عەقلّ و دلّ و دنیاو دوارۆژ پێکــەوە دەبەســتێتەوەو بڕیــاری ئــەوە دەدات لێــرەدا تاوانو هەلّەی بنەڕەتی نیەو سزادانی مرۆڤ نیە لەپێناو ئەو هەلّەیەی ئادەمدا کــە خــوا لێــی خۆش بوو هەروەك ئیسلام خواو جیهان و خوایەتی و مرۆڤایەتی لەیەك جیادەکاتەوە، نــاکرێ مرۆڤ بگاتە پلەی خوایەتی، هەروەها نێوەندی نێوان خواو بەندە لەکاردەخات و دان نانــێ بــە نێوەندێدا ئیتر لەڕێی پیاوچاکانەوە بێ یان لەڕێی پێناوە ڕۆحیەکانەوە، وێڕای ئەمەش ئیــسلام ڕازی نیە بە دانانی ڕوخسارێکی مرۆیی بۆ سروشتێکی خوایی، نکوولّیش لەوە دەکات ئەرکی سەرشانی هەر موسلّمانێ نەمێنێ با لە هەر ئاستێکی ئیماندا بێ، بەلّکو ئەو ئەرکــە لەســەر شانی پێغەمبەر ﷺ هەلّنەگیرا کە بالاّترین ئیمانی هەبووە.

خوا دروستکەری مرۆڤەو خۆیشی ڕێباز بۆ مرۆڤ و مرۆڤایەتی دادەنێ، لێرەوە ئیسلام هەڵەی ئەو بانگەشەیە دەخاتەڕوو کە دەڵێ مرۆڤ دەتوانێ بێ ڕێنیشاندەرێکی دەرەکی سروش‌و ئاین ڕێی خۆی بزانێ، یان دەڵێ مرۆڤ دەتوانێ بەبێ ڕێنوێنی ڕێ بزانێ.

بێگومان بڕوابوون بە تەنهایی خوا مرۆڤ لە بەندایەتی بۆ مرۆڤ یان هەر شتێ ڕزگار دەکات، ئیسلام بنەڕەتەکانی بەختەوەری حەقیقی فێری مرۆڤ کرد کاتێ میسری یان یۆنانی یان ڕۆمانەکان ئەوەیان نەدەزانی، دیارترینیان پێدانی یەکخواپەرستی پوخت بە عەقڵ و پاککردنەوەی لە خورافەو خەیاڵات تا بیرو هزر سەربەخۆ بێ، ئەمە لەکاتێکدا بڕوای هەیە بە بەرپەرچدانەوەی تەقلیدو پشت بە بەڵگە دەبەستێ، ئەوەش ڕوون دەکاتەوە کەون چەند ڕێساو یاسایەکی چەسپاوی هەن کە دەبێ مرۆڤ بۆ ڕێکردەی زانستی و کردەیی ڕێنمونییان لێ وەربگرێ بێ ئەوەی ئەو سوننەت و ڕێسایانە بوونی حەقی خۆیان لەبیربکەن، توانای خواش لەسەر موعجیزە دەسەلمێنێ.

ئیسلام بە گشتی کامڵ و هاوسەنگەو لەسەر یەکخواپەرستی وەستاوە، بەمەش تێکەڵەی وەك بیروباوەڕەکانی تر نیە چونکە دەوترێ: بیروباوەڕی ڕۆژئاوا تەنها تێکەڵەی فەلسەفەی یۆنانی و یاسای ڕۆمانی و ئایینی مەسیحیە.

لێرەوە دەردەکەوێ ئاین دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی سەر زەوی نیە بەڵکو ڕاستیەکی گەورەیە کە مرۆڤ ناتوانێ دروستی بکات و پێویستی بەوەیە ڕێنموونی لێ وەرگرێ، ئاین خەڵاتی خوایە بۆ مرۆڤ ﴿قَدْ جَاءَكُم مِّنَ اللَّهِ نُورٌ وَكِتَابٌ مُّبِينٌ﴾ بەڕاستی حەقی خۆیەتی بوترێ ئیسلام بە ڕاستکەرەوەی ڕاڤەکاریەکانی ناو ئاین و بیروباوەڕەکان هاتووەو بەرپەرچدانەوەیەکی یەکلاکەرەوەی هەرگومان و لادان و هەڵەیەکی پێش ئیسلام و دوای ئیسلامیشە، (ربعی کوڕی عامر) ڕاست دەکات کە بە فارس دەڵێت (ئێمە هاتووین تا مرۆڤەکان لە بەندە پەرستیەوە بەرەو خواپەرستی و لە ستەمی ئایینیەوە بۆ دادپەروەری ئیسلام و لەبەرتەنگی دنیاوە بۆ بەرفراوانی دنیا بەرین).

# باسی سێیەم

## (بە شارستانی کردنی مرۆڤایەتی و ڕزگارکردنی مرۆڤ لە کۆیلایەتی)

بێگومان یەکخواپەرستی عەقڵی لە بتپەرستی ڕزگارکردو مرۆڤایەتی لە بەندایەتی بۆ جگە لە خوا ڕزگر کرد، ئیسلام بوو ڕێی کردەوە بۆ بەشارستانیکردنی مرۆڤ و ڕزگارکردنی عەقڵی و جەستەیی و ئەو بەربەرستە کۆیلەییەی شکاند کە ژیارە فیرعەونی و فارسی و هیندی و ڕۆمانی و یۆنانیەکان دایاننابوو و فەلسەفەو ئایین و بیروباوەڕەکان کە لەسەر سیستەمی چینایەتی وەستابوون بیانوویان بۆ دەهێنایەوە، ئیسلام بوو شارستانیەتی بە مرۆڤایەتی بەخشی و ژیاری لە کۆتی بتپەرستی و بەندایەتی ڕزگارکردو زانستی لە ماددیگەرایی ڕزگارکردو هەموو ڕێبازە کۆمەڵایەتی و هزریەکانی گێڕایەوە بۆ خوای تاك و تەنها، ئیسلام کە هات مرۆڤایەتی بەدەست سەختترین جۆری ستەم و چەوساندنەوەو بەندایەتیەوە دەیناڵاند و تیایدا بە شێوەیەکی بێ وێنە ڕێزی مرۆڤایەتی سووکایەتی پێ دەکراو ژێرپێ دەخرا.

* براهاما گەورەو خەڵکی تر کۆیلە.
* لای فارس ئیمپراتۆر دەپەرسترا.
* لە یۆنان و ڕۆمان قەیسەر دەپەرسترا.
* لە میسر فیرعەون دەپەرسترا.

لە هەموو شوێنێ کۆیلە بۆی نەبوو بچێتە چینی سەرووتری وەك بەرهەمی یان گەورەو خانەدان یان قەیسەر، چونکە ڕەچەڵەك و زاڵی ڕەگەز بنچینەو سەرچاوەی چینایەتی بوون، دامەزرانی چینەکان پەیوەست کرا بوو بە چەند دەقێکی پیرۆزەوە کە لابردن و گۆڕینی قەدەغە بوو، چینەکانی سەروو ئیشیان نەدەکرد چونکە کارکردن لە شانوشکۆی بەرزی ئەواندا نەبوو، کۆیلە ئەگەر بخرایەتە شوێنی خانەدانان هەر کۆیلە بوو، گەورەش بچوایەتە شوێنی

کۆیلە هەر گەورە بوو، کەسی بەرهەمی کە لەدایك دەبوو لە ڕیزی یەکەمی دنیادا بوو و چی لە دنیادا هەبوو مولکی بەرهەمی بوو، کەسی بەرهەمی ئەگەر هەژار بکەوتایە بۆی هەبوو سامانی کۆیلەکەی ژێر دەستی داگیر بکات.

لە فارسدا خەلکی وەك خوا سەیری پاشاکانیان دەکردو پێیان وابوو خوا هەلیبژاردون تا حوکمی خەلك بکەن و خەلکی پێش ئەوان هیچ مافێکیان نیە، هەروەها لە سەردەمی پاشا ساسانیەکاندا بیردۆزەی مافی خوایی هەبوو، کیسراکان بانگەشەی ئەوەیان دەکرد تەنها ئەوان مافیان هەیە تاجی دەسەلات بکەنە سەر چونکە خوێنێکی خوایی لە دەماریاندا هەیە، بەندایەتی ڕومانیش شتێکی تاڵ و ناخۆش بوو و درێژەپێدەری کۆیلایەتی یۆنانی بوو کە سوقرات و ئەفراتون و ئەرستۆ پشتگیریان لیٚ دەکرد.

لە ئیمپراتۆریەتی یۆنانیدا پشتگیری لە سیستەمی کۆیلایەتی شیشرۆن و تاسیاس و سنکا دەکرا، ئەو دلڕەقیە بێ سنووروو ستەمە تەواو ڕەقە لە ڕۆمانەکان بینراوە کە بەرامبەر بە کۆیلەکان دەیانکردو وەك کالا دەیانفرۆشتن، ڕۆمانەکان خۆیان بە گەورەی جیهانی و حەقی پیرۆز دادەناو ئامانجیان شالاوبردنە سەر جیهان و دەست گرتن بوو بەسەر هەموو خێرو بەرەکەتی سەر زەویدا، لەو پێناوەشدا هەر کارێکیان دەکردو هەموو هەنگاوو خراپەیەکیان ڕەوا دەکرد، زۆرجار هاولاتیانی ئەو ناوچانەیان سەردەبڕین کە دەستیان بەسەردا دەگرتن وەك چۆن مەڕ سەردەبڕن، ئەمەش دوای ئەوەی پێشتر چاك سزا دەدران، کاتێ موسارەعەکان فراوان بوون دیلەکان نەدەکوژران بەلکو دەبران بۆ شارە جیاجیاکان تا بۆ یاری موسارەعە بەکاربهێنرێن.

لە شارە گەمارۆدراوەکاندا لە شارێکدا شمەکیان کۆدەکردەوەو کۆیلەکان بێبەش دەکران لە خواردن و ناچار بوون لەسەر گژوگیا بژین، هەروەها کۆیلەکانیان دەخستنە بەردەم ئاژەڵە درندەکان و بەسەیرکردنی ئەو دیمەنە چێژیان وەردەگرت، لە سەردەمی ئیمپراتۆر ئۆگستس قەیسەردا حوکمی ئیعدام بە خستنە بەردەم ئاژەڵە درندەکان سزایەکی یاسایی بوو، کاتێ یاساکان بڕیاریان دەرکرد بە سووککردنی حوکمی سەر کۆیلەکان ئەوە بە کارێکی ئابووری

ئەنجام درا چونکە سەرچاوەکانی بەدەست هێنانی کۆیلە دوای سەقامگیری ئیمپراتۆریەت کەمیان دەکرد، لە هەمان کاتدا کە باری کۆیلەکان بەرەو چاك بوون دەچوو سزاکان و جۆری جێبەجێکردن و شێوەی سزادانی سەخت زیادی دەکرد وەك بڕینی زمان و قورقوشمی تواوە کردن بە دەمی تاوانباردا، ئەمە سەبارەت بە کۆیلە، سەبارەت بە کۆیلەی جەنگی بارەکە زۆر زۆر سەختتر بوو.

سەید ئەمیر عەلی دەڵێت: ئەو نەریتەی پێش ئیسلام باو بوو ئەوەبوو دیلەکانی جەنگ بە شمشێر لەت دەکران دواتر ژن و منداڵیان دەبوونە کۆیلە، بەڵام موحەممەد ﷺ ڕێگری کرد لە سەربڕین و شێواندنی تەرمی کوژراوان و فەرمانی کرد تەنها ئەوانە بە بەندکراوی بمێننەوە کە لە جەنگی نیزامیدا گیراون تا کاتێ فیدیەی ئازادبوونیان دەدەن، فیدیەو ئازادکردنی دیل لە ئیسلام یەکێکە لە کارە چاکەکان، ئیسلام بە هیچ جۆرێ ڕێی نەداوە دایك و باوك لە منداڵەکانیان جیا بکرێنەوە، ئەگەر ژنێکی دیل سکی پڕبوو لە گەورەکەی ئیتر ئازاد دەکرێ و منداڵەکەش مافی شەرعی بەسەر باوکیەوە دەبێ، ئینجا بەراوردی ئەمە بکە بە باری ئەوروپا لە سەدەی پانزەدا، لە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی پێش ئیسلامدا ئیمپراتۆر وەك هەر دروستکراوێکی تری سەرزەوی سەیر نەدەکراو لای بتپەرستان هیچ جیاوازیەکی ڕوون نەبوو لەنێوان خواو مرۆڤدا، ئیمپراتۆر بە خوا سەیر دەکراو بە خواوەند قەیسەر دەناسرا، پەرستشی بۆ دەکرا لەبەرئەوەی بە پێویستیان دەزانی بۆ بەردەوامی ئەو دەوڵەتەی کە لای ئەوان جیهانی دەگەیاند.

سەبارەت بە ئایینەکان پێیان وابوو ئیمپراتۆر مرۆڤەو حکومەت ئەزەلی یان دەسەڵاتی ڕەهای نیە، بەڵام جیهانی ڕۆژئاوا خێرا لە قەڵەمڕەوی قەیسەریەوە چوو بۆ قەڵەمڕەوی پاپایی کە لەیەك کاتدا یەك کەس هەردوو دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی و پاپایی لەدەستدا بوو، کتێبی عەهدی قەدیم کۆیلایەتی بە ڕەوا داناوەو بازرگانی کۆیلەش لە هەموو جیهاندا لەسەر دەستی جوولەکە بڵاوبوویەوە، کاتێ مەسیحیەت هات چی یاسای ڕۆمانی هەبوو هێشتیەوە، یاسای

ڕۆمانی کۆیلەی بە مرۆڤێکی خاوەن مافی مـرۆڤ بـوون دانـەدەناو بـەڵکو وەك کـاڵا سـەیری دەکرد کە دروستە بازرگانی پێوە بکەیت.

دکتۆر (جۆرج پۆست) لە کتێبەکەیدا (قاموس الكتاب المقدس)[1] دەڵێت: مەسـیحیەت لـە دیدی سیاسی و ئابووریـەوە ڕەخنـەی لـە کۆیلایـەتی نـەگرت و بـاوەڕدارانی هـان نـەدا تـا نەوەکەیان لە ئادابیاندا دوور بگرن لە کۆیلایەتی و تەنانەت قسە لەسەر کردنیشی، بەڵکو دژ بە مافی خاوەن کۆیلەکان هیچی نەوت و کۆیلەکانیشی هـان نـەدا بـۆ داوای سـەربەخۆیی و قسەی لەسەر سەرچاوەکانی کۆیلایەتی نەکردو فەرمانی نەکرد کۆیلە ئازاد بکـرێن، بەگـشتی ڕێژەی شەرعی نێوان کۆیلەو گەورە هیچ نەگۆڕا، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەرك و مـافی هـەردوو دەستەکەی وەك خۆی هێشتەوە.

بێگومان ئەو پەیامەی سەید مەسیح هێنای هـەموو واتایـەکی بـەرگریکاری کۆیلایـەتی لەخۆ دەگرت، بەڵام ئەو ڕاڤانەی ئەوروپا بۆی دانـاوە لـەو چـەمکە دەرکـراوە، (مەوسـوعەی بیبولاروس) کە گەورەترین مەوسوعەی سەدەی نۆزدەهەم (١٨٧٠ز) بوو دەڵێت:

مرۆڤ سەرسام نیە بـە مانـەوەی کۆیلـەگیری و بـەردەوامی لـەنێو مەسـیحیەتدا چـونکە نوێنەرانی مەسیحیەت دانیان دەنا بە ڕاستی کۆیلایەتیداو بە شەرعی و ڕەوایان دادەنا.

(قدیس تۆماس) دەڵێت: سروشت کۆیلایەتی بۆ هەندێ کەس داناوە.

(بالی) گەورە فەیلەسوفیش هـاوار دەکـات بـۆ ڕەوایـی کۆیلایـەتی و بـۆ ئـەوەش پـشت دەبەستێت بە ئیسحاحی ١١، ئوسقوفی ئەڵمانی (بوفییە) لە فەتوا لاهوتیەکانیدا کۆیلەگیری بە ڕەواو دادپەروەری دادەنێ و ڕازیە لەسەر پێناوەکانی بـازاڕی کۆیلەفرۆشـی، جوولەکایـەتی کۆیلایەتی بە بنەڕەتی سامانداری دادەنێ، میسریە کۆنەکانیش ستەمیان دژ بە نامیسریەکان بە حەڵاڵ دەزانی و خراپ لەگەڵ کۆیلەدا دەجووڵانەوە، لەوانە داگیرکردنی هەزاران کەسیان بۆ دروستکردنی هەڕەمەکان، بەوجۆرە نابینێت شەریعەتێکی دانراو یان ڕاڤەیەکی لادەری ئـایین

---

١- من ٦٠ و ٦١، ط بیروت سنة ١٩٠١.

لە پێش ئیسلامدا هەبێ کە هەموو خەڵك بە یەك ڕیز سەیر بکات یان کۆتی سەر چینی هەژارو کارکەرو سودبەخش هەڵگرێ.

توێژەران جەخت دەکەنەوە سەر بەرزڕاگرتنی دیاردەی کۆیلایەتی لەپێش ئیسلامدا کە بە شێوەیەکی گشتگیر لە جیهاندا وابوو، لە چوار کۆمەڵگە ژیاریە گەورەکەی فارس و ڕۆم و فیرعەونی و هیندیدا کۆیلایەتی باو بوو و کۆیلەکانیش بەدەست ستەمی سەرکردەو زۆری گەورەکانیانەوە دەیانناڵاند.

ناجی مەعروف لە کتێبەکەیدا (أصالة الحضارة العربية) دەڵێت: لای ئیغریقەکان کۆیلایەتی حەرام و ناڕەوا نەبوو، ئەرستۆی فەیلەسوفیان دەڵێت: کۆیلە دروست کراوە بۆ ملکەچی و گوێڕایەڵی و کەسانی ئازاد دەبوو کۆیلە زۆر بکەن، ئەو پێی وابوو کۆیلە ئەو پێناو زیندووەیە کە هاوڵاتی ئازا بۆی شیاو نیە دەستی لێبدات، بە ڕای ئەو کۆیلە پێناوێکی گرنگی بەرهەمهێنانە کە دەبێ بۆ شارستانیەت بەکاربێ، ئەفلاتوونیش ڕای وایە کۆیلەکان یۆنانی نەبن، جوولەکایەتی و مەسیحیەتیش نکوولی ناکەن لە کۆیلایەتی بەتایبەت ئەو ئەوروپیانەی کار دەکرێ بۆ ملکەچ کردنیان و ناردنیان بۆ وڵاتانی ڕۆژهەڵات تا لە بازاڕی کۆیلەفرۆشاندا بفرۆشرێن، کۆیلەفرۆشانی جوولەکە لە ئەوروپادا ژن و منداڵیان دەدزی تا لە بازاڕەکاندا بیانفرۆشن.

بازرگانی فرۆشتنی کۆیلەی سپی و ڕەش لە ئەوروپا و لەسەر دەستی مەسیحیەت چەند سەدەیەك بەردەوام بوو بەتایبەت لەسەردەمی داگیرکاری دۆزینەوە جوگرافیەکانی ئەفریقاو ئاسیاو ئەمریکا لە سەدەی شانزەوە تا سەدەی نۆزدەهەم.

(مۆنتسکیۆ) یاساناسی گەورەی فەڕەنسی پێی وایە مەحاڵە مرۆڤ شیوەن بکات بۆ ئەفریقیە ڕوخسار ڕەشەکان و نابێ کەس وابزانێ خوای گەورە کە خاوەن حیکمەتی باڵایە ڕۆحێکی پاکی لەناو ئەو جەستە ڕەشەدا دانابێ، ڕۆژئاواییەکان دوای مەسیحیەت هەمان سیاسەتی ڕۆماو ئەسینایان پەیڕەو دەکرد کە سیاسەتی کۆیلایەتی بوو، ڕۆژئاواییەکان بە

چاوی سووکایەتی و زەلیلکردن سەیری کۆیلەیان دەکردو لە داگیرگەکانیاندا ئیشیان پێ دەکردن و یاسایان بۆ دادەنان و کارو دامەزران و ژنهێنان و فێربوونیان لێ حەرام دەکردن.

بەڵام ئیسلام کەوتە ئازادکردنی کۆیلەو مرۆڤ بە گشتی و پەیامەکەی عومەر لەبەرچاوە کە دەڵێت (مەدەن لە دەم و چاوو ڕوومەتیان و لێیان مەدەن و زەلیلیان مەکەن). یان قسەکەی ئیبن خەلەکان (دەم و چاوی سپی هیچ کەمتر نیە لەوەی نەفسێکی پاکی هەبێ و هیچ لە زانستی زاناو بەرزی بیریار کەم ناکاتەوە). هاواری ئازادی و ڕێزگرتن لە دڵی مرۆڤەکانەوە بەرزبوویەوە و باری ئەوروپاو هەموو هزری ڕۆژئاوای گۆڕی. ئەوە ئیسلام بوو کە لە هەموو شوێنێ کۆیلەی ئازاد کردو جیاوازی نێوان ڕەش و سپی نەهێشت و دیدی جیاکاریو ڕەگەزی یان ساماندارییان ڕەچەڵەك یان پایەی یەکەمی لەکار خست.

مرۆڤایەتی لە پێش ئیسلامدا چەندین نموونەی سووك و سوکایەتی کردن بە ڕێزو ئازادی مرۆڤی هەبوو، خەڵکی بەپێی جیاوازی ڕەگەز یان مافی هێزیان هەبوو، کەسی بەهێز زاڵ بوو بەسەر لاوازداو بۆ بەرژەوەندی خۆی بەکاری دەهێنا یان لەناوی دەبرد، گەلە لاوازەکان خزمەتکاری گەلە بەهێزەکان بوون، ئەمەش لەژێر کاریگەری دیلگیریدا بوو، خەڵکی کۆیلەکانیان بۆ حکومەتی خۆیان بەکاردەهێنا، خەڵکی یەکتریان دەدزی و منداڵ و کچیان لە کۆشی باوکانیاندا بەزۆر دەبرد تا لە بازاڕەکاندا بیانفرۆشن، خەڵکی هیچ مافێکیان بۆ ژن دانەدەناو فێرکردن و میراتی بۆ نەبوو، خەڵکی تەنها لەبەر جیاوازی بیروباوەڕیان خوێنی یەکتریان حەڵاڵ دەکرد.[١]

ئیسلام هات و تیشکی خستە نێو قووڵاییەکانی ئەو تاریکیەو لە کرۆکیدا بانگەوازی بۆ یەکخواپەرستی و ڕزگارکردنی مرۆڤ بوو، بۆیە کۆیلایەتی لەکار خست و دژی کۆیلایەتی ڕاوەستاو ستەمی لەناوبردو برایەتی جیهانی ڕاگەیاندو ئاڵای یەکبوونی مرۆیی بە جیاوازی ڕەنگ و خوێن و ڕەگەزەوە بەرزکردەوەو بنەمای یاسای ڕزگارکردن و ئازادکردنی کۆیلە و لەناوبردنی سوخرەی دانا.

---

١- بتصرف عن بحث لفريد وجدي.

زانا (فیشەر) لە کتێبەکەیدا (تأريخ أوروبا) ئەو واتایە نیشان دەدات و دەڵێت (جیهانی ڕۆژئاوا بە ڕووناکی ئیسلام هاتەوە هۆش کاتێ پێشتر لە خەوی نەزانی و تاریکیدا بوو).

ئیسلام پێناوی یەکەمی لەناوبردنی کۆیلایەتی بوو بەوەی لە بواری تەصفیەدا داینا، یەکەم هۆکاری تەصفیەکەش ئەوە بوو یەك دەروازەی بۆ دانا کە جیهادەو دەروازەکانی تری لەکارخست وەك فرۆشتن و قومارو تاڵان و بڕی و چەتەیی، ئیسلام هەموو ئەوانەی داخست جگە لە دەروازەی جیهاد.

دواتر ڕێکخستنێکی دانا بۆ دیلەکانی جەنگ، هەروەك ئیسلام کۆیلایەتی پێ قبوڵ نیەو کار دەکات بۆ لەناوبردنی، لە هەمان کاتدا بانگەواز دەکات تا بەچاکی لەگەڵ کۆیلەکاندا هەڵسوکەوت بکەن، بانگەواز دەکات تا لەگەڵ کۆیلە بڕیار بنووسرێ بۆ ئازادکردنی لە بری پێدانی سامانێ بە گەورەکەی، لەناوبردنی کۆیلایەتی بۆ ئیسلام شتێکی هەروا سادە نەبوو چونکە لە کۆمەڵگەی مرۆییدا کۆیلایەتی دیاردەیەکی باو بوو، بەڵام نەخشەیەکی دانا بۆ لەناوبردنی قۆناغ بە قۆناغی[1] و دوای پەروەردەکردنی دەروونەکان لەسەر ڕێزگرتنی مرۆڤ و دیاری کردنی ئەرك و مافەکانی ئیسلام لەو پێناوەدا چەند بنەمایەکی گشتی دانا:

**یەکەم:** چاکی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ کۆیلەکانی بەردەستیاندا، موسڵمانان دەبێ بە چاکە لەگەڵیان بجووڵێنەوە.

**دووەم:** هاندان لەپێناو ڕزگارکردنی کۆیلەدا، لە قورئاندا ئازادکردنی کۆیلە بە واجب هاتووە (لە سورەتی تەوبەو سورەتی نووردا) لە زەکاتیشدا بەشێکی داناوە بۆ ڕزگارکردنی کۆیلە، ئیسلام ڕزگارکردنی کۆیلەی لەبری فیدیەی چەندین شت داناوە بۆیە بەوە هەوڵی خێرا دەدات تا لە دیلی دەریان بکات. دیلەکان لەپێش ئیسلامدا چەندین ئازاری دوورو درێژیان هەبوو، هەندێ جار بۆ هەتا هەتایە بە کۆیلە دەگیران، ئیسلام ئازادکردنی دەردەدار کە دیلە بەبەرزی ڕەوشت دەزانێ و سوورە لەسەر ئازادکردنی گەردنەکان و لە زەکاتدا بەشی بۆ داناوە، ڕزگارکردنی کۆیلەی بۆ لێخۆشبوون لە تاوان داناوەو بۆ کوشتنی بەهەڵە و سوێند کەوتن

١- أصالة الحضارة العربية: ناجي معروف.

کەفارەتی ئازادکردنی کۆیلەی داناوە، بۆ زیهار و ڕۆژوو شکاندنی ڕەمەزانیش کەفارەتی ئازادکردنی کۆیلەی داناوە.

ڕێیەکی تری ئازادکردنی کۆیلەکە ئیسلام دایناوە کڕینی هەموو ئەو کۆیلانەیە کە لای نا موسڵمانانن بە پارەی زەکات و ڕزگارکردنیان لەپێناو خوادا، هەروەك ئەو بنەمایەشی داناوە (هەرکەس زللەیەك بدات لە کۆیلەیەك یان لێی بدات کەفارەتەکەی ڕزگارکردنیەتی) ئیسلام ڕێ نادات کۆیلەو ژن و منالّی لەیەك جیا بکرێنەوەو خاوەن کۆیلە دەبێ جلوبەرگ و خواردن بە کۆیلەکەی بدات، ئیمامی عومەر ڕێی نەدا ژنانی مندالاّن بفرۆشرێن، پێغەمبەر ﷺ ڕێی نەداوە بە وشەی عەبد یان ئەمە ناوی کەس ببەیت، ڕێگریشی لەوە کردووە کۆیلەکان وشەی (رب) بۆ گەورەکانیان بەکاربهێنن.

**سێیەم:** دانانی بنەمای هەڵسوکەوتی جوان لە جەنگە نێودەوڵەتیەکاندا سەبارەت بە دیلەکان و بنەمای کۆیلەگیری و کۆیلەگیری شەرعی لە جەنگەکاندا مەبەست پێی بەرزڕاگرتنی پەیامی خوا نیە ئەگەر بە نیازی کۆیلەگیری چوو بوون.

**چوارەم:** لە تەشریعاتی ئیسلامدا یەك دەق نیە فەرمان بکات خەڵکی بە کۆیلە بگیرێ یان بازرگانی پێوە بکرێ لە بازاڕی کۆیلەفرۆشاندا.

**پێنجەم:** ئیسلام ڕایگەیاندووە ئەگەر دوژمن یەکسەر خۆی دا بەدەستەوە ئازاد بکرێ.

موسڵمانان وایانکردووە لە کاتێکدا ڕۆژئاوا بیری نەکردەوە لە ئازادکردنی کۆیلە تا لە سەدەی حەڤدەدا بیری کەوتەوە، واتە ئیسلام نزیکەی هەزار ساڵ پێش ئەوان کەوت، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوروپا لە سەدەی نوێدا بانگەشە دەکات بۆ زاڵبوونی ڕەگەزەکان و لەوەشدا بە سەختی ڕۆچووە، چالاکی کۆچپێکردنی زنجە ڕەشەکان لە ئەفریقاوە بۆ جیهانی نوێ کە دەیان ملیۆن کەسی گرتەوە چەندین کارەسات و نەهامەتی لە ژێر باری کۆیلەفرۆشیدا بەخۆوە دی، هێشتا ملیۆنەها زەنجی هەن لە جیهانی نوێدا بەوپەڕی ڕەقی هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکرێ.

(دویر)ی مێژوونووسی زەنجی ئاماژە بەوە دەکات ژمارەی ئەو زەنجیانەی کۆیلەفرۆشان بۆ داگیرگەکانیان فراندن دەگاتە سەد ملیۆن زنجی، ئەو بازرگانیە چوار سەدە بەردەوام بوو و تیایدا شەرمەزاری و دڕندەیی وا بەکارهاتووە کە ناتوانی بیهێنیتە پێش چاو.

(بنالکدرین ترۆبە) ژنە نووسەر لە کتێبەکەیدا (مێژووی زنجەکان) دەڵێت: چیرۆکی بازرگانی کردن بە کۆیلەی ئەفریقی گەورە تۆماری ناو مێژووی جیهانی ڕۆژئاوایە، ئەو کۆیلەفرۆشانە لە بەرژەوەندی داگیرگەکان کاریان دەکردو منداڵ و گەنجیان دەفڕاندو دەیانبردن بۆ بەندەرەکان و لەوێ کەشتیگەلە ئینگلیزیەکان چاوەڕێیان دەکردن و بە هەزاران لەو زنجانەیان باردەکردن و بە پەت دەیانبەستنەوە تا خۆیان نەخەنە ناو ئاوەکە.[1]

(ویستر مارك) دەڵێت: مێژوونووسە ڕۆژئاواییەکان لەوەدا زیادەڕەوی دەکەن گوایە کڵێسا لەگەڵ کۆیلەکاندا بە نەرمی جوڵاوەتەوە، بەڵکو لە سەدەی سیانزەدا گەورە مافی نەمانی ژیان و مەرگی کۆیلەی لەدەستدا بوو، کۆیلە لە هەموو وڵاتی مەسیحیەکاندا وەك کاڵا دەفرۆشراو ڕێیان نەدەدا کۆیلە فێری خوێندنەوەو نوسین بێ و هەرکەسیش سەرپێچی بکردایە بەسەختی سزایان دەدا.

(سامی داود) ئاماژە دەکات بە شکستی کڵێسا لە دادوەری جیاکاری ڕەگەزی ئەوروپادا کە لە سایەی سیستمی دەرەبەگایەتیدا دانرابوو و ڕەشپێستەکان بە دەستیەوە هاودەم بە خەڵکی لاواز بەدەست فەرمانڕەوایانەوە ڕەقی و توندیەکی زۆریان تووش بوو، کاتێ ئەوروپا بۆ دەرەبەگەکان بورجی گەورەی دروست دەکرد بەوەوە دەیاننازی ئەو کۆیلانە خوێندەواری و نووسین نازانن.

کاتێ ئیسلام بانگەوازی کرد بۆ یەکسانی نێوان گەل و ڕەگەزەکان لەبەردەم دەوڵەت و لەبەردەم خواشداو هەر لەگەڵ دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامیدا بانگەوازی کرد بۆ ڕزگارکردنی کۆیلە، هەمان بانگەواز چەندین سەدە لەڕێی بانگخوازانی مەسیحیەتەوە ئاسمانی ئەوروپای داگرتبوو، کەسی سپی مەسیحی بە هەمان عەقڵیەت و بیرکردنەوەی بتپەرستی و

---

١- نقلا عن حسن درح: مجلة الكويت ١٩٧٢.

ڕەگەزپەرستی جاران دەژیا، کڵێسا لە ئەورووپا مافی پیرۆزی پاشاو خانەدانانی دەپاراست، بەمە جیاوازی ڕەگەزایەتی دروست دەبوو و کڵێساش دانی دەنا بە شەرعیەتی و کۆیلەگیری و چەوساندنەوەو داخستنی دەرگاو بەندیخانە بەسەر کۆیلەو لاوازەکاندا.

لە پێنج شارستانیەتە گەورەکەدا کۆیلایەتی پیاوو ژن هەبوو (یۆنان، ڕۆمان، فارس، فیرعەونی، هیندی)، ئافرەت بۆ خزمەتی پەرستگاکان بەکاردەهات، لە ئایینی بابلیدا دەبوو هەندێ ئافرەت وەك ڕێزگرتنی خواوەندەکان پەیڕەوی داوێن پیسی بکەن، ناشیرین ترین ماوەی ئەوە بوو بەلایەنی کەمەوە وا سەیری ئافرەتی دەکرد دەبێ پەیڕەوی داوێن پیسی بکات چونکە بە پەیڕەوێکی ئایینی دادەنا، لە هەندێ شوێنی هیندیشدا ئەو دیدەیان هەبوو بۆ داوێن پیسی و بە فەرزێکی ئایینی سەیریان دەکرد.

جوولەکەکان پەیڕەوی داوێن پیسییان دەکردو بە پیرۆزیش سەیریان دەکرد، میرو ئاشوورو فینیقیە و وڵاتی کلدان و فارس و شوێنانێکی تریش پەیڕەوی دینی تێکەڵاوییان هەبوو و هەموو جۆرە بێڕەوشتیەکیان ئەنجام دەدا، پەرستشی ئیزیس و سۆلك و عشتروت و ملیتەو چەندێکی تر زۆرترین نمونەی ناشرینی لەو جۆرەیان لەخۆدەگرت، بەڵکو پەرستگای تایبەت بەو خواوەندانە تەنها چەند سەکۆیەك بوون بۆ ئەو جۆرە پەرستشە ئارەزووبازیانەی کە خەڵکی بەناوی ئایینەوە پەیڕەویان دەکرد.

پەرستگایەکی تایبەت بەناوی (ئەفرۆدیت) دروستکرا کە ئەفسانەی خەڵك بوو و دەیوت خواوەندی ئارەزووەکانە و پەرستگاکەش بە چەند ژنە کاهینێ ڕازێنرابوویەوە کە بە ناوی ئایینەوە پەیڕەوی داوێن پیسییان دەکرد.

لە سەردەمی ڕۆمانیدا نیزامی کاهینە کچەکان بۆ خزمەتی پەرستگاکان دامەزرا، کاتێ مەسیحیەت هات هەڵوێستی نەرمونیانی بۆ داوێن پیسی نواند، ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی هەموو مافە مەدەنی و کۆمەڵایەتیەکانی گێڕایەوە بۆ داوێن پیسەکان، ئیمپراتۆر (یوستنانوس) ئافرەتێکی داوێن پیسی بەهاوسەرگرت بەناوی (بسودورا).

ئەبەکانی کلێساو لەپێش هەموویانەوە ئۆگەستۆنیوس دانیان بەوەدانا داوێن پیسی خراپەیەکە هەر دەبێ هەبێ و لابردنی یەکجارەکی دەبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی سووکایەتی و خراپەی زیانمەندتر بۆ کۆمەڵگە.

بەڵام ئیسلام ڕێزی ئافرەتی گرت و دووری خستەوە لە داوێن پیسی و لە کۆتی زەلیلی و کۆیلایەتی ڕزگاری کرد، سەید ئەمیر عەلی دەڵێت: خراپترین بەختی ئافرەت لای گەلانی مەسیحی بوو، پێگەی شەرعی ژن بەپێی ئاین تەنانەت لە یەکەم ولاتی مەسیحیشدا هیچ بەرەوپێش چوونێکی بەخۆوە نەدەبینی، ئافرەتی شوو کردوو تا ماوەیەکی لەمەو پێش هیچ مافی جیاو سەربەخۆ لە مێردەکەی نەبوو تا لەم ماوەدا ئینگلتەرا لەو ڕایە دەرچوو. بەڵام ئەو پێغەمبەرەی لەو ولاتەدا دەرکەوت کە ئافرەتی زیندەبەچاڵ دەکردو لەسەردەمێکدا کە لە هەر ولاتێکی تردا هیچ نیزامێ نەبوو مافێ بدات بە ئافرەت ئیتر کچ بێ یان ژن یان دایك.

ئەو پێغەمبەرە کۆمەڵێ مافی بۆ ژن بەدەستهێنا کە تەنها بەفشارێکی زۆر لای گەلانی شارستانی لە سەدەی نۆزدەدا ئینجا قبوڵ کران بە هێندە شانازی بەسە بۆ موحەممەد ئەگەر لەپێناو مرۆڤایەتی دا هیچی تری نەکردایە، ئافرەتی موسڵمان لای شارەزایانی ئایینی باری زۆر زۆر باشتر بووە لە ئافرەتی ئەورووپی.

پاشاو سەرکردە مەسیحیەکان ئافرەتیان ناچار دەکرد تا بە ویستی ئەوان شوو بکەن، ئەمەش دوای چەند سەدە لە دەرکەوتنی ئیسلام لای مەسیحیەکان هەروا بوو، بەڵام ئیسلام ئەوپەڕی مافی بەخشی بە ئافرەت تا بە ویستی خۆی شوو بکات و پیاو دەستوەرنەداتە سامانی، هەروەها پیاو بۆی نیە بە دڕندانە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکات، ئافرەت هەرکات گەیشتە تەمەنی پێگەیشتن بۆی هەیە هەڵسوکەوت بکات بە هەموو شت و سەروەتی خۆیەوە بێ ئەوەی مێردی یان کوڕی دەستوەردانی هەبێ.

ئەگەر بە گشتی سەیری باری ئافرەت بکەین لەپێش ئیسلامدا وێنەیەکی ترسناك دەبینین (ئافرەت لە ئەسینا کە لە هەموو گەلانی تری کۆن شارستانی ترو خاوەن زانست تر بوون کەچی ئافرەت بە پێناوی چێژوەرگت سەیر دەکراو وەك کاڵا لە بازاڕدا دەکڕدراو دەفرۆشرا

پلەوپایەشی لەوپەڕی خوارەوە بوو، بەڵکو بە پیس و کاری شەیتان سەیردەکراو هیچ نرخی نەبوو هەر پیاوێکی ئەسینا بە ئارەزووی خۆی بوو چەند ژن دێنێ. دیموشینتس شانازی بەوەوە دەکرد کە سێ چین ئافرەت لەناو گەلەکەیدا هەیە دوو چینیان بەژنی شەرعی و نیمچە شەرعی دادەنێ.

لە سپارتەدا ئافرەت بۆی هەبوو شوو بە چەند پیاوێ بکات و زۆربەی ژنانیش پەیڕەوی ئەو نەریتەیان دەکرد، فرەژنی لە وڵاتانی دراوسێی ڕۆماندا هەبوو و ئەوەش بەهۆی ئەو فتوحاتەوە بوو کە ڕۆمان ئەنجامی دەدا وێڕای ئەو خۆشگوزەرانیەی هەیانبوو، هەموو ئەمانە وایان دەکرد زەواجی پیرۆز تەنها وشەی سەرزاری لای ڕۆمان بێ، بەڵام گەورەکانی ڕۆما دەیانویست ئازادی زیاتریان هەبێ و لەوپەڕی ئارەزووبازیدا دەژیان، ئیتر وای لێهات زەواج بوو بە فسقێکی ئاسایی، پاشان حکومەت لە یاساکانیدا دانی نا بەزینادا، ئازادی ئافرەت و ئەو پەیوەندیە ڕووتبوونەی دەیبەستنەوە بە پیاوەوە ئافرەتی لە کۆشی پیاواندا دەساو دەس پێدەکرد، ئەمە فرەژنی لێکەوتەوە، دواتر دۆست گرتنی تەنها بۆ چینە ئەرستۆکراتیەکان نەبوو تەنانەت پیاوانی ئەکلیرۆس خۆیان زیاد لە ژنێکی شەرعی یان ناشەرعییان هەبوو یا پیرۆزییان هەرچی بخواستایە.

کاتێ ئیسلام هات مرۆڤایەتی لەو باری کۆیلایەتیەی ژن و پیاودا بوو، خێرا ماف و ڕێزو ئازادی و پلەوپایەی بۆ ئافرەت دانا بەجۆرێ خەویشی پێوە نەدیبوو. ئیسلام مافی ئافرەتی لە ژیاندا ڕاگەیاندو ئازادی لە هاوسەرگیری و موڵکداریدا ڕایگەیاند، بە هەمووانی وت ژن توانای سەرپەرشتی کاری خۆی هەیە، بۆ پیاویش پلەیەکی دانا. لەو بارەوە کە ژن بەچێژ بۆ پیاو سەیردەکرا ئیسلام ئافرەتی گواستەوە بۆ بوونی کەسایەتی تەواو و لە کۆیلایەتی و داوێن پیسی و خراپەوە بەرەو ئەو ئاستەی برد کە بتوانێ خۆی هاوسەر بۆ خۆی هەڵبژێرێ، دواتر ئەو سنوورانەی دانا کە ڕێ نادات ئافرەت سوکایەتی پێ بکرێ و بە کۆیلە بگیرێ. لەبری ئەوەی بقۆزرێتەوە یان بە کۆیلە بگیرێ یان داوێن پیسی پێ بکرێ ئەمەی بۆ دانرا ﴿وَلَا تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاء إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّناً﴾ ڕێی نەدا ئافرەت زیندەبەچاڵ بکرێ ﴿وَإِذَا

﴿الْمَوْؤُودَةُ سُئِلَتْ بِأَيِّ ذَنبٍ قُتِلَتْ﴾ بەڵکو ڕێزی ئافرەتی گرت و یاسایەتی دانا بۆ چوونە لای ژن ﴿ثَلَاثُ عَوْرَاتٍ﴾ تا تیایدا داوای مۆڵەت لە ئافرەت بکرێ، بەڵکو بانگەوازی کرد تا ئافرەت خوێندنی فێر بکرێ و میراتی بۆ بڕیەوەو نیوەی شایەتی پیاوی بۆ دانا و سنورێکی دانا بۆ فرەژنی کە پێشتر هیچ سنورێکی نەبوو. هێنانی دوو خوشك یان هێنانی خوشك یان دایك یان ژنی باوك یان خوشکی شیری بە هاوسەر حەرام کرد پایەیەکی ڕێز و پارێزگاری ئابڕوی بۆ دانا کە هەرگیز هیچ شارستانیەتێك بەوەی نەگەیاندبوو. ئیسلام پلەوپایەی ئافرەتی گەیاندە پلەیەکی بەرز لەکاتێکدا پێشتر لای جوولەکەو عەرەب لەوپەڕی نزمیدا بوو. ئافرەتی بەڕێز وەك خزمەتکار وابوو تەنانەت لە ئایینی جوولەکەییدا لە ماڵ و باوکیشیدا هەر خزمەتکار بوو و باوکی مافی هەبوو ئەو کچە بفرۆشێ، ئەگەر باوکەکە مرد براکانی ئەو مافەیان هەیە چی پێ ئەکەن بیکەن ئافرەت بۆی نەبوو هیچێ بەمیرات وەربگرێ ئەگەر هاتوو باوکەکە هیچ کوڕێکیشی نەبووایە. عەرەبی سەردەمی نەفامیش ئافرەتی بە کاڵا سەیر دەکردو بە بەشێ لە سامانی باوك یان مێردی دادەنرا، بێوەژنانیش دەبوونە میراتی بۆ کوڕ یان کچەکانیشی هەروا دەبوون، بۆیە ئیسلام بە یەکجارەکی ئەو هاوسەرگیریەی حەرامکرد کە کوڕێ ژنی باوکی بە هاوسەر بگرێ. هەروەها داڕمانی پایەی ئافرەتە لای عەرەبی جاهلی گەیشتە ئاستێ بە زیندوویی و خێرا کچەکانیان زیندەبەچاڵ دەکردن تا ئیسلام هات و ئەوەی حەرام کرد، ئەو باوە لەناو عەرەبی قوڕەیش و هۆزەکانی کندەدا باو بوو و ئیسلام بە ستەمی دانا، ئەوان وەك قوربانی و لەسەر بنەمای چاولێکەری هەندێ گەلانی تر کچەکانیان دەکردنە قوربانی بۆ خواوەندەکان. لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی دەوڵەتانی فارس و بیزەنتیشدا پایەی ئافرەت زۆر نزمو سووك بوو، دەمارگیرانێ کە بە کەفوکوڵ بوون هەڵمەتێکی هەر لە خۆیان دەبردە سەر ئافرەت، ئەوان دواتر لە جیهانی مەسیحیدا بوونە قدیس و دەیانوت ئافرەت هۆی خراپەیە و ئەوەیان لەبیر چوو بوو ئەو خراپەی دەیدەنەوە پاڵ ئافرەت تەنها لە ئەنجامی گومڕایی بیریانەوەیە، لەو کاتەدا کاتی پێگەی کۆمەڵایەتی ئافرەت لە هەموو لایەکەوە داڕماو هاوارەکان پەنایان دەبرد بۆ ئەوەی بڵێن ئەو ئەزموونانە گەندەڵی هەموو سیستم و شەریعەتە

کۆنەکان دەسەلمێنن، لەو کاتەدا موحەممەد ﷺ بە ڕێنماییەکانەوە بانگەواز بۆ چاکەوە هات و دەیفەرموو ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ﴾. خوا ڕێزی لە ئافرەت نا بەوەی سیفەتێکی پاك و سیفەتی ژنی چاکی لێنا. یاسا ئیسلامیەکان بە هەموو جۆرێ هاوسەرگیری مەرجداریان حەرام کرد، ئیسلام بڕێ مافی بە ئافرەت بەخشی کە پێشتر نەیبوون دوای ماوەیەکی زۆر ئینجا ئافرەت بە دروستی نرخ و بەهای ئەو شتانەی زانی. شەریعەت لە هەموو ماف و کارە مادیەکاندا یەکسانی لەنێوان ژن و پیاودا کردووەو سنوری فرە ژنیشی دیاری کردووەو حوکمی بەسەر پیاودا داوە تا لەنێوان ژنەکانیدا تەواو یەکسانی بکات ﴿فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تَعْدِلُواْ فَوَاحِدَةً﴾ ﴿وَلَن تَسْتَطِيعُواْ أَن تَعْدِلُواْ بَيْنَ النِّسَاء وَلَوْ حَرَصْتُمْ﴾ لێرەدا دادپەروەری بریتییەی لە دادپەروەری تەواو، ئەوەش لە قورئاندا هاتووە مەبەست ڕێگریە لەو عادەتەی پێشتری جیهان[1].

سەبارەت بە فرە ژنی پێشتر لە هەموو گەلانی کۆنی ڕۆژهەڵاتیدا باو بوو، لە ڕێی پاشاو سەرکردەکانەوە کە خەڵك بە پیرۆزیان دادەنان ئەو کارە ڕوویدا بوو بەشتێ کە گەلان بە پیرۆز سەیریان دەکرد. لەنێو هندۆسەکاندا تا ماوەیەکی لەمەو پێش هەر باو بوو، پیاو تەواوی ئازادی هەبوو چەند ژنی بووێ بە هاوسەریان بگرێ، لای ئیسرائیلیەکانیش پێش سەردەمی مووسا ئەوە باو بو.

موحەممەد ﷺ هات و ئەو نەریتە نەك تەنها لەناو گەلی خۆیدا بەڵکو لەناو گەلانی دراوسێشدا باو بوو، ئەوەش خراپترین باری کۆمەڵایەتی لێکەوتبوویەوە، بەڵێ یاساکانی دەوڵەتی مەسیحی هەوڵیاندا ڕێ بەو خراپەیە بگرن بەڵام نەیانتوانی، فرەژنی بێ بەربەست و پارێزەرێ هەروا مایەوە، لە ئێراندا لە یاسا پیرۆز سەیرکراوەکانیاندا سنورێ بۆ فرە ژنی نەبوو، بەڵکو بە دڵی خۆیان سەرقاڵی ئەوە دەبوو، وێڕای بەربڵاوی ئەو نەریتە لای عەرەب و جوولەکە کۆنەکان چەند نەریتێکی تریان هەبوون وەك هاوسەرگیری کاتی کە پشێوی ئەخلاقیو بڵاوبوونەوەی خراپەی لێدەکەوتەوە.

---

١- سید أميرعلي: المرأة في الأسلام.

بەڵێ ئیسلام کە هات سنورێ بۆ فرەژنی نەبوو، بەڵام ئیسلام ژمارەی دیاریکراوی بۆ دانا کە چوار ژن بوو، دواتر بنەمایەکی سەختی بۆ دانا کە دادپەروەری بوو ﴿وَلَن تَسْتَطِيعُواْ أَن تَعْدِلُواْ بَيْنَ النِّسَاء وَلَوْ حَرَصْتُمْ﴾[1].

گەورەترین بەخششی ئیسلام لە بەراوردی ئایینەکاندا لەناوبردنی بێڕەوشتی و کەنارگیری لە ژیانیش بوو کە حەڵاڵەکان و حەرامەکان و بانگەواز بۆ دابەشبوونی گشتی لە ژن و ساماندا و ڕەواکردنی بەهاوسەرگرتنی کچان و ژنانی تر لەلایەن زۆربەی ئایین و مەزهەب و ڕاڤە ئایینیەکانەوە بانگەوازی بۆ دەکرا، مەزدەك ڕوایی بەشداری گشتی لە ژن و سامانی دانابوو، هەزاران ئافرەت لەبەر ڕازیکردنی ئارەزووەکانیان کەوتنە شوێنی، دەستەیەك لە زیادەڕەوی لە ئارەزووەکاندا بەتایبەت ژیارەکانی فارس و یۆنان و هیندو ڕۆمان.

لە هەمان کاتدا چەند ڕاڤەیەکی هەندێ ئایین کەوتنە سەرکوتکردنی ئارەزووەکان و داماڵینی دەروون و دوورخستنەوەی لەهەر ویستێکی سروشتی گیانی مرۆیی، لەوانە چەند ئایینێ بڕوایان بە خوا نەبوو وەك بوزی و بەرهەمی یان هەبوون ئایینی ئاسمان بوون و لاڕێ کرابوون، ئەو بانگەوازانە سلبی بوون و ئەو کۆمەڵگانەیان لەناو دەبردن کە تیایدا بوون چونکە بانگەوازیان دەکرد بۆ کوشتنی ویستە سروشتیەکانی قەوارەی مرۆیی نکوڵییان دەکرد لە هەر جوانی و خۆشیەکی ژیان و دەیانوت جەستەی مرۆڤ خێری تیا نیە چونکە شوێنی کەمیەکانە، خۆشی و سامان و شکۆ هیچ بەهایەکی نیە، با ڕۆژان لە پێناو مەرگخوازیدا لەژێر تیشکی سووتێنەری خۆر و دوور لە چێژی دنیا بژین و لەپێناو زوو لەناوچووندا کارنەکەین.

---

١- فرە ژنی لە ئیسلامدا تا چوار ژن ڕەواو ڕێ پێدراوە، ئەوەش حیکمەتی تێدایە، مەسەلەی دادپەروەریش کە خوا دایناوە دادپەروەریە لەوپەڕی تواناداا بە ڕووکەش و تا بکرێ لە ناخیشدا، بەڵام لە ئایەتی دووەمدا کە دەفەرموێ هەرگیز ناتوانن دادپەروەر بن مەبەستی لە بڕیاری خۆشەویستی دڵە لەناخەوە بۆیە ئەمە هیچ بیانویەك نیە بۆ ڕێگرتن لە فرەژنی ڕێپێدراوی شەرعی. وەرگێڕ.

لە ئاسیاو ئەوروپاو هیندو چین و ئەفریقا و ئوستورالیادا لەپێش ئیسلامدا شتێ هەبوو کە پێی دەوترا (البغا) داوێن پیسی کە بەسەر کچاندا فەرزکرابوو کچێنی خۆیان پێشکەشی خواوەندەکان بکەن و داوێن پیسی بکەن تا بڕێ سامان کۆبکەنەوەو پێشکەشی پەیکەری خواوەندی بکەن و بچنە دەرەوە.

هیرۆدۆت باس لەوە دەکات کچە جوانەکان زۆر دەمانەوە، بەڵام کچە ناجوانەکان ناچاربوون چەند ساڵێ بمێننەوە بۆ پارە کۆکردنەوە، داوێن پیسی میوانداریش هەبوو، کاتێ میوانێ لەسەر حیسابی خاوەن ماڵ دەهات دەبوو کچەکەی یان ژنەکەی یان خوشکەکەی یان خزمەتکارەکەی بخستایە خزمەتی میوانەکە، بەو جۆرە بارەکە زۆر ڕەق و توندو ستەمکارانە بوو و پڕ بوو لە خراپە و تاوان، چەند بەراوردێکی ئایینەکان کە پشت بە چەند سەرچاوەیەکی ڕۆژئاوایی دەبەستن تیشکیان دەخەینە سەر.

موعجیزەی فەلسەفی دەڵێت: قورئان لە تەورات جیاوازە چونکە لاوازی مرۆڤ بە سزایەکی خوایی دانانێت وەك ئەوەی جوولەکایەتی دەیڵێت، لە سیفری تەکوین (٣-١٦) دا باس لەوە دەکات. هەڵەو تێکەڵکردنە شتی وا خراپی بەرامبەر بە ئافرەت بدەینە پاڵ یاسا دانەرێکی گەورەی وەك موحەممەد. لەڕاستیدا ئەوە قورئانە دەفەرموێت ﴿فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَى أَن تَكْرَهُواْ شَيْئاً وَيَجْعَلَ اللّهُ فِيهِ خَيْراً كَثِيراً﴾.

(پۆل دی رکلا) دەڵێت: ئیسلام تاکە ئایینی نێو هەموو ئایینەکانە کە بە ڕێنماییە بەرزەکانی بەرامبەر بە حەزی فسق و خراپەی گەلان چەندین بەربەستی داناوە، هێندە شانازی بەسە کە ڕەچەڵەکی پیرۆز ڕاگرتووەو بە گەورەی داناوە تا پیاو حەز بە هاوسەرگیری بکات و واز لە زینا بهێنێ کە بە شەرع و تەشریع تاوانە، ئیسلام بە عەقڵیەتێکی تەواو دادپەروەرانەوە زۆربەی ئەو مەسەلە کۆمەڵایەتیانەی چارەسەر کردووە کە تا ئەمڕۆش بیروباوەڕی ڕۆژئاوا بەدەستیەوە گیرۆدەیە.

(واصف غالی) دەڵێت: زۆربەی پیاوانی ئایینەکانی تر کە یەکێکیان (سان بونتفتیور)ە بە خوێندکارەکانی دەڵێت ئەگەر ژنێکتان بینی وا مەزانن مرۆڤێ دەبینن، بەڵکو وا مەزانن دڕندەیەکیش دەبینن، بەڵکو ئەوەی دەیبینن خودی شەیتانەو دەنگیشی دەنگی مارە.

بەڵام بەڕاستی موحەممەد گەورەترین پشتیوانی کردەیی ئافرەتانە ئەگەر خودی گەورەترینیان نەبێ، ئەو بەسۆزو نەرمونیانیەوە لەگەڵیان دەجووڵێتەوە، زۆر سۆزی نواندووە بۆیان و ڕێزیان دەگرێت، ئەمەش تەنها بۆ ژنەکانی خۆی نەبووە، بەڵکو لەگەڵ هەموو ژناندا هەمان ڕای هەیە.

بەڕاستی بە ڕوانینێ بۆ گەلان سەبارەت بە ویستی ژن ئاستی قووڵی تێگەیشتنی و بنەڕەتی بوونی ئیسلام دەزانین، کیسرا کە ژنی دەهێنا سامانی هەڵدەبژارد، قەیسەر کە ژنی دەهێنا جوانی هەڵدەبژارد، سەردەمی جاهیلی ڕەچەڵەکیان هەڵدەبژارد، بەڵام ئیسلام ئایین هەڵدەبژێرێ (تنكح المرأة لأربع لمالها و جمالها و حسبها و دينها فاظفر بذات الدين تربت يداك). ئەگەر ئیسلام ئەو ڕێبازە پیرۆزەی پێشکەشی ژن و پیاویش کردبێ و ئازادی تەڵاق و فرەژنی هاوسەرگیری داوە بە پیاو، ئەوە -بەپێی وتەی موحەممەد ئەسەد- ڕاڤەی ئەو هۆکارە دەکات لەپێناویدا شەریعەتی ئیسلامی زینا بە پیسترین تاوان دەزانێ، چونکە بەرامبەر ئەو ڕێپێدان و ئازادیە ناکرێ هیچ بیانوویەك بهێنێتەوە بۆ ئارەزووبازی.

ئیسلام لە ڕێزگرتنی مرۆڤدا (بە ژن و پیاوەوە) ئەوپەڕی هەڵوێستی ڕێپێدان و یەکلاکردنەوەی گرتووەتە بەر وەك هەڵوێستی سەبارەت بە مەی خواردنەوە. موحەممەد ئەسەد دەڵێت کاتێك تەنها ئیسلام مەی حەرام دەکات لە کتێبی ئایینەکانی تردا ئەوە نابینی بەڵکو دەبینیت هەندێکیان هاندان بۆ مەی نۆشییان هەیە وەك قسەکەی قدیس پۆلس بە خوێندکارێکی بڕێکی کەم مەی بنۆشە بۆ چاکبوونی گەدەت، یان ڕووداوی گۆڕینی قاچاخی پڕ لە ئاو بۆ مەی دەبینین، بەڵام موسڵمانان قاپ و قاچاخیان پڕ بوو لە مەی کە خوای گەورە مەی حەرام کرد هەموویان ڕشت و کۆڵانەکان ڕووباری مەییان لێ دروست بوو.

هنری دی کاستری دەڵێت: بڕەترین چەك کە موسڵمانانی پێ بکوژرێت و بەهێزترین شمشێر بۆ کوشتنی موسڵمانان مەییە، ئەو چەکەمان بەسەر خەڵکی جەزائیردا تاقی کردەوە بەڵام ئامادە نەبوون قبووڵی بکەن بۆیە وەچەیان چەند بەرامبەر بوو، ئەگەر قبووڵیان بکرداسە لەبەردەماندا زەلیل دەبوون وەك ئەو هۆزەی مەیەکەی ئێمەیان نۆشی و پێویستە موسڵمانان شەریعەتی خۆیان بپارێزن کاتێ سەرخۆشکەری لێ حەرام کردوون چونکە ئەوە بەهێزی ئەوانی تێدایە ئەو هێزانە گەورەیی ئیسلام دەهێڵنەوە بەڵکو مانەوەی ئەو هێزانە شارستانیەتی ئیسلامی دەپارێزن.

ئەوروپا دواتر زانییان چۆن ئیسلام ڕێزی مرۆڤی گرتووەو پایەی بەرزکردووەتەوەو چۆن بۆ یەکەمجار دوای ئیسلام خەڵکی خۆشەویستی پاك فێربوون لەناو هەموو ڕەگەزەکاندا کە پێشتر ئەوەیان نەدەزانی، شیعری سەردەمی جاهیلی هەموو وێنەیەکی خۆشەویستی گرتنە دەستی ژن و ڕابواردن و چێژ لێوەرگرتنی جەستەیی بوو، کاتێ بیروباوەڕی ئیسلامی دەرکەوت ژنی پاك ڕاگرت و لە بری ئەوە بە چاوێکی پێناوی چێژوەرگرتن سەیری بکات خۆشەویستی پاك و دیاریکردنی سنوور بۆی دەرکەوت. ئەمە گوازرایەوە بۆ ئەوروپا، کاتێ هەندێ ڕەخنەگری بەشەرەفی ڕۆژئاوا ڕەخنەیان دەگرت ئەوەیان بە گرنگترین هۆکاری پاکڕاگرتنی دەروون و ڕێ خۆشکەری دەوانی تا مرۆڤایەتی لەسەردەمی ناوەڕاستەوە بەرەو سەردەمی نوێ بهێنێ، هەر لە دەرکەوتنی ئیسلامەوە موسڵمانان سیستمی حەرییان نەبووەو ئافرەتیش بەکەمی بە پەچە دەموچاوی داپۆشیوەو لە پشت دیوارەوە نەبووە، بەڵکو وەك پیاو زانستی وەرگرتووەو پێش ئافرەتی ئەورووپی فێربووە چۆن تایبەتمەندی مەعنەوی هەبێ.

(بیرونکس) لە کتێبەکەیدا (القصة في سبعة قرون) دەڵێت: ئافرەتی ئەورووپی لەو ڕاستیە بێئاگا بوو کە ئەگەر بیزانیایە لە گەورەییدا گەشکەی دەکرد، ئافرەتی ڕۆژئاوا بەرزی و پێشکەوتنی دانەهێنا، بەڵکو ئەوەی بە میراتی لە ئافرەتی موسڵمان وەرگرت، هەڵەیەکی باو سەبارەت بە خۆشەویستی پاکی دوور لە مەیلی جەستەیی ئەوەی ئەفلاتونە، سەرچاوەی ئەو تێکەڵ کردنەشی ئەوەیە ئەفلاتون لە ماددیگەری ژیاندا نغرۆ بووە، هەندێ جار بیری

زیندووکردنەوەی خۆشەویستی پاك دەردەکەوێ کە شاعیر (لترویادور) دەری دەبڕێ و پێی وایە ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ مەسیحیەت، بەڵام لە ڕاستیدا ڕێنماییەکانی مەسیحیەت هیچ لە نەریتی هەمەجی و ڕەوشتی بەربەری بتپەرستییان نەگۆڕی کە زاڵ بوو بەسەر سەرکردەکانی ئەورووپادا پێش پەیوەندییان بە موسڵمانانەوە، بەڵکو کڵێسا ناچار بوو چاوپۆشی لێبکات، لە ڕاستیدا کڵێسا لەژێر دەسەڵاتی بیری ئیغریقیدا بوو، دیارە دەستەیەکی قەشەکانی سەرسامی ئەفلاتونو دەستەیەکی تریان سەرسامی ئەرستۆ بوون، ئەو دوو فەیلەسوفە و ڕێنماییەکانیان بوونە بناغەی بیروباوەڕو ڕێنماییەکانی کڵێسا، زیاتر پیاوانی کڵێسا سەرقاڵی ئەدەب بوون بەڵام بەردەوام کاریگەربوون بە بیری ئیغریقی و تەنها بە زمانی لاتینی شتیان دەنووسی.

(ڕۆبیربریفۆ) دەڵێت فەلسەفەی باڵا فەلسەفەی خۆشەویستیە کە بەردەوام پەیوەندی هەیە بەو شیعرە سۆزداریەوە کە لە ئەندەلوسەوە وەرگیراو بازنەی خۆشەویستی لە برۆفانسی گرتبووە دەست، هەموو ئەمە لە بنەڕەتی ئیسلامەوە وەرگیرابوو.

شاعیران (الترویادۆر) خوێندکارانی شاعیرانی موسڵمان بوون و فەلسەفەی سۆفیگەرییان قۆستەوە کە ناچاربوون دواجار پەنا بەرنە بەر مەزهەبی پاکی و پاکداوێنی، هەروەها سوربوون لەسەر ئەوەی سۆزداری پاکی ئیسلامی لە شیعری ئەندەلوسیدا بۆ خۆیان ڕابکێشن کە توانای هەبوو ڕەونەقێکی تایبەت بدات بە هونەریان، ئەگەر دیدی شیعری مەدح کە پەیوەست بوو بە خەلقی مەمدوحەوە بکەوتایە جیهانێکمان لە ڕوانگەی چاکەی دەروونی مرۆییەوە دەخستە ڕوو کە تیشك دەخاتە سەر ڕووداو و لایەنەکانی و دیدە پاکەکانی باس دەکات. چیرۆکی عەنتەرە یەکەم هاواری هونەری مرۆیی بوو دژ بە کۆیلایەتی و جیاکاری ڕەگەزی، لە زۆربەی چیرۆکە ئیسلامیەکاندا ئافرەتی موسڵمان سیفەتی وەفاداری هەیەو چەرمەسەریەکانی لە نەرمی هەستیەوە دێن و لەنێو خۆیدا ململانێی دوو سۆز هەڵدەگیرسێ مە هەردووکیان سۆزی بەرزو پاکن. کەچی ئافرەتی ئیغریقی لە زۆربەی ڕووداو و چیرۆکەکانی ئیغریقدا سیفەتی ناپاکی و کاری سوکی بێ هیچ بەرگریەکی هەیە و خراپترین کاری دڕندانەی بۆ

ئارەزووەکانی ئەنجام داوە، ئەوەتا هیلینی لە چیرۆکی تەروادەدا ناپاکی لە مێردەکەی دەکاتو بەو هۆیەوە چەند گەلێ لەناو دەبات و ولاتێ بەتەواوی وێران دەکات.

نکوولّی ئیسلام لە ڕەهبانیەت بەشێکە لە پەیامی ئیسلام بۆ ڕزگارکردنی مرۆڤ لە کۆیلایەتی و بە شارستانی کردنی مرۆڤایەتی دوای ئەوەی ماوەیەکی زۆر لەپشت شورەکانی ستەم و دلڕەقی و بێبەش کردنەوە پەسەند کرابوو و لەنێوان بێڕەوشتیدا کە جوولەکایەتی تلمودی سەپاندبووی و نێوان ڕەهبانیەتدا کە دواتر هات گیرۆدە بوو. ڕەهبانیەت سیستمێکی تایبەتە کە چەند کۆمەڵێکی ئایینی گرتیانە بەرو مەرجی هەژاری و بێ هاوسەری و گوێڕایەڵی کوێرانەی لەخۆ دەگرت، دەبوو لە دنیادا بڕێ و کەنارگیری بگرێتەبەر، ڕەهبانیەت لەپێش مەسیحیەتدا لە هیندو چەند هەرێمێکی تری ئاسابیدا هەبوو، جولەکەکان پێش سەردەمی مەسیحی ئەو نیزامەیان دەگرتەبەر، دواتر لەناو مەسیحیەت دا دەرکەوت کاتێ ژنو پیاو ڕێیان لێ گیرا بۆ هاوسەرگیری و خواردنی گۆشت و هەموو تەمەنیان سەرقاڵی بڕێ پەرستش بوون. بانگەوازەکەیان لە میسر لە نێوەندی سەدەی سێیەمدا دەستیپێکردو لە ڕۆژئاوای ئەوروپا لەسەردەمی قدیس ئەسناسیۆس و دواتر قدیس بندکتۆشدا بلاوبوویەوە، بندکتۆس لە ڕۆژئاوادا پایەکانی ئەو سیستمەی چەسپاند.

مێژوونووسان باس لەوە دەکەن لە ساڵی ٣٥٦ زایینیدا لە دێرێکدا دە هەزار ڕاهیب و دە هەزار ژنە ڕاهیب هەبوون، گۆلیزلیروی لە لێکۆڵینەوەیەکیدا سەبارەت بە ڕەهبانیەت لە ڕۆژئاوادا دەڵێت: کلێسای قیبتی کاریگەر بوو بە بیروباوەڕی میسریە کۆنەکان، مەسیحیەکان کە جەستەیان بە فەوتاو و ڕۆحیان بە ماوە دەزانی بۆیە گاڵتەیان دەکرد بە خۆشیەکانی دنیاو بە عەیبەیەکیان دەزانی کە دەبێ لە دەستی ڕزگار بن تا بەردی بەربەست نەکەوێتە سەر ڕێی چوون بەرەو خلودو نەمرییان، ئەمە ڕاڤەی باری ئەوانەیە کە جیهانی ئێمە جێدەهێڵن و ڕوودەکەنە بیابان و لە گۆڕستانی میسریە کۆنەکاندا ژیانێکی نوێ دەست پێدەکەن و دەیکەنە شاندی ڕەهبانیەت.

لیکنی نووسەری کتێبی (تأریخ أخلاق أوروبا) دەڵێت ڕوهبانەکان تەواو ژمارەیان زیادی کرد و باریان دەرکەوت و کەوتنە بەرچاو و خەڵکیان سەرقاڵ کرد تا ئەوەی مێژوونووسان باس لەوە دەکەن لە ڕۆژانی جەژنی (الفصح)دا پەنجا هەزار ڕوهبان کۆدەبوونەوە. لە سەدەی چوارەمی مەسیحیدا یەك ڕاهیب سەرپەرشتی پێنج هەزار ڕاهیبی دەکرد.

سزادانی جەستە مەترسیدارترین کاری ڕوهبانەکان بوو، هەیانبوو سێ ساڵ لەسەر یەك قاچ دەوەستا هەیانبوو بارێکی قورسی ئاسنی هەڵدەگرت، جلیان نەدەپۆشی و قژیان بە درێژی دەهێشتەوەو لەسەر دەست و پێ وەك ئاژەڵ دەچوون بەڕێداو لە شوێنی درندەکان و بیرەکاندا نیشتەجێ دەبوون و گژوگیایان دەخوارد، پاکی جەستەیان بە دژایەتی مانەوەی ڕۆح دادەناو شۆردنی جەستەیان بە تاوان دەزانی. ئەوەیان تەقوای زۆر بووایە ئەوەیان بوو کە زیاتر خۆی بە پیسیەوە بتلاندایە، هەیانبوو بە مانەوەی هەموو تەمەنی ئاو بەر لەشی نەدەکەوت، هەیانبوو پەنجا ساڵ ئاو بەر دەم و قاچی نەدەکەوت. لە ئەنجامی ئەو ڕەهبانیەتەدا کە خراپەکان دەکرانە گەورەیی و عەیب و سووکی نەما ئیتر خەڵکی کەوتنە بەکەمدانانی ڕۆح و ڕونبێژی و دلێری‌و نەبەردی، لەو ئەنجامەدا پایەکانی ژیان لەرزین، ئەبولحەسەنی نەدەوی لەو بارەوە دەڵێت ڕەهبانیەتی باڵا نەیتوانی ڕەوتی ماددیگەی ئەورووپی بگۆڕێ و یان لق و پۆپ بکات. نەسرانیەتی ڕۆمی هەوڵیدا فیترەت بگۆڕێ و لایبەرێ، باری لە توانا بەدەری بەدەست دەروونەکاندا دەدا. ئەوەی وەك پەرچەکرداری دژ بە ماددیەتی سەرکەش گرتەبەرو بە ناحەزی لێی نەوی و دواتر لەدەستی دەرباز بوو و لەدژی ڕاپەڕی. نەسرانیەت بەو زێدەڕۆییەی لە ڕەهبانیەت و دوورگرتنەی لە دنیاو فیترەت نەیتوانی ڕەوشتی خەڵك ڕێکبکاتەوە، ئیتر بزاڤی خراپەکاری و بێڕەوشتی و ڕۆچوون لە دنیا نەویستی و ڕەهبانیەتیش هەردووکیان لە وڵاتی مەسیحیدا لەپاڵ یەکدا دەبری. بەڵکو ڕاستتر وایە ڕەهبانیەت لە بیاباندا کەناری دەگرت و لە ژیاندا هیچ دەسەڵاتێکی نەبوو، بزاڤی بێڕەوشتی و خراپەش لە شارو پایتەختەکاندا دەستڕۆ بوو.

ڕەهبانیەت کاریگەریەکی مەترسیداری هەبوو بۆ سەر خودی کۆمەڵگە، ئەو ڕوهبانانە ژن‌و منداڵی خۆیان لە بارێکی سەختی ژیاندا جێدەهێشت و دایکانیان بە جەرگ سوتاوی و ژنانیان بە بێوەژنی و منداڵانیان بە هەتیوی جێدەهێشتن و ڕووەو بیابان دەچوون، لە سێبەری ژنان ڕایاندەکردو ئەگەر خۆیان لێ نزیك بکردنایەتەوەو لەگەڵیان کۆبوونایەتەوە خۆیان بە تاوانبار دەزانی، تەنانەت پێیان وابوو ئەگەر لەسەرەڕێدا بیانبینن و قسەیان لەگەڵ بکەن با دایك و ژنیان یان خوشکیان بن هەرچی کار هەوڵی ڕۆحییان هەیە هەمووی لەناو دەچێت[1].

لەلایەکی ترەوە دێرەکان نموونەی باڵای خراپی هەر ئاکاریێ بوون. ئینکلۆپیدیای لارووس ص٨٩٨ج٣ دەڵێت: ڕوهبانەکان بە چاکی ڕەچاوی ڕەهبانیەتیان نەدەکرد.

لە سەدەی یانزەدا ڕوهبانە ڕۆژهەلاتیەکان کە لەسەر خۆیان مەرجیان دانابوو بێ هاوسەرگیری بژیین نەیاندەوێرا ئاژەڵی مێ ببەنە ناو دێرەکانیان دەترسان ئەوە مەترسی بێ بۆسەر ڕۆحیان لەگەڵ ئەوەشدا لەمڕۆدا دەردەکەوێ ئەوان وەفاداری خۆیان بەجێنەگەیاندووە سەبارەت بە پاکداوێنی نێوان ژنان و پیاوانی ئایینی.

رۆبرتۆ دوای ئەوەی سەردانی دێرەکانی نەمساو شانشینەکانی تری سەر بە پاشا فردینانی یەکەمی کردووە دەڵێت سەدو بیست دێری دیوەکە چوار سەدو سی ڕاهیب و سەدو شەست ژنە ڕاهیب و سەدو نەوەدو نۆ سریەو پەنجاو پێنج ژنی شوو کردوو و چوارسەدو چل و سێ منداڵی تێدابووە، ئەو دەترسێ قسە لەسەر ژنە ڕاهیبەکانی سەردەمی خۆی بکات چونکە دەترسێ گومان ببرێ سەبارەت بە ناتەواوی و ناڕاستی قسەکانی. هێرشێکی توند دەکاتە سەر دێرەکانی سەردەمی خۆی سەبارەت بە مێژووی دێر (دوریال) کەسیۆ رولوز لە مێژووی پاریس ١٨٢٣ وا قسەی لەسەر کردووە سەبارەت بە دێری فەرەنسی لە سەدەی شانزەدا بیرۆکەیەك دەبەخشێ، پاشان دائیرە تولمەعاریف دەڵێت: ئەو باری کاروبارە کەنارگیری و تایبەتانە ماوەیی نەبوون، بەڵکو لەسەردەمانی کۆند (قدیس سریاسین و قدیس بازیل) سەرکۆنەی کچە

---

١- نقلا عن أبي الحس الندوي (ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمين)

شوونەکردووەکانی سەردەمی خۆی دەکات کاتێ ژیانی خۆیان وا نیشان دەدەن بۆ خوای دادەنێن کەچی پاکداوێن نەبوون.

(جان کریزستوم) پێی وایە تەنها کوشتنی ئەو ژنە ڕاهیبانە بەس نیە کە پاکییان ناپارێزن بەڵکو پێی وایە بکرێ بە دوو بەشەوە یان بە زیندوویی لەگەڵ شەریکە تاوانەکەیدا زیندەبەچاڵ بکرێ، هەندێ دەستەی مەسیحی وەك پرۆتستانت و جگە لەویش باشیان کرد کە بەیەکجارەکی ڕەهبانیەتیان نەهێشت و دەرفەتی هاوسەرگیرییان دا بە پیاوانی ئایینی، چونکە هاوسەرگیری دورکەوتنەوە لە خوا نیە لەبەرئەوەی بۆیان دەرکەوت زۆربەی پێغەمبەران خاوەن پێداویستی بوون و هاوسەرگیریەکەشیان ڕێگری گوێڕایەڵی خوا نەبووە لێیان.[١]

ئیسلام ژیانی دنیاو ڕۆژی دوایی پێکەوە دەبەستێتەوەو خۆشیەکانی ژیانی وەك هاوسەرگیری و جوانی و خۆشی و خواردنی بۆ مرۆڤ ڕەواکردووە بەپێی بنەماو ڕێکخستنەکانی تایبەت بە ڕێزگرتنی مرۆڤ و پاراستنی و پاڵپشتی بنیادی دەروونی و کۆمەڵایەتی، ژیانی دنیاشی تەنها بەرتەسك نەکردوەتەوە سەر کارکردن بۆ ڕۆژی دوایی، خوا دەفەرموێت ﴿مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللّهِ الَّتِيَ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالْطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزْقِ﴾ ﴿وَابْتَغِ فِيمَا آتَاكَ اللَّهُ الدَّارَ الْآخِرَةَ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ الدُّنْيَا﴾ ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تُحَرِّمُواْ طَيِّبَاتِ مَا أَحَلَّ اللّهُ لَكُمْ وَلاَ تَعْتَدُواْ﴾.

لەم بارەیەوە ئیمامی عامری لە کتێبەکەیدا (الإعلام في مناقب الأعلام) دەڵێت: (ئەگەر خوا بیویستایە بەندەکانی خۆیان لەناوبەرن فێری پۆشاك دروستکردنی نەدەکردن تا خۆیان بپارێزن، یان لە گەرما نەیدەپاراستن و جۆرە گیاییەکانی بۆ چارەسەرکردنی ئازارو دەردەکان فێر نەدەکردن).

ڕەقترین ئاین بە درێژایی مانەوە ئەوەیە باری لەنێوان خۆشی و سەختیدا بێ تا بۆ هەموو بارە جیاوازەکان شتی شیاو بەو حاڵەی هەبێ لە مەعادو بژێویدا و خێری دنیاو دوارۆژی بۆ کۆبکاتەوە، هەر ئایینێ ئەو سیفەتەی نەبێ و لەسەر بنەمایەك دامەزرابێ کە کارو بەرهەم

---

١- من بحث في السياسة الأسبوعية (نوفمبر سنة ١٩٢٨).

لەناو بەرێ نابێ بە ئایینێکی چاك ناوبرێ ئەوە وەك ئەوەیە کە ڕەهبانیەتی مەسیحی گرتویەتیە بەرو ژن ناهێنێ و لەپەرستگادا کەنار دەگرێ و ڕۆژی پاك واز لێ دێنێ، یان کاری دوانەیی صدیقان لەوەی دەروون بەرەو دانیشتن و کەیفی دوور لە بزاڤی بنیاد دەبات، یان ڕێبازی ئەو هیندیە دوورگیرانەی کە جەستەیان دەسوتێنن و لەبەرزی شاخەکانەوە خۆفڕێ دەدەنە خوارو زەوی ئاوەدان ناکەنەوە.

بەوجۆرە ئیسلام هەڵوێستی ڕێزو دلێری و لێبوردەیی هەیە بۆ مرۆڤایەتی، ئەگەر لەسەر ڕەهبانیەت بدوێ پەیامی نموونەی بەهێزی و بنیادی کەسێتی لەخۆدەگرێ (ڕەهبانیەتی ئوممەتی من جیهادە) هەندێ دەمارگیر دەیانەوێ بارێکی سەرشێوێن بۆ ڕەهبانیەت دابنێن تا بەرزی ڕاگرن ئەمەش دژی فیترەت و عەقڵ و زانستە.

ئەگەر ڕەهبانیەتی ئیسلام جیهاد بێ ئەوا مێژوو پەڕەیەکی گەشاوەی بۆ موسڵمانان پاراستووە سەبارەت بە بنیادی سوارچاکی و گەیاندنی ڕێبازێکی هەرەباڵای وەفاو خانەدانی بە هەموو جیهان.

(سان هیلد) دەڵێت هەموو فەزڵی گەورەیی و سوارچاکانی ئەوروپا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا کە باری ڕەقی خۆیان گۆڕی بە نەرمونیانی دەگەڕێتەوە بۆ موسڵمانان، دواتر ئەوپەڕی سۆزو پاککردنەوەی دەروونی و فێرکردن و بەرەو مرۆڤایەتی و خانەدانی بەرزی کردونەتەوە، هەموو ئەمەش بێ ئەوەی تووشی لاوازیەکیان بکات کە هیچ لە سوارچاکی و دلێرییان پێ لەدەست بدات.

(تتیان دینیە) ئەو دیاردەیە بە جۆرێکی تر دەخاتەڕوو و دەڵێت مێژوو لە تۆمارەکانیدا سوارچاکی موسڵمانان و ڕۆحیەتی باڵایان بە هەموو بەڵگەیەکی باڵای پاکی و نەرمونیانی بۆ تۆمار کردوین.

ئیسلام سوارچاکی عەرەبی پاککردەوەو بنەماکانیشی بردە ناو ئەوروپا، ئیسلام نەك ڕەهبانیەتی نەگرتەبەر بەڵکو حەرامیشی کرد، سوارچاکی و خانەدانی وا لای یۆنان و ڕۆمانە کۆنەکان نەبوو، بەڵکو لای عەرەب هەبوو و ئیسلام هات و پاکی کردەوەو ڕێکی خست.

گەورەترین شتێ کە ئیسلام لەپێناو بە شارستانی کردنی مرۆڤایەتی و ڕزگارکردنی مرۆڤدا بانگەوازی بۆ دەکات برایەتی مرۆییە، کەمترین زیادەڕەوی نیە ئەگەر بڵێین هەموو ئەوروپاو جیهان لە دوای ئیسلام ئینجا زانییان برایەتی مرۆیی چییە پاش ئەوەی ئیسلام ئەو پەیامەی پێ گەیاندن.

(عەبدولکەریم حرمانوس) دەڵێت: ئەوروپا بیرۆکەی برایەتی لەنێوان خەڵکی نەدەزانی تا دوای شۆڕشی فەرەنسی لە کاتێکدا ئیسلام هەزار ساڵ پێش ئەو شۆڕشەی فەرەنسا بانگەوازی بۆ دەکردو موسڵمانانیش پەیڕەویان کرد، کەچی ئەوروپا لە سەدەی حەڤدەدا ئینجا فێری ئەوە بوو لە کاتێکدا ئەو برایەتیە ڕاستی و بنەڕەتی سەرەتای سەرهەڵدانی ئیسلام بوو.

فەرمانڕەوایانی ئیشتراکی ئەوروپا لە ساڵانی نوێدا فێری ئەوە بوون، بەڵام ئیسلام زۆر پێشتر یەکسانی لەنێوان موسڵمانان و ئەهلی کیتابدا داناو بەوە سیستمی دادوەری کۆمەڵایەتی دامەزراندو لە سایەیدا هەموو کەس هەموو مافێکی سیاسییان هەبوو، بەڕاستی بانگەوازی ئیسلام ڕێزی لە مرۆڤ ناو مرۆڤبوونی هێنایەدی و ڕێگەیەکی نوێی بۆ دروستکرد کە لەو ڕێیەوە ئەو ڕووناکیەی دەست کەوت کە ژیانی ڕووناك دەکردەوە).[١]

هێشتا تا ئەمڕۆش بیرۆکەی برایەتی ئیسلامی هیوایەکە دڵی چاکسازانی داگرتووە، دوای هەموو ئەو هەوڵانەی جیهانی ئەمڕۆ دەیانخاتە کار بۆ دامەزراندنی برایەتی جیهانی کەچی هێشتا هیواو ئومێد بۆ بەدیهاتنی ئەو نیازە ئیسلامە.

هاملتون جب لە کتێبەکەیدا (وجهة الأسلام) دەڵێت: ئیسلام بەردەوام توانای ئەوەی هەیە خزمەتێکی گەورە پێشکەش بە مرۆڤایەتی بکات، هیچ ڕەوتێکی تر نیە بتوانێ وەك ئەو سەرکەوتن بەدەست بهێنێ لە وابەستەکردنی ئەو ڕەگەزە مرۆییە جیاوازانەداو لە یەك بەرەدا لەسەر بنەمای یەکسانی یەکیان بخات.

جامیعەی ئیسلامی گەورە لە ئەفریقاو هیندو ئەندۆنیسیا، بەڵکو ئەو جامیعە بچووکە ئیسلامیەی لە چین یان لە یابان هەیە، هەموو ئەوانە ئەوە نیشان دەدەن هێشتا ئیسلام

---

١- د.عبدالرحمن علي الحجي: الحضارة الأسلامية.

توانای هەیە بە تەواوی زاڵ بێ بەسەر ڕەگەزی جیاوازی وادا کە بەپێی چینایەتی و ڕەگەزایەتی جیاواز کەوتوون، ئەگەر ناکۆکیەکانی دەوڵەتانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بخرێنە بەر باس دەبێ بۆ یەکلاکردنەوەی پەنا ببەینەوە لای ئیسلام.

بێگومان برایەتی ئیسلامی جیهانی لەژێر یاسای ئەخلاقی گشتیدا وەستاوەو برایەتیەکی جیهانی ڕاوەستاو لەسەر ڕۆشنبیریەکان نیە بەڵکو لەسەر یاسای یەکگرتووی ئیسلامی دامەزراوە.

بەڕاستی کاتێ ئیسلام هات و برایەتی مرۆیی هێنا ئەوە وەڵامێکی یەکلاکەرەوە بوو دژ بە ڕەگەزپەرستی کە مرۆکی هەموو مرۆڤایەتی و مەنتیقی ژیانی مرۆڤایەتی بوو لەو ماوە دوورو درێژەدا کە تیایدا چەمك و واتای تەورات دەستکاری کرابوو و لە لێبووردەیی برایەتیەوە گۆڕا بوو بۆ بەرزڕاگرتنی ڕەگەزو خوێن و گەلی هەڵبژاردە. ئەوە پەیامیان بوو بۆ هەموو مرۆڤایەتی، دیارە تەورات ڕاستیە مێژووییەکانی بردە قاڵبێك کە جەخت لە ڕەگەزپەرستی بکەنەوە، بەڵام قورئانی پیرۆز لە قاڵبی برایەتی مرۆییدا پێشکەشی کرد. بۆیە تەورات بوو بە بانگەوازێکی ڕەگەزپەرستی بەڵام ئیسلام بانگەوازە بۆ برایەتی مرۆیی.

ئیسلام کە هات شانازی کردن بە ڕەچەڵەکی سریەوەو بانگەوازی کرد بۆ گەڕانەوەی بۆ یەکبوونی یەکەمی ڕەگەزی مرۆیی (هەمووتان لە ئادەمن و ئادەمیش لە خۆڵە، هیچ فەزڵی سپی پێستێ نیە بەسەر ڕەش پێستێکدا و هیچ فەزڵی عەرەبێ نیە بەسەر عەجەمیەکدا تەنها بە تەقوا نەبێ) بەڵام ڕۆژئاوا بەتەواوەتی نەیانتوانی لە برایەتی مرۆیی تێبگەن چونکە دیدی خۆیان لە فەلسەفەی تلمودو یۆنانەوە هێنا بوو، ئەوە بوو جولەکایەتی خوێن و ڕەگەزی بەرز ڕادەگرت، ئەرستۆیش بیانوی دەهێنایەوە بۆ چاوچنۆکی ئیغریق بۆ دەستگرتن بەسەر جیهانداو دەیوت چەند کۆمەڵێکی دیاریکراو بە سروشتی ئازادی لەدایك دەبن و کۆمەڵێکیش بۆ کۆیلەیی لەدایك دەبن، فارسەکانیش هەمان بیروباوەڕیان هەبوو.

لە سەردەمی نوێشدا دەنگی ڕەگەزپەرستی بەرزبوویەوەو داگیرکەر هات و نیزامی کۆیلایەتی کرد بە نیزامێکی پیرۆز سەیرکراو بۆ ئەوەش بیریارو زانایانی کۆمەڵناسییان

ئەفسانەیەکی نیمچە زانستییان داهێنا بۆ بیانوو هێنانەوە بۆ ڕەگەزپەرستی. دواتر دەرکەوت هیچ بنەڕەتێکی زانستی نیە بۆ ڕیزبەندی گشتی و ڕەگەزەکان لەسەر بنەمایەکی ڕەگەزپەرستی. ڕەشەبای دەمارگیری ڕەگەزی بە ناحەزیەوە بەرامبەر هەموو ڕەگەزە ڕەنگینەکان هەڵیکردە سەر ئەوروپا و بانگەواز بۆ گەورەیی ڕەگەزی جەرمانی و سەرتبوونی ڕەگەزی ئاری و جۆری ئەنگلۆسکۆنی و ڕەگەزی جوولەکەیی دەرکەوت.

تەنها ئیسلام مایەوە بەڕاستی بانگەواز بکات بۆ برایەتی مرۆیی، ئارنۆلدتوینبی دەڵێت: موسڵمانە سپی پێستەکان هەر لە سەرەتاوە پەیوەندییان بەست لەگەڵ زنجە ئەفریقیەکان و گەلانی ڕەنگ جیاوازی هینداو بەردەوام بەڕێزەوە ئەو پەیوەندییەیان تا ئەمڕۆ پاراستووە. چونکە ڕەش و سپی لەژێر ئالای ئیسلامدا بە درێژایی کیشوەری ئەفریقی و هیندی تێکەڵ دەبن. موسڵمانە سپیەکان بە بەڵگەوە ئازادی خۆیان لە هەر هەستێکی ڕەگەزپەرستی نیشان دەدەن بە جۆرێ کچەکانی خۆیان لە موسڵمانە ڕەش پێستەکان مارە دەکرد.

برناردلویس دەڵێت هەموو موسڵمانە سپیەکالە کۆتی تەحەدای ڕەنگی دژ بە ڕەگەزی سپی بە دوورو ئازادبوون و خەڵکیان دابەش نەدەکرد بۆ ڕەش و سپی بەڵکو دابەشیان دەکرد بۆ باوەڕدارو بێ باوەڕ، موسڵمانان بەتەواوی لەڕووی دیدی ڕەنگیەوە ئازادبوون.

ئیسلام تەقوای وەك بنەمایەکی بنەڕەتی داناوە تا بەدیلی ڕەنگ و ڕەگەز بێ، قورئان دژی خێڵگەرایی و ڕەگەزپەرستی بوو و لەبری ڕەگەزپەرستی بیروباوەڕی داناوە. مقۆقس بە موسڵمانێکی وت چۆن ڕازی دەبن کەسێکی ڕەش پێست سەرکردەتان بێ؟ ئەوانیش پێیان وت هەرچەندە ڕەش پێستە بەڵام چاکترینمانە لە پلەوپایەو زیرەکی و داناییدا چونکە لەنێو ئێمەدا ڕەش پێستان کەم نرخ سەیر ناکرێن. ئەم واتایە لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا بەردەوام بەرچاو بووە تا ئەوەی ماکۆم ئەکسی زنجی ئەفریقی کە لە ویلایەتە یەکگرتووەکان دادەنیشێت لە یادەوەریەکانیدا دەڵێت: هەزاران حاجی لە هەموو لاکانی دنیاوە لە هەموو ڕەنگێ لە چاوشینەوە تا ئەفریقی ڕەش پێست هەبوون، بەڵام هەموومان لە یەك بۆنەدا وەك یەك بەڕۆحی یەکبوون و برایەتیەوە بەشداربووین، ئەو ڕۆحەی ئەزمونەکانم لە ئەمریکاوە بەرەو

ئەوەی بردم بڕوام وابێ سپی و جگە لە سپیش هیچ کەسێ تایبەتمەندی هەبێ گرێی خۆبەزلزانی یان خۆ بەکەمزانی نیە، چونکە هەموو ڕەگەزەکان بە ویست و سروشتی خۆیان تێکەڵی یەکتر دەبن.

ئیسلام لە سنوری خستنەڕووی بیرۆکەی برایەتی جیهانی مرۆییدا وەك مەزهەبێکی فیکری نەوەستاوە، بەڵکو وەك ڕێبازێکی ژیان پەیڕەوی کردووە چونکە فەتحخوازە موسڵمانەکان بەردەوام لەگەڵ گەلانی فەتحکراودا تێکەڵ بوون و پەیوەندییان لەگەڵ ئەوان و هەموو ڕەگەزەکاندا دروست کردووەو تێکەڵ بوون و یەکبوونی بیروباوەڕو هزرو ئاین و ڕێبازی ژیانیان کردووە بە بنەڕەتی یەکبوونی حەقیقی.

ئیسلام ڕێبازی زانستی ئەزموونی و ڕێبازی مەعریفەی تەواوی وەستاو لەسەر بنەمای پەیوەندی نێوان ڕۆح و جەستەی بە مرۆڤایەتی بەخشی، ئیسلام بە ڕزگارکەری عەقڵ و ڕێزلێنەری مرۆڤ هات و خێرا پەیامی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بڵاوبوویەوە تا گەیشتە ئەوروپایەك کە وەك ئاین ئیسلامی وەرنەگرت بەڵکو لەڕووی هزرو زانست و ڕۆشنبیری و ڕێبازەوە پێی کاریگەر بوو، ئەو ئیسلام چەمك و واتاو سروشتی ژیان و سیستمی کۆمەڵگەی ئەوروپای گۆڕی.

ئیسلام بوو بیری ئەوروپای لە بتپەرستی بیری ئیغریقی و کۆیلایەتی کۆمەڵگەی ڕۆمانی و ڕاڤەی ئایینەکان ڕزگار کرد، ئەو ڕاڤانەی کە عەقڵ و فیترەت قبوولّیان ناکەن، ئیسلام بوو عەقڵی ئەوروپی لەدەست قەڵەمڕەو و نهێنیەکانی کڵێسا ڕزگار کردو لە چنگی هەر ئەفنەو خورافەو جادوویەك دەریهێنا. ئیسلام بوو بەشکاری بە مرۆڤایەتی بەخشی پێشتر بیری یۆنانی تەنها لەسەر قیاس بوو، ئیسلام یەکەم کەس بوو جیهانی فێرکرد چۆن لەگەڵ ئاییندارییدا ئازادی هزری هەبێ.

بێگومان بیردۆزەکانی ئازادی و پێشکەوتنخوازی و دادوەری کۆمەڵایەتی دوای ئەوە دەرکەوتن کە بنەڕەتەکانیان لە ئیسلامەوە وەرگیران، دواتر بەپێی مۆرك و کۆمەڵگاکانی ڕۆژئاوا پێکهاتن. دیارترین شتێ ئیسلام پێشکەشی کرد ئەخلاقی ژیان و کۆمەڵگەو

سیاسەت و چەمك و واتای سۆزو لێبوردەیی و سۆزداری لەگەڵ ئەهلی کیتاب و دادوەری لەگەڵ موسڵمانان بوو.

بانگەوازی ئیسلام بۆ بەشارستانی کردنی مرۆڤایەتی بەرێزگرتنی مرۆڤ و لەکارخستنی کۆیلایەتی بوو، ڕزگارکردنی بیرو هاوکات بانگەواز بوو بۆ زانست وەك سەرچاوەیەکی بنیادی شارستانیەت. ئیسلام بەها ڕەوشتیەکانی بە پایەی بنیادی شارستانیەتەکان داناوە، ئەگەر ئەو بەهایانە دارمێن شارستانیەتیش دادەرمێ. ئیسلام ڕاستگۆیی و یەکسانی و ئامۆژگاری حەق و پەیڕەوی دادپەروەری بەسەر موسڵمان و ناموسڵمان و دۆست و دوژمندا کردووەتە پایەی شارستانیەت. چ شارستانیەتێ بێ سەرچاوەی ئیمان بەخواو دادپەروەری کۆمەڵایەتی و برایەتی مرۆیی دروست دەبێ، ئەوە ئەو ژیارە ماددیەیە کە لە ئەگەری کەوتن و دارماندایە. دارمانی ڕەوشتی یەکەم هۆکاری شارستانیەتەکانە ﴿وَإِذَا أَرَدْنَا أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا الْقَوْلُ فَدَمَّرْنَاهَا تَدْمِيراً﴾. بەم پێیە گەورەترین بەخششی ئیسلام بۆ ئەورپاو مرۆڤایەتی بریتیە لە:

* شارستانیەت لە ڕزگارکردنی مرۆڤ و بە شارستانی کردنی مرۆڤایەتی.
* شارستانیەت لە بنیادی ڕێبازی ئەزموونیدا.

بێگومان شۆڕشی ئەورپا دژ بە کڵێسا سەرچاوەی پەیوەندی کردنی بوو بە شارستانیەتی ئیسلامی ئەندەلوسەوە و کاریگەربوونی بوو بە دیمەنەکانی ئازادی هزری و کۆمەڵایەتی موسڵمانان، ئەورپا سێ سەد ساڵ لە ئیسلامەوە زمان و زانستی وەردەگرت،[1] کاریگەری ئیسلامیش بەڕوونی لەوەدا دەردەکەوێ کە چەندین رۆژئاوایی لە ڕێنماییەکانی کڵێسا دەرچوون و دەستیان گرت بە بنەمای ئازادی هزرو دەسەڵاتداری عەقڵەوە لەسەر بنەمای ڕوانین و ئەزموون، دیارە پیاوانی ئایینی[2] لە کتێبە ئایینیە پیرۆزەکانیاندا چەند وتەیەکی مرۆیی و قەناعەتی هاوسەردەمی مێژوو و جوگرافی و زانستە سروشتیەکانیان زیاد کرد،

---

١- من بحث (داتيان دينية).

٢- الندوي: ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمين.

خێرا ئەو وڵاتانە لەگەڵ پێشکەوتنی زانستدا نەگونجان، ئیتر لەوەوە تەنگـژەی نـاکۆکی نێـوان ئاین و زانست سەریهەڵداو خێرا ئاین لەو مەسەلەدا دۆڕاندی.

کلێسا لە کاتێکدا کەوتە چەوساندنەوەی زانست کە زانایـانی سروشـت و زانـست زنجـیری کۆتی تەقلیدی ئایینیان لادەبردو بەوپەڕی ڕاشکاویەوە کەوتنە ساختە دانان و ڕەخنە لێگرتنی ئەو بیردۆزە جوگرافیانەو ڕاستیە زانستیەکانیان ڕاگەیاندن. ئیتر کلێـسا هـاواری لێ هەسـتاو پیاوانی ئایینی کەوتنە حەڵاڵ کردنی خوێن و سامانی ئەو زانایانـەو دادگاکـانی پـشکنینیان دانان کە ئەو ملهوڕو زندیقانەیان سزا دەدان کە لەشارو ماڵەکاندا بڵاوبوون، کلێـسا هەوڵێـدا ڕیشەی هەر دژایەتیەکی کلێسا لە جیهانی مەسیحیدا هەڵکێشێ، ئەو دادگایانە سزای (سـێ سەد هەزار) کەسیان دا، لەوانە (سـێو دوو هـەزار)یـان بـە زینـدوویی سـووتێنران، لەوانـە (برۆنۆ)ی زانای سروشتی، (گالیلۆ)ش سزای کوشتنی بەسەردا درا چـونکە بـڕوای هـەبوو بـە خولانەوەی زەوی بەدەوری خۆردا، گەورەترین بەڵگەی دژایەتی کلێسا بۆ زانست بریتی بوو لە سووتاندنی کتێبەکانی پەتلیمۆسەکان و میسریەکان بوو لە ئەسکەندەریە لە سـەردەمی گـۆل قەیسەردا، دواتر نیۆڤیل بەتریکی ئەسکەندەریە کتێبخانەیەکی تریشی سووتاند.

لە مەسیحیەتدا هەر بیروباوەڕێ دەربکەوتایە نیاز پێی ڕزگاربوونی لە دەستەیەك بووایـەو لەگەڵ دەستەیەکی تردا ناکۆکی هەبووایە هەر دەبوو خوێن لەنێوانیانـدا بـڕژێ. لـە مێـژوودا نابینی دوای دەرکەوتنی مەسیحیەت باسی زانست بکرێ. ململانێی نێوان زانست و ئایینیش لـە ئـەوروپا دوای دەرکـەوتنی ئیـسلام دەسـەڵاتداری ئیـسلامی لـە ئەنـدەلوس بـوو کاتـێ ئەوروپیەکان لە جەنگە خاچیەکاندا لەگەڵ موسـڵماناندا بەریەککـەوتن، دادگاکـانی پـشکنین دانران و لە غەرناتە (کـەردینال ئەکـسمینس) نزیکـەی (هەشـت هـەزار) کتێبـی ئیـسلامی دەستنووسی سووتاند، مەسیحیەت پێی وابوو زانستە یەکەمینەکان مەترسین بۆ سەر کلێـسا بۆیە لە هەموو شوێنێ کتێبەکانی دەسووتاندن، کتێبخانـەی ئەسـکەندەریە لـە سـاڵی ٣٩٠ زایینی سووتێنرا. کتێبخانەی قوستەنتینیە لە ساڵی ٤٧٦زایینیدا سووتێنرا، لاوی لۆزریـانی کەوتە سووتاندنی ئەو کتێبانەی تر کە مابوون، ئەمەش لە ساڵی ٧٤٠ زایینیدا بوو.

لە پەیکەری ئەپۆلۆن لە شاری ڕۆما کتێبخانەیەکی ناوازەی پڕ لە کتێبی سەردەمی ئۆگەستس هەبوو کەچی سووتێنرا و خەڵکی لێ بێبەش کراو تەنها چەند کتێبێ مانەوە کە موسڵمانان زیندوویان کردنەوەو هەڵەکانی ئەو کتێبانەشیان ڕاست کردنەوەو بەرەو بنیادی ڕێبازی زانستییان بردن، ئەم ڕێبازە خەلاتی ئیسلام بوو بۆ شارستانیەتی جیهانی، ئاڕاستەکە ڕووەو ڕێبازی زانستی بوو کە تێبینی و ئەزموون لە لێکۆڵینەوەی دیاردە جوزئیەککاندا دروست دەکات تا جێ خۆش بکات بۆ باری یاسا گشتیەکان کە ڕاڤەی ڕووداوە کەونیەکان دەکەن.[١]

لە ڕێبەرانی ئەو ڕێبازە بریتی بوون لە (جابری کوڕی حەیان و حەسەنی کوڕی هەیسەم)، زانا موسڵمانەکان ڕەخنەیان دەگرت لە سەرچاوەکان و شیکاریان دەکردن و هەڵەو کەم و کورتیەکانیان نیشان دەدان و باسیان لە تێبینی زیندوو دەکردو نکوڵییان دەکرد لە لێکۆڵینەوەی دیاردە سروشتیەکاندا، ئەوان داوایان دەکرد ئەزموونی زانستی پەیڕەو بکرێ و لە لێکۆڵینەوەی ئەزموونی دیاردە جوزئیەکانەوە بچن بەرەو دانانی چەند یاسایەکی گشتی کە ڕاڤەی ئەو دیاردانە بکەن، موسڵمانان توانییان یاسا گشتیەکانی ڕاڤەکاری دیاردەکان دانێن ئەوەشیان لە بازنەی بڕوابوون بوو بەخوادا دەکرد. شارستانیەتی ئیسلامی تەنها لەسەر زانست نەوەستا بوو، بەڵکو زانست لە چوارچێوەی بیروباوەڕدا، بەهاکانی ئیسلام ڕێگرنەبوون لەبەردەم پێشەکەوتنی زانستیدا بەڵکو بە پێچەوانەوە سەرچاوەیەکی زانستی بوون. بەڵێ ئیسلام ئایینداری و ئازادی هزری پێکەوە کۆکردوەتەوە.

موسڵمانان لە هەنگاوە زانستیەکانیاندا ماوەیەکی بەرفراوانیان بڕی و توانییان هەڵەکانی ئەبۆقرات و گلینۆس ڕاست بکەنەوە، هەڵەکانی (ابن النفیس) گالینۆس کە پێی وایە تەشریح بە درۆی دەخاتەوە. موسڵمانان هەڵە پزیشکیەکانی ئەبوقرات و گەردونناسی بەتلیمۆس و دەرمانسازی دیسفۆریدس و فەلسەفەی ئەرستۆیان ڕاستکردنەوەو پشکنینیان بۆ دەکردن لە سایەی تێبینی هەستی و ئەزموونی زانستیدا لێیان دەکۆڵینەوە.

---

١- توفيق الطويل: العرب و العلم.

موسڵمانان پێش داهێنەرە ئەوروپیەکان گەیشتن بە بڕێ شت لەوانە:

**یەکەم:** کورتی هەستەکان لە هەستکردن بە هەندێ دیاردە لەبەر زۆر بچووکیان یان دووریان لە بری کورتی هەستەکان داهێنانی ئامێریان دانا کە توانای هەستپێکردنی هەبێ. (ئیبنولهەیسەم) لە لێکۆڵینەوەی بڵاوبوونەوەو ڕەنگدانەوەی تیشکدا پشتی دەبەست بە چەند ئامێرێ کە خۆی دروستی دەکردن یان خۆی سەرپەرشتی دروستکردنی دەکردن.

هەروەك (ئەبولقاسمی زەهراوی) سەدان وێنەی بڕێ ئامێری جێهێشتووە کە لە کاری پزیشکیدا بەکارهێنراون، زانا موسڵمانەکان لەبواری گەردووونناسیدا چەند تەلەسکۆپێکیان جێهێشتوون کە هاودەمن بە دەیان وێنەی چەندین ئامێرو دەزگا.

**دووەم:** گرتنەبەرو دۆزینەوەی ڕێی ئەزموونی زانستی و زانینی ڕۆڵی لە لێکۆڵینەوەی زانستیدا، ئەوان تەنها چاودێری و تۆماری دیاردەو بارەکەیان نەبوو، بەڵکو دەچوونە ڕێکردەکەیەوە تا لەباری وادا کە خۆیان بە ویستی خۆیان ئامادەیان کردبوون بکەونە تێبینیو وردبوونەوە، جابر پێی دەڵێ تەدریب ئیبنولهەیسەمیش پێی دەڵێت ئیعتیبار.

**سێیەم:** لەسەروو ئەمەشەوە گەیشتن بەوەی مەبەست لە لێکۆڵینەوە ئەزموونیەکان دانانی ئەو یاسا گشتیانەیە کە ڕاڤەیەکی کردەیی دیاردەکان دەکەن، بە گشتی ئیسلام دەستووری زانستی داناوە: بانگەواز دەکەن بۆ هەڵنەخەڵەتان بە وەهم یان قبولکردنی گومان، بانگەواز دەکەن بۆ کاری عەقڵ و پرسیار کردن لە شارەزایان و نکوڵی لە تەقلیدو ئازادی ڕوانین، دەوڵەتی ئیسلامیش ئازادی تەواوی بە زانست بەخشی و دڵنیایی بۆ زانایان و زانستخوازان دابین کرد لە کاتێکدا ئەوروپا زانایانی بە دەستەی لە ئاین دەرچوان دادەناو بەرەو دادگاکانی پشکنینی دەبردن بەتایبەت سەبارەت بە بیردۆزەی خولانەوەی زەوی کە لای زانایانی موسڵمان جێی مشتومڕ بوو کەچی کەسیان لەو ڕاجیاییەوە تووشی هیچ ئازارو دژایەتیەك نەدەبوویەوە.[1]

---

١- د.توفیق الطویل.

لە جیهانی ئیسلامیدا زانایان جێی ڕێزو بەرچاوی بوون، ئازادی هـزری ڕێـی دەدا هـەموو توێژەرێ بێ بوونی ئەگەری هەر مەترسیەك توێژینەوەی خۆی بکات، حەلاج[1] کە کەسێکی بە بنەڕەت مەجوسی بوو و سەرقاڵی فێڵ و ساختە بوو و بانگەشەی ئـەوەی دەکـرد نهێنیـەکان دەزانێت بێ ڕێگـرتن لـە کـاری خـۆی بـەدەوام بـوو تـا کاتـێ لەگـەڵ (جـەبائی) سـەرۆکی قەرمەتیەکاندا بە نهێنی ڕێککەوتنی بەسـت بـۆ لێـدانی دەوڵـەتی ئیـسلامی کـە ئەمـەش هۆکاری حەقیقی دادگایی کردنەکەی بوو.

خەلیفەکان ئەوپەڕی ڕێزیان دەنا لە زانست و زانایان، پاشا موسڵمانەکان لە بڵاوکردنەوەی زانست و هاندانی زانایان و ڕێزگرتنیاندا هەموو یەك ڕێیان دەگرتەبـەرو خـەرجی زۆریـان بـۆ دەکردو خوێندنگەو کۆگای کتێب و کتێبخانەیان دروست دەکردن، ئیتر ئەوپەڕی هەوڵیان دەدا بۆ خزمەتی زانست و زانایان.[2]

بێگومان لە ئەوروپادا زانست کاتێ پێشکەوت کە ئایین لە زانست جیا کرایەوە، بەڵام لـە ئیسلامدا سەرچاوەی پێشکەوتنی زانست خودی ئیسلام بوو کە بانگەوازی دەکرد بۆ ڕوانینـە ئاسۆکانی ئاسمان و زەوی و پشت بەستن بە بەڵگە. دەستورەکەی بـە کتێـب ناسـراوە، یەکـەم ئایەتیشی (إقرأ)ە، خوای گەورە لە سورەتێکدا سوێند بە پێنووس دەخوات.

ئەوروپا لە سەدەکانی ناوەڕاست دا تەواو دوور بوو لە زانست، دکتۆر تۆفیق تەویل دەڵێت: لەحەق دەرنەچووە هەر کەس بڵێ زانستە سروشتیەکان و فەلسەفە لە ژیانی جوولەکـەدا هـەر لە سەرەتاکانی سـەدەی دووەمەوە تا کۆتاییەکانی سەدەی سیانزەی زایینی تەنها لـە جیهـانی ئیسلامدا بوونی هەبووە، لە سایەی چاودێری و لێبوردەیی خەلیفە موسڵمانەکانەوە جوولەکـە

---

١- بەڕاستی مەسەلەی حەلاج کراوە بە بابەتێکی ڕەخنەیی لە مێـژووی ئیـسلامیدا، کەسـانێکی دەروون بەزیو یان لەخشتەبراو یان سۆزکاری ناو موسڵمانان لەمرۆدا دەچنە سەنگەری بەرگری لەو کەسـایەتیە بـێ ئەوەی ئامادە بن بە وردی بڕواننە ڕێڕەوی ژیان و هەنگاو و ئامانجـەکانی حـەلاج، بۆیـە لـە کۆتـایی ئـەم بەشەدا پاشکۆیەکمان لەو بارەیەوە داناوە. وەرگێر.

٢- عبدالوهاب عزام (الرسالة ١٩٤٤).

هەڵکەوت تا گەیشتە لوتکـە، شارسـتانیەتی ئەندەلوسـیش چـەند دەسـتکەوتێکی نایـابی پێشکەشی مرۆڤایەتی کرد. لە ڕەبزی شەرقی قورتوبەدا سەدو حەفتا ئافرەت هەبوون کـە بـە نووسینی کوفی قورئانیان دەنووسیەوە، لە ڕۆژانـی دەسـەڵاتی دووەمـی موستەنـسریەدا لـە ئەندەلوس ئەخفتا کتێبخانەی گشتی هەبوون[1]، ئەمە لە کاتێکدا لە هەموو ئـەوروپادا تـەنها چـینی بـاڵای قەشـەکان نووسـین و نووسـینەوەیان دەزانـی[2]. ئـەوروپا نـەزانی دایگرتبـوو و ئەندەلوسیش سپاردەی زانستی هەڵگرتبوو، شارلەمان و کەسانی تریش هـەوڵیان دەدا فێـری نووسینی ناوی خۆیان بن[3].

چەندین کەس شایەتی بۆ ئەمە دەدەن لەوانە فۆن کریـمـەر دەڵێـت: عـەقڵی ئیـسلامی لـە لووتکەی چالاکیدا بوو کاتێ لە بازنەی مەعریفەی ئەزموونیدا بـوو و لـە سـایەی تێبینـی و تاقیکردنەوەدا لێکۆڵینەوەی دەکرد. ئیتری موسڵمانان چالاکی و هەوڵێکی سەرسـوڕهێنەریان نیشانداو تێبینی دیاردەکانیان دەکردو ڕێکخستن و کۆکردنەوەیان بۆ دەکرد تا بەرەو ئـەزموون هەنگاو بنێن، لەبەر بوونی تێبینـی وردو بیرکردنـەوەی ڕەسـەن و داهێنـەر بۆیـە لـە بـواری بیرکاری و گەردووناسیدا چەندین سەرکەوتنی کەم وێنەیان بەدەستهێنا.

سیدیۆ دەڵێت: بزاڤی زانستی موسڵمانان تایبەتمەندی ئـەوەی هەیـە لـە زانـراوەوە بـەرەو نەزانراو دەچـوون لێکۆڵینـەوەی وردیـان دەکـرد لـە دیاردەکـانی ئاسمـان و بەرپەرچـی هـەر حەقیقەتێکی کەونییان دەدایەوە کەلە ڕێی تێبینی هەستیەوە نەچەسپێ.

(بریفۆڵت) لە کتێبەکەیدا (Making of Hwnanitiy) دەگاتە لوتکـەی ئـەو قەناعەتـەو پێی وایە هەرچی لایەنی گەشەسـەندنی ئـەوروپی هەیـە دەبـێ بنەڕەتەکـەی بگەڕێتـەوە بـۆ کاریگەری ڕۆشنبیری ئیسلامی، چونکە ئەو کاریگەریانە ڕوونترو گرنگترین لەو توانایـەی کـە هێزی تایبـەت و چەسپاوی زانـستی نـوێ هەیـەتی. قـەرزاری زانـستی ئێمـە بـۆ زانـستی

١- المعجب في تلخيص أخبار المغرب.

٢- دوزي.

٣- مونكي: شمس الله.

موسڵمانان لەوەدا نیە کە چەند دۆزینەوەیەکی سەرسوڕهێنەری چەند بیردۆزەیەکی داهێنەریان پێداین و بەس، بەڵکو زۆر زیاتر لەوە قەرزارین، خودی زانستەکەیان پێ قەرزارین. خودی زانستەکەیان پێ قەرزارین، ئەمە هەمان وتەی سیدیۆو گۆستاف لۆیۆنە، لۆیۆن دەڵێت هەرکات لە لێکۆڵینەوەی ژیاری ئیسلامی و کتێبە زانستیەکانیان و داهێنان و هونەریاندا وردەبینەوە بۆمان دەردەکەوێت موسڵمانان ماددە عەقڵ و ئەخلاقیان نیشانی ئەوروپای نوێ دا. مێژووی نمونەی وەك ئوممەتی ئیسلامی نەدیوە کە لە ماوەیەکی کورتدا هێندە بەرهەمی هەبێ.

لێرەوە دوو ڕاستی بەریەککەوتوو دەخاتەڕوو:

**یەکەم:** بەهیچ جۆرێ پەیوەندی نیە لەنێوان ژیاری نوێی ئەوروپاو مەسیحیەتدا.

**دووەم:** شارستانیەتی ئیسلامی لە ڕاستیدا خودی شارستانیەتی مرۆییە.

مسمر پشت ڕاستی ئەوە دەکاتەوەو دەڵێت: کەسی ڕۆژئاوایی کە دەبێتە زانا واز لە ئایینەکەی دێنێ، بە پێچەوانەوە موسڵمان کاتێ واز لە ئایینەکەی دێنێ کە نەزان دەکەوێ.

# باسی چوارەم

## ( بنیادی کۆمەڵگەو مرۆڤ )

بێگومان گەورەترین بەخششی ئیسلام بنیادی مـرۆڤ و ڕێزگـرتن و شـکۆدارکردنیەتی بـە ڕزگارکردنی عەقڵی بە یەکخواپەرستی و ڕزگارکردنی قەوارەی مرۆڤ لـە کۆیلایـەتی و دواتـر دانانی لە پێگەی هزری توانـاداری بنیـادو بیناسـازی و بـەرگریکاری داو پەیوەسـت کردنـی ئەرکی مرۆڤ بەرامبەر بە خواو بەرامبەر بە خۆی و بەرامبەر برا مرۆڤەکەی، ئیـسلام مـرۆڤ تەنها بـە کـائینێکی زینـدوو دانانـێ و بـەس بـەڵکو لـە پایەیـەکی بـەرزدا دایـدەنێت کـە جێگرایەتیە لە زەویدا.

ئیقبال دەڵێت: تەورات بەهۆی تاوانەکەی ئادەمەوە نەفرین لە زەوی دەکات بـەڵام قورئـان زەوی بە شوێنی سوکایەتی و سەرچاوەی قازانجی مرۆڤ دادەنێـت، ئەگـەر مـرۆڤ دارِمـا ئـەوە بەهۆی تاوانی ئادەمەوە نیە بەڵکو بەهۆی خراپەکاری خۆیەوەیە، هەر منداڵێ لەسەر حـەق و پاکی لەدایك دەبێ و دوای ئەوە هەر خەوشێ لەرِێی حەق و سەقامگیریدا هـەبێ لـە هەڵـەی پەروەردەوەیەتی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (هەموو لەدایکبوویەك لەسـەر فـیترەت لـەدایك دەبێ، دواتر باوك و دایکی دەیکەن بە جوولەکە یان مەسیحی یان مەجوسی) سەرەنجامی رۆژ بەپێی کارو کردەوەیەتی. چونکە هەموو کەسێ بەرپرسە لە سەرەنجامی خۆی، ئیسلام ئازادی هەڵبژاردنی رێی خۆی لە ئەخلاق یـان پاشەکـشەو لادان دەداتـە دەسـت مـرۆڤ، مـرۆڤ تاکـە دروسـتکراوی خوایـە کـە لەسـەر سـپاردە تـاقی دەکرێتـەوە، ئـەویش ئـازادی ویـست یـان هەڵبژاردنـە، مـرۆڤ جیـا لـە دروسـتکراوەکانی تـر تایبەتمەنـدی بیرکردنـەوەو مـشتومڕو بەرپرسیارێتی تاکەکەسی و ئەخلاقی و بەرەنگاربوونـەوەی ململانێـی نێـوان چـاکەو خراپـەو حەق‌و پووچەڵی هەیە، ئەمەش جەنگێکە بە درێـژایی هـەموو ژیـانی بەردەوامـە. بنـەڕەتی بانگـەوازی ئیـسلام بانگـەوازە بـۆ ڕزگـارکردنی مـرۆڤ لـە ئـارەزووی دەروون و کۆیلایـەتی بەندەکان. ئیسلام ڕێزێکی مرۆڤی گرتووە کە لە مەزهەب و بانگـەوازەکانی پێـشتردا نـەبوو.

نەفس کوشتن و شێواندنی جەستەی مرۆڤ لە کاتی کوژرانیدا حەرام دەکات و لە یەك تاواندا سزای کوشتنی بۆ مرۆڤ داناوە کە ئەویش تاوانی کوشتنی دەست ئەنقەستە، لەگەڵ ئەمەشدا دەسەڵاتی بۆ خاوەن کوژراو داناوەو زێدەڕەویش لە کوژراندا ناکات، لە کاتێکدا لە ئەوروپا سزای لەسێدارەدان بۆ چەندین شت بوو وەك زیناو دزی و درۆ، ئیسلام ڕایدەگەیەنێت نابێ جەستە بشێوێنرێ یا بەسەگیش بکرێ. بەو چاوە سەیری مرۆڤ دەکات کە مرۆڤە نەك بڵێ ڕەنگی یان سامانی یان ڕەگەزی وایە. بۆیە ئازادی هەڵبژاردنی کار و ئازادی ویستی بۆ مرۆڤ داناوە، بەرپرسیارێتیشی لەو کارانەو دەرەنجامی ئازادی و بەرپرسیارێتی لە پاداشتی دەخاتە ئەستۆ. بە مافی هەر مرۆڤێکی داناوە ڕای خۆی نیشان بدات، لەگەڵ ئەوەشدا ئیسلام سوورە لەسەر بەدیهێنانی بەرژەوەندی گشتی بۆ کۆمەڵگە ئەدا تاکبوونی هەر تاکێ دەپارێزرێ و بانگەوازیش دەکات بۆ پاراستن و هاوسەنگی نێوان بەرژەوەندی گشتی و بەرژەوەندی تاك، ئەمە واتە تاك ئازاد نیە چی بوێ بیکات بەڵکو لە سەرەتای ئازادی بەرامبەرەوە ئازادی ئەو تاکە کۆتایی دێ. گەورەترین بەخششی ئیسلام هاوسەنگی نێوان ماددەو ڕۆحە، مرۆڤ لە ژیاندا مافی هەیەو دەتوانێ ویستەکانی خۆی لە خواردن و خواردنەوەو جنس و ساماندا بەدیبهێنێ، ئیسلام ئەو مافەی پێداوەو برێ یاساو ڕێسای بۆ داناوە کە بۆ بەرژەوەندی مرۆڤو قەوارەو عەقڵ و ڕۆحیەتی. بەمە مرۆڤ لە هەستکردن بە بێبەش بوون یان ململانێی نێوان حەزو ڕێگریەکان ڕزگار دەکات. موحەممەد ئەسەد (لیۆپۆلدفایس) لەو بارەیەوە دەڵێت (دەبینیت لەنێو هەموو ئایینەکاندا تەنها ئیسلام ڕێ بە مرۆڤ دەدات تا ئەوپەڕی سنور چێژ لە ژیانی دنیا ببینێ بێ ئەوەی یەك چرکەسات ئاراستە ڕۆحیەکەی بفەوتێنێ، لە ئیسلامدا تاوانی بنەڕەتی بە میرات ماوە نیە، لەو پێناوەشدا پسولەی لێخۆشبوونی گشتی بۆ مرۆڤایەتی نیە، هەموو موسڵمانێ بەرپرسی دەستکەوتی خۆیەتی، ئیسلام بەڕێز و هێوریەوە سەیری ژیان دەکات بەڵام دنیاش ناپەرستێ، سەرکەوتنی ماددی پێ باسە. بەڵام ئامانجی نیە بەڵکو مرۆڤ بەرەو هەستکردن بە چاودێری ئەدەبی هەر کارێکی دەبات، ئامانج لە هەموو چالاکی کردەوەییمان بریتیە لەوەی ڕەوشتی بن).

ئەو گرنگیدانەی ئیسلام بە دەروونی مرۆیی لەلاکانی ترەوە تەواو پشتگوێ خرابوو و لە کاریگەری کڵێسا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بەسووك سەیر دەکرا، چونکە عەقڵەکانی بەرەو گومڕایی دەبردو بانگەشەی ئەوەی دەکرد مرۆڤ بە سروشتی حاڵ خراپ و تاوانبارە، پێی وابوو مرۆڤ دیدێکی شەیتانی هەیە، کڵێسا ئامانجی ئایینی هەڵگێڕایەوە لە کاتێکدا ئاین تەنها بۆ ئەوە هاتبوو متمانەبوونی مرۆڤ بەخۆی و چەسپاوی بیروباوەڕی بە ئێستا و داهاتووی پتەوبکات، لە هەمان کاتدا کە ئیسلام وەڵامی پرسیارە گرنگەکەی مرۆڤ دەداتەوە (بۆچی هاتوین؟ بۆ کوێ دەچین؟ ئیشمان لە ژیاندا چیە؟) ئیسلام بۆ ئەوە ڕێبازێکی ڕوون و کاملی بەخشیوە کە عەقڵی مرۆیی بە پێناوە سنوورداره‌کانی ناتوانێ پێی بگات با هەر جۆرە هەوڵێ لەو پێناوەدا بگرێتە بەر.

پاشان ئیسلام مرۆڤی لەو هەستەی زادەی فەلسەفە کۆنەکان ڕزگارکرد کە نێوانی دەرونی مرۆیی و قەدەر گرژ دەکەن. سەلماندیشی ئەوە شتێکی وەهمیەو مرۆڤی لە ترسی مەرگ و نەزانی ڕزگارکرد و لە بانگەواز بۆ سەرکوتکردنی حەزە جەستەییەکان و بەرگری دژ بە ویستەکانی جەستەو دەروون ڕزگاری کرد. چونکە ئەو فەلسەفانە دەیانوت دەبێ لە دنیا کەناربگرن و ڕەهبانیەت بگرنە بەر، ئیسلام ئاشکرای کرد ئەوە لەگەڵ سروشتی ژیان و فیترەتی مرۆییدا ناگونجێ بەڵکو بانگەوازی کرد بۆ پەیڕەوی ژیان بکرێ لە سنوری سورشتی خۆیاندا نەك کەناربگرین لە ژیان، حەزە جنسیەکانی بە پەیوەستی مرۆڤ زانی و دەبێ دوور لە کەمڕۆیی و زێدەڕۆیی پەیڕەوبکرێن، زێدەڕەوی عەقڵی مرۆڤ پەك دەخات و هەر سەرقاڵی ڕابواردن دەبێ و ناتوانێ بەرامبەر بە دوژمنی جەنگاوەرێکی باش بێ یان لەپێناو ڕێی ئاخیرەتدا ئیشکەر بێ، کەمڕۆییش مرۆڤ بەرەو دواێن پیسی دەکات تا لەڕێی ناسروشتیەوە پەیڕەوی نیازەکەی بکات، بەمە ئیسلام کۆمەڵگەکەی لە مۆرکی دارمان یان بێهیوایی یان لاوازی یان پەرتەوازەیی یان ڕەشبینیەك ڕزگار کرد کە لەبیری ڕۆژئاواییدا لە ئەنجامی ئەو شوێنەوارانەدا دەیبینین، هەروەك لە هەمان کاتدا کۆمەڵگەی ڕزگارکرد لە ئارەزوو و جەستەو چێژ و خۆشی پەرستن.

ڕێزگرتنی ئیسلام لە مرۆڤ لە بازنەی ئامانجێکی گەورەدایە کە بنیادی کۆمەڵگەیە، ئەگەر ئیسلام جەخت دەکاتەوە سەر دروستکردنی تاك مەبەست پێی بنیادی کۆمەڵگەیەکی تـەواوە کە لەسەر خشتی بەهێز دروست کرابێ و هەموو ئەندام و تاکێکی باوەڕداری بگرێتەوە.

قورئان وێنەری مرۆڤی نایاب و ناوازەی خاوەن پەروەردەو پێکهاتە لەسەر گوێڕایەڵی خواو نوێژو ڕۆژوو و زەکات بۆ تاکی موسڵمان دەکێشێ، ئەمەش لە دیدگای سپاردەکاری و بـەڵێن پارێزی و بەرزی و بەهێزی ڕەوشت و سـاغی بیرکردنـەوەوە، تـەنها ئیـسلام لـە چوارچـێوەی کۆمەڵدا ڕێزو چاودێری بۆ تاك نیشان دەدات و جەخت دەکاتەوە سەر ویژدانی موسڵمان و بـە تەنها بەرپرسیارێتی کاری خۆی لەسەر خۆی دادەنێ وەك لە قورئاندا هـاتووە ﴿وَلاَ تَـزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾ ﴿كُلُّ امْرِئٍ بِمَا كَسَبَ رَهِينٌ﴾. دواتر ئەو نمونەیە لە چوارچێوەی کۆمەڵگەدا دادەنێ ﴿وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ﴾ ئیسلام لەگەڵ ئەو ڕەوت و بڕوایـەدا نیـە کـە دەڵێت گرنگی بێسنور بدەن بە تاك، هەروەك لەگـەڵ ئـەو ڕایـەدا نیـە کـە وێنـەی تـاك لـە کۆمەڵگـەدا لـەناو بـرێ چـونکە لـە هـەمان کاتـدا ئەنـدامانی کۆمەڵگـە بەرهەمەکـەی و هەموویشیان بانگەوازی خوا کۆیان دەکاتەوە، بۆیە بێ ئیجتیهـادی نـاوخۆیی یـەك ئامـانجی لەناو موسڵماناندا هەیەو باوەڕداران پێکەوە دەبەستێتەوەو هەموو ئاسـایی یەکدەسـت و وەك یەك کەس دەنەونە کارەکەیان ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَإِذَا كَانُوا مَعَهُ عَلَى أَمْرٍ جَامِعٍ لَمْ يَذْهَبُوا حَتَّى يَسْتَأْذِنُوهُ﴾.

عامری ئەو چەمك و واتایە دەخاتە ڕوو و دەڵێـت ئیـسلام گرنگیـەکی گـەورە دەدات بـە مرۆڤ وەك تاکی ناو کۆمەڵگە، جەخت دەکاتەوە سەر پێویـستی بـە پێـشکەوتنی بـەردەوام، بەمە هەموو توانا بەهێزەکانی (فکری و عەقڵی و کرداری) ڕزگار دەکات تا لـە خزمەتێکـدا وەك مرۆڤێ پێشکەشی بکـات و بـۆ خزمـەتی کۆمەڵگـەش وەك گـشتێکی بـێ ڕێـدان بـە بەربەستی بەردەمی لێ بنەوێ بەتایبەتی گرفتی چینایەتی کە لە چینی کۆمەڵایەتیدا بەسـەر مرۆڤدا دەسەپێنرێ نەك لەسەر بنەمای تواناکانی و ئاسـتی پێـشکەش کردنـی خزمـەت بـە کۆمەڵگە.

لێرەدا ئیسلام لە زەردەشتی و مەجووسیەت جیا دەکرێتەوە، چونکە پاشا فارسەکان بە کاریگەری ئایینەکەیان خەڵکیان دابەش دەکرد بۆ چەند چینێ و بەپێی ڕەچەڵەك بڕیاریان لەسەر دەدان نەك لەسەر بنەمای کارکردن. ڕێگەشیان لێ قەدەغە دەکردن کە لە چینێکەوە پێشکەون بۆ چینێکی تر، بەمە چەندین وزەو تواناییان پەکخست و ڕێیان نەدا کارو داهێنانیان هەبێ چونکە لەسەر ڕەوتی زانست و داهێنان دایانالێ.

ئیسلام پێی وایە شەرەف و گەورەیی ڕێژەیین و هەر تاکێکی کۆمەڵگەی ئیسلامی بەپێی بەرپرسیارێتی سەر شانی لەسەر ئامانجێکی ڕوون و شیاوی گوێڕایەڵی و ڕێزگرتنە، ئەو ئامانجەش دامەزراندنی کۆمەڵگەیەکی یەکانگیرە کە خۆشەویستی و هەواداری بەسەریدا زاڵ بێ و تیایدا دوژمنایەتی و پەیوەندی پچڕاندن حەرام بێ.

بۆیە ئیسلام هەواداری بۆ ڕەچەڵەك دەپارێزێ و بە واجبی دەزانێ لەگەڵ ئەوەدا هەواداری بۆ بەڵێن و بۆ ئایین بپارێزێ، هەروەك لاوازانی کۆمەڵگە دەپارێزێ کە لە ڕووی پێکهاتەوە ژنانن و لەڕووی تەمەنەوە هەتیوان و لەڕووی بژێویەوە هەژاران و لەڕووی پلەوە کۆیلەکانن، لە ڕوانگەی ناو کۆمەڵگەیەکی تەواوو کامڵ هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکرێ.

بێگومان گەورەترین بەخششی ئیسلام ئەو بنەمایەیە کە کۆمەڵگەی ئیسلامی منداڵانی پەککەوتوان و لاوازو هەژاران بە تەواوەتی دەگرێتە خۆو وەك کۆمەڵگەکانی تر داوا ناکات لاوازو نەخۆش و هەژاران ڕیشەکێش بکرێن و سۆپەرمان دابمەزرێنن بەڵکو ئیسلام هەموویان دەپارێزێ. ئیسلام کۆمەڵێ بەهای پێشکەشی مرۆڤایەتی کردووە وەك: حەق، دادپەروەری، ڕەحمەت و سۆز، لێبوردن، لەخواترسان، چاکە، چاکەکاری، ڕاستگۆیی، خۆڕاگری، فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە، دەستگرۆیی و تێکەڵی، چەندین مافیشی داوە بە مرۆڤ لەوانە ژیانی ئازاد، یەکسانی کارکردن، برایەتی، زانست، موڵکداری.

کۆمەڵێ سنوریشی بە قەدەغە داناوەو سزای بۆ داناوە: سوو، زینا، کوشتنی مرۆڤ، مەی خواردنەوە، دزی، ئیسلام چەند نیزامێکی چەسپاوی داناوە کە بریتین لە سیستمی خێزان، سیستمی میراتی، سیستمی تاوانەکان، سیستمی ئاشتی و جەنگ، سیستمی کڕین و فرۆش،

هەموو ئەو سیستمانەی لە چوارچێوەی ئەخلاقدا داناوە، ئیسلام وەك بیروباوەڕو شەریعەت و ئەخلاق تەواو جیانەبووەوەیە، لەو پێناوەشدا کۆمەڵگەی ئیسلامی وەك گرێیەکی بەشداری و یەکانگیری نێوان تاکە بەهێزو لاوازو دەوڵەمەندو هەژارەکانی پێکهاتووە، هاندانیشی هەیە بۆ چاودێری هەموویان بەوەش دژی بیردۆزەکانی ڕەگەزی نایاب و کوشتنی نەخۆش و هەژاران وەستاوە، جوانترین وێنەش بۆ وەسفی پەیوەندی کۆمەڵگە بە تاك و تاك بە کۆمەڵگەوە هەمان ئەو وێنەیەیە کە پێغەمبەر ﷺ نیشانی دا: کۆمەڵێك لە دەریادا لەسەر کەشتیەك سوار بوون، دواتر یەکێ لەوانەی لە قاتی خوارەوە بوون ویستی بۆ هەڵگۆزینی ئاو کەشتیەکە کون بکات، ئەگەر هەمووان وازی لێ بهێنن هەمووانی ناو کەشتیەکە دەخنکێن، ئەگەریش ڕێی پێبگرن کەشتیەکە ڕزگار دەکەن و هەمووان ڕزگار دەبن.

ئیسلام بەرامبەر بیرۆکەی بەختەوەری بیرۆکەی تەقوا دەخاتەڕوو وەك چۆن بەرامبەر بە بیرۆکەی خۆشگوزەرانی بیرۆکەی خۆبەخشین پێشکەش دەکات.

ئەرکی مرۆڤ لە ژیاندا = کارو ئامانجی کار = بنیادی زەوی

سنوری کار لەخواترسانە بە مەرجێ کاری جێگرایەتی بێ نەك مولکداری، هەمووکاریش لە پێناو خوادا بیرۆکەی حەق لەلایەن ئیسلامەوە بە مرۆڤایەتی دەبەخشێ.

بیرۆکەی حەق بنەمایەکی بنەڕەتیە کە ئیسلام بەرامبەر بە ئارەزوو و چەقبەستوویی و تەقلید و میراتی پووچی باوو باپیران هێنای، بەرامبەر بەو ڕایەی کە لەسەر گومان دامەزرابوو، ئیسلام داوای بەڵگە دەکات و بانگەواز دەکات بۆ ڕەخنەو لەبێژنگ دان، بەو جۆرە بانگەوازی ئیسلام بۆ ڕزگارکردنی مرۆڤە لە هەر گرێیەك جگە لە یەکخواپەرستی و سەرکەوتن بەسەر پووچەڵی یان پەنابردنە بەر کەس و بت و داروبەردو شیرك و سووککردنی مرۆڤایەتی.

ئیسلام مافی ژیانی داوە بە مرۆڤایەتی، خوای گەورە ژیانی داوە بە مرۆڤ ئیتر مافی هەر تاکێکە چێژ لە ژیانی وەربگرێ. لێرەوە کۆتایی هێنان بە ژیان دەبێتەنها بۆ خوابێ ﴿وَلاَ تَقْتُلُواْ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ﴾.

ئیسلام هەوڵی لەناوبردنی ژیانی پووچ کردوەتەوە کاتێ لەپێش ئیسلامدا خۆکوشتن یان کوشتنی منداڵ لەترسی هەژاری یان لە زیندەبەچاڵ کردنی کچ لە ترسی حەیاو ئابڕوو هەبوو. ئیسلام چواردە سەدە لەمەوبەر جەختی کردووەتەوە لەسەر مافی مرۆڤ لە ژیاندا، پێش ئەوەی رۆسۆ و جۆن لوك و هۆبزو کۆندرسیەو جیفرسۆن بڵێن مرۆڤەکان بە یەکسانی دروستکراون، بەڵکو ئەو وتەی ئەوان لە بنەڕەتدا لە قورئانەوە وەرگیراوە، هەروەك ئیسلام مافی ئازادی بە مرۆڤایەتی بەخشیوە. ئیسلام ئایینی ئازادیە نەك ئایینی خۆسەپێنی ئازادی مرۆڤ لە هەڵبژاردن و عەقڵ لەگەڵ ویست و توانای خواییدا ناتەبا نین.

ئازادی[1] بریتیە لە: ئازادی بیروباوەڕ، ئازادی زانستی، ئازادی سیاسی، ئازادی مەدەنی، ئازادی کۆمەڵایەتی، هەروەك مافی یەکسانی پێکداوە، یەکسانی لە ئیسلامدا بنەمایەکی سەرەکی و حەقیێکی سروشتی مرۆڤە، خوا هەموو مرۆڤەکانی دروست کردووەو هەموویشیان لەبەردەم خوادا یەکسانن، هیچ جیاوازیەك لە نێوانیاندا نیە جگە لە کاری چاکەو تەقوا نەبێ ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾ پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت (بەڕاستی پەروەردگارتان یەکەو باوکیشتان یەکە، هەموو لە ئادەمن و ئادەمیش لە خۆڵە، بەڕێزترینتان لای خوا لەخواترس ترینیانە، عەرەبێ بەسەر عەجەمێکدا یان عەجەمێ بەسەر عەرەبێکدا و سووریێ بەسەر سپیەکدا و سپیەك بەسەر سوورێکدا هیچ فەزڵێکی نیە جگە بە تەقوا) ئیقبال دەڵێت: ئیسلام بتی خوێن و ڕەنگ و ڕەگەزی تێکشکاند.

لویس ماسینیۆن دەڵێت: ئیسلام هێندە توانای هەیە بتوانێ هەوڵ بدات بۆ بەدیهێنانی بیرۆکەی یەکسانی، لە کۆمەڵگەیەکی تردا نمونەی وەك نمونەی ڕابردووی ئیسلام نیە کە تەواو

---

١- مەسەلەی ئازادی ڕادەربڕین لە ئیسلامدا پرسێکی تەواو هەستیارە و ناحەزانی ئیسلام زۆر دژ بە موسڵمانان بەکاری دەهێنن و مێژووی ئیسلام و موسڵمانان بە مێژوویەکی خۆسەپێنی دەمکوتکەر باس دەکەن و بەجۆرێ دەیخەنەڕوو زۆربەی خەڵك تەنانەت هەوادارانی ئیسلامیش زۆر خێرا پێی لەخشتەبراون، ئێمەش بەپێویستمان زانی لەو بارەوە لە کۆتایی ئەم بەشەدا پاشکۆیەك دابنێین (ئازادی ڕادەربڕین لە مێژووی ئیسلامیدا). وەرگێڕ.

سەرکەوتوو بوو لە یەکدەنگکردنی ئەو هەبووە گەلە جیاوازەدا و بە یەکسانی ماف و ئەرك و یەکیخشتن.

ڕاین ئینج دەڵێت: ئیسلام بەجۆرێ توانی بەسەر دەمارگیری ڕەگەزیدا زاڵ بێ کە هیچ ئایین یان بیروباوەڕێکی تر نەگەیشتووە بەوە.

تۆینبی دەڵێت: سەرکوتکردنی دەمارگیری ڕەگەزی و دیدی ڕەگەزپەرستی لەنێو موسڵمانان‌دا گرنگترین دەستکەوتی ژیاری ئیسلامە.

ئیسلام بۆ مرۆڤایەتی دادپەروەری بە خەڵات هێنا، ئیتر هەمووان لەبەردەم خواو یاسایدا یەکسانن، هیچ جیاوازیەك نیە لەنێوان فەرمانڕەواو هاوڵاتی و هەژارو دەوڵەمەندو نزیك یان دوژمندا ﴿فَاحْكُم بَيْنَ النَّاسِ بِالْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ الْهَوَى﴾ ﴿وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلاَّ تَعْدِلُواْ اعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى﴾.

ئەمەش بەڕوونی لەو دەستەواژەی پێغەمبەردا ﷺ دەرکەوتووە (بەڕاستی ئەوانەی پێش ئێوە بەوە لەناوچوون ئەگەر لەنێویاندا کەسی خانەدان دزی بکردایە وازیان لێ دەهێنا، وە ئەگەر کەسی لاواز لەنێویاندا دزی بکردایە حەدیان لەسەر پەیڕەو دەکرد، ئەرێ بەخوا ئەگەر فاتیمەی کچی موحەممەد دزی بکات موحەممەد دەستی دەبڕێت).

شەریعەت دادپەروەری خوایە لەنێوان بەندەکانی خواداو ڕەحمەتی خوایە لەنێو دروستکراوانیدا. لە بەراوردی ئایینەکاندا یەکێ لە گەورەترین بەخششەکانی ئیسلام بریتیە لە ئەخلاق لەڕووی کردەییەوە نەك لەڕووی نەزەریەوە، چونکە دابەشکارێکی هاوبەشی بە هەموو بەهاو هەڵسوکەوتەکانەو بە واتای ئیسلام تەواوکاری ئەو ڕەوشتە بەرزانەیە کە پێشتر مرۆڤایەتی فێریان بووە (إنما بعثت لأتمم مكارم الأخلاق).

لێرەوە ڕێبازی ئەخلاق لە ئیسلامدا جیایە لە ڕێبازی ئەخلاقی یۆنان و ئەخلاقی مەسیحیەت، ئیسلام مانەوەی ئەخلاق و پەیوەندی بە تاکەوە دادەنێت و ئایین و ئەخلاق دەکاتە دوو ڕاستی لە یەك جیا نەکراوە. لێرەدا جیاوازیەك نیە لەنێوان بیردۆزەو ئاکاری کردەییدا، ئەخلاقیش تەنها لە چوارچێوەیەکی ڕەسەنی بیروباوەڕی لێجیانەبووەدا دەجوولێ.

ئیسلام بەرپەرچی ئەو بیرۆکەیە دەداتەوە کە دەڵێت مرۆڤ کوڕی ئارەزووەکانیەتی، بەڵکو کوڕی بیروباوەڕیەتی. ئیسلام بە شێوەیەکی ڕیشەیی مرۆڤەکان و مۆرك و نەریتی خەڵکی گۆڕی و توانای گۆڕینی دەروونەکانی لەلایەن بیروباوەڕی دروستەوە سەلماند. لە ئیسلامدا ئەخلاق لە ڕەگەزێکی چەسپاوەوە دەردەکەوێ کە خودی قەوارەی مرۆڤە نەك لە گۆڕانکاریەکانی کۆمەڵگە یان پێشکەوتنەکانی شارستانیەتەکان بێ.

لە ئیسلامدا مرۆڤ تاك و جیاکراوە لە ئاژەڵەو پێوەری جۆربەجۆری بۆ هەیە. مۆرکی چەسپاوی سەبارەت لە شەریعەت و ئەخلاقدا بنەڕەتێکی پتەوی توانای مرۆڤە بۆ بەرەنگاربوونەوەی گۆڕانەکان، یاساکەش ئەوەیە یاساکانی خوا گۆڕانیان بۆ نابێ و ئەنجامی بارو کەشێکی ئاوو هەوایی یان ئابووری نین و لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر یان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر ناگۆڕدرێن، خوا دەفەرموێت ﴿فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ اللَّهِ تَبْدِيلاً وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ اللَّهِ تَحْوِيلاً﴾.

ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی نەگۆڕاوی مرۆڤ. حافیزە مرۆییەکانی ئەمڕۆ هەمان ئەوانەی سەرەتای ژیانی مرۆیین، ئارەزووەکانیش کە نێوەندی کاری مرۆڤن تا ئەمڕۆش وەك جاری یەکەمیان ماونەتەوە، بە هەمان شێوە سیفەتی ئیسارو ئابڕوو و ڕاستگۆیی و دلێری تا ئەمڕۆ ماونەتەوە.

لەمەدا ئیسلام لە ئایینە ئەخلاقیەکانی بووزاو بەرهەمی جیاوازە، ئەو ئایینانە لەسەر ویژدان و ئەخلاق و کاری چاکە دامەزراون، بەڵام کێشەی گەورەی بوونیان چارەسەر نەکردووەو لایەنی باڵای دەروونی مرۆییشیان تێر نەکردووە کە لایەنی شارەزابوونە لەو نهێنییە گەورەی لەم بوونەدا شاردراوەتەوە، هەندێ لەو خەڵکە تاویان دابووە بتپەرستی و جانەوەرپەرستی و هێزە ماددی و ڕۆحیەکانیان دەپەرستن و لەنێوان هێماو لێڵی و خەیاڵات و لادانی پڕوپوچدا لە فەوتاندا بوون، بەوەش عەقڵ و مرۆڤایەتی خۆیان لەبەردەم خواوەندە بەردو دارو مانگاو مارو قۆلانچەکانیاندا لەدەست دەدەن.

بەڵام ئیسلام بیروباوەڕ دەبەستێتەوە بە ئەخلاقەوەو بزاڤی ئەخلاقی لە چوارچێوەی بیروباوەڕدا دادەنێت. ئیسلام کە ئایینی پەرستش و دروشم و فەرزە دانراوەکانە لاوازی مرۆیی بەتەواوی دەزانێ کە زۆربەی زۆری خەڵك لاوازن، بۆیە بنەڕەتی دەرچوون لە شوێنکەوتنی ئایین لە ڕەوشت یان ئاکار راستاڵیدا دانانێ بەڵکو لە داننان بە خوای تەنهاو دەسەڵاتی لە بووندا و داننان بە شەریعەتی لە ژیاندا دەکاتە بنەڕەت. ئیسلام بیروباوەڕی داناوەو هیچ لادانێکیشی بۆ قبووڵ نەکردووە چونکە بیروباوەڕ لە ئاییندا بنەڕەتە، بۆ لێخۆشبوون لە تاوانەکان چەندین ڕێوشوێنی داناوە، بنەڕەتی کارو پاداشتی داناوە بە داننان بە دروستکەری و تەنهایی خواو گەیشتنەوە پێی لەڕۆژی پاداشت وەرگرتنەوەدا، ئەخلاقی ئیسلام ئەخلاقی تەقوایە نەك ئەخلاقی بەختەوەری، تەقواش لە خۆپارێزییەوە هاتووە بە واتای شەرعی پاراستنی دەروونە لە ترسانەکان، بەپێی شەرع واتە بەجێگەیاندنی فەرمانی خواو دورکەوتنەوە لە قەدەغە کراوەکانی. بێگومان ئەخلاق فیترەتێکی مرۆڤە کە خوا بۆی داناوە، مرۆڤ تاکە دروستکراوێکە لەگەڵ ویستی دژایەتی حەزو ئارەزووەکانی و ڕێکخستنی بارو پاڵنەرەکانی و زاڵ بوون بەسەر ئارەزووەکانی و کەنارگرتن لەزۆر باری حەزەکانی و دەرچوون لە واقیعی خۆی و چوون بەرەو ئەوەی پێویستە لەسایەی نمونەی باڵادا هەبێ و لە دروستکراوانی تر جیای بکاتەوە خێرا دەتوانێ خۆی داماڵێ.

بەختەوەری لە واتای ئیسلامدا جیایە لە واتای ئایینەکانی تر، چونکە ئیسلام بەختەوەری لە دنیاو دوارۆژیشدا داناوەو وەك مەسیحیەت نیە تەنها لە ڕۆژی دواییدا کورتی بکاتەوە. ئیسلام لەگەڵ ئەوەی سوورە لەسەر بانگەواز کردن بۆ ڕۆژی دوایی و ڕازاندنەوەی بۆ خەڵك هاوکات دنیای پشتگوێ نەخستووەو دەقی پێویستی چێژوەرگرتن لە خۆشی و کەیفە ڕەواکانی ژیان پشتگوێ ناخات. پێی وا نیە بۆ بەختەوەری دەبێ دژی جەستە بجەنگی و ئارەزووەکان ڕیشەکێش بکەیت وەك دەستەی کەلبی و ڕەواقیەکان ئەو بانگەشەیان دەکرد، هەروەها بەختەوەری نەکردووە بە کەیف و خۆشیەك بۆ چێژەکانی دنیاو بەدیهێنانی بەرژەوەندییەکان و بەس وەك ئەوەی لە کۆندا قۆریناییەکان و لە سەردەمی نوێشدا بانگخوازانی سوودگیری

بانگەشەی بۆ دەکەن. بەڵکو ئیسلام دنیاو دوارۆژ پێکەوە کۆ دەکاتەوە و ڕێزی داواکاریەکانی ڕۆح و جەستەش دەگرێ بە مەرجێ لە سنوری میانەڕەوانەی خۆیان دەرنەچن، خوا دەفەرموێت ﴿وَابْتَغِ فِيمَا آتَاكَ اللَّهُ الدَّارَ الْآخِرَةَ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ الدُّنْيَا﴾.

دکتۆر تۆفیق تەویل چیرۆکی ململانێی نێوان فەیلەسوفان و ئایینەکان لەسەر بەختەوەری باس دەکات، دەستەیەك لە ژیاندا وێنای دەکەن کە تیایدا عەقڵ زاڵە بەسەر هاواری هەستداو دیدی تیایدا ڕۆدەچێ تا ئاستێ پێیان وایە کەماڵی بەختەوەری بەنانەوەی جەنگێکی سەختی نێوان عەقڵ و جەستیەوەو بە ڕیشەکێش کردنی حەزەکان کۆتایی دێ. دەبێ حەزەکان زیندەبەچاڵ بکەیت و ئارەزووەکان سەرکوت بکرێن و دژی هەست و سۆزو ویژدانەکان بجەنگیت تا مرۆڤ وەك ڕۆحێکی بێ جەستە یان عەقڵێکی بێ ماددە دەربکەوێ و ژیانێك دروست بکات لەسەر دنیانەویستی و سەخت ژن و حیرمان دامەزرابێ (لەوانە کەلبی و ڕەواقیەکان و کاست) دەستەیەکی تر بەختەوەری وا دەنوێنن کە ژیانێکی پڕ چێژو ئارەزوو بێت و تیایدا بەرژەوەندی تاك وەك جەستەیەکی بێ ڕۆح دەربکەوێ، بە ئاشکرا هاوار دەکات هاواری جەستە دەنگی سروشتە، نەفامیە مرۆڤ شەرم لە ویستەکانی بکات، هەیانە گاڵتە دەکات بەو نمونە باڵایانەی کەسە میسالیەکانی کۆمەڵگە بانگەوازی بۆ دەکەن. ئەوان جەخت دەکەنەوە سەر ئەوەی غەیریە خودگەراییەکی ڕازیکەرەو مەبەست لە ئەخلاق بەختەوەرکردنی کۆمەڵگەیە، ئەو دەستە ئارەزوو ویستە ئارەزوو و چێژ و خۆگێلکردن لە بانگەشەی میسالیەکان کە بە واجب ناوی دەبەن دەگرنە بەر (بنتام دواتر فرۆیدو سارتەر) ئەمەش هەوڵی جەستەی بێ ڕۆح یان ڕۆحی بێ جەستەیە، ژیانێکی تەواو ڕۆحی یان ژیانێکی تەواو ماددی. ئیسلام جەخت لە هەڵەی هەردوو ئاڕاستەکەدا دەکاتەوە چونکە سروشتی مرۆیی لەو لادانەوە دەست پێ ناکات کە بە نەخۆشی دادەنرێ لە کاتێکدا وەك گشتێکی تەواو کۆکەرەوەی عەقڵو جەستە دەردەکەوێ و پێویست ناکات بەزاڵکردنی عەقڵ بەسەر هاواری جەستەو زاڵکردنی هاوارای جەستە بەسەر دەسەڵاتی عەقڵدا، دژایەتی جەستە بەسەر کوتکردنی ویستو حەزەکان و ڕیشکەکێشکردنی ئارەزووەکان بە چەند گرێیەکی دەروونی و بارگرژیەکی

دەمارگیری کۆتایی دێت. نزیکترین ڕایەك لە ڕاستیەوە نزیك بێ ئەوەیە مرۆڤ بە ڕێنمونی عەقڵی ویستەکانی جەستەی ڕێکبخات بێ ئەوەی هەوڵبدات ئەو لایەنە هەستیەی بکوژێت کە بەشێکە لە سروشتی.

بۆیە ئیسلام بانگەواز دەکات بۆ تەواوکاری نێوان ڕۆح و ماددەو عەقڵ و جەستەو هەوڵدان لەپێناو دەستگرتن بە بنەماکانی ئیمان و ئەخلاق و بەدیهێنانی حەزەکانی دەروون و هاودەم بەوەش دەرنەچوون لە سنووری دادپەروەری و میانڕەوی و لە چوارچێوەی ئەو ڕێسایانەدا کە ئاین دایناون، ئیسلام بەرزڕاگرتنی یەکێ لەو دوانە بە هەڵەو کەموکورتی دادەنێت بەڵکو بانگەوازی بۆ ئەوەیە بەڕێزانەو دادپەروەرانە ئەو دوانە یەکبخرێن.

شەریعەتی ئیسلامی لە فیترەتەوە هاتووە و لەگەڵ عەقڵ و سروشتی مرۆییدا دەگونجێ و سوورە لەسەر هاوسەنگ ڕاگرتنی مافەکانی نێوان تاك و کۆمەڵ و مەوزوعیەتی حوکمەکان و خۆدامالین لە دەمارگیری و سۆزداری و ئارەزوو و خزمانە بڕیاردان و سوورە لەسەر بیرۆکەی دادپەروەری و حەقی ڕەها، هاوکات بۆ هەموو سەردەم و بارە گۆڕاوەکان نەرم و گونجاوە.

تەشریعی ئیسلامی بەرژەوەندی دنیاو دوارۆژ پێکەوە کۆدەکاتەوەو ئەوەش بە بنەڕەتێکی ئیسلام دادەنێت، هەروەك ئاین و دەوڵەت پێکەوە کۆدەکاتەوەو بەهیچ جۆرێ ناکرێ دین و دنیا لە یەك دوور بخرێنەوە.

ئەمە بنەڕەتێکی تەواو چەسپاوی ئیسلام و گرنگترین پایەیەتی و پێناوێکی جیاکردنەوەی ئیسلامە لە ئاینەکانی تر کە تەنها ڕوویان لە بیروباوەڕیان تەنها ڕوویان لە ئەخلاقە.

کاتێ ئیسلام شەریعەتێکی هێناوە (بۆ ڕێکخستنی کاروباری ژیان) بۆیە سروشتیە گرنگی بدات بە دامەزراندنی دەوڵەت و حکومەتێ کەلەسەر پەیڕەوی ئەو شەریعەتە دامەزرابێ ﴿أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْماً لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾ بوونی شەریعەت دەبێ هێزێکی هەبێ بۆ جێبەجێکردنی، لە قورئاندا چەندین ئایەتی ڕوون هەن کە بەڵگەی ئەوەن ئیسلام لەپاڵ ئەوەیدا بیروباوەڕ یان ئاینێکە هاوکات دەوڵەتیشە، خوا دەفەرموێت ﴿إِنَّا أَنزَلْنَا

إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ بِمَا أَرَاكَ اللّهُ﴾ ﴿فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّىَ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ﴾.

پێغەمبەر ﷺ لە مەدینەدا دەوڵەتێکی دامەزراند کە مەرج و پایەکانی دەوڵەتی لەخۆدەگرت پێغەمبەر ﷺ هێڵە گشتیەکانی دەوڵەتی ئیسلامی بەتەواوی دانا (ڕێکخستنی کارگێڕی و یاسایی و سەربازی). ئیسلام چەند بنەمایەکی تایبەتی دانا وە کە پەیوەستن بە نیزامی دەسەلاتەوە، لەوانە شوراو یەکسانی و ئازادی و دادپەروەری، ئیسلام لە کۆمەلگەی خۆیدا لەسەر بنەمای داوای شان و شکۆ ژیان دادەمەزرێنێ. موحەممەد عەبدە دەڵێت: هەرکەس بڕوانێته بنەڕەتی ئەم ئایینە (ئیسلام) و هەرکەس سورەتێکی قورئانی پیرۆز بخوێنێتەوە بەبێ گومانی بڕیاری ئەوە دەدات ئەوانەی بڕوایان بە ئیسلام هەیە دەبێ یەکەم ئوممەتی جەنگی سەرزەوی بن و پێش هەموو گەل و تاقمەکان پێناوی جەنگی دابهێنن و بە چاکی زانستە سەربازیەکان بزانن، هەروەها زۆر ڕۆبچن لەو زانستە پێویستانەی ئەو بوارەدا (کیمیاو بیرکاری و ئەندازیاری) خوا دەفەرموێت ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ﴾.

بەلام مەسیحیەت لەسەر بەرێکردن و پشتگوێ خستنی هەموو شتێ دامەزراوەو هاتووە تا تۆڵە سەندنەوە نەهێڵێ و واز لە دەسەلات بێنێ و دنیا پشتگوێ بخات و بە واجبی ملکەچی دەسەلاتێ بێ کە زاڵە بەسەر مەسیحیەکاندا، هەروەها وازبێنێ لە سامانی سوڵتانەکان بۆ خۆیان و دوور بکەوێتەوە لە ململانێی شەخسی و ڕەگەزی و ئایینەکانیش. لە وەسیەتەکانی ناو ئینجیلدا هاتووە هەر کەس زللەیەکی دا لە لایەکت ... ئایینی مەسیحی بە ئاشتەوایی و ڕێککەوتن لەگەڵ مەزهەبی عەقڵی شانشینە ئەوروپیەکان هات و لەڕێی قەناعەت پێکردن و ئەندێشە دزیەوە چووە ناو دەسەلاتانە نەك لەڕێی هێزو تواناوە، بۆیە وەك ئەوان مایەوەو ئەوەی لێ دانەماڵین کە لە ڕابردوویانەوە بۆیان مابوویەوە[1].

لەم ڕوانگەوە دەڵێین ئیسلام ئاین و دەوڵەت و ڕێبازی ژیانیشی، بەلام ئیسلام سوورە لەسەر ئەوەی دامەزراوەیەکی نەبێ بەناویەوە یان لەبریدا یان بە وەکیلی لە پیاوێکی ئایینی

---

١- محمد عبده: الأسلام و النصرانية.

یان کەسی ترەوە قسە بکرێ ئیسلام کاهینی و نێوەندی نێوان خواو بەندەی نیە، لە ئیسلامدا ئەو شتە نیە کە کەسانێ بە دەسەڵاتی ئایینی ناوی دەبەن، چونکە هەموو موسڵمانێ دەتوانێ لەڕێی قورئان و سوننەتەوە لە خواو پێغەمبەرەکەی تێبگات بێ ئەوەی هیچ نێوەندێ هەبێ، بەڵکو پێویستە پێش ئەوە پێناوی پێویستی تێگەیشتن بەدەست بهێنێ. موسڵمانان بە دەسەڵاتی پێغەمبەریان نەدەوت پاشایەتی بەڵکو بە ئیمامەت ناویان دەبرد، بۆ خیلافەتیش وا تێگەیشتون کە لەبری پێغەمبەر ﷺ پاسەوانی ئاین و سیاسەتی دنیا دەکات. مێژوو بۆمان باس دەکات دەسەڵاتی خۆسەپێنی پاپاو پیاوانی تری ئایینی کڵێسا تا چ ئاستێ چووە، هێندە دەسەڵاتیان هەبوو کە لە دەوریاندا دەسەڵاتێکی تر نەبوو هاوئاستیان بێ یان بتوانێ دەسەڵاتی پاپاکان لە سنوری خۆیاندا بوەستێنێ.

فیشەر لە کتێبەکەیدا (مێژووی ئەوروپا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ج١) دەڵێت: پیاوانی ئایینی بۆ دەوڵەت و بنەڕەتی دەسەڵات هیچ فەلسەفەیەکیان نەبوو بەجۆرێ سووکە گۆڕانکاریەکیان کرد لە سیاسەتی ڕۆمانی یان کۆمەڵگەی ڕۆمانیدا، چونکە ئەوان دڵنیابوون لە ساختەیی ژیانی دنیاو بە خراپ زانینی و پێیان وابوو مرۆڤ دەرکراوی بەهەشتی هەتا هەتاییەو سزای سەختی بەسەردا سەپاوەو ئەم دنیایەش خێرا ئاوا دەبێ مادەم بارەکەش وایە ئیتر چی وا دەکات کەسی مەسیحی کۆیلایەتی لەکار بخات یان جەنگ و سوو یان بەکارهێنانی هێزی ڕەق لەکار بخات کە هاریکاری دەوڵەتی ڕۆمانی بوو بۆ ڕاوەستان مادەم ژیانی دنیا ئاوا دەبێ بۆیە دەبێ هەمووی پشتگوێ بخرێ.

ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە مەسیحیەت ئاین و دەوڵەت لەیەك جیا دەکاتەوە، بۆیە ناتوانێ کاریکات لەسەر چاکسازی ناو کۆمەڵگەی ڕۆمانی، ئەمەش سەرچاوەی ئینشیتاری گشتی ناو هزری ڕۆژئاوایە. لە ئیسلامدا ئایەتێ یان دەقێ یان وتەیەك نیە بەڵگە بێ بۆ جیاکردنەوەی دنیاو دوارۆژ و دەوڵەت و دین لەیەکتر بەڵکو بە پێچەوانەوە ئیسلام بنەمای تۆڵە (قصاص) و بنەمای جیهادی داناوە[1].

---

١- عبدالحميد متولي: حملة القانون والأقتصاد، سنة ١٩٦٤.

هەروەها ئیسلام لەسەر بنەمای بازرگانی و بەخشین کۆمەڵگەی دامەزراندووە لەبری ئەوەی لەسەر بنەمای سوو و هەڵگرتنی سامان دایمەزرێنێ. تەوای کردووە بە بنەڕەتی ئەخلاقیەتی بازرگانی و هەڵسوکەوت و نیزامی زەکات و میراتیشی داناوە بۆ تەسفیەی هەڵکشانی سامان و ڕێ نەدان بە دامەزراندنی دەوڵەتی دەوڵەمەندان.بەم جۆرە کۆمەڵگەی لە مەترسی قۆرخکاری پاراستووەو هاوسەنگی بازرگانی پاراستووە، هەروەك بانگەواز دەکات بۆ تەزاموونی کۆمەڵایەتی و زەکاتی کردووە بە دامەزراوەی دەستگرۆیی و موڵکیەتی تایبەتیشی پاراستووە، سوو و قۆرخکاری حەرام کردووە. ئازادی ئابووری خاوەن ڕێسای ئەخلاقی داناوەو کاری کردووە بە بنەڕەتی سامان و دەوڵەمەندی ئیسلام ڕێ نادات جیاوازی گەورە هەبێ لەنێوان سامان و داهاتدا و دانیش نانێ بە چینایەتیدا.

ڕێبازی ئابووری ئیسلامی هەردوو بەرژەوەندی تایبەتی و گشتی پێکەوە کۆدەکاتەوەو جووڵەت دەکاتە بڕیار کە بەرژەوەندیەو بەرژەوەندی تاك و کۆمەڵیشی پێکەوە گونجاندووە. بەرژەوەندی گشتی پێش بەرژەوەندی تاکەکەسی داناوە، بەرژەوەندی ماددی و پێویستیە ڕۆحیەکانی پێکەوە کۆکردووەتەوە بەتایبەت هەستکردن بە خواو چاودێری خوا بۆ هەموو شتێ. بانگەواز دەکات بۆ پەیوەندی نێوان لایەنی ماددی و ڕۆحی و پێکەوە کۆکردنەوەی لایەنەکانی چەسپاوی و گەشەسەندن.

لێرەوە ڕێبازی ئابووری ئیسلامی گشتی و گشتگیرەو پەیوەست نیە بە قۆناغێکی دیاری کراوی مێژووییەوە وەك مەزهەبی وەسفی، بەڵکو ئیسلام کورت نەبووەتەوە لە وێنەیەکی دیاری کراوی پەیڕەویدا. ڕێبازی ئابووری ئیسلامی چارەسەری کێشەی هەژاری دەکات و بڕیاردەدات مێژوویەك کلیلی نیە کە هۆکاری ماددیە، بەڵکو چەندین هۆکاری هەیە، بەڵام ئیسلام گرنگی دەدات بە لایەنی ماددی و کەناری لێ ناگرێ، ئیسلام بنەڕەتی پەرستشی کردووە بە دڵنیابوونی خەڵك لە ژیانی بژێوییان.

ئیسلام پێی وایە مرۆڤ لەڕووی بەرهەمهێنانەوە جێگیرە لەسەر زەویدا و کارو بەرهەمیش پەرستشە و سامانیش هەمووی هی خوایەو مرۆڤەکان ئەوەیان دراوەتە دەست و بۆ

سنورێکیش سەرەتا بەشی پێویستی هەیە، هەر کەسیش بەپێی کاری، ئیسلام دوای کەفالەتی سنوری پێویستی ڕێ دەدات بە دەوڵەمەندی، هەروەك ڕێ نادات بە جیاوازی گەورە لە سامان یان خەرجکردندا[١].

زەکاتیش وەك زامنی کۆمەلایەتی پایەی دووەمی بیروباوەڕە دوای نوێژ، لە ماڵ و ساماندا جگە لە زەکات مافێکی تریش هەیە، لە فەرموودەکەی ئیمام ترمیزیدا هاتووە لە ساماندا جگە لە زەکات مافێ هەیە، زەکات سنوری هەرە کەمی ناو سامانە.

ئیسلام هەموو ئەو قازانجانە دەدات کە زیان دەگەینن بە کۆمەڵگە لەوەوە دەست دەکەون وەك دزی و قومارو مەی فرۆشی و ئەو شتانەی سوویان لێ دەکەوێتەوەو لە دەستکەوتی بێ هەوڵ و ماندووبوونیان لێدەکەوێتەوە هەموو ئەوانە بە حەرام دادەنرێن و دروست نیە بەناوی ئازادی ئابوورییەوە پەیڕەو بکرێن چونکە ئەو ئازادیە لە ئیسلامدا ڕەها نیە بەڵکو لە سنوری بەرژەوەندی مرۆڤ و کۆمەڵگەشدا دەبێ، ئەمە وێڕای حەرامکردنی خۆقۆستنەوە و قۆرخکاری هەڵگرتنی سامان کە ئیسلام هەموو ئەوانەی حەرام کردووە. حەرامکردنی سوو لە ئیسلامدا بنەڕەتێکی پتەوو سەرەکی و چەسپاوە، هیچ ڕاڤەو لێکدانەوەیەك نیە ڕێ بدات بە حەلاڵ کردنی. بە هیچ جۆرێ کەی ناتوانێ بڵێ حەرامکردنی سوو ڕێ دەگرێ لە پیشەسازی یان گەشەسەندنی پیشەسازی. هەموو ئەو مەسەلانە دەکرێ بێ دەستوەردانە ئەو پایە گرنگە بەدیبهێنرێن. بێگومان سوو نیزامێکی دژ بە پەیامەکانی ئاسمانەو دژی ئاشتی و پێشکەوتنی مرۆڤایەتیە، جوولەکەی تلمودی بوونە ئالاهەڵگری سووخۆری و بە سووخواردن دەستیانگرت بەسەر سامانی گشتی و خەرجیدا. تا ئێستاش سوو خواردن هۆکاری مەترسیداری لەناوبردنی سامانی موسڵمانانە بەناوی قەرزو قازانجەوە، ئیسلام هات تا لە جەنگێکی پیرۆزدا دژی سەرکەشی سووخۆری بجەنگێ، خوا دەفەرموێت ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ وَذَرُواْ مَا بَقِيَ مِنَ الرِّبَا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ فَأْذَنُواْ بِحَرْبٍ مِّنَ اللّهِ وَرَسُولِهِ وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُؤُوسُ

---

١- مخلص عن بحث الدكتور الفنجري: مدخل إلى الأقتصاد الأسلامي.

أَمْوَالِكُمْ لاَ تَظْلِمُونَ وَلاَ تُظْلَمُونَ وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَى مَيْسَرَةٍ وَأَن تَصَدَّقُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾.

چەندین توێژەر ئاماژەیان داوە بە کاریگەری خراپی سوو لەسەر کۆمەڵگە ڕۆژئاواییەکان، بەڵکو لۆرد کیتس دەگاتە ئەوەی هەموو مەترسیەکان دەباتەوە سەر سوو و دەڵێت: دەکرێ هەموو بەڵاو چەرمەسەریە کۆمەڵایەتیەکان بدرێنەوە پاڵ سوو خواردن.

یەکێکی تر لە بەخششەکانی ئیسلام بیروباوەڕی ئیسلامی قەدەرە، ئەو بیروباوەڕەی وایکردووە موسڵمانان پێشڕەوی بکەن و بەسەر مەترسیەکاندا زاڵ بن و بڕوایان وایە ﴿لَّن يُصِيبَنَا إِلاَّ مَا كَتَبَ اللّهُ لَنَا﴾ (هیچمان تووش نابێ مەگەر ئەوەی خوا بۆی نووسیوین).

موسڵمانان بڕوایان بەوە هەیە هەموو شتێ دروستکراوی خوایەو هوا هەموو شتێ دەزانێ بەڵام خوا کەسی ناچار نەکردووە بەزۆر چاکە بکات یان بەزۆر خراپە بکات، بەڵکو عەقڵی جیاکردنەوەی پێداوەو هەردوو ڕێگەجیاکەشی بۆ داناوە، خوا ڕۆزی هەمووانی بێ کەم و زیاد بڕیوەتەوەو ماوەی ژیانی هەمووانی بێ پێش و باش دیاریکردووە، ئەوەی بۆت دانراوە با لاوازیش بیت پێت دەگات ئەوەش هی تۆ نیە با بەتواناش بیت پێت ناگات، ئەگەر سەرە مەرگت هات چرکەساتێ پێش و پاشی نیە، ئیتر بێ ترس لە مردن لە ڕێی خوادا هەنگاو دەنێن چونکە تەواو بڕوایان وایە کەسێ کە لە مەیدانی جەنگدایە لەگەڵ ئەو بارەی لە ماڵەوەو لەنێو کەسوکاریدا بێ هیچ لە مەرگ نزیکتر نیە چونکە ئەگەر سەرە مەرگی هات لە هەر لایەکیان بێت دەمرێ.

ئیسلام هاوسەنگی نێوان[1] ڕۆح و ماددەی دامەزراندووەو گرنگیەکی گەورەی داوە بە هێزی ماددی کە هەندێ ئاین پشتگوێی دەخەن یان نرخی بەکەم دەگرن، داوا دەکات ماددە دابین بکرێ تا کۆمەڵگەی پێ پێش بخرێ و ئازادبێ. هاوکات ئیسلام گرنگیەکی زۆر دەدات بە بەها ڕۆحیەکان. ئەگەر جوولەکایەتی لە لەبەرچاوگرتنی هێزی ماددیدا زێدەڕەوی کردبێ مەسیحیەتیش لەلایەنی ڕۆحیدا ڕۆچوویێت ئەوا ئیسلام ئاینی هاوسەنگی حەقی نێوان

١- العامري: الاعلام بمناقب الأسلام.

هەردوو لایەنەکەیەو هەردوو بوارەکە بـە ڕەگـەزی بنـەڕەتی سروشـتی مرۆیـی دەزانـێ و بـۆ پێشکەوتنی مرۆڤ نابێ هیچکامیان پشتگوێ بخـرێ. ئایینـەکان کـە کۆکردنـەوەی سـامان و گرنگیدان بە دارایی لە شوێنکەوتوانیان حەرام دەکەن و هانیان دەدەن لەسـەر کـەنارگیری لـە خەڵك لە ڕاستیدا پێناوی هێزیان لێدەسێنن و لەڕێی ڕەوشت بەرزیدا پـەکیان دەخـەن، هێـزی ماددی بێ یان ڕۆحی هێزێکی خراپ یان چاك لەبوونی خۆیدا دروسـت ناکـات بـەڵکو پـشت دەبەستێ بە جۆری بەکارهێنانی لەلایەن مرۆڤەوەو بەپێی ئـەو ئامانجـەی بـۆی بـەکاردێ بـۆ بەختەوەری و پێشخستنی خەڵك یان چەوساندنەوەو بەکۆیلەگرتنی خەڵك نوێ دەبێتەوە.

تایبەتمەندی ئیسلام لەوەدا بیرۆکەیەکی تەجریدی نیە، بـەڵکو ڕێبـازێکی چاکـسازیە کـە ڕۆح و ماددە پێکەوە کۆدەکاتەوە، ئیسلام هەوڵی ماستاوکردن نادات بـۆ دەروونـی مرۆیـی و ناکەوێتە هەوڵی ڕازیکردنی لایەنە دانراوەکانی، بەڵکو هەوڵ دەدات هێزی لەوەدا بێ بەرگەی ناڕەحەتی و قوربانیدان بگرێ و لەئاست نیازە گەورەو داواکاریە باڵاکاندا بوەستێ.

هەندێ ئاین ڕۆح و ماددە لەیەك جیا دەکەنەوەو، هەندێکیان زۆر جەخت دەکەنـەوە سـەر ماددە، هەندێکی تریان زۆر جەخت دەکەنەوە سەر لایەنی ڕۆحی، جوولەکایەتی لە ئاڕاسـتەی ماددیدا گەیشتە لووتکە، مەسیحیەتیش ڕاستەوخۆ هەوڵ دەدات بۆ چارەسەری کێشەی ژیـان لەڕێی نکوولّی کردن لە ژیان، بووزا لەبەرزی و باڵایی بـیردۆزەی ئەخلاقیەکانیـدا وای نیـشان دەدات نەگبەتی و ناڕەحەتیەو هەوڵ و هیوای ڕزگـاریش تـەنها لـەڕێی زابانـەوە دەبێـت کـە هەموو ویست و حـەزەکان سـەرکوت دەکـات و داواکاریـەکان لـەناو دەبـات و ئارەزووەکـان دەمرێنێ، ئەمە ئەو بیردۆزە ڕەشبینیەیە کـە دەیـەوێت ژیـان هەڵوەسـێنێتەوەو بـە تـەواوی دەستبەرداری دنیا بێ، ئەمەش تایبەتمەندی زۆربەی ئایینە کۆنەکانە. گرنگترین گەورەییـەکی ئیسلام لە هەموو نیزامەکانی تر جیای دەکاتەوە گونجانی تـەواوی نێـوان لایـەنی ڕەوشـتی و لایەنی ماددی ژیانی مرۆڤە[١].

---

١- الأسلام على مفترق الطرق.

موحەممەد ئەسەد دەڵێت: ئەمە هۆکارێکی سەرکەوتنی ئیسلامە لە هەر سەرەتای هێزێکیدا و بچێتە هەر کوێ ئیسلام پەیامێکی نوێی هێنا کە قۆرخکردنی دنیا ناکاتە مزۆجی سەرکەوتنی ڕۆژی دوایی، ئەمە دیاردەی تایبەتی ئیسلامە کە بە هەتایی دەمێنێتەوەو بەڵگەی ئەوەیە پێغەمبەرەکەمان زۆر گرنگی داوە بە هەردوو لایەنی ڕۆحی و ماددی ژیانی مرۆڤایەتی. دەبینین ئیسلام لە هەموو ڕێکخستنە نوێکان باڵاترە چونکە هەموو ژیان دەگرێتەوەو گرنگی بە هەردوو دنیاو جەستەو نەفس و تاك و کۆمەڵگە دەدات. لە نێو هەموو ئایینەکان دا دەبینین ئیسلام ڕێدەدات بە مرۆڤ تا ئەوپەڕی سنور چێژ لە ژیان وەربگرێ بێ ئەوەی یەك چرکەش ئاراستە ڕۆحیەکەی لەدەست بدات. لە ئیسلامدا تاوانی بەجێماوی بنەڕەتی نیەو لەو پێناوەشدا پسوولەی لێخۆشبوونی گشتی بۆ مرۆڤایەتی نیە، بەڵکو موسڵمان بەپێی هەوڵی خۆی لێپێچینەوەی لەگەڵ دەکرێ، ئیسلام لەسەرخۆو بەرێزەوە سەیری ژیان دەکات و لێی دوور ناکەوێتەوە، حەزی بە سەرکەوتنی ماددیە بەڵام نایکاتە ئامانج بەڵکو مرۆڤ بەرەو ئەو هەستە دەبات لە هەر کارێکیدا شوێنکەوتەی ئەدەبی هەبێ و مەبەست لە هەموو چالاکییەکی کردەییمان دەبێ ڕەوشتی بێ.

# باسی پێنجەم

## (ئیسلام و ئایینەکان)

ئیسلام عەقڵی مرۆیی لەو کۆت و بەندانە رزگار کرد کە لە دەوری پەرستگەکان و لەبەردەستی کاهینانی ئایینە جیاجیاکاندا بەند بوون، دواتر ئەو عەقڵانەی بەرزکردەوە بۆ ئاستی بڕوابوون بە خوای تاك و تەنهاو بڕوابوون بە ژیانێ لە پشت ئەم ژیانەوە (ژیانی ڕۆژی دوایی).

ئیسلام مرۆڤایەتی لە پەرستشی هێزە سروشتیەکان و فرەخودایی و ئاگرپەرستی و ئاژەڵپەرستی رزگار کردو بڕوای زیندووبوونەوەو پاداشت وەرگرتنەوەی ڕاگەیاندو جیاوازی کرد لەنێوان خواو سروشتدا، بیرۆکەی نەمانی ئەرك و بەرپرسیارێتی سەرشانی کەسان و بیری فەیزو ئیشراق و ئیتیحادو حلولی دارِماند، ڕاوکردنی ئاژەڵ و باڵندەی حەڵاڵی ڕەوا کرد ئەو ئاژەڵانەی کە خوا گۆشتی حەڵاڵ کردبوون، هەروەك مرۆڤایەتی لە دڕندەیی و هەمەجیەت و کۆیلایەتی و ستەمی کۆمەڵایەتی و بەرزڕاگیری ڕەگەزو ڕەچەڵەکەوە بەرەو ڕێزگرتنی مرۆڤ و ڕێزداری بەپێی تەقواو کارکردن برد، یەکبوونی ڕەگەزی مرۆیی چەسپاندو بەهەمووانی گەیاند خەڵکی لە ئادەمەوەن و ئادەمیش لە خۆڵ دروستکراوە.

ئەو ڕێبازو کۆیلایەتیەی بە مرۆڤایەتی بەخشی کە لەسەر دادپەروەری و ڕێزو سۆزو ڕەحمەت دامەزراوە، ئەخلاقیەتی ژیان و تەواوێتی پەرستش و شەریعەتی لە چوارچێوەی ئەخلاقدا بەخشی. ئیسلام هەموو خورافەی بتپەرستی و ئەفسانەو فرەخودایی و مۆرکی بێڕەوشتی قەدەغە کرد هاوکات بیری ئەوروپی لە بتپەرستی ئیغریقی ڕزگارکرد.

هەروەك ئیسلام نکوولی دەکات لە تەناسوخ و بڕیاری ئەوە دەدات ڕۆح و جەستە دەجووڵێنێ و لەسەر کردەوەی جەستەکەی محاسەبە دەکرێ، ئەمەش دوای ئەوەی مرۆڤ داندەنێ بە هەڵەو تاوانەکانی خۆیدا. ئیسلام برایەتی مرۆیی و یەکبوونی مرۆیی دامەزراندووە و بانگەواز دەکات بۆ یەکسانی نێوان خەڵك بە جیاوازی زمان و ڕەنگیانەوە کە

هەموویان لە ئەرك و مافدا یەکسانن، بەمەش دەمـاری دەمـارگیری ناحـەزی بـڕی و دیـدی ڕەگەزپەرستی لەناو برد، ئیسلام بە شەریعەتەکەی بازنەی ڕەگەزی فراوان کـرد بـۆ یەکـسانی نێوان گەلان ئەگەر بە شەریعەتی ئیسلام ڕازی بن.

پێشتر پێناسی میرییەکان میسر بوو، یۆنانیەکان ئەسـینا بـوو، ڕۆمانیـەکان ڕۆمـا بـوو، ئیسلام داوا دەکات واجبی مرۆڤ بەرامبەر خواو بەرامبەر بە برا مرۆڤەکەی پەیوەسـتی یـەك بن. ئیسلام کۆمەڵگە فارسی و فیرعەونی و بتپەرستی و ڕۆمانی و هیندیەکانی لەدەست ئـەو پیاوە ئایینیانە ڕزگارکردن کە عەقڵەکانیان داخست بـوون و بـیرو هزریـان کردبـووە کۆیلـەی خۆیان، هەروەها لەو پاشایانە ڕزگاری کردن کە کۆمەڵگەیان بۆ چەند چینێ دابەش کردبـوو و خۆیان لە لووتکەدا دانابوو.

هاوکات ئیسلام چەند یاسایەکی جێگیرو چەسپاوو بنەمای گشتی داناون کـە وەك یاسـای پاڵپشتی کەسێتی مرۆیین و دەیپارێزن، ئەو ڕێسایانەشی داناون کە ڕێ دەگرن بە دارمانی. بە تایبەت سەبارەت بە سوو و زیناو مەی خواردنەوەو بتپەرستی. جگە لەوە ڕێی داوە بە مـرۆڤ هەوڵ بدات و پێشبکەوێ و گەشە بکات و لەگەڵ سەردەم و بارەکاندا ڕێ هەڵبکات.

دکتۆر حوسەین نەسر بەراوردی نێوان ئیسلام ئایینەکانی کردووەو دەڵێت: کۆنترین ئایینی سامی ئایینی جوولەکەیـە و نوێترینیـان ئیـسلامە، ئـایینی موسـایی شـەریعەت و ئـایینی عیسایی تەریقەتە، ئیسلام شەریعەت و تەریقـەتی پێکـەوە کۆکردوەتـەوە بۆیـە ئیـسلام بـە ئایینی بێگەردو پاك دادەنرێ کە ڕووخسارو ناخ پێکـەوە کۆدەکاتـەوە ئـەو سـنووردارکردنەش دەسڕێتەوە کە لەگەڵ دەرکەوتنی ئایینی جوولەکەیی و مەسـیحیدا دەسـتی پێکـرد، ئیـسلام جارێکی تر گشتگیری بەخشی بە ئاین و ئەو ڕاستیەی ئاشکرا کرد کە لە یەکـەم چرکەسـاتی دروست بوونی مرۆڤەوە دابەزی. ئەویش ڕاستی یەکخواپەرستیە، بنەڕەتی هەموو مەزهەب و ئایینە ڕاستیەکان لە هەموو سەردەمەکاندا بریتی بووە لە یەکخواپەرستی.

بـەردەوام ئیـسلام لـەنێوان ڕووخـسارو ناخـدا هاوسـەنگی نوانـدووە، بـە پێـچەوانەی مەسیحیەتەوە کە هاوسەنگی لەدەستداوەو لە ئیسلامدا شەریعەت و تەریقەت نزیـك لەیـەك

پارێزراو و ماونەتەوەو هیچ هێزێ نەیتوانیوە ئەو هاوسەنگیە لەناوبەرێ کە لە سەرەتای دەرکەوتنی ئیسلامەوە هەبووەو هێمای مانەوەی بووە، هەموو زانایانی موسڵمان هۆشیاریان داوە سەبارەت بەو تێبینیە و جەختیان لەوە کردوەتەوە تاکە ڕێی حەقیقەت پاراستنی هاوسەنگی نێوان شەریعەت و تەریقەت و ڕووخسارو ڕووکەشە.

بەمە ئیسلام توانـاو ئاستێکی بڵاوبوونـەوەی بێوێنـەی بەدەست هێنـاو کەسایەتیەکی جیهانی لەنێو هەموو ئایینەکاندا دەست کەوتووە. سورشی موحەممەدی کە کۆتـایی ئـەو قۆناغەی مرۆڤایەتیە کۆکەرەوەی ئایینەکانی پێشووە لـە ڕوانگـەی گەڕانـەوە بـۆ بنـەڕەتی سروش، لە لایەکی تریشەوە لە ڕوانگەی بنەماو ڕێبایەوە لـە ئایینـە هیندیـە حەقیقیەکانـدا بەشاراوەیی و نادیاری دوور لەدیدی گشتی هەیە. لە بنەڕەتی ئایینی هیندی لـە بەرهەمیـدا هاتووە کۆمەڵگە دابەش دەکات بۆ چەند دەستەیەك یان چەند سیفەتێ، بنەڕەت و یاساکانی ئایینی هیندی بە لایەنە جیاجیاکانیەوە هەموو چینەکانی دادەگرێ، بەڵام تەنها براهاماکـان گەیشتنە زانینی هەموو ڕاستی و هێماکان.

جوولەکایەتی کەوتە ژێر دەسەڵاتی بیری کۆنی بابلی، مەسیحیەتیش کەوتە ژێر دەسەڵاتی بیری ئیغریقی (لە میسالیەتی ئەفلاتون و مەنتیقی ئەرستۆ)، بـەڵام ئیسلام تـوانی پـێش پەیوەندی کردن بە فەلسەفەو ڕێبازە جیاجیاکانەوە لە قورئانـدا ڕێبـازی خـۆی بـە تـەواوەتی پێکبهێنێ.

(درابەر) دەڵێت: ئیسلام جیاوازە لە نەسرانیەت چونکە ئیسلام بـە یـەکجارەکی ڕکەبـەری بتپەرستی لەناو بردو بیروباوەڕی پـەروەردگار بڵاودەکاتـەوە، بـەڵام مەسـیحیەت چـووە نـاو کۆمەڵگەیەکی تێکەڵ و تیایدا بوویە بەشدار بێئەوەی بتوانێ بتپەرستی لەناوبـەرێ، هەنـدێ پێیان وایە ئایینی نوێ ئەگەر دارِما دواتـر گەشـە دەسـەنێ، هـەروەها خـۆی لکانـدووە بـە بیروباوەڕی کۆنی بتپەرستیەوە، لە ئەنجامدا بنەماو بیری تێکەڵ بووەو لەوەوە ئایینێکی نـوێ دروست بووە کە بە یەکسانی نەسرانیەت و بتپەرستیش تیایـدا بەرچـاو دەکـەون، بـەوجۆرە

مەسیحیەت بەرگریەکی توندی نواند بەرامبەر بە هێرشی فەلسەفەی غەنوصی رۆژهەلاتی[1] و بەلام غەنوصی توانی شالاوێکی توندی بباتە سەرو زال بوو بەسەر دەستەیەکی گەورەی بڕیاراندا لەوانە قدیس (کلیانس) و قدیس (ئۆریگان)، غەنوصیەت کاریگەریەکی بەرچاوی هەبوو لەسەر فەیلەسوفی مەسیحیەت یان کەسایەتی لاهوتی قدیس (ئۆگەتنوس)، بەلام ئیسلام لە فتوحاتیدا بەرامبەر غەنوصی وەستاو دەرگاکانی داخست.

زانا صەلاحەدینی سەلجوقی لە بەراوردی نێوان ئایینەکاندا دەلێت: جوولەکایەتی بانگەواز دەکات بۆ یەکخواپەرستیەك کە لە بیرۆکەی خوای تاك و تەنهاوە دەردەکەو، بەلام دواتر ئەم بیروبڕوایە لارێ دەکرێ و خواوەندی ئیسرائیل دەپەرسترێ.

نەسرانیەتیش پێشتر ئایینی یەکخواپەرستی بوو پێش ئەوەی ببێ بە سیانە خوایی، ئینجا ئیسلام وەك میانڕەوی فیترەتی هات و عەقل و دل و سۆزو هەستی دەدواند، هەلوێستێکی میانڕەوی گرتە بەر کە نەتەوایەتی و مرۆڤایەتی پێکەوە دەبەستەوە.

پەیامی ئیسلام پێی وایە ئایینی خوا لە هەموو سەردەمەکان و لەسەر زمانی هەموو پێغەمبەران لە کرۆکدا یەك بوون، هەموو ئایینەکان لە بنەڕەتدا یەکن، ئیسلام هەموو لایەنەکانی لەخۆگرتووەو ئەو لارکردنانەی لە بنەڕەتەکانی ئایینەکاندا لەلایەن شوێنکەوتە جولەکەو مەسیحیەکانیانەوە ئەنجامدراون. ئیسلام ڕاستیان دەکاتەوەو لەنێوان زێدەڕۆیی نەگونجاوی هەردووکیاندا هەلوێستێکی میانڕەوی دەگرێتە بەر، بانگەواز دەکات بۆ نەتەوایەتیەکی مرۆیی کە وەك جوولەکایەتی نەبێ ڕەگەو پەرستانە و داخراو بێ. میسالی و دوورگیریش نەبێ کە لەبری ئەوەی لە پەیوەستی مرۆڤ بە باری بوون و ژیانیەوە نزیك بێ زیاتر لە خەیالەوە نزیك بێ وەك ئایینی مەسیحیەت، بەلکو پەیامی ئوممەتی میانڕەوی هێناوە.

ئایینی ئیسلام هەموو جەختکردنەوەی لەسەر لایەنی دنیایی نیە وەك ئەوەی جوولەکایەتی کردوویەتی، وەك مەسیحیەتیش نیە تەنها سوور بێ لەسەر لایەنی ئاسمانی، بەلکو ئیسلام هەولی داوە دین و دنیا پێکەوە کۆبکاتەوەو دەسەلاتی ڕۆحی و دەسەلاتی

---

١- من بحث لدكتور علي سامي النشار.

زەمەنیش پێکەوە وابەستە بکات. پەیامی ئیسلام وا نیە: (چی هی قەیسەرە بۆ قەیسەرو چی هی خوایە بۆ خوا) بەڵکو دیدی گشتی و کۆکەرەوەو یەکخەری هەیە بۆ جیهانی بینراوو نەبینراو و لەسەر بنەمای یەکخواپەرستی نیزامی هزرو ڕامیاری داناوە.

کاتێ ئەوروپا باس لە بیری خۆی دەکات دەگەڕێتەوە سەر یۆنان و ڕۆمان و دواتر دەڵێت: مەسیحیەت هات، ئەمەش ئەڵقەیەکی مێژوویی ئەوروپایە، بەڵام عەرەبەکان پێیان وایە مێژووی حەقیقیان لە ئیسلامەوە دەست پێدەکات وەك ئومەت و هزرو شارستانیەت.

مەسیحیەت وەك گشتێکی ئایینی دابەزیو عەقیدەو شەریعەت بوو، ئەگەرچی وردەکاری تەشریعی نەهێنابوو، بۆیە شەریعەتە بنەڕەتیەکەی ئەوەبوو تەورات لەگەڵ ئەو گۆڕانکاریانەدا بوو کە دابەزینە سەر عیسا، بەڵام ئەو قەڵەمڕەوەی کە کڵێسا لە ئەوروپای سەدەکانی ناوەڕاستدا بەدەستی هێنا ئەوە بوو تەنها حوکمڕانی یاساکانی ڕۆمانی بوو، لە بنەڕەتدا مەسیحیەت ئایینێکی جیهانی نەبوو بەڵکو پەیامێکی تەواوکاری پەیامی مووسا بوو.

(پۆل فالیری) دەڵێت: مەسیحیەت کە لە ئەوروپا بڵاوبوویەوە خودی مەسیحیەتەکەی قدیس پۆلس بوو، مەسیحیەت ئەخلاقیەتێکی خۆیی هێناو کاری کرد بۆ یەکخستنی ئەو ئەخلاقیەتە هاودەم بە یەکبوونی یاسایی، ئەو یەکبوونەی کە یاسای ڕۆمان داینا، هەروەها دەڵێت: لەوانەیە ئەوەی قەرزاری یۆنان بین ئەوە بێ کە لە باقی تری مرۆڤایەتی جیامان دەکاتەوە لە عەقڵماندا قەرزاری یۆنانین، ئێمە قەرزاری یۆنانین لە شێوەی بیرکردنەوەدا کە پەیوەندی هەموو شتەکانە بە مرۆڤەوە، بەوجۆرە مەسیحیەت لە ئەوروپادا وەك بەشێ لە ژیانیان دەردەکەوێ، بەڵام ئیسلام وەك هەموو ژیانی موسڵمانان دەردەکەوێ، بەبێ ئیسلام هیچ ژیانێکی کۆمەڵایەتی و هزریان نابێ.

(ول دیورانت) دەڵێت: مەسیحیەت لەناو دەبرد بەڵکو هێشتیەوە، چونکە عەقڵی ژیاری یۆنانی لە وێنەیەکی نوێی لاهوت و بۆنەی کڵێسادا گەڕایەوە بۆ ناو ژیان، زمانی یۆنانی کە چەند سەدەیەك مایەوە بوو بە دەسەڵاتداری سەر سیاسەت و ئەدەب و بۆنە مەسیحیەکان بۆنە شاراوە یۆنانیەکان گوازرانەوە بۆ بۆنەی پیرۆزی نهێنی ڕەهبانیەت، چەند دیاردەیەکی

تری ناو ڕۆشنبیری یۆنانی بوونە هاریکاری ڕوودانی ئەو ئەنجامە نەگونجاوە، ئیتر لە میسر ڕای سیانەی پیرۆزو ڕۆژی موحاسەبەو هەمیشەیی بوونی پاداشت و سزاو نەمری مرۆڤ هێنرا. لەوانە پەرستشی دایکی منداڵ و پەیوەندی صۆفی بەخواوە هێنرا، ئەو پەیوەندیەی ئەفلاتونی نوێ و ئەردی و سرینەوەی مەشخەڵی بیروباوەڕی مەسیحیەتی لێکەوتەوە.[1]

لە بنەڕەتدا مەسیحیەت بۆ ئەوە هات باری نائاسایی بڵاوی ناو بەنی ئیسرائیل ڕاست بکاتەوە، جوولەکە کەوتبوونە سامانداری و کۆکردنەوەی بە هەر شێوازێ بێ، مەسیحیەت هات و بانگەوازی دنیانەویستی کرد تا توندی ئەو دنیا پەرستیە بشکێنێ، تەحەدداو تۆڵەسەندنەوە مۆرکی پەیوەندی نێوان دەستەکانی جوولەکە بوو. مەسیحیەت هات و باسی لێبوردەیی دەکرد. ئەگەر مەسیحیەت بەو جۆرە وەك ئایینی بەنی ئیسرائیل لەسەر باری خۆی بمایەتەوەو بانگی بکردنایە بۆ دنیانەویستی ئەوا ئەو توندی تەحەدداکاریەی ناو جوولەکەی دەشکاند، مەسیحیەت ئایینێ بوو لەباری تایبەت و بۆ کۆمەڵێکی تایبەت هات، بەڵام پۆلس کرد بە ئایینێکی جیهانی، پۆلس بڕیاریدا مەسیحیەت مەزهەبێکی جوولەکەیی نیە بەڵکو ئایینێکی نوێیەو دەبێ بانگەوازەکەی بۆ هەموو گەلانی تری جگە لە جوولەکەش بێ، ئەگەر چی ئەوە ببێتە هۆی چاوپۆشی و ئاسانکاری لە هەندێ تەشریعات و بۆنەدا کە باربە بتپەرستان تەنگ دەکەن وەك خەتەنە کردن و حەرام کردنی گۆشتی بەراز[2]، بە یەك ڕوانین بۆ هەڵوێستی پۆلس سەبارەت بە نیزامی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی سەرسامی داتدەگرێ چۆن هەوڵیداوە مەسیحیەت لە ئامانجی ڕەسەنی خۆی دەربکات.

پۆلس داوا لە کۆیلەکان دەکات (دوای ئەوەی چوونە ناو مەسیحیەتەوە) گوێڕایەڵی گەورەکانیان بن و بە سپاردەکاری و دڵسۆزیەوە خزمەتیان بکەن با ئەوانیش سزایان بدەن یان لەگەڵیاندا ڕەق بن، هەروەها ملکەچی هەموو دەسەڵاتدارو فەرمانڕەوایان بن و هیچ گلەیی و گازندەیەکیان نەبێ، لێرەوە ئەو گۆڕانو ئەو نەگونجانەی نێوان بانگەوازی مەسیحیەتی بۆ

---

١- قیصر والمسیح، ص٢٧٦.

٢- عبده فراج: معالم الفكر الفلسفي.

کۆشك و دنیانەویستی دەستی پێکرد، لە کاتێکدا ئەوروپا ڕووەو داگیرکاری هەنگاوی دەنا، ئەم نەگونجانە ڕوونەی نێوان بانگەوازی مەسیحیەت و پەیڕەوی شوێنکەوتوانی لە ئەوروپاو ئەمریکادا لەبەرچاو بوو.

ئینسکلۆپیدیای بەریتانی ئەوە نیشان دەدات و دەڵێت: مێژووی مەسیحیەت و فرە کڵێسایی و دەستەو تاقمی جیای مەسیحیەکان ئەو هەستەی لای لێکۆڵەران دروست کردووە کە مەسیحیەکان شتێکیان نیە تیایدا هاوبەش بن جگە لە گەلان).

ئەم نەگونجانە لە چەندین ڕووداوی مێژووی مەسیحیەتدا دەردەکەوێ: دادگاکانی پشکنین و دەسەڵاتی پاپاکان و جەنگی سانت بارتلمی لە نێوان کاسۆلیك و پرۆتستانتەکاندا، گیانی دەمارگیری بۆ بانگەواز بۆ جەنگە خاچپەرستیەکان. ئەمەش لە ئەنجامی کاریگەربوونی بوو بە تلمودەوە مەسیحیەت لە بزاڤێکی کۆمەلایەتی پڕ سۆزو چاکەو خۆشەویستیەوە گۆڕا بۆ توندی و ڕەقی پاشاکانی ڕۆما لەڕێی کڵێساوە هەرچەندە بە هۆکاری کاریگەری دیدو واتای ئیسلام لەسەر هەموو ئەوروپا لۆسەر هەوڵیدا کەچی پرۆتستانتی نەیتوانی هیچ بکات، کاسۆلیکی و پرۆتستانتی هەردووکیان لەسەر بڕوای سیانە خوایی و خوایەتی عیساو بوونی تاوانە بنەڕەتیەکە مانەوەو مەزهەبی پرۆتستانتیش نەیتوانی لەو بیروباوەڕەوە ڕزگار بێ.

کاتێ ڕێبازی زانستی ئەزموونی ئیسلامی هات و ڕوویکردە ئەوروپا بەجارێ ڕۆژئاوای غەیبیاتی مەسیحیەت ڕاچڵەکاند، ئەوەشی ئاشکرا کرد کە ئایینی مەسیحی بەپێی وێنای کاهینان لەگەڵ عەقلی ڕۆشنگەریدا ناگونجێ. عەقلی کە وردبوونەوەو شرۆڤەو ئیستینباتی هەبێ، ئیتر هەڵمەتێکی گەورەی دژ بە بیرۆکەی سیانە خوایی دەستپێکردو بە تەعقید وەسفی کرد، هەروەها بیرۆکەی وازهێنان لە دنیای بەرپەرچ دایەوە، لە دەروونی ڕۆژئاواییەکاندا مەسیحیەت تووشی لەرزین هات بەهۆی خۆسەپێنی کڵێساوە ئەو شتە غەیبیانەی لە مەسیحیەتدا هەبوون و بیری ڕۆژئاوایی هێرشی بردنە سەر لە هزری ئیسلامیدا بەهیچ جۆرێ بوونیان نەبوو.

عەقڵیـەتی ڕۆژئـاوایی بەکاریگـەری چـەمك و واتـای ئیـسلامی و ڕێبـازە زانـستیە ئەزموونیەکەی خەریك بوو لەدەست دەسەلاتی لاهووتی کڵێسا ڕزگاری دەبوو، ئەو دەسەلاتەی بوو بوویە چاودێر بەسەر نەفس و عەقڵدا.

فەلـسەفەکەی (نیتـشە)و (رینـان) وەك پەرچـەکردارێکی تونـد بـوو دژ بـە ئـەخلاقی مەسـیحیەت، بانگـەواز بـوو بـۆ ڕزگـارکردنی مـرۆڤ لـە کۆتبـوونی ئـەخلاقی بەدەسـت مەسیحیەتەوە، چونکە ئەو ڕەوشت و ئاکارەی مەسیحیەتیان بە ڕەوشتی زەلیلی دەزانی.

(ئەنیس فریحە) دەڵێت: ئەوروپا کاتـێ لـە ڕووی هـزر یـان ڕۆشـنبیری یـان زانـست یـان ئابووریەوە پێشکەوت کە دژ بە دەسەلاتی کڵێسا ڕاپەڕی و بەتەواوەتی لەدەست ئەو دەسەلاتە ڕزگاری بوو، بەڵام ئیسلام بە تەواوەتی بەرپەرچی داوەتەوە بیرۆکەی ڕەهبانیەت و ڕاکـردن لـە ژیان و نەرێنی و دنیا تۆراندن پەیڕەو بکرێ، بەڵکو ئیسلام یەکەم پەیام بوو بانگەوازی دەکرد بۆ ڕزگاربوون لە دەست کۆت و بەندی نەزانی و خورافەو تەقلید.

ئیسلام هات و بـوو بـە فـەرمانڕەواو بڕیـاردەر بەسـەر شارسـتانیەتەکاندا نـەك حـوکمی بەسەردا بدرێ، ئیسلام توانای هەیە بەرامبەر تەنگژەو هەموو هەڕەشـەکان بوەسـتێ و سـەر لەنوێ خۆی ڕێکبخاتەوەو بنەڕەت و بنەماکانی خـۆی لـە هـەر بارگرژیـەك ڕزگـار بکـات و بەوپەڕی زیندوێتی و چالاکیەوە ئەوە ئـەنجام بـدات و بنەڕەتـەکان بپـارێزێ و لـە ڕوانگـەی گۆڕانەکاندا توانای جووڵەی هەبێ، ئیسلام چەند وەڵامێکی تەواو ڕوون و کامڵی سەبارەت بە هەر مەسەلەیەك بە مرۆڤ بەخشیوە، هاوسەنگی ڕوونی نێوان بەها جیاجیاکانی وەك جیهـادو بانگەوازو بەخشین و ڕەواو قەدەغەکانی داناوە.

بەڵێ ئیـسلام بزاڤێکـی بـەرفراوانی کۆمەلایەتیـە کـە بیروبـاوەڕو دەوڵـەت و سیـستمی کۆمەلایەتی و ئەخلاق لەخۆدەگرێ، ڕەسەنی ڕوونی ئیسلام لەوەدایە بەردەوام هەر ڕەگـەزێکی

نامۆو بەدەر لە ئیسلام بەرپەرچ دەداتەوە،[١] ئیسلام سەلماندویەتی توانـای تـەواوی هەیـە بـۆ چارەسەری کێشە گەورەکانی مرۆڤایەتی، لە هـەموو ئەمانـەدا ئیـسلام خـودێتی تایبـەت و پێوەری تایبەت بەخۆی هەیە.

ئیسلام بە چەمکە خواپەرستیەکانی کەلەسەر بنەمای فیترەت و عەقڵ ڕاوەستاون بارێکی گەورەی هێزو ئیمان و قوربانیدانی بەخشیوەو پاڵی ناوە بە موسڵمانانەوە تا بـەرەو ئاسـۆکان سەرکەون، بەردەوام ئیسلام توانای ئەوەی هەیە سەرلەنوێ خۆی نـوێ بکاتـەوەو بـیرو هـزری داڕێژێتەوە هەرکات هەوڵ درا ئەو بیرو هزرە لاڕێ بکرێ یان شتێ هێنرایە ناوی کە شـتێ لـە کرۆکی ئیسلام بگۆڕێ خێرا ئیسلام خۆی ڕێکدەخاتەوەو ڕێی پـێ نـادات، ئیـسلام هەمیـشە قەوارەیەکی زیندووە کە توانای کشان و بەخششی هەیە، نیشانەی ئەمەش توانـای بەرچـاوی ئیسلامە بۆ بەرفراوانی و پەلکێشان و تێکەڵ بوون لەگەڵ گەلە جیاوازو سەردەمە یـەك دوای یەکەکاندا.

هەر لەو کاتەوەی ئیسلام دەرکەوتووە تا ئێستا هیچ ئایینێ بەسـەریدا زاڵ نـەبووەو هـیچ گەلێ بەسەر ئوممەتی ئیسلامدا سـەرنەکەوتووە، بێگومـان دیـارترین بەڵگـە بـۆ ڕەسـەنی و جیهانی بوون شیاوێتی مانەوەو بڵاوبوونەوەی ئیسلام گونجانیـەتی لەگـەڵ فیترەتـی مرۆیـی و توانای بەخشینی بۆ هەموو سەردەم و کەش و بـارێ و دەرکـەوتنی مۆرکـە مرۆییەکـەی لـە برایەتی و یەکسانیدا.

---

١- ئەمە ئاماژەیە بەو فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کـە بەرپەرچـی هـەر شـتێ دەداتـەوە لـە ئیـسلامدا نەهاتبێ و بهێنرێتە ناو ئیسلام واتە ئیسلام کاملەو هـیچ کـەم و زیـادێ بـەهیچ جـۆرێ قبـووڵ ناکـات. وەرگێڕ.

# پاشکۆی یەکەم

## کورتەیەك لەسەر مەنسووری حەلاج

ئەم نووسینە بەشی یەکەمی ئەو بابەتەیە کە لەسەر ژیانی حەلاج نووسیومە و لە ژمارە دووی گۆڤاری ڕێنوێندا بە نازناوی (ئومێد هەورامی) بڵاوم کردەوە، پشت بەخوا بە نیازین لێکۆڵینەکە تەواو بکەین و سەربەخۆ لە کتێبێکدا چاپی بکەین بە ناونیشانی (حەلاج خاچە شکێنراوەکەی موسڵمانان).

## مەنسووری حەلاج

مێژووی ئیسلامی خاڵێکی دیاری تێدا بەدیدەکرێت کە ئەویش بریتیە لە دەرکەوتن و ڕۆڵی کەسایەتیەکان لەو مێژووەدا، ئیتر کەسایەتیەکان باشن یان خراپن، هەواداری ئەو دەسەڵاتە یان ئایینەن یان دژ بەو دەسەڵاتە یان ئایینەن، حەقبێژن یان حەقکوژن.

یەکێك لەو کەسایەتیانەش کە لە مێژووی ئیسلامیدا ڕۆڵی دیاری هەبووە و مەودایەکی گەورەی گرتووە و بەردەوام قسەی لەسەر کراوە و تەنانەت تا ئەمڕۆش ڕۆڵی ماوە، بریتیە لە (مەنسوری حەللاج ٢٢٤-٣٠٩ك/٨٥٨-٩٢٢ز) ئەم کەسایەتیە تا ئەمڕۆش لە نێوان دوو تێڕوانیندا خۆی دەبینێتەوە، دەستەیەك هاواری بۆ دەکەن کە خواپەرستێکی ڕاستگۆ بووە و لەسەر حەقیقەت و چاکسازی کوژراوە و ئەو کەسایەتیە لەوە گەورەتر بووە کە دەسەڵاتی عەبباسی و زاناکانی دەربار لێی تێبگەن، بەم پێیە بە بانگەشەکاری خواپەرستی دادەنێن، دەستەیەکی تریش پێیان وایە ئەم کەسایەتیە خراپەکارو گێرەشێوێن و دوژمن بە ئیسلام و موسڵمانان بووە و حەقیقەتی لێ ونبووە و تێکەوتووە و داوای پایەبەرزی و دواجاریش داوای خوایەتی کردووە، بەم پێیە بە بانگەشەکاری خوایەتی ویستی دادەنێن.

گرفتەکە لێرەدایە کە تاکەکانی ئەمڕۆ هێشتا دەستبەرداری نەبوون و بەردەوام قسەی لەسەر دەکەن، هەوادارەکانی پێیان وایە حەللاج هەموو ڕاستیەکانی پێبووە وەك ئەوەی سەرچاوەکانی حەقیقەت لەدوای حەللاج ونبووین، پەروایانە بەدوای وتە وکردارەکانی

حەللاجدا دەڕۆن تا بیخەنە قاڵبی ئەمڕۆ و بزوتنەوەکەی زیندوو بکەنەوە، لەپێناو ئەوەشدا کە حەقبوونی حەللاج بسەلمێنن ئامادەن هەر لێکدانەوەیەك بکەن و هەموو شتێکی دژبە دیدی خۆیان بۆ حەللاج بەرپەچبدەنەوە، بەڵکو سەرچاوەکان تا ئەو کاتە ڕاست دەکەن کە حەقبوونی حەللاج دەسەلمێنن، ئیتر هەمان ئەو سەرچاوانەی وتەو کردوەکانی حەللاجیان گواستۆتەوە و لەو کاتەدا ئەمانەتپارێز بوون، کاتێك شتێك لەسەر حەللاج دەڵێن کە دژ بە دیدی ئەوانە (دیدی پیرۆز ڕاگرتنی حەللاج ) ئەو سەرچاوانە دەبنە ئەمانەت نەپارێز و دەسەلاتخواز و ماستاوچی و...هتد. واتە لەیەك کاتدا ڕاستگۆ و درۆزن، حەقبێژ و دژەحەقن، ئەمانەتپارێزو ناپاکن.

ئەمەش دەرەنجامی دەمارگیری کوێرانەیە بۆ کەسایەتیەکان، چونکە هەرکات سەرچاوەکانی حەقیقەت دیاری نەکران، هەموو شتێك دەبێتە حەقیقەت وەرگر.

لەئیسلامدا ئەگەر قورئان و سوننەت تاکە سەرچاوەن و هاوەڵانیش نمونەی باڵان، ئەوا کەسایەتیەکانی مێژووی ئسلامی هەموویان جێی ئەوەن تا بە تەرازووی قورئان و سوننەت پێوانە بکرێن و بە بێژنگی سەرچاوەی ئایینی ئیسلام لە بێژنگ بدرێن.

لێرەدا هەوڵدەدەین کورتەیەك لە ژیانی حەللاج لە سەرچاوەکانی مێژووەوە باس بکەین، نووسینێکی مامۆستا (أنور الجندی) ش لەسەر هۆکاری کوشتنی حەلاج بهێنین کە لە کتێبی (شبهات فی الفکر الاسلامی)دا هێناویەتی.

**یەکەم : ژیانی حەللاج :**

ناوی حوسەینی کوری مەنسوری کوڕی مەحمی ئەبو عەبدوڵڵای ئەبو موغیثی فارسی بەیزاویە، لە شاری بەیزا لە ناوچەی فارس لە ساڵی (٢٢٤ك/٨٥٨ز) لەدایکبووە،دەشوترێت ناوی موحەممەدی کوڕی ئەحمەدی فارسی بووە، مەحمی باپیرەی ئاگرپەرست بووە.

**ڕاجیاوازی هەیە کە بۆچی پێی وتراوە حەللاج، لەمبارەیەوە سێ ڕای سەرەکی هەیە :**

١- لەبەرئەوەی نهێنیەکانی ناو دەروونی خەڵکی زانیوە و وتویەتی، بۆیە پێیان وتووە (حلاج الاسرار) دواتر ئەو نازناوەی بەسەردا سەپاوە.

٢- چونکە کە چوەتە شاری واسیت چووە بۆلای هەلاجێك و ناردوویەتی بۆ کارێك، هەلاجەکە پێی وتووە : من سەرقاڵی کاری خۆمم، ئەویش وتوویەتی تۆ برۆ من کارەکەی تۆ دەکەم، پیاوەکە چووەو گەڕاوەتەوە سەیر دەکات هەموو خورییەکەی تەواوکردووە، بۆیە ناوی لێنرا حەلاج.

٣- دەڵێن پێش هەموو ئەمانە ئەوەبووە کە باوکی هەلاج بووە، ئیتر ئەو ناوە بەسەر ئەمیشدا سەپاوە.

**سەبارەت بە نازناوەکانی :**

لە هیندستان پێیان دەوت (موغیث)، لە تورکستان بە (موقیت )، لە خۆراسان بە (ئەبوعەبدوڵڵای زاهید)، لە خوزستان بە (الشیخ حلاج الاسرار) و لە بەغداد بە (المصطلم) و لە بەسرە بە (المعیر) بانگدەکرا.

حەللاج هەرجارەو جۆرە بەرگێکی دەپۆشی، بەرگی شێوە ئایینی و سەربازی و...هتد، لەگەڵ بنەماڵەکەیدا چوو بۆ واسیت لە عیراق و لەوێ سەرقاڵی وەرگرتنی بڕێك زانست و زانیاری بوو، ئینجا چوو بۆ توستور و لەگەڵ (سوهەیلی کوری عەبدوڵڵای توستوریدا ) ماوەی دوو ساڵ هاودەم و برادەرایەتی هەبوو.

پاشان چوو بۆ شاری بەسرە کە پێگەیەکی گرنگی تەسەوف بوو، ئەوکات تەمەنی هێشتا(١٨) ساڵان بوو، لەوێ بوو بەدۆست و هاودەمی (عەمری کوڕی عوسمانی مەککی ) و ماوەی (١٨) مانگ لەگەڵیدا مایەوە و کومەڵێك زانیاری لێوەرگرت، دەڵێن حەللاج چەند کتێبێکی لە (عەمر) دزیوە و عەمریش دوعای لێکردوە کە خوا دەست و پێی ببڕێت.

لە بەسرە کۆمەڵێك وتە و گوفتاری هەبوو کە شێخەکانی تەسەوف پێی بێزار بوون، چونکە وتەو کارەکانی پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلام و تەریقەتی دنیانەویستان بوون، عەمری کوڕی عوسمان دەڵێت: ڕۆژێك ئایەتێکی قورئانم خوێند، حەللاجیش گوێی لێبوو، وتی: (یمکنني أن أؤلف مثله وأتكلم به ) (منیش ئەتوانم شتی وادابنێم و وەك ئەوەش بڵێم).

پاشان حەللاج کچی (ئەبو یەعقوبی ئەقتەعی) هێنا کە لەگەڵ عەمردا لە ڕکەبەریدا بوون، ئەمەش لێزانی حەللاج بوو تا بەو نەیاریەی کە عەمر بۆی هەبووە بەرامبەر بەوە بتوانێت پالپشتی بۆ خۆی پەیدا بکات لەلایەن شیخێکی سۆفیەوە کە (ئەبو یەعقوبی ئەقتەع) بوو، بەلام (ئەبوو ئەقتەع)ی گەورە زانای صۆفی دەڵێت: ( من کە ژنما بە حەللاج لەبەرئەوە بوو کە ڕێگە و عیبادەتیم باش دەهاتە پێش چاو، بەلام دوای ماوەیەکی کەم بۆم دەرکەوت کە جادووگەرێکی فێڵباز و کافرێکی زۆر پیسە).

پاشان حەللاج بەسرە بەجێ دەهێڵێت و دەچێت بۆ بەغداد و دەچێتە خزمەت پێشەوای گەورەی تەسەوف (جونەیدی بەغدادی)(ڕەحمەتی خوای لێبێت) و باسی ڕکەبەری نێوان عەمرو ئەبو یەعقەبی بۆ دەکات تا وانیشانبدات ئەو حەزی بە ڕکەبەری و نەیاری نیە و خوێنی خۆیشی شیرین بکات و ئەو حەقیقەتەش نەشارێتەوە، پێشەوا جونەیدیش ئامۆژگاری دەکات لەسەرخۆ و هێور بێت، ئەویش ماوەیەك بەوجۆرە دەکات، ئینجا سێ جار سەفەری حەجی کرد و کەسانێکی لەگەڵدا بوو، دواتر دەستبەرداری حەج بوو و ڕای گۆڕا.

حەللاج لە بەغداد دەچێتە لای جونەید و پرسیاری لێدەکات، بەلام جونەید بە پرسیارەکەی بێزارە و وەلامی ناداتەوە، کارە ناباوەکانی حەللاج دەگەنە ئاستێك کە سەلام بۆ جونەید بکات و جونەیدیش وەلامی نەداتەوە.

حەللاج کە پێشتر دەچووە حەج لەهەیوانی مزگەوت و لەبەر خۆر دادەنیشت و جگە بۆ پێویستی دەستگەیاندن بە ئاو یان بۆ تەواف لە شوێنی خۆی نەدەجولا، نان و ئاویشی زۆر کەمکردبوویەوە، ئەوگەشتەی حەجیشی کە وایکرد ماوەی ساڵێکی خایاند، ئینجا گەڕایەوە بۆ بەغداد و ئەو پرسیارەی جونەید هاتەپێشەوە و لەبەرامبەر ئەو هەڵوێستەی جونەیدا حەللاج ترساو لەگەڵ ژنەکەی چوو بۆ توستور و لەوێ نزیکەی ساڵێك مایەوە وخەڵکی زۆر بە گەورە و خواناس لە قەڵەمیان دەدا، لەگەڵ ئەوەدا بەرگی سۆفی لابردو وەك خەڵکی تر کلاوێکی کردەسەری و ماوەی حەوت ساڵ دووریگرت و گەشتیکرد بۆ خۆراسان و ئەودیو ڕووبار و سجستان و کرمان و ئینجا گەڕایەوە بۆ فارس و کەوتە قسەو بانگەواز و لێدوان بۆ

خەڵك، ئینجا چوو بۆ ئەهواز و لەوێ خەڵکی پێشوازییانلێکرد و چوون بە دەمیەوە، ئینجا دووبارە چوویەوە بۆ بەسرە و پاش ماوەیەکی کەم لەوێوە بۆ جاری دووەم چوویەوە بۆ مەککەو هەمدی هاتەوە بۆ بەسرە و مانگێك لەوێ مایەوەو داوتر چوو بۆ ئەهواز و لەوێوە لەگەڵ کۆمەڵێك لە کەسە دیارەکانی ئەهوازدا چوو بۆ بەغداد و ساڵێك لەوێ مایەوە، ئینجا بڕیاریدا بچێت بۆ هیند تا لەوێ بانگەواز بۆ خوا بکات.

ئەبو قاسمی قوشەیری دەڵێت: کە عەمری کوری عوسمان لە مەککە بووە چووە بۆلای حەللاج، سەیر دەکات لە وەرەقەیەکدا شت دەنووسێت، عەمر پێی وت: ئەوە چیە؟ حەللاجیش دەڵێت: بەمە ڕکەبەری و بەرهەڵستکاری قورئان دەکەم. عەمر تووڕەبوو وە سەرکۆنەی ئەبو یەعقوبی کرد کە بۆچی کچی پێداوەو لای خەڵکیش کەوتە دژایەتیکردنی حەللاج.

حەللاج کە چووە هیندستان لەوێ فێری جادووگەری بوو، ئەو دەیوت دەیەوێت بە جادووگەری بانگەواز بۆ ئایینی خوا بکات، ئاخۆ هیندستان پێگەی دێرینی جادووگەری و ئەفسانە و تەڵەکە سیحرییەکان بوو، حەللاجیش لە تێکەڵی ئایینەکانی ئەوێوە شتی وەردەگرت و فێری جادووگەری بوو، ئینجا دەیوت دەیەوێت ئایینی خوا بگەیەنێت، دیارە جادووگەریش بە یارمەتی جنۆکە و شەیتانەکان دەبێت بە تێڕوانینی ئایینی ئیسلام و جادووگەریش لە ئیسلامدا و بە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغە کراوە و حوکمی کوشتنی لەسەردراوە. ئەگەریش بیەوێت بۆ چاکە بەکاری بهێنێت، ئەوا لە ڕێگەیەکەوە کە خوا پێی خراپ بێت و پیس بێت چارەسەری خراپە ناکرێت، وەك چون لەبارەی (مەی) یەوە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت خۆی دەردە نەوەك دەرمان.

ئەو گەشتەی حەللاج بۆ هیندستان خاڵی گۆڕانی گەورە بوو لە ژیانی حەللاجدا، چونکە لەمەوبەدوا کارە ناباوەکانی حەللاج زیاتر دەبن.

حەللاج بۆ سوودوەرگرتن لە ڕێرەوەکان دەیدایە پاڵ دەستە جیاجیاکان، ئەو جارێك خۆی بە سوننە دەزانی و جارێك بە شیعە و جارێك سۆفی و...هتد.

لێرەدا کۆمەڵێك بیانوو دێننەوە کە حەللاج وتویەتی بۆ فێربوونی جادووگەری دەچمە هیندستان بۆ شاردنەوەی مەبەستی حەقیقی مەعریفی خۆی بووە، بەڵام ئەمە لە دوو لایەنەوە جێی قبوڵ نیە:

١- حەللاج هیچ کات ترسی نەبووە لەوتنی ئەوەی بڕوای پێیەتی.

٢- دواتر بەڕوونی ڕۆڵی جادووگەری لە ژیانی حەللاجدا بەدیدەکرێت.

حەللاج کە لە سەفەری هیندستان گەڕاوەتەوە، تەمەنی نزیکەی (٤٦) ساڵان بووە، ئینجا لە ماڵەوەی خۆیدا کەعبەیەکی بچووکی دروستکردووە و فتواگەلێکی جۆربەجۆری داوە، ئەمە بوویە هۆی ئەوەی حەللاج بەرەو دادگا ئاڕاستە بکرێت، دادگاییەکەیشی نزیکەی (٨) ساڵی خایاند، واتە لە ساڵی (٣٠١) تا ساڵی (٣٠٩ك) ئینجا دادگاییەکەی تەواو بوو.

<u>حەللاج چوار تۆمەتی بەرەو ڕوو کراوەتەوە :</u>

١- بوونی پەیوەندی لەگەڵ قەرمەتیەکاندا.

٢- گوفتاری أنا الحق کە واتای داوای خوایەتی لەخۆدەگرت.

٣- دەوروبەرەکەی وەك خوا سەیریاندەکرد.

٤- فەتوادانی سەبارەت بە حەج.

لێرەدا پێویستە پیش ئەوەی باسی دادگاییەکە بکەین باسێکی ڕەوشی سیاسی ئەوکاتەی جیهانی ئیسلامی بکەین تا لەو دادگاییە تێبگەین.

لەوکاتەدا جیهانی ئیسلامی خۆی لە دوو دەسەڵاتی سەرەکی دەوڵەتی عەبباسی و دەوڵەتی فاتیمیدا دەبینیەوە و دەسەڵاتگەلێکی تری وەك قەرمەتیەکانیش هەبوون، هەرچی عەبباسیەکانن سوننە مەزهەب بوون، بەلام شیعە بوەیهیەکان دەستیانگرتبوو بەسەر دەوڵەتی عەباسیدا و ڕۆڵی دەسەڵات و خەلیفەیان نەهێشتبوو، ئەمەش بەڵگەیە دژ بەوانەی کە دەڵێن عەبباسیەکان لە ترسی دەسەڵاتی خۆیان حەللاجیان کوشتووە، خۆ دەسەڵات لەدەست شیعەی بوەیهیدا بوو و ئەوانیش لەگەڵ نەیارانی عەبباسیدا خۆشیان دەهات. بەتایبەت کەسایەتیەکانی نەیاری سوننەگەرایی، ئیتر ڕۆڵی عەبباسی لەم مەیدانەدا چی بوو؟ بەڵکو

بڕیاری دادگا لەدەست دەسەڵاتی عەباسی و بوەیهیەکاندا بەرتەسك نەبووبویەوە و ئەوەی لە دادگادا ڕۆڵی دەبینی زانایان بوون.

هەرچی فاتمیەکانی شیعەمەزهەب بوون دژ بە عەباسییەکان بوون و حەللاجیش هەواداریەکی بۆ خیلافەتی فاتیمی هەبوو وەك لە وتەیەکیدا بە ئاشکرا دەریدەبڕێت.

هەروەها قەرمەتیەکانیش شیعە بوون و هەرئەوانیش بوون بەردەڕەشی کەعبەیان بۆماوەیەکی زۆر بردو کوشتارێکی زۆری موسڵمانانیان کرد، کاتێکیش حەللاج لەخاچدرا بانگەواز دەکرا ئەمە یەکێکە لە بانگەشەکارانی قەرمەتی بیناسن.

بەڵام بوەیهیەکان لەبەر لاوازنەبوونی دەسەڵاتی خۆیان لەلایەن دەسەڵاتە شیعەکانی ترەوە ئامادەنەبوون پاڵپشتی تەواوی فاتیمی و قەرمەتی بکەن، هەر ئەمە وای لێکردن کێشەی حەللاج بەلای خۆیاندا سەرنەخەن.

هەروەها سەردەمێك بوو ئەفسانەو جادووی هیندی و بیری ئاگرپەرستی پێشووی ساسانیو فەلسەفەی لادەری یۆنانی و دەمارگیری مەزهەبی ناوخۆیی حەقیقەتی شەریعەتیان لەبەردەم جەماوەردا ئاڵۆز کردبوو، حەللاجیش سوودی لەهەموو ئەمانە وەرگرت. ئایا بەمەبەست بوویێت یان نا، یان ئایا مەبەستی باش بوویێت یان خراپ.

## دادگاییکردنی حەللاج

پێشتر وتمان حەللاج چوار تۆمەتی بەرەو ڕوو کرابۆیەوە کە بریتی بوون لە:

١- بوونی پەیوەندی بە قەرمەتیەکانەوە.

٢- وتەی (أنا الحق) کە لێکدانەوەی داوای خوایەتی بوو.

٣- شوێنکەوتەکانی بە خوایان دەزانی

٤- لە بارەی حەجەوە ڕای پێچەوانەی بنەمای ئیسلامی هەبوو.

لەساڵی ٢٩٩ك.دا بڕیاری گرتنی حەللاج درا، ئەو ساڵەش ساڵی دامەزراندنی دەوڵەتی فاتیمی بوو لە مەغریبی ئیسلامی، بەڵام گرتنەکەی لە ساڵی ٣٠١ك و لە سوس لە ئەهوازبوو، هێنرا بۆ بەغداد و هاوار دەکرا بەناو خەڵکدا کە ئەمە یەکێکە لە قەرمەتیەکان

بیناسن، حەللاج خرایە بەندینخانە، پاش ئەوەی برا بۆ لای وەزیر عەلی کوڕی عیسا و پاش دادگاییکردن خرایە بەندیخانە.

لە بەندینخانەدا بڕیاری سزای توندی سێ نیوە ڕۆژی درا، لە ماوەی بەندیخانەکەیدا ڕێی پێدەدرا تا خەڵکی ببینێت و ڕای خۆی بڵێت، تەنانەت ژوورێکی لەپاڵ بەندینخانەکەدا بۆ دروستکرا تا لەوێ وانەکانی خۆی بڵێتەوە، ئەمەش جێی سەرنجە لەوکاتەی دادگاکانی تەفتیش زانا گەردونی و زانستیەکانیان لە ڕۆژئاوادا لەسێدارە دەدا، لە ڕۆژهەڵات و لە جیهانی ئیسلامیدا کەسی تۆمەتبار بە نەیاری ئایین و دەوڵەت ئەو مافەی هەبێت، خوێندکارەکانی هەوڵیاندا حەللاج بفڕێنن، بەلاّم حەللاج ئامادەیی نەبوو، ڕایەکی تریش دژ بەمە پێی وایە حەللاج پێشنیاری وای بۆ نەکراوە، بەلاّم حەللاج کە سیحرو جادوی هیندی فێربوو دەیتوانی خۆی دەرباز بکات، سەر چاوەکانیش لەوبارەیەوە نمونەیان هێناوە.

لە ساڵی ٣٠٩ک.دا حەللاج لەسەر داوای وەزیر ئەبوحامید دادگایی کرایەوە و دادوەران لەسەر دوو ڕابوون، ئایا بکوژرێت یان ئازاد بکرێت، ئەوانەی دەیانوت ئازاد بکرێت داوایان ئەوەبوو داوای تەوبە لە هەڵەکانی بکرێت، دەستەیەکی تریش بە زندیقیان لە قەڵەمدەداو وتیان تەوبەی لێ داواناکرێت، هەڵوێستی ئیبن بەهلول بۆ داوای تەوبەلێکردنی و هەڵوێستی ئەبوو عومەری حەممادی بۆ کوشتنی بوو.

ئەو دادگاییە بەبێ بڕیاری کۆتایی تەواوبوو، ئینجا دادگاییەکی تر ئامادەکراو ئەمجار لە جیاتی زانا ئیبن بەهلول زانا ئەبولحوسەینی ئەشناسی هات، حەللاج لەسەر نوسینەکانی دادگایی کرا، چەند کەسێکیش لە دوورو نزیکانی خۆیشی شایەتییان لەسەردا.

لەمەسەلەی حەجدا حەلاج فەتوایەکی پێچەوانەی بنەماکانی شەریعەتی نوسیبوو، ناچار بۆ خۆڕزگارکردن وتی ئەوەی لە کتێبی (الاخلاص)ی حەسەنی بەسری وەرگرتووە، بەلاّم لەو کتێبەدا شتی وا نەبوو، دواجار بڕیاری کوشتنی حەللاج دراو حەللاجیش هاواریکرد کە لە خوا بترسن خوێنم لە ئێوە حەلاڵ نیە، بۆ ئەوەش دەیوت من نوسینم لەسەر ڕێبازی ئەهلی سوننەش هەیەو لە بازاڕی وەراقینە.

هەوادارانی حەللاج گومان لەسەر شایەتەکان و دادگاییەکە دروستدەکەن لە پێناوی ئەوەی بڵێن بە ستەم کوژراوە، نەیارانیشی بێ خەوشی دادگاییەکە دەخەنەڕوو، بەڵام لە ڕاستیدا دادگاییەکە بە ڕێژەی زیاتر دادگاییەکی ڕەوابوو، ئەگەر دەست تێوەردانی وەزیر ئەبوحامید نەبوایە کە کەمێك خەوشی خستە دادگاییەکەوە، زانایانیش زۆرینەیان لەسەر ئەوەن کە بڕیاری دادگا لەسەر حەللاج بڕیارێکی ڕەواو شەرعی بووە، کەمینەیەکی ناو سۆفیەکانیش ئەوە بە ستەم دادەنێن.

لە ٢٣ زیلقەعدەی ٣٠٩ك.دا حەللاج بە ئامادەبوونی خەڵك کوژرا، شێوەی کوشتنەکەشی بڕینی دەست وپێ و لەخاچدانی بوو، هەوادارانی حەللاج دەڵێن: لەژێر شوێنەکەیدا بە خوێنەکەی نوسراوە(الله) یان شتی تریش دەڵێن، هەروەها دەڵێن لێو بەخەندە بووە، لەگەڵ ئەوەی سەرچاوەکان بەوپەڕی گومانەوە ئەو دەقانە دێنن و لە لایەنی زێدەڕۆیی هەوادارانی حەللاجەوە باسیان دەکەن.

هەروەها دەڵێن حەللاج نوێژی کردووە، نەیارانیشی دەڵێن نەخێر بەڵکو وتویەتی من ناکوژرێم و ماوەیەکی تر دێمەوە بۆ لاتان، واتا خۆی چواندبێت بە عیسا(علیه‌السلام)ەوە. هەوادارانیشی وەك سامی مەکارم و ماسینیون بە سەرسامیەوە حەللاج دەچوێنن بە عیسای مەسیحەوە، پاشان جەستەکەی سوتێنراو پرژێنرا بە ناو ڕووباری دیجلەدا و سەریشی لەگەڵ دەست وپێیدا مانەوەو دوو ڕۆژ هەڵواسران و دواتر بۆ ساڵێك سەری لە کۆشکی خیلافەتدا هێڵرایەوەو لە ٣١٠ك.دا برا بۆ خوراسان.

هەوادارانی حەللاج ئاوی دیجلەیان بە پیرۆز سەیر دەکرد و دەیانخواردەوە بۆ منداڵبون و سکپڕی، زۆرێکیشیان چاوەڕوانی هاتنەوەی بوون، بەڵکو هەندێکیان دەیانوت پاش چل ڕۆژ حەللاجیان لەسەر گوێدرێژێك بینیوە، ئەمەش شتێکی دوور و چاوەڕوان نەکراو نیە، چونکە جنۆکەکان هوندێکجار بۆ لەخشتەبردن بێت یان بۆ خۆشەویستی بێت خۆیان بە کەسێك دەچوێنن، وەك ئەوەی بۆ ئیمامی ئیبن تەیمیە ڕوویدا کە لەو کاتەی لە بەندیخانە بوو جنۆکەیەك لە خۆشەویستیدا خۆی بە ئیبن تەیمیە چواندبوو و وەڵامی پرسیاری کەسانێکی

لەوپەڕی جیهانی ئیسلامیەوە دابوویەوە، کە ئەمە بە ئیبن تەیمیە وترا، وتی ئەوە کاری جنۆکەکانەو لەوە زیاتر لە ئیسلامدا جێی نابێتەوە، پێدەچێت بۆ حەللاجیش لەلایەن جنۆکەکانەوە ئەمە کرابێت تا مرۆڤەکان لە خشتە ببەنو دوچاری شیرکیان بکەن.

هەندێکی تریش کە نەیاری بوون سوپاسی خوایان دەکرد کە لە دەستی کەسێکی شێوێنەری بنەماکانی ئیسلام ڕزگاریان بووە، زانایانیش بوونە دوو ڕای جیاواز، زۆرینەیان بە سۆفیەکانیشەوە لە دژی بوون و بە کوشتنی ڕازیبوون، کەمینەیەکی ناو سۆفیش بە کوشتنی نا ڕازی بوون

## بەرهەمەکانی حەللاج

١- لماسين الأزل والجوهر الأكبر والشجرة الزيتونة النورية.

٢- الأحروف المحدثة والأزلية والأسماء الكلية.

٣- الظل الممدود والماء المسكوب والحياة الباقية.

٤- حمل النور والحياة والأرواح.

٥- الصهيون.

٦- تفسير (قل هو الله أحد).

٧- الأبد والمأبود.

٨- قران القرآن والفرقان.

٩- خلق الإنسان والبيان.

١٠- كيد الشيطان وأمر السلطان.

١١- الأصول والفروع.

١٢- سر العالم والمبعوث.

١٣- العدل والتوحيد.

١٤- السياسة والخلفاء والأمراء.

١٥- عالم البقاء والفناء.

١٦- شخص الظلمات.

١٧- نور النور.

١٨- المتجليات.

١٩- الهياكل والعالَم والعالِم.

٢٠- مدح النبي والمثل الأعلى.

٢١- الغريب الفسيح.

٢٢- النطفة وبدء الخلق.

٢٣- القيامة والقيامات.

٢٤- الكبر والعظمة.

٢٥- الصلاة والصلوات.

٢٦- خرائن الخيرات.

٢٧- العين.

٢٨- التوحيد.

٢٩- النجم اذا هوى.

٣٠- الذاريات ذروا.

٣١- كتاب في أن الذي أنزل عليك القرآن لرادك الى معاد.

٣٢- الدرة.

٣٣- السياسة.

٣٤- هوهو.

٣٥- كيف كان وكيف يكون.

٣٦- الوجود الأول.

٣٧- الكبريت الأحمر.

٣٨- السمري وجوابه.

٣٩- الوجود الثاني.

٤٠- لاكيف.

٤١- الكيفية والحقيقة.

٤٢- الكيفية بالمجاز.

٤٣- موائد العارفين.

٤٤- خلق خلائق القرآن.

٤٥- الصدق والأخلاص.

# بۆچی حەلاج کوژرا؟

**نووسینی: أنور الجندی**

هەندێ لە نووسەران هەوڵ دەدەن بیری ئیسلامیش تۆمەتبار بکەن بەهەمان ئەو چەوساندنەوەی بیریاران و بار بەرتەسککردنەوەی سەر ئازادی بیرو هزر کە لە رۆژئاوادا هەبووە، ئەمەش بە نموونە هێنانەوەی کوشتنی حەلاج و ئیبن روشد بەرامبەر بە گالیلۆ و زانایانی تر لە رۆژئاوادا.

بەڵام بەراستی بەراوردەکە پووچ و بێمانایە، چونکە ئیسلام دەروازەیەکی فراوانی کردوەتەوە بۆ ئازادی بیرو هزر، تا ئەوەی رێی داوە بە بیستنی رای کەسانێ لە جوولەکە و مەسیحی و مەجووسیەکان کە نەیاری ئیسلام بوون، کەچی لە کۆڕی خەلیفەکاندا مشتومڕیان کردووە و رای خۆیان وتووە تا لەو کۆڕەدا حەقیقەت دەربکەوێ.

ئیسلام رێی ئازادی داوە بە بیر و بەرامبەر هیچ کەسێ نەوەستاوە کە بیەوێ رای خۆی دەربڕێ چ لەناو بازنەی ئیسلامدا بێت یان لە دەرەوەی ئەو بازنەدا بێ، تەواو بڕوای هەیە بە بنەمای راشکاوانەی خۆی(ادع إلى سبيل ربك بالحكمة والموعظة الحسنه).

ئەی ئەگەر وایە ئەی بۆچی حەلاج و سەهرەوەردی کوژران و ئیبن روشد چەوسێنرایەوە؟ ئەم مەسەلە تەواو لەو بەراوردکاریە جیاوازە.

سەبارەت بە حەلاج ئەوا راو بۆچوونەکەی نەبوونە هۆی کوشتنی، بەڵکو ناپاکی و پەیوەندی بە دەرچوان لە دەوڵەتی ئیسلامی و هەوڵدەرانی لەناوبردنی دەوڵەتی ئیسلامی هۆکاری کوشتنی بوو.

چەندین نووسینی راشکاو سەبارەت بەو بانگەوازەی لەسەری چەسپان و جەختیان لەوە کردەوە ئەو پەیوەندیەی هەبووە، ئیتر بیرە لارێبووەکەی هۆکاری کوژرانی نەبوو، ئیبن عەرەبی خوێندکاری زۆر زیاتر لە حەلاج قسەی لارێبوو و نەگونجاو لەگەڵ بیری ئیسلامی وت بەڵام لە سنووری بیرو هزر دەرنەچوو و لە بازنەی فیکردا کاری کرد، سەبارەت بە سەهرەوەردیش هەمان شتی لەسەر چەسپا.

زۆرێك لە بانگخوازانی رۆژئاواگەری زۆر هەوڵدەدەن شانازی بکەن بە حەلاجی کوژراو و سەهرەوەردی کوژراوەوە، ئەمەش بۆ گومان نانەوە لەسەر ئیسلام و هەڵوێستی ئیسلام بەرامبەر بە ئازادی رادەربڕین.

لەراستیدا ئەوەی حەلاج و سەهرەوەردی وتیان لە بیری ئیسلامیدا بوون و بنەرەتی نەبوو، هەروەها لە مونتەلیقی روونی یەکخواپەرستیدا نەبوو، بەڵکو وەرگیراو بوو لە بڕێ رۆشنبیری کۆنی هیندی و مەجووسی کە باس لە وەحدەتولوجود و حلول و هەنگاو و رێبازی تری وا دەکات کە ئیسلام قبوولّیان ناکات و دانیان پێدانانێت.

بەڵام کەسانی وا لەلایەن موسڵمانانەوە بەرەو رووی کوژران نەبوونەتوە، بەڵکو بەرەخنەو ئاشکراکردنی ئامانج و ئارەزووەکانیان بەرنگاریان بوونەتەوە، تەنها حەلاج و سەهرەوەردیش لەو مەیدانەدا کاریان نەکردووە بەڵکو چەندین کەس لەو بوارەدا بون و کاریان کردووە تا بانگەوازەکەیان مردووە، تەنها ئەوانەیان تووشی کوشتن بون کە پەیوەندییان کردووە بە سیاسەتەوەو لەگەڵ باتینیەکاندا دەستیان تێکەڵ کردووە، ئەو باتینیانەی دەیانویست دەوڵەتی ئیسلامی لەناوبەرن.

سەبارەت بە ئیبن روشدیش مەسەلەکەی تەواو جیاوازە، ئیبن روشد هاورێی خەلیفە بوو وچەندین کۆڕ و دانیشتنیان پێکەوە هەبووەو خەلیفە زۆر پێی سەرسام بووە، ئەو پەیوەندیە گەیشتە ئاستێ خەلیفە رێی دەدا ئیبن روشد بە براکەم خەلیفە بانگ بکات، کاتێ نەیارانی ئیبن روشد هەستیان کرد بەو پلەوپایە بەرزەی کەوتنە گومان نانەوە لەسەری و پیلان گێڕان لە دژی، یەکێ لەو شتانەی ورووژاندیان ئەوەبوو دەیانوت ئیبن روشد وشەی شیاو بە خەلیفە لە ئاست خەلیفەدا بەکارناهێنێ، مەسەلەکە شتی تری بۆ زیاد کرا، لەوانە وا گەیەنرایە لای خەلیفە گوایە بە خەلیفەی وتووە ئەو ئەمیری بەربەرەکانە، بەمە لە پایەی ئەمیری باوەرداران دایدەماڵی، هەموو ئەمانە هۆکار بوون تا خەلیفە بەو توندیە دژایەتی ئیبن روشد بکات، دووری بخاتەوە بۆ شوێنێکی دوور و کتێبەکانی بسووتێنێ و قەدەغەیان بکات، بەڵام ئەو بارە زۆر درێژەی نەکێشا و ئیبن روشد توانی زۆر لەو بارانە راست بکاتەوەو لای خەلیفە بیانوو

بهێنێتەوە بۆ دەستەواژەی ئەمیری بەربەر و وتی ئەوە دەستکاری کراوە و ئەصلەکەی ئەمیری بەررەین بووە، ئیتر بارەکە لەوەدا وەستا.

هەموو ئەمانە واتای ئەوەیە چی بانگەشەی بانگخوازانی رۆژئاواگەری هەیە و چی شالاوی رۆشنبیرییان هەیە لە بنەرەتی مێژووییدا لارێکراوو دەستکاری کراوە بە نیازی تۆمەتبار کردنی بیری ئیسلامی.

# پاشکۆی دووەم

## ئازادی ڕادەربڕین لە مێژووی ئیسلامیدا

**نووسینی: هاد جلال حبیب الله**

ئازادی ڕادەربڕین بانگەشەیەکی زەقی زۆربەی ڕەوت و هزرە نوێکانی ئەمڕۆیە کە بەو بانگەشەیە بەرامبەریان دەکەنە تاوانبارو خۆیان دەکەنە مافدەر بە جۆرێ زۆرجار بە بیانوی کۆتبوونی بیروڕاوە سنوورە گشتی و ڕەواکانی ئازادی ڕادەربرینیش تێدەپەڕێنرێن، ئەمڕۆش زۆرینەیەك بە زمانی برەرو گوێی کەڕکردوو و چاوی داخراوەوە کەوتوونەتەوە وێزەی کەمفامان یان دەروون بەزیوانی موسڵمان و جگە لە موسڵمانانیش تا داخی ناو دڵیان بەرامبەر ئیسلام و موسڵمانان بڕێژن، بۆیە هەوڵماندا کورتە باسێك لەسەر ئازادی ڕادەربڕن لە مێژووی ئیسلامیدا بخەینەروو.

ڕێبازی پێغەمبەرانی پێش موحەمەد(صلی الله علیه وسلم) و مێژووی دوورو درێژیان لە ئیسلامدا بە پوختی و لە چەند وێستگەیەکی دیاردا خراوەتە ڕوو. لەسەردەمی پێغەمبەرانی پێشوودا بەرفراوانی بیروڕا هێندە بووە کە ئەمە پەیامی پێغەمبەران بووە (ئێوە کاری خۆتان بکەن، ئێمەش کاری خۆمان دەکەین (اعلموا مكانكم إنا عاملون) بۆ ئەو ئازادی ڕادەربڕینەو دەروازە بەرفراوانەش دەرگای پەیامی خوایی وا کراوە بووە تا بە بەرامبەر بڵێن (تعالوا ندع أبناءنا وأبنائكم ونساءنا ونساءكم وأنفسنا وأنفسكم ثم نبتهل فنجعل لعنة الله على الكاذبين)بەرامبەر بەمەش دوژمنان و نەیارانی پەیامی خوایی هەمیشە بۆ بێدەنگکردنی ئەو زمانانەی بە دڵی ئەوان نادوێن شمشێرو پەتی سێدارەیان بەکارهێناوە، بۆیە کاتێ زەکەریاو یەحیا(علیهما السلام) بە دڵی ئەوان نەدوان شمشێر هاتە ئارا، کاتێ ئیبراهیم شتێکی وت جیا لە وتەی ئەوان ئاگری بۆ ئاودرا، کاتێ عیسا (علیه السلام) بیرێکی نوێی خستە ڕوو با تەنانەت ئەوپەڕی ئاسانکاریش بێت(أحل لكم بعض الذی حرم علیكم) ئەو کات خاچی بۆ سازدرا. بەڵام ئەمە هەڵوێستی پێغەمبەران نەبوو کاتێ ڕای جیاوازیان دەدەی، ئەوەتا کاتێ

مووسا(علیه السلام) پەیامی ڕاستی خوا دەگەیەنێ و خوا سەری دەخات پاش چوونی چل ڕۆژەی کە هاتەوە هەرچەندە بینی سامری سەری لە خەڵك شێواندبوو بەڵام شمشێری بۆ بەرز نەکردەوە و ئاگری بۆ تاو نەدا و خاچی بۆ ساز نەدا، بەڵکو ڕاو بڕیاری خۆی لەسەر نیشاندا، ئەمە لە کاتێکدا پێشتر مووسا(علیه السلام) کاتێ ڕای جیاوازی لەبەردەم فیرعەوندا دەربڕی فیرعەون هەوڵیدا بە بەڵگە بێدەنگی بکات و سەربکەوێ، کەچی کاتێ زانی حەق لای مووسایە (علیه السلام) خێرا هەڵمەتی بردە بەر هەڵواسین و سووتاندن و بڕین بەبێ ئەوەی تەنانەت چەکێکی لەڕوودا هەڵگیرا بێ.

بە کورتی پەیڕەوی ناو مێژووی پێغەمبەران لە ئازادی ڕادەربڕیندا لەم ڕێبازەدا خۆی دیوەتەوە (ئێوە هەنگاوی خۆتان بنێن ئێمەش هەنگاوی خۆمان دەنێین)، چونکە هەرکەس ترسی نەبێ لە کەموکورتی پەیام و بیروڕای خۆی باکی نیە لە بوونی ڕای جیاواز بە مەرجێ سنووری ڕەوای ئازادی ڕادەربڕین نەشکێنێ، واتە هێڵە بنەڕەتیەکان تێنەپەڕێنرێن، هەر بۆیە خوا دەفەرموێت (ولاتسبواالذین ...فیسبوا لله عدوا بغیر علم) واتە سنووری بنەڕەتی ڕای جیاواز با هەڵەی تەواویش بێ نابێ لە مشتومڕی ڕەوا دەربچێ، ئەگەر نا دەبێ قبووڵی هەڵەی بەرامبەر بکرێت. هەر بۆیە ئازادی ڕادەربڕینی پەیامی خوایی ڕێی نەداوە قسە بوترێ بە بتەکانی بتپەرستان بەڵکو تەنها بەڵگەخوازی نەقڵیو عەقڵی لەپێش بووە، ئەمە سەبارەت بە مێژووی پێغەمبەران و پەیامە ئاسمانیەکانی پێش ئیسلام.

سەبارەت بە مێژووی ئیسلامی ئەوا لەچەند بوارێکەوە باسی ئازادی ڕادەربڕین دەکەین، لەوانەیە ئەم باسکردنە جیاواز بێ لە باسکردنەکانی دیکە، چونکە ئازادی ڕادەربڕن کورت ناکەینەوە لە وتە و نووسینی مەزهەب وئایین و ڕەوتە جیاجیا فرەلایەنەکانی ناو مێژووی ئیسلامی، بەڵکو ڕادەربڕینی کرداریش دێنینە ناو باسەوە، بۆ نموونە کاتێ کۆمەڵێك جوولەکە ساختەی بەڵگەنامەیی لای ئیبن تەیمیە دەکەن و ئەویش بە بەڵگەوە ساختەکەیان ئاشکرا دەکات و بەرامبەر بەمەش هیچ سزایەك نادرێن، ئەمە لە وتەدا شتێکی وا بەدی ناکەین، بەڵام لە کرداردا ئەو ئازادیە ڕادەربڕینە بەدی دەکەین کە لە ناو دەوڵەتێکدا کە بیری تۆ

ڕکەبەرو نەیارە هەوڵ بدەیت ساختەی یاسایی و بەڵگەنامەیی لە بەرامبەردا بگریتە بەرو ترست نەبیٚ دەم و دەس و بیرکۆت بکرێیت.

ئەو مەیدانو بوارانەی سەبارەت بە ئازادی ڕادەربڕین لە مێژووی ئیسلامیدا دەیانخەینە ڕوو بریتین لەمانە:

یەکەم: ئازادی ڕادەربڕینی ئایینی.

دووەم: ئازادی ڕادەربڕینی سیاسی.

سێیەم: ئازادی ڕادەربڕینی هزری (نووسین و لایەنە ڕاگەیاندنیەکانی).

*یەکەم: ئازادی ڕادەربڕینی ئایینی: بەگشتی سروشتی ئایینە ئاسمانیەکان و دانراوە مرۆییەکانیش وابووە کە هەرکامیان هاتووە هەوڵی گۆڕان و گۆڕینی داوە لە پەیامی پێشوودا. ئیدی ئەوانەی ئاسمانی بوون بە دوو شێوە گۆڕانیان دەکرد لە پەیامی پێشوودا.

١-گۆڕین بە پێی بڕیاری خوایی وەك عیسا(علیه السلام) بە فەرمانی خوا هەوڵ دەدات گۆڕین بکات لە پەیامی مووسادا(علیه السلام)دا بەوجۆرەی خوا بۆی دیاری کردووە (أحل لکم بعض الذی حرم علیکم) ئەم گۆڕانانەش تەواوکەربوون بۆ پەیامی پێشوویان نەك تێکشێنەر و لەناوبەر وەك لە فەرمایشتی سەحیحی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) هاتووە کە کاری پێغەمبەران دەشوبهێنیٚ بە بینایەك کە دروستیان کردووە و خشتێکی سووچێکی ماوە کە ئەوەش کاری پێغەمبەرانە(علیهم السلام).

٢-ئەو گۆڕانکاریەی کە پەیڕەوکەرانیٚ یان شوێنکەوتوانیٚ یان دوژمنانێکی پەیامی ئەوکات یان پەیامی پێشوو ئەنجامیان داوە و پاڵنەرەکەش کەمفامی یان ڕق و کینە یان نەزانی بووە کە دواجار بوونەتەوە مایەی سەر لێشێواونی خەڵکی، خواش لەبارەیانەوە دەفەرموێت (یحرفون الکلم عن مواضعه). خەڵکی حیجازیش (قوڕەیش بەتایبەت) لەو نێوەندەدا پەیامی پاکی حەنیفیان شێواندبوو، کاتێکیش پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) هات لە دژی وەستان و هەوڵیاندا پەیامی سەرکوت بکەن، بەجۆرە سەرەتای توندڕەوی دژ بە

ئازادی ڕادەربرین بەرامبەر پەیامی ئیسلامی دەرکەوت، بۆ ئەمەش ئەم هەنگاوانەیان گرتنەبەر:

١-سووکایەتیکردن بە ئایینی ئیسلامو شوێنکەوتووانو ڕێبەرەکەشی.

٢-چەوساندنەوەی شوێنکەوتووان.

٣-ڕێگرتن لە بانگەواز کردن بۆ ئیسلام.

٤-گەمارۆدانی ئابووری و شەهید کردنی ئەندامەکانی.

٥- دەرکردنی کەسەکان و هەوڵی شەهیدکردنی پێغەمبەرەکەی.

٦-هەڵمەتی سەربازی و پیلانی هاوپەیمانی دژ بە ئیسلام.

بەرامبەر بەمە بانگەوازی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆ شتانێ بوو کە پەیامە ئاسمانیەکانی پێشوو داوایان دەکرد، هەروەها پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بە چاوی سۆزو دڵ بۆسووتان سەریری دەکردنو نەك توندی لە دژ بەکارنەهێنان بەڵکو هێندە نەرمی نواند و هەوڵی ڕێنموونی بۆ نیشان دەدان کە لە چەند قوناغێکدا ئاگاداری کردنەوە، ئەمەش سەرەتای پەیامی ئیسلام بوو بۆ ئایینەکانی دی، (تعالوا الی کلمة سواء بيننا وبينكم) ئەگەریش ئەمەیان نەویست داوای گفتوگۆ مشتومڕی نێوان هەر دوو لای دەکرد (تعالوا ندع أبناءنا و أبناْءکم ونسأْنا و نسائكم وأنفسنا وأنفسكم ثم نبتهل) کە دەوڵەتی ئیسلامیش دامەزرا پەیامی یەکلایی خۆی دەربڕی (لا اکراه فی الدین) بەڵکو جگە لە ئازادی تاکە کەسی بیروڕا ئازادی بە کۆمەڵیشی پێدان وەك لە دەستووری مەدینەدا ئەوە بەدیدەکەین لە چەند بەندێکی دەستوورەکەدا هاتووە کە جوولەکەکان دەستووری خۆیانیان بۆ کێشەکانی خۆیان هەیە و ئایینی خۆیان بۆ خۆیانە و مافی پەرستش و بیروباوەڕو چارەسەری کێشە ناوخۆییەکانیان هەیە، بەشداری سیاسی و ئابووری و هتد...یان بۆ هەبوو و مافی تەوای هاوڵاتیبوونیان لە دەوڵەتی مەدینەدا هەبووە وەك موسڵمانان. تا دواجار کەوتنە پیلان گێڕان دژ بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)و دەوڵەتی ئیسلامیو لەو یاسایە لایاندا کە خۆیان

بڕیاریان لەسەری هەبوو، ئەویش پاراستنی بەرژەوەندی گشتی دەوڵەت بوو، بۆیە دوای ئەو ناپاکیە بە پێی قۆناغ و ئاستی ناپاکیەکەیان دەستە دەستە سزای خۆیان وەرگرت.

واتە ئیسلام ئەو پەڕی ئازادی دەبەخشێت تا ناپاکی بێتە مەیدان، ئەو کات بەپێی ناپاکیەکە دەرکردن و پێ چوڵ کردن وکوشتن سزای ناپاکان دەبوو تا سنوورە گشتیەکانی دەوڵەتی ئیسلامی پێ پەشێو نەبن، هەروەك لە هەموو دەوڵەت و یاسایەکی هەر پارچەیەکی جیهاندا لە هەر ماوەیەکی مێژوویدا سزای توند بۆ ناپاکان بە دەسەڵات هەبووە، وەسیەتەکانی پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) سەبارەت بە نەبەزاندنی سنوورە ڕێپێدراوەکانی ئازادی ڕادەربرین بنەمایەك بوو بۆ هزرو دەستووری ئیسلامی دواتری ناودەوڵەت و کۆمەڵگە ئیسلامیەکان. بەڵام پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نەیهێشت لەسەر بنەمای ئازادی ڕادەربڕین چاڵە ئاگرینەکان و قامچیەکانی ستەم وەك خۆیان بن، بۆ نموونە بتەکانی ناو دەوڵەتی ئیسلامی لەناوبردن و لەگەڵ لێبوردنی بۆ هەموو ستەمکارەکان بەڵام نەیهێشت لەسەر سیستمی ستەمکاری خۆیان برۆن. بەڵام لەناو دەوڵەتی ئیسلامیدا بنەمای گشتی پەیڕەوی ئایینی بریتی بووە لە (فمن شاْ فلیؤمن ومن شاْ فلیکفر).

لەسەردەمی خەلیفەکانی ڕاشدینیشدا ئازادی ڕادەربڕین لە چوارچێوەی دەستووری ئیسلامیدا بەردەوام بوو، ئەوە بوو باری ناوخۆ هەمان ئازادی ئایینی هەبوو، کاتێکیش بزووتنەوەی فتوحات ئەنجامدرا لەسەر ئەو بنەمایە بوو، بانگەواز بۆ ئیسلام، ئەگەر نەیانویست پێدانی سەرانە لەبری پاراستنیان لەلایەن دەوڵەتی ئیسلامیەوە. ئەگەر نا بەوانە ڕازی نەبوون و گرفتیان لەبەردەم بانگەواز بۆ ئیسلامدا هەبوو ئەو کات هێزی چەکداری بەکاردێت. بەڵام ڕێگری ئایینی بوونی نەبوو، تەنانەت هێماکانی ئایینەکان ماونەتەوە، بەڵکو هەوڵیانداوە گومانەکانی بەردەم ئازادی ئایینیش نەهێڵن، وەك ئیمامی عومەر کاتێ چوویە قودس لە کڵێسای مەسیحیدا نوێژی نەکرد نەك موسڵمانان ئەوە بکەنە بیانوو تا سنووری ئازادییان ببەزێنن و ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەوێ بکەنە مزگەوت. لەو بەڵێننامەشیدا کە بۆی نووسین تیایدا هاتبوو( الأمان علی حیاتهم و کنائسهم وصلبانهم لا یضار أحد منهم ولا

یرغم بسبب دینه)، یان ئەو مەجوسیانەی هێنرانە مەدینە ئایینی خۆیان واز لێ نەهێنا و ناچاریش نەکران بە موسڵمان بوون. هێماکانی گۆڕستان و پەیکەری خواوەندەکانی زەردەشتو پەرستگاکانیانو خاچەکانی مەسیح مانەوەو لەوپەڕی ئاستی ڕەچاوی ئازادی ئایینیاندا بوون.

لەسەردەمی دەوڵەتی ئومەویدا لەسەرەتادا کە ئیمامی موعاویە ڕێبەری دەوڵەت بوو ئەو ئازادیە وەك خۆی مایەوە، بەڵام بەرەبەرە سنوورەکە لە چەند لایەنێکەوە بەرتەسك کرایەوە تا ئەوەی سەرانەیان دادەنا لەسەر ئەو کەسانەی سەرانەیان لەسەر بوو و دواتر موسڵمان ببوون هەر سەرانەیان لەسەر لانەدەبرا، چونکە ئەوەیان بە فێڵ دەزانی بەرامبەر بە دەوڵەتی ئیسلامی، بەڵام زوو بە زوو خەلیفەی ناوداری ئومەوی خەلیفە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بارەکەی گێڕایەوە بۆ ڕێڕەوی خۆی وئازادییە لێسەندراوەکانی دانەوە بە خەڵك، لەگەڵ ئەوانەشدا ئازادییە ئایینەکان لە سەردەمی ئومەویدا بەرفراوان بوون و مانەوەی پەیکەرە ئایینیەکان و جیاوازیە ئایینیەکان هەبوون، هاوکات موعتەزیلە لەسەر دەستی واصلی کوڕی عەتا دوستکرا کە خوێندکاری حەسەنی بەسری بوو و دواتر ڕەوتی موعتەزیلی گرتەبەر، لەهەمان مزگەوت و لە پاڵ بازنەکەی حەسەنی بەسریدا وانەی خۆی دەوتەوە و ئەو ڕەوتەش ڕێی لێنەگیرا تا دواجار لە سەردەمی مەئموونی عەبباسیدا گەیشتە لووتکەی دەسەڵات (لە دەوڵەتی عەبباسیدا)ئەو کات موعتەزیلە کەوتە تیرۆری هزری و زمانبڕی ئەهلی سوننە کە ئەو هەمووە ئازادیەیان پێدابوون.

لە دەوڵەتی ئومەویدا ئازادی ئایینی ناموسڵمانان دەروازەو سنووری بەرفراوان بووە تا ئەو ئاستەی دەگەیشتە مەیدانە سیاسیە چەکدارییەکەی، ئەوکات چەك بەرامبەر بە چەك هەڵدەگیرا، لە هیچ دەسەڵاتێکی کۆنو نوێو هاوچەرخیشدا ڕێنەدراوە بە بەرهەڵستکاری چەکداری، بۆیە کاتێك ئازادی ئایینی دەقۆزرایەوە بۆ هەڵوێستی دژایەتی چەکداری، ئەوکات دەسەڵاتی ئومەوی بەرامبەر بەوە چەك و هێزی بەکاردەهێنا وەك ئەو چەند بەرهەڵستکاریە چەکدارییەی لەو ماوەدا ڕوویاندا کە هەندێکیان بۆ چاکسازی بوون وەك ڕاپەڕینی ئیمامی حوسەین، هەندێکیشیان ناپەسەند بوون وەك مەعبەدی جوهەنی وشۆڕشە شیعیەکان.

سەبارەت بە سەردەمی عەباسیی ئەوا لە دوو لایەنەوە باسی ئازادی ئایینی دەکرێ:

١-ئازادیە ئایینیەکانی جگە لە ئیسلام: لێرەدا فراوانترین ماوەی ئازادی ئایینی بەدیدەکرێت بە جۆرێ ئەهلی کیتاب دەستیان دەکرد بە نووسینو بڵاوکردنەوەی ئایینی خۆیانو پەرستگاکانیان کراوەو ڕازاوە بوونو کەسایەتیەکان بەشداری فرەلایەنەیان هەبوو تەنانەت کەسانی مەسیحی دەگەیشتنە پلەی وەزیری و کەسانی جوولەکە نووسەری نزیکی کۆشك بوون، کەسانی مەجووسی لە تاو ڕێ لێ نەگیرانیان هێندە دەرفەتیان هەبوو تا کەوتنە کۆبوونەوە و پەیڕەوی بزاڤی چەکداری وەك بابەکی خوڕەمیو چەندێکی دی، مەسیحیو جوولەکەکان لە بازاڕدا دیارو کارابوونو جەژنو پەیڕەوە ئایینەکانیان زۆر سەربەستانە بوون، بەڵکو لەناو مێژووی عەبباسیدا نابینرێ لێدانێك هەبوویێت بەرامبەر مەسیحیو جوولەکەکان، تەنانەت ئەو جوولەکانەی لەلایەن خاچپەرستانی ڕۆژئاواوە دەردەکران لەلایەن موسڵمانانەوە ئامێزیان بۆ کرایەوە. ئەگەریش لێرەدا نموونە بێنینەوە پێویستمان بە نووسینێکی سەربەخۆ دەبێت، چونکە ناموسڵمانەکان بە ڕاشکاوانە ئەم شایەتیە دەدەن.

٢-ئازادیە مەزهەبیەکانی ناو ئیسلام: لێرەشدا هەمان یاسای پێشوو پەیڕەو دەکرا، ئازادی تەواوی مەزهەبی هەبوو تا کاتێ چەك و هێزی بەرهەڵستکاری چەکداری نەبوایە، بەڵام لە چەند وێستگەیەکی دیاریکراودا ژمارەیەك لادان و سنووربەزێنی دەبینین، بەڵام ماوە ئازادیەکە ماوە لادانەکەی تەواو داپۆشیبوو، بۆ نموونەی مەزهەبو ڕەوتەکان لەم ماوەدا دەرکەوتن، ئەوانەی بە بیری یۆنان کاریگەر بوون ئەو بیرەیان دەهێناو بانگەوازیان بۆ دەکرد، وەڵامدەرەوەکانیشیان هەمان دەرفەتیان هەبوو، بۆ نموونە لەمینبەری مزگەوتداو بە ئامادەیی ژمارەی بەرچاوی خەڵك ڕێبەری موعتەزیلە لەگەڵ ئیمامی ئەشعەریدا مشتومڕ دەکەن کەسیشیان ڕێگرییان لێنەکراوە، یان شیعەکان نووسینەکانیان بڵاوکردوونەتەوەو تەنانەت وەزیریان هەبووە، بەڵکو ئەمە گوتاری دەسەڵاتی ئیسلامی بوو (خەڵکینە پەیامی خۆتان بخەنە ڕووو ئەو پەیامەش بێنن کە پێی کاریگەرن، زانایانی ئیسلامی ئێوەش لەسەرچاوەی نەبڕاوەو کاملی قورئان و سوننەتەوە وەڵامیان بدەنەوە)، هەر بۆیە زێڕیان دەدا بۆ هێنانی

بیری شێواوی یۆنانی و بە هێزی زانستی قورئان و سوننەت کەمی و ناتەواوی ئەو بیرەیان بۆ موسڵمانان دەخستەڕوو.

بەڵام سنوورە سوورەکانیش لەبیر نەدەکران، بۆیە کاتێ حەللاجی بانگەشەکەری خوایەتی هات تا پێش هاواری بۆ خوایەتی بوونی ڕێی تەواوی پێدەدرا، بەڵام کاتێ کەوتە دەستکاری کردنی چەسپاوەکانی ئایین وەك( حەج و سروش و تەنانەت چەمکی خودایی ) (هەرچەندە خەڵکانێکی زۆر لەمڕۆدا بۆی دەکروزێنەوە و بیانووی بۆ دەهێننەوە و ڕۆڵی پارێزەری بۆ دەبینن وەك ئەوەی ئەوان لە زانایانی وەك ئیبن تەیمیە و زەهەبی و ئیبن کەسیرو ڕێبەرانی سۆفی وەك ئیمامی جونەید زاناترو لە حەللاج نزیکترین دەکەونە پاساو بۆ هێنانەوەی)دوای ئەو دەستکاریە مەترسیدارو سنوور بەزێنیانەی درایە دادگاو ماوەی نۆ ساڵ و شتێ دادگاییەکەی درێژەی کێشا ئینجا کوژرا. بەڵام لەماوەی نۆ ساڵدا ڕێی پێدەدرا لەسەر بانگەوازی خۆی بڕوات‌و لەبەر زۆری سەردانکەرانی ژوورێکی گەورەی تایبەتی بۆ دروستکرا بۆ ئەوەی تا کاتی بڕیاری کۆتای دادگا ئازادی ڕادەربڕینی لێ زەوت نەکرێ.

لەسەردەمی عوسمانیدا مەیدانەکە هێندە فراوانکرا کە هەندێ جار سنووری ڕێنمایی ئیسلامی دەبەزاند، بەڵکو کار گەیشتە ئەوەی مەسیحی و جوولەکەکانی دەوڵەتی عوسمانی دەستەو تاقم دروست بکەن و دەرفەتی ئازادی ئایینی بقۆزنەوە و بکەونە پیلان گێڕان دژ بە دەوڵەتی عوسمانی ئیسلامی. مەزهەبەکانیش -بەدەر لە شیعە- هەمان ئازادییان هەبوو، بەڵام دواجار پیلانی نیاز خراپی مەسیحیە ئەرمەنەکان و جوولەکەکانی ناو دەوڵەت‌و گەندەڵی فرەلایەنی تووش بوو بە دەوڵەتی عوسمانی دەستی داگیرکەریان هێنا تا خاکی موسڵمانان بگرن و ئەمجار ئەوان ڕێ بگرن لە ئازادی موسڵمانان لە خاکی خۆیانداو دەسەڵاتی ئەڵقە لەگوێی بیرسەپێنی دیکتاتۆر بکەنە گەورەی موسڵمانان.

بەرامبەر بەم ئازادییە ئایینەی جیهانی ئیسلامی با نموونەیەکی کورتی ئازادی ئایینی لە جیهانی ڕۆژئاوای خاچپەرستی ئەو کاتەدا وەربگرین کە بەرامبەر بە جوولەکەکان چییان دەکرد.

جوولەکەکان لە ئیسسپانیای مەسیحی شاریان دامەزراندبوو و بوونیان هەبوو و خۆیان جیا گرتبوو وەك لە شارەکانی ئەلیسان و ئەلبیرا، لە شارەکانی قورتوبە و ئیشبیلیە و مەلقاو هتد.. بەڵام لە ساڵی ۳۰۳ زایینیەوە (پێش هاتنی ئیسلام) مەسیحیەکان کەوتنە سووکایەتی کردن بە جوولەکە تا خۆراكو ماڵو تێکەڵیدا دوور بگرن لە جوولەکە، دواتر لە ساڵی ٥٨٩ز.دا پاشا ڕیکاردۆ بڕیاریدا هەر کۆیلەیەکی مەسیحی لای جوولەکە بێ بەبێ پرسو بێ بەرامبەر ئازاد بکرێ، کەچی لەو کاتەدا لە مەدینە سەلمانی فارسی کە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) پێی دەفەرموو (سلمان منا أهل البیت) کۆیلەی جوولەکەیەك بوو، کاتێ پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) ویستی ئازادی بکات کابرای جوولەکە داوای شتێکی خەیاڵی کرد، بەڵام پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەو لاسارییەی کابرای جوولەکەی نەکرد بە هۆکاری بەزاندنی سنووری ئازادی جوولەکە و سەلمان بە کۆیلەیی مایەوە تا داواکەی کابرای جوولەکە جێبەجێ کرا.

دواتر لەسەردەمی پاشا سبوتی مەسیحیدا بڕیاردرا جوولەکەکان یان دەبێ ببن بە مەسیحی یان دەبێ وڵات بەجێ بهێڵن، ناچار هەندێکیان بە ڕووکەش بوونە مەسیحی و هەندێکی دیکەش وڵاتیان بەجێ هێشت، کەچی مەسیحیەت وازی لێ نەهێنان و وتی دەبێ سەرلەنوێ تەعمید بکرێن و گۆشتی بەراز بخۆن تا دڵنیا بن لە بوونیان بە مەسیحی، پەیڕەوی ئایینی جوولەکە بە ڕەسمی قەدەغە کرابوو. ئەو جوولەکانەش بە جوولەکەیی مابوونەوە سامانیان دەستی بەسەردا گیرا، کەچی لە جیهانی ئیسلامیدا بازاڕی سەربەخۆیان هەبوو.

لەسەردەمی ئیرفیجدا بڕیاردرا جوولەکە ببنە مەسیحی یان نەك تەنها سامانیان دەبرێ دەبێ لە ماوەی ساڵێکدا وڵات بەجێبهێڵن، لەسەردەمی ئەخیکادا بڕیاردرا هەرچی جوولەکە هەیە بە کۆیلە بگیرێ و منداڵەکانیان جیابکرێنەوە و بکرێن بە مەسیحی، لە ناوچەکانی سەرویشدا کاتێ هەڵمەتی خاچی هات بۆ جیهانی ئیسلامی داخی دڵی خۆی ڕشت بە جوولەکە، جوولەکەکان کە ڕایاندەکرد دەچوون بۆ ناو خاکی ئیسلامی لە ئەندەلووس، بەڵام کە مەسیحییەکان ئەندەلووسیان گرت کەوتنەوە وێزەی جولەکە و چوار هەزار جوولەکەیان

لەیەك کاتدا کوشتن. ئەو جوولەکانەش بە ناچاری دەبوون بە مەسیحیو بە (مارانوس و لەعنەت لێکراو یان ناپاك یان دووڕوو) ناو دەبران، بەڵام دواتر لە ساڵی ١٤٨٣ز.دا دادگاکانی پشکنینی مەسیحی جوولەکەکانیان بەوانیشەوە کوشت کە ببوون بە مەسیحی، لە ساڵی ١٤٩٣ز.دا بە تەواوی لە ئیسپانیا دەرکران بۆ پورتوگالو لەوێوە پاش دوو ساڵ دەرکرانو خوار چواردە ساڵەکانیان هێشتنەوە تا بکرێن بە مەسیحی.

لەبەشی سەرەوەی ئەوروپاش لە ساڵی ١٢٦٢ز. تەنها لە لەندەن پێنج هەزار جوولەکە کوژران، لە ١٢٧٩ز.دا ڕەشەکوژییەکی دیکەیان ئەنجامدا، لەساڵی ١٢٩٠ز. لەسەر دەستی ئیدواردی یەکەم لە ئینگلتەرا دەرکران، دواتر لە وڵاتی دیکەی ئەوروپا دەرکران، بەڵکو ئەوك ارەیان تا سەدەی بیستەمیش بەردەوام بوو. بەرامبەر بەمە جوولەکە لە وڵاتی ئیسلامیدا سەربەرستی زۆری هەبوو، تەنها شتێ لەسەری بوو پێدانی سەرانە بوو کە بڕەکەی لەگەڵ بڕی زەکاتی موسڵماناندا یەکسان بوو، لەگەڵ ئەوەشدا خزمەتی سەربازی لەسەر نەدەما، بەرامبەر بەوە چەند مەرجێ بۆ جوولەکە دانرا بوون وەك ڕێزگرتنی ئیسلام و بە سووك ناونەبردنی، دەست نەبردن بۆ ئابڕووی موسڵمان، هاوسەرگیری نەکردن لەگەڵ کچ و ژنی موسڵماندا، بەشداری نەکردن لە ئاژاوە نانەوەدا، لانەدانی موسڵمانان بە ڕەسمی لە ئایینی ئیسلام، ئەو ڕەخنانەش کە دەدرێنە پاڵ مێژووی ئیسلامی بەوەی سووکایەتی بە ئەهلی زیمە کراوە بەوەی جلی تایبەت بپۆشن و چەکیان پێ نەبێ و....هتد ئەمانە لای کەسانێك بە سووکایەتی دادەنرێن بۆ ئەهلی زیمە، لای کەسانێکیش بە ئیجابی سەیر کراوە بەوەی تا جیاو دیار بن و موسڵمانان لەگەڵیان بەریەك نەکەون و بیانناسنەوە، لەبەر ئەوەش کە بەڵگەی سەریحی لەسەر نیە بۆیە لە مێژووی ئیسلامدا تەنها لە چەند وێستگەیەکی کورت و دیاری کراودا پەیڕەو کراوە، چونکە ئەوان توانیویانە بنووسن و بانگەواز بۆ بیری خۆیان بکەن و دەربکەونو بچنە پۆستە گەورەکانەوە وەك یەعقووبی کوڕی ئیسحاقی کندی کە یەکێ بوو لە دیارترین فەیلەسووفە جوولەکەکانی ناو جیهانی ئیسلامی. بەڵکو مێژوونووس ئارلۆتد پێی وایە بەهۆی تێکەڵی هاوسەرگیرییەوە نزیکی لە نێو موسڵمان و جوولەکەکاندا هەبووە و هەندێ جار

جوولەکەکان لەتاو نەبوونی گلەییان لە موسڵمانان ناوی موسڵمانانیان لە خۆیان ناوە، کەسانی ئەدیبی وەك یەعقوبی کوڕی نەسنائیل و داودی کوڕی عیمرانی نەجید و نەسنائیلی ئیبراهیمی کوڕی حەلفون و سەموئیلی کوڕی عادیا و کەعبی کوڕی ئەشرەف دەرکەوتن، تەنانەت هەیانبووە ناوی خۆی گۆڕیوە بۆ ناوی موسڵمانەکان وەك صەموئیل لاوی کوڕی یوسف کە ناوی خۆی گۆڕی بە ئیسماعیل، یان یەهودای کوڕی صەموئیل کە ناوی خۆی گۆڕی بە ئەبولحەسەن، بەڵکو لە ئەندەلووس حکومەتی خۆیان هەبوو و دەوڵەتی ئیسلامی دەستی وەرنەدایە کاروباریان، بەڵکو نازناوی سەرۆکی ئەکادیمیان لە میسری ئیسلامیدا پشکێکی جوولەکەکان بوو وەك (روش یشیفت یەعقوب) واتە سەرۆکی ئەکادیمیای یەعقوب، موسای کوڕی مەیموون پزیشکی تایبەتی نورەدین عەلی کوڕە گەورەی صەلاحەدینی ئەیووبی بوو. دەستەیەکی زۆری جوولەکەش لە سەردەمی صەلاحەدینی ئەیووبی دا پەنایان هێنا بۆ جیهانی ئیسلامی و صەلاحەدینیش پەنای دان. هەروەها صەلاحەدینیش کە قودسی ڕزگارکرد تەواوی مافی مەسیحیەکانی پاراست و نەیهێشت هیچ ستەمێکیان بەرامبەر بکرێت، ئیدی ئەگەر بمانەوێت نموونە لەسەر مێژووی ئیسلامی بهێنینەوە دەبێ کات و پەڕەی تایبەتی بۆ تەرخان بکەین.

دووەم: ئازادی ڕادەربڕینی سیاسی: لە مێژووی پێغەمبەراندا ئازادی ڕادەربڕینی سیاسی مەودای خۆی هەبووە و لە بازنەی بەدەر لە بەرهەڵستکاری چەکداریدا گوتاریان ئەوە بووە (ئیشی خۆتان بکەن، ئێمەش ئیشی خۆمان دەکەین) بە هاتنی پەیامی ئیسلامیش دامەزراندنی و چەسپاندنی دەوڵەتی ئیسلامی بەرنامەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوو، بەڵام وەك تەواوکەری پەیامی پێغەمبەرانی پێشوو جوولایەوە و پلەی کەماڵی پەیامی خواییش لەو قۆناغەدا بوو، سەرچاوەی بیرو پەیڕەوی سیاسی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە دەوڵەتەکەیدا سروشی خوایی بوو، لە دەوڵەتی ئیسلامی دواتریشدا قورئان و سوننەت سەرچاوە و ئیجماع و ئیجتهادیش لە مەیداندا بوون. واتە بە پشت بەستن بە دوو سەرچاوەی تەشریعی قورئان وسوننەت دەرگای ئیجتیهاد و ڕادەربڕینەکانی زانایان کراوە بوو،

هەر ئەمەش جیاوازی ڕاو زۆری و قەرەباڵغی کتێبخانەی هزری سیاسی ناو مێژووی ئیسلامی هێنایە کایەوە.

لە دەوڵەتی مەدینەدا ئازادی ڕادەربرینی سیاسی لە سێ لایەنەوە بوو:

١-ئازادی ناموسڵمانان: ئەمەش زیاتر جوولەکەکانی دەگرتەوە کە مافی بەشداری ڕاو بڕیاری ناو دەستورەکەی مەدینەیان بەڵگەی ئازادی سیاسییان بوو، تیایاندا مافی جۆرە سەربەخۆییەکی سیاسی و چارەسەری کێشەکان لای خۆیانیان هەبوو، هاوکات مافی بەشداری سیاسی ناو موسڵمانانیش هەبوو بۆ نموونە بۆیان هەبوو ئەگەر ویستیان کێشەکانیان ببەنە لای سەرکردەی ئیسلامی (پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بەڵام وەك موسڵمانانی دیکە لە چەند لایەنێکی بنەڕەتی سیاسیدا ملکەچبوون وەك هەنگاونان بۆ پاراستنی دەوڵەتو دژایەتی نەکردنیو ڕێنەدان بە دەستدرێژی ناحەزان.

٢- ئازادی دوو ڕووەکان: ئەمانە کە لە ڕوخساردا خۆیان بە موسڵمان دەزانی و لە ناخدا دژیان بوون نیازو کاریان لای سەرکردەی دەوڵەتی ئیسلامی ڕوون بوو، بەڵام ڕێیان لێ نەدەگیراو دژایەتیو سووکایەتییان بەرەوڕوو نەدەکرایەوە. بەڵکو لەبری لێدان وریابوون لە پیلان دەگیرایە بەر، بۆ وەڵامی هێرشە ژێربەژێرەکانیشیان خوا قورئانی دانا وەك چۆن بۆ هێرشی بێباوەڕان چەکی دانابوو بۆ وەستان لە ڕووی دووڕووەکاندا قورئان بوو(وجاهدهم به جهادا کبیرا)

٣-ئازادی ڕادەربڕینی سیاسی موسڵمانان: ئەمەش خۆی دەبینیەوە لە ڕاوێژو ڕاوەرگرتن وەك پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لە جەنگی خەندەقدا ڕای سەربازی سەلمانی وەرگرت، لە بەدردا موسڵمانانی کۆکردەوەو ڕای وەرگرتن ئایا جەنگ هەڵدەبژێرن یان دەگەڕێنەوە. لە ئوحوددا ڕای لەسەر ئەوە بوو لە مەدینە بمێننەوە، بەڵام کە دەستەیەکی موسڵمانان ڕایان وابوو بچنە دەرەوەی مەدینە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) ڕاکەی ئەوانی هەڵبژارد، یان ڕادەربڕینی ئەبووبەکری سدیق سەبارەت بە دیلەکانی بەدر، یان ڕاوێژی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لە مەسەلەکانی دیکەی مەدینەدا و ئازادی دەربڕینی ڕای تاکەکان و گوێگرتنی

سەرکردە لێیان هەموو ئەمانە بوونە بەڵگەو بنەڕەت بۆ دواتر ئازادی ڕادەربڕینی سیاسی موسڵمانان بوون.

لەسەردەمی خەلیفەکانی ڕاشدینیشدا سەرەتای ئازادی ڕادەربڕین لە پەیامی یەکەم خەلیفەدا دەرکەوت کە وتی (ئەگەر ڕاست بووم شوێنم کەون، ئەگەر هەڵە بووم ڕاستم بکەنەوە).بەڵام لەبەردەم مەسەلەکانی پەیوەست بە لەناوبردنی دەوڵەتدا ڕێی نەداو دژی هەڵگەڕاوەکان وەستاو سەرکەوت. ڕاوێژی بەردەوامیش لە سەردەمی عومەردا بەردەوام بوو بە جۆرێ ناوی لەگەڵ وشەی دادپەروەریدا لێکئاڵاوبوو لەلایەن موسڵمان و ناموسڵمانەکانیشەوە، لە سەردەمی عوسمانی کوڕی عەففاندا هێندە ئازادی ڕادەربڕین هەبوو تا ئەوەی بێترسانە کەوتنە ساختەی بەڵگەنامە بە ناوی سەرکردەی وڵاتەوە، ئیمامی عوسمان هەوڵیدا بە گفتوگۆ لە گەڵیان ڕێ بکات، داوای گۆڕینی سەرکردەکانیان دەکردن، ئەویش یەك یەك دەیگۆڕین و بە گوێی دەکردن، بەڵام دواجار ئەو ماوە فراوانیەی ئازادیەکە گەیشتە ئەوەی چەکیان لە دژ هەڵگرت و دواجاریش شەهیدیان کرد.

لەسەردەمی عەلی کوڕی ئەبو تالیبیشدا بارەکە گەیشتە ئەوەی خەواریجەکان جیاکارییان دەویست، ئیمامی عەلیش بۆ پاراستنی سنووری ئازادی ڕێپێدراو ئەو پێشنیارەی بۆ کردن (سێ مافتان لەسەرمان دەبێت، ڕێتان لێناگرین لە مزگەوتەکانی خوادا یادو پەرستشی خوای تێدا بکەن، دەستپێشخەری جەنگتان لەگەڵ ناکەین، تا دەستتان لە گەڵمان بێت لە فەیئ‌و زەوی بێبەشتان ناکەین) بەڵام خەواریجەکان سنووری جیاکاریشیان تێپەڕاندو چوونە قۆناغی جەنگەوە، بەوەی کاربەدەستی عەلییان لە نەهرەوان کوشت. ئیمامی عەلی کە داوای کرد ئەو کەسە بدەنە دەست تا تۆڵەی لێ بکرێتەوە ئەوان وتیان بەس ئەو نەیکوشتووەو هەموومان کوشتوومانە و ئەم کەسە نادەینە دەست، ئەوکات ئیمامی عەلی هێرشی بردە سەریان چونکە ئەوان ئەو بەڵێنەی نێوانیان شکاند و جەنگیان لە دژی ڕاگەیاند.

بەڵام لەسەردەمی ئومەویدا سنووری ئازادی ڕادەربڕینی سیاسی تا ئاستێ کۆت کرا بە داخستنی دەرگای خیلافەت‌و کردنەوەی دەرگای میراتگری، بۆیە نەیاری ئومەوی لێی دەدرا،

بەڵام سەرەتا هەنگاوی گفتۆ دەگیرایە بەر، ئەگەر ئەوە سوودی نەبوایە ئینجا لێی دەدرا، واتە ئازادی ڕادەربڕینی سیاسی تا ئەو سنوورە بوو کە باسی لابردنی بنەماڵەی ئومەوی نەکرێ.

لە سەردەمی عەبباسیدا هەمان داخران هەبوو، بەڵام جۆرێ ئازادی زیاتر بەخشرا بەوەی پلەی بنەماڵەیی کرا بە نیمچە هێماو دەسەڵاتە خۆجێیەکان هێنرانە مەیدان بە دامەزراندنی میرنشینەکان و بەشداری ڕەگەزە جیاجیاکانی فارس و تورك و عەرەب، تاکیش جگە لە پلەی خیلافەت بۆی هەبوو هەوڵی هەر پۆستێ بدات تەنانەت ئەمە کۆیلەکانیشی دەگرتەوە، بۆ نموونە ئەحمەدی کوڕی تولۆن کە لە میسر دەوڵەتی دامەزراند سەرەتا کۆیلەیەك بوو کە موسڵمانان کڕییان و پەروەردەیان کرد و ڕایانهێنا، ئەویش لە ئاسۆی بەرفراوانی ئازادی سیاسی دەوڵەتی ئیسلامیدا پێشکەوت تا دواجار توانی ببێتە سەرکردە، پاشان چەندین نموونەی زانایان دەبینین کە بە توندی ڕەخنەیان گرتووە لە سەرکردە سیاسیەکانی دەوڵەتی ئیسلامی، چونکە لە دەوڵەتی ئیسلامیدا سێ دەسەڵاتی خەلیفە و زانایانو جەماوەر جیابوونو پەیوەندی زۆریشیان پێکەوە هەبوو، مەزهەبەکانیش بەشداری سیاسییان هەبوو و پۆستی گەورەیان وەرگرت و بە ڕای سیاسی خۆیان کاریان دەکرد.

لە سەردەمی عوسمانیشدا میراتگری ستەمێك بوو کە مافێکی سیاسی خەڵکی دەبرد، بەڵام مافەکانی خوار ئەوە بۆ هەر تاکێك دەبوون، بۆ نموونە شێخی گۆرانی پاڵنەرو کەسی کارای هەنگاونان بۆ فەتحی قوستەنتینیە بوو کە کەسایەتیەکی کورد بوو، چەندین کەسی مەسیحی ڕاوێژکاری سوڵتان و سەرکردەی سەربازی بوون، بەڵکو زۆرجار ئازادیە سیاسیەکان دەگەیشتنە ئاستی پشتگوێخستن و بێسەروبەرییان لێدەکەوتەوە، بەرهەڵستکاریش لە دەوڵەتدا هەبوو، تەنها ڕێگەنەدەدرا بە بەرهەڵستکاری سەربازی.

بە گشتی ئازادی سیاسی لە سەردەمی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) و خەلیفە ڕاشدینەکاندا بەرفراوان بوو و لە سنووری پەیامی خواییدا بوو، بەڵام لە سەردەمی ئومەویەوە تا ڕووخانی عوسمانی پۆستی کەسی یەکەم کرا بە بنەماڵەیی و لەگەڵ ئەوەشدا پۆستەکانی دیکە کراوە بوون و چەند جار کۆیلە کڕاوەکان گەیشتوونەتە بەرزترین پلە سیاسیەکان، هەندێ

جار ستەمی سیاسی و کوتی بیروڕای سیاسی هەبوو، بەڵام دەروازەی ڕێپێدانی ئازادی سیاسی زیاتر بووە لەو لایەنە داخراوانە، لە بەرامبەردا ئەزموونی نوێی دیموکراتی لە جیهانی ئیسلامیدا پەیڕەو کرا، لە جەزائیر موسڵمانان کە بە دەربڕینی ڕای خۆیان زۆرینە دەرچوون ڕۆژئاوا پێی وتن ئازادی سیاسی لە زەمانتان نابێ زیاتر بڕوات بۆیە کەمینەیان پێشخست، لە سۆماڵ موسڵمانان زۆرینە بوون خێرا فرۆکەی وڵاتانی دیموکراسی بۆیان هەستا، لە فەلەستین کە موسڵمانان بوونە زۆرینە ئابلوقەی هەمەلایەنە دران و لە بری هەر ڕادەربڕینێکی موسڵمانێکدا فیشەك یان مووشەکێکیان پێوەنرا، لە تورکیاش چەند جارێ کوودەتا بەسەر موسڵماناندا کرا کە بە زۆرینەش دەرچووبوون، کوتا هەوڵێشیان لە سەدەی بیست و یەکەمدا بوو کە سەرکەوتوو نەبوون.

سێیەم: ئازادی ڕادەربڕینی هزری: مەیدانی هزری لە تێڕوانینی ئیسلامدا بەرفراوانترین ماوەی هەیە، بەڵکوکراوە بە پێویستی و ئەرکی سەرشان (لاولی الالباب)(لقوم یتفکرون...) (یتفکرون فی خلق السموات والارج...)تەنانەت بێباکانە ئیسلام لایەن و ئایینەکانی دی بانگ دەکات تا مشتومڕ لەسەر مەسەلەکان بکەن (تعالوا ندع أبناءنا وأبناءکم...ثم نبتهل....) پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) زۆر هەوڵی داوە بیری هاوەڵان بجولێنێ تا زیاتر بیریان فراوانتر بکەن، بۆیە ئەو ئازادیە رادەربڕینە هزرییەی لە مێژووی ئیسلامدا بە هەموو ماوەو سەردەمەکانیەوە بەدیدەکرێت پێویستی بە نووسینی چەند بەرگێکە لەسەری، بەڵام چەند نموونەیەکی سەرەکی ئاستی بەرفراوانی ئازادی هزری لە مێژووی ئیسلامدا دەخەینەڕوو:

١-زۆری مەزهەب و ڕەوتەکانی ناو مێژووی ئیسلامی و بوونی چەندێکیان لە یەك سات و شوێندا بەبێ ڕوودانی توندی لە نێوانیاندا وەك شیعەو موعتەزیلەو ئەهلی سوننەو سۆفیو....هتد بە جۆرێ هەرکامیان کتێب و نووسین و وتارو کۆڕی تایبەت بە هزری خۆیان هەبوو و دەسەڵاتی ئیسلامیش ڕێی لێ نەدەگرتن.

٢-قسەکردن لەسەر پیرۆزییەکانی ئیسلام بە پێچەوانەی پەیامی خودایی بەبێ ئەوەی توندیو ڕێگرتن بەرامبەریان هەبێ، بۆ نموونە سەبارەت بە قورئانی پیرۆز موعتەزیلە بە مەخلوقیان دەزانی و شیعەش بە دەسکاری کراویان دادەناو باگەشەشیان بۆ ئەو بیرە مەترسیدارە دەکرد کەچی ڕێیان پێ دەدرا.

٣-سەرەڕای ڕاجیاوازەکانی ناو جیهانی ئیسلامی وەرگێڕان و هێنانی دوو کلتوورە ڕزیوەکەی یۆنانی فەلسەفەگەرا و هیندی جادووگەرا تێکەڵ بە ڕیشەی ئاگرپەرستیو ڕەگی بتپەرستی لە شکڵی فەلسەفێنراویدا لە جیهانی ئیسلامیدا تێکەڵ ببوون و کەچی ڕێیان لێ نەدەگیرا، بەڵکو زانایانی وەك غەزالی و ئیبن تەیمیە و چەندێکی دی بە بنەڕەتی زانستی بەرپەرچیان دەدانەوە، بۆ نموونە ئیبن عەرەبی سەرلێشێواو پێی وابوو کۆتای ئەولیا لە کۆتای ئەنبیا گەورەترە، موحەمەدی بە کۆتای ئەنبیاو خۆی بە کۆتای ئەولیا دەزانی، ئەمە بەزاندنی پیرۆزییەکان بوو، بەلام بازنەی ئازادی هزری مێژووی ئیسلامی نەیوەستاند و لە پێنووس و بیرو زمان بۆ وەڵامی دروست بۆی زیاتری لە ڕوودا بەکارنەدەهێنا.

٤-نووسەرو کەسایەتیە دیارە هزریەکانی ناو جیهانی ئیسلامی تەنها ئەندامانی دەستە ئیسلامیەکان نەبوون، بەڵکو وەك پێشتر ناوی هەندێکیان هێنران بەدەیان کەسایەتی و نووسەری دیاری جوولەکە دیارن.

٥-بەڵکو ڕەوتەکانی جیا لە ڕەوتی ئەهلی سوننەی دەسەڵاتداری گشتی کاتێ لە ناو ئەو دەسەڵاتەدا ئازادانە پێگەیشتنو سەرکەوتن کە بوونە دەسەڵاتدار ئەو ئازادیە هزریەیان داخست، بۆ نموونە ڕێبەرانی موعتەزیلە لای ئەهلی سوننە لەیەك مزگەوتدا لەپاڵ ئەواندا و لەیەك شارو شەقام و شوێندا هاودەم بەوان پەیامی خۆیان دەگەیاند کەچی کە دەسەڵاتیان گرتە دەست لەسەر سەپاندنی ڕایەکیان کە مەخلوقیەتی قورئانە کەوتنە چەوساندننەوە و گرتنی هەرچی زانای دیاری ئەهلی سوننەیە تا بە زۆر پێیان بڵێن قسەی موعتەزیلە ڕاستە، لەسەروو زانا گیراوەکانیشدا ئیمامی ئەحمەد بوو، یان دەوڵەتی فاتیمی شیعی بە هەموو جۆرێ ئەهلی سوننەی بێدەنگ و بیرکوت دەکرد.

ئەمە بەو واتایە نا پاکانە بۆ دەسەڵاتی ناو مێژووی ئیسلامی بکەین، چونکە لادان و قەتیسکردنی ئازادی ڕادەربڕین لە چەند سات و شوێنێکی دەسەڵاتی ئیسلامیدا هەبووە و حاشای لێ ناکرێ، بەڵام لە هێڵی گشتی مێژووی ئیسلامیدا بازنەی ئازادی ڕادەربڕین لە بازنەی ڕاسەپێنی گەورەتر و فراوانتر بووە، تەنانەت هەندێ جار هێندە چوون سنووری بەرگری لە ئیسلامو بڕینی دەستی دەستدرێژییان بۆ سنوورە قەدەغەکراوەکانییان لەبیرکردووە لەپێناو فراوانی سنووری ئازادی ڕادەربڕیندا کە ئەمەش ئەنجامی خراپی لێکەوتەوە.

چەند لایەنێکی دیکەی ئازادی ڕادەربڕین هەن کە ئێمە لێرەدا باسیان ناکەین لەبەر ئەوەی پێویستی بە مەودای زیاتر هەیە، بۆیە بە نموونە سێ لایەنمان هێنان، ئەگەرنا ئازادی ڕادەربڕینی کۆمەڵایەتی لە مێژووی ئیسلامیدا جێی باسە وەك ئازادی کچ یان کوڕ لە دیاریکردنی هاوسەریدا یان ئازادی ڕادەربڕینی منداڵ کە بۆ نموونە منداڵ بۆی هەیە وەك کەسێکی گەورە بە تێڕوانینی خۆی پەنای کەسایەتیەکی نەیار یان بەدەر لە میللەتی ئیسلام بدات. یان ئازادیە مەیدانیو تیۆرییەکانی ئابووری کە لێدوان و لەسەر نووسین لەسەریان پێویستە، ئەمەش کورتەیەکە نەك تەنانەت پوختەیەکیش لە چەند لایەنێکی ئازادی ڕادەربڕین لە مێژووی ئیسلامیدایە کە لەوانەیە کەسانێ لە پێش یان لە دوای ئەم خوێندنەوەش بە هەر لایەنێکدا بیری خۆیان لەسەر ڕایەکی سەپێنراو بەسەر مێژووی ئیسلامیدا داخستبێو بەم نووسینە قەڵس بن، بەڵام بەهەر حاڵ ئەمە پاش خوێندنەوەیەك بۆ مێژووی ئیسلامی نووسراوە، بەو هیوایەی لە ڕوانگەی دادوەری دوور لە ڕقو سۆز هێڵە گشتیەکانی ئازادی ڕادەربڕینی ناو مێژووی ئیسلامی بخاتە ڕوو.

# بەشی چوارەم

# ( ئیسلام و جیهانی هاوچەرخ )

## باسی یەکەم

## ( ئیسلام و جیهانی هاوچەرخ )

کاتێ ئیسلام هات ئایینەکان بەوپەڕی دوژمنایەتیەوە بەرامبەری وەستان و کەوتنە ململانێیەکی توندەوە کە خۆی دەنواند لەو بزاڤە لێ بڕینانەی کە جوولەکایەتی فارسی بەناوی شعوبیەت و باتینیەتەوە وروژاندی، یان ئەو بزاڤە شاڵاوبەریانەی کە بە ناوی ئەوروپای مەسیحیەوە لەلایەن دەوڵەتی بیزەنتیەوە دەبرانە سەر ناوچەکانی جیهانی ئیسلامی، خێرا ئەو شاڵاوانە لە جەنگە خاچپەرستیەکاندا خۆیان نواند کە دەبرانە سەر کەناراوەکانی شام و میسر.

هەروەها جەنگە فرەنجیەکان کە دەبرانە سەر کەناراوەکانی مەغریبی ئیسلامی، دواتر شاڵاوی داگیرکاری کە لە ئەوروپاوە بەرەو هەموو جیهانی ئیسلامی هات و گەیشتە دوورگەکانی مەلابۆو هیندو کەنداوی عەرەب تا دەستی گرت بەسەر قودسدا، دوای هەشت سەد ساڵ لە شکستی جەنگە خاچپەرستیەکان کە ئەوروپا ڕایگەیاندو بە سەرکەوتنی ئەوروپای مەسیحی بەسەر جیهانی ئیسلامی داو دەستگرتنی سیاسی و ئابووری و سەربازی بەسەر موسڵماناندا جەنگە خاچپەرستییەکان کۆتاییان هات.

دواتر ئیسلام بەرنگاری ئەو تەحەدا مەترسیدارانە بوویەوە کە لەڕێی هەوڵی دەست گرتن بەسەریداو ساختەکردنی واتاو پەیامەکانی و وروژاندنی گومان لەسەر ڕاستیەکانی و بەرزڕاگرتنی موژدەبەری مەسیحی لە جیهانی ئیسلامیدا ئاڕاستەی دەکران؛ دواتر جوولەکایەتی صەهیۆنی بەرەو فەلەستین کشاو لە ڕووانگەی بیری ئەوروپییەوە دژ بە جیهانی

صەهیۆنیەت و مارکسیەت یەکەم ڕاگەیەنەرانی جوولەکەی ئەڵمانی صەهیۆنی هرتزل بوون و لە ساڵی ١٨٨٠ دا چوویە ڕووسیا، ئیتر کێبڕکێکە بۆ کارل مارکسی نەوەی یەکێ لە حاخامەکان و کاهینی گەورەی مارکسیەت و خودی مارکسیەت بوو، دەبوو دوارجار هەر جوولەکەیەکی ڕووسی پەیوەندی بکات بە یەکێ لەو دوو بزاڤەوە.

لە سایەی ئەمەوە شیکاری دەروونی بۆ خزمەتی ئامانجەکە دەبینی، دەبینی ماددیگەری مێژوویی بۆ خزمەتی ئامانجەکە بووە، جیاکاری نێوان کڵێساو دەوڵەت و هاتنی بوونگەرایی و هەیبەتیش بۆ هەمان شت بووە.

گۆڤاری فەرەنسای کۆن دەڵێت: بەڕێوەبەرانی گەشەسەندنی کاری ئومەتی جوولەکە جەنگی گەورەی جیهانییان هەڵگیرساندو بەفێڵ و پیلان لەپێناو کۆکردنەوەی ملیارەها سامانو دابەشکردنی خاك و دەسەلاتەکان بەڕێوەیان دەبرد، دواتر لادانی داراییان و ڕێخۆشکەری بۆ گەلی هەڵبژاردەی خوا تا دەست بگرن بەسەر هەموو بووندا، ئەو سەرکردە جوولەکانە بوون پیلانیان بۆ بەلشەفیەت داناو بە سامان خەرج کردن ڕێیان بۆ خۆشکردو وەك تۆڵەی گەلی ڕووسی و تەواوکردنی کارە دۆزەخیە جەنگیەکانیان ئەوەیان نایەوە تا ڕەگەزە مرۆییەکان لەناو بچن و بنەما ئابووریەکان دارمێن، شیوعیەتیش دەستێکی جوولەکەیی صەهیۆنیە بۆ هەڵگێڕانەوەی سیستمە زاڵەکان، گەنی تر لە وێرانکاری و شێواندنی بیروباوەڕ لەلایەن ڕەگەزی جوولەکەییەوە تێگەیشتن گۆڤاری المشرق لە ساڵی ١٩٢١دا بە وەرگرتن لە ڕۆژنامەی موزنیخ پۆستەوە پوختەی کتێبێکی بلاوکردەوە کە لە نیویۆرك چاپ کراو ئەوەی دەگەیاند بزووتنەوەی بەلشەفی لەدەست ڕەگەزی جوولەکەییدایە.

مارکسیەت چیە؟ مارکسیەت دیدێکی گشتی گشتگیرە (Totalism) ڕێگەیەکە بۆ ڕاڤەی سیاسەت و ئابووری و ژیان و دیدە مرۆییەکان، دیدو بانگەوازێکە بۆ کارو فەلسەفە یەکە هەموو لایەنەکانی چالاکی مرۆیی دەگرێتەوەو هەوڵێکە تا مێژوو بە ڕابردوو و ئێستاو داهاتووە وە بکاتە نیزامێکی مەنتیقی کە لەنێو خۆیدا سەرەنجامی حەتمی لەخۆبگرێ وەك

قەدەر، مارکسیەت پێی وایە ماددیگەری بنەڕەتی هەموو شتێکەو پێی وایە ئایین دیاردەیەکە بۆ دەستەوسانی مرۆڤ لەبەردەم هێزە کۆمەڵایەتی و سیستمە دەرەبەگایەتیەکان.

بیروباوەڕی مارکسی ئەوەیە لەبووندا دروستکەرێ نیە بەڵکو بوون ماددەیەو ئایینیش هۆشبەری عەقڵەکانەو دەبێ لەدەستی ڕزگار بیت و پاڵپشتی بنەڕەتیش ملهوڕی و نکوڵی کردنە لەخواو لەڕۆژی زیندووبوونەوەو هەڵوەشاندنەوەی ئەو ماف و پەیوەستیانەی کە هی خێزانن، لەبەرئەوەی خێزان پاڵپشتی نیزامی بۆرجوازیە بۆیە دەبێ ئەو پاڵپشتیە دابڕمێنرێ و لەناوببرێ، تاك پێناوە نەك ئامانج، تاك وردیلەیەکە کە لە جەستەی دەوڵەتدا لەناو دەچێ، دەبێ مافی موڵکداری تاك و مافی میراتگری و مافی بەرهەمی دەستکەوت لەکاربخرێ.

لێرەوە شیوعیەت و ئایین و دوو دژی یێکەوە نەگونجاون، هەروەها دژ بە مەسیحیەتە چونکە هاندەرە بۆ سۆزو ڕەحمەت، شیوعیەت نیزامێکی ماددیە کە بیرۆکەکەی خۆی بیردۆزەکەی مارکسەوە وەرگرتووە کە بانگەشەی ئەوە دەکات چی لە مێژوودا ڕوودەدات لە جووڵەو بزاڤ سەرچاوەکەی بۆ هۆکاری ئابووریەکان دەگێڕێتەوە.

تا هۆکارە ئابووریەکان هەبن ڕێکردەی مێژوویان لەدەستەو بەو ئاراستەی دەبەن کە دەیەوێ. ئیتر هیچ دەرفەتێ نیە بۆ داننان بە خوایەکی دروستکەر یان هێزێ لەپشت غەیبەوە کە مرۆڤ بەرەو سەرەنجامیان ئاراستە بکات، لای ئەوان ئایین تەنها ڕاڤەیەکی هەڵەیە بۆ دیاردە کۆمەڵایەتیەکان و پاشماوەیەکی سیستمە لەناوچووە قۆرخکاریەکانە.

بێگومان مارکسیەتی شیوعیەت بەو واتایە ئایینێکی نوێیە کە ئایینە کۆنەکان بەسووك سەیر دەکات. ئایینێکی ماددیە کە نکوڵی دەکات لەخوا و پەیامەکانی ئاسمان، هەوڵێکە بۆ بەکارهێنانی چینی کارکەر بۆ چینێکی نوێی فەرمانڕەوا کەلەناوبەری تەواوی ئازادی تاکەکەسی و ئازادی نووسینە، ئەمەش بەپێی بڕیارو دەسەڵاتێکی خۆسەپێنی دیکتاتۆری.

کاتێ شیوعیەت هەوڵیدا چەمك و دیدی مارکس پەیڕەو بکات ئاستی ماوە فراوانی نێوان چەمکە هزریەکەی و پەیڕەوی لەڕەگەزە ماددیە هەستپێکراوەکاندا دەرکەوت. بیردۆزەی ڕاڤەی ماددی بۆ مێژوو بیری مارکس نەبوو چونکە داهێنەرەکەی هیگلی فەیلەسووفی

ئەڵمانی بوو، شیوعیەت تەنها هەڵگری ئەو نیە بەڵکو ماددیەکان و دەهریەکانیش لەوەدا بەشدارن.

ڕاڤەی ماددی بۆ مێژوو تاکە ڕاڤە نیە، بەڵکو چەند ڕاڤەو لێکدانەوەیەك هەن کە مۆنتسکیۆ و بۆکل خستوونیانەتەڕوو، هۆکار دانان بە پێی کەش و هەوا و خواردن و خاك زۆرن. ڕاڤەی سامان و باری ئابووریش هەیە کە مارکس یەکێ لەوانەی باس کردووە، بەڵام لە مارکسیەتدا بە بنەڕەتی یەکەم دانراوە.

بەگشتی لە مارکسیەتدا ماددە ڕاڤەی هەموو شتێکی ناوبوون و کۆمەڵگەی مرۆیی دەکات، کاتێ هەڵگرانی ئایینەکان بڕوایان هەیە بە ڕۆح و ماددەش کەچی مارکسیەت تەنها بڕوای بە ماددە هەیە. کاتێ مرۆڤ بڕوای هەیە بەو گیانەی کە بە مردن دەردەچێ، مارکسیەت بڕوای وایە جەستە ئامێرێکە دەزگاو ئامێری جۆراوجۆر کاری تێدا دەکەن و مەرگیش ئەو ئامێرانە لە ئیشکردن دەوەستێنێ. کاتێ موسڵمانان بڕوایان بەوە هەیە ئایین پێناوێکی گرنگی لە جووڵاندنی کۆمەڵگەو پاڵنانی بەرەو گەشەسەندن کەچی مارکسیەت پێی وایە پێناوە ئابووریەکانی هەژاری و دەوڵەمەندی هۆکاری ڕووداوەکانی مێژوون (واتە هەموو شتێ لە ماددەوە سەیر دەکەن).

هەڵەی بنەڕەتی ناو بیردۆزەکەی مارکس ئەوەیە لە سایەی بارێکی پانیدا دایمەزراند کە خێرا گۆڕا. پێش مارکسیەت چەند سیستمێکی تری سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی هاتن کە هەڕەشەیان دەکرد لە بیروباوەڕی ئایینی و تۆمەتباریان دەکرد بەوەی بەربەستی ڕێی چاکسازیە دواتر ئەو سیستمانە هەڵوەشان یان بوون بە سیستمی دیکە، بیروباوەڕی ئایینیش وەك شاخ بەرزو چەسپاو مایەوەو هیچ ڕێیەك نەبوو تا لەدەروونی مرۆڤایەتیدا دەرکرێ یان کاریگەری لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا پشتگوێ بخرێ.

مارکسیەت لە جیهانی ئیسلامی و هێزی ئیسلامیدا خۆی خستەڕوو و قەڵەمڕەوی داگیرکاریشی بە پاڵپشتێ زانی کە ئەویش کاری دەکرد بۆ هاریکاری مارکسیەت لەپێناو

تێکشکاندن و پەرش کردنی هزری ئیسلامی و پەرتکردنی چەمك و واتـای ئیـسلام و بردنـی موسڵمانان بەرەو شتانێکی بێ بایەخ و لارو مەترسیدار.

بەڵام خێـرا چـەمك و واتاکـانی ئیـسلام بەرامبـەر ئـەو پیلانانـە وەسـتانەوەو بـەڕوونی لەبەرامبەریاندا هەڵوێستی ئیسلامیان نیشاندا. چونکە لە ئیسلامدا بەشی پێویست دادوەری کۆمەڵایەتی هەیە کە ئیتر موسڵمانان پێویستیان بەوە نەبێ ڕوویکەنە ڕێبازو بەرنامـەی تـر، ئیسلام یەکسانی و شکۆیان بۆ بەدی دێنێ بێ ئەوەی تاك ئازادی خۆی لێ بـسەنرێ یـان بـێ ئەوەی خەڵك بخاتە ژێر وەصایەی خۆسەپێنیەوە خودی ئەزموونی مارکسی شـیوعی بـەڕوونی دەستەوسانی خۆی دەخاتە ڕوو لەئاست بەدیهێنانی ئەو ئامانجانەدا کە بە بنەڕەتی داناون لـە ڕێبازی خۆیدا. شیوعیەت نەیتوانی سیستمی چینایەتی لەکار بخـات بـەڵکو چـەند چـینێکی سڕیەوەو لەبری ئەوەدا چەند چینێکی نوێی دامەزراند.

بێگومان مارکسیەت لە هیچ شوێنێ وەك لە جیهانی ئیسلامیدا تووشـی شکـست نـەبوو ئەگەر چی ئامانجی بانگەوازەکەی داڕماندنی ئەو سیستمە کۆمەڵایەتیانـە بـوو کـە ئیـسلام بانگەوازی بۆ دەکردن. بێگومان دیارترین بانگەشـەی مارکـسیەت بـۆ لـەناوبردنی جیـاوازی چینایەتی و ڕزگارکردنی مرۆڤ لە کۆیلایەتی بۆ مرۆڤ بوو کـە ئەمانـە گـەورەترین ئامـانج و بەخششی ئیسلام بوون، موسڵمانان هیچ پێویستیان بە ڕێبازی تر نـەبوو بـەڵکو ئیـسلام لـە چوارچێوەی ئیمان بە خواو یەکخواپەرستیدا ئەو ئامانجە بەدیدەهێنێ.

هەموو مێژووی مرۆڤایەتی (لەڕووی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیـەوە) ئاسـتی ڕۆڵـی گرنگی ئایین لە پێکهێنانی ڕووداوەکاندا نیشان دەدات و پێویـستی گرنگـی مرۆڤایـەتی بـۆ بەدواداچـوونی دەخاتـەڕوو هێـشتا ئـەو کۆمەڵگـە ڕۆژئاواییانـەی کـە لەناوجەرگـەی ماددیگەراییـدا داڕمـاون بـەدوای ڕێبازێکـدا دەگـەڕێن کـە تـەکافولی کۆمەڵایـەتییان بـۆ بەدیبهێنێ و ئیمان و دڵنیایی دەروونیان پێ ببەخشێ و ڕارایی و پەرتبوونیان لەسەر لابـات، هەموو ئەمانەش تەنهاو تەنها لە ئیسلامدا هەن.

ئیسلام هەر لە ڕۆژی یەکەمیەوە ڕوویکردە هەژاران و لاوازان و ستەم لێکراوان و مافی بۆ دانان و کۆمەڵگەیەکیشی دامەزراند کە پەیڕەوی ئەو مافانە بکات، بانگەوازەکەشی لە هەموو جیهاندا بڵاوکردەوە هەرگیز هیچ ڕێبازێ یان ئایدۆلۆژیایەکی مرۆیی ناتوانێ بگاتە ئەو ئاستەی کە ئیسلام پێی گەیشتووە.

ئیسلام هەموو ئەمەشی لە چوارچێوەی یەکخواپەرستیدا دامەزراندووە، لە چوارچێوەی ئەخلاقداو بەپێی ڕێبازی ڕێزگرتنی مرۆیی و دادوەری کۆمەڵایەتی. سیستمی زەکات و میرات‌و هی تری بەشتی سوننەت دانەناوە بەڵکو بە بنەڕەتی چەسپاوی واقعی داناوە، هەموو ئەمانەش هاتنە دی بێ ئەوەی دڵۆپێ خوێن بڕژێ یان جیهان بکەوێتە ململانێیەکی خوێناویەوە، دوای ئەوە ئیسلام لە قۆناغەکانی مێژووی مرۆڤایەتیدا بەردەوامە لە کاتێکدا بیردۆزەی مارکسی هێمای قۆناغێکی مێژووی مرۆڤایەتیەو ئێستا هەموو جیهان بیری مارکسی تێدەپەڕێنێ وەك هەر بیرێکی مرۆیی و وا ڕووەو لوتکە هەنگاو دەنێ، دواتر گۆڕانکاریەکان دێن و ئەویش تێدەپەڕێنێ.

مارکسیەت جار دوای جار هەوڵیداوە خۆی ڕاست بکاتەوەو کەم و زیاد لە دیدیدا بکات وەك هەوڵێ بۆ گونجان لەگەڵ گەشەسەندن و ژیاندا، بەڵام ئاین و ئیسلام وانین، ئیسلام چوارچێوەیەکی قووڵ و چەسپاوی داناوە کە سەرچاوەکەی فیترەتەو لەگەڵ هەموو سەردەم و بارەکاندا دەگونجێ.

لێرەوە دەبینین ئیسلامان بەخششی زۆر زۆر زیاترە لە مارکسیەت و ڕەوت و ئایدۆلۆژیا جیاجیاکانی تر چونکە ئیسلام لەسەر تەکافول و پەیوەندی نێوان بەهاکان و تێگەیشتنی قووڵ بۆ خودی مرۆڤ و کەفالەتی جێبەجێکردن لەڕێی مۆرکی ئەخلاقی و بڕوابوون بە خواو بە پاداشتی ڕۆژی دواییەوە دامەزراوە ئەمەش پایەکانی بەرپرسیارێتی تاکەکەسی و پەیوەستی ئەخلاقی دەچەسپێنێ.

ئارنۆلد توینبی پێی وایە مارکسیەت بەرهەمی ژیاری ڕۆژئاواییە و تەنگژەو لاڕێبوونێکی ئەو ژیارە نیشان دەدات، ڕاستی ئەم قسەش لەوەدایە مارکس لەڕاستیدا پەیامێکی پێ

نەبووە بانگەوازی بۆ ژیارێکی نوێ نەدەکرد بەڵکو کوڕێکی چاکەکار بوو بۆ ژیاری ڕۆژئاوایی‌و بیردۆزەکەی خۆی لە فەلسەفەی ئەڵمانی و ئیشتراکیەتی فەرەنسی و ئابووری سیاسی ئینگلیزیەوە دروست کرد بوو واتە چۆڕاوەی ژیاری ڕۆژئاوایی لە لوتکەی گەشەسەندنیدا.

مارکس بڕوای بە ژیاری ڕۆژئاوایی هەیە بە هەموو بەهاو مێژوویەوەو بەو مێژووەشەوە دەنازێ و بەپێشکەوتنی دەزانێ بۆ مرۆڤایەتی لەو ڕێگەیدا کەبەرەو سەرکەوتنی گەورە گرتوویەتیە بەر، تاوانەکانی ئەو ژیارەش بەحەتمیەتێکی مێژوویی دەزانێ کە هێندەی دەیگێڕێتەوە بۆ پێویستی ئابووری هێندە نایگێڕێتەوە بۆ فەلسەفەکەی. هەرچیەك مارکس دەیخاتەڕوو چارەسەرێکە بۆ ڕزگارکردنی ئەو ژیارەو دەرکردنی لە گرێکانی.

بەڵام ئێمە بانگەواز دەکەین بۆ ژیاری خۆمان، عومەر دەڵێت: هەر کەس پشتی بکردایە لە هەژار ئێمە بە پیسکەمان دادەنا، سوێند بە خوا ئەگەر بێنی دەبینی شوان لە شاخی سەنعاوە پشکی لەم سامانەدا هەیەو لەشوێنی خۆشیدایە.

ئەو دیزانیە خواییەی کە ئیسلام کۆمەڵگەو ئابووری پێ ڕێکخستووە هیچ ڕێبازێکی مرۆیی نیە بتوانێ پێیبگات چونکە ئەوەی ئیسلام لەلایەن دروستکەری مرۆڤەوە دانراوە.

ڕێگەیەکی جیا لە سەرمایەداری و مارکسیەت هەیە کە ڕێی ئیسلامە، ئیسلام تەشریعێکی وردی لەسەر مەسەلەکانی دەسەڵات و ئابووری و کۆمەڵایەتی هەیە کە لەسەر ڕێزگرتنی مرۆڤ و ئەخلاقیەتی ژیان وەستاوە، هەرگیز ئەو مەزهەبانەی تر ناتوانن ئەوە ببەخشن کە ئیسلام بە مرۆڤی دەبەخشێ چونکە ئەوان بڕوایان بەوە نیە مرۆڤ جێگیری سەر زەوی بێ بەڵکو بە ئامێرێکی دەزانن، گرنگیدان بە چینی کرێکارو ماندوو تەنها لە بازنەی بڕوابوون بە خوادایە کاتێ مرۆڤ لە شوێنی سروشتی خۆیدا دادەنرێ و ویست و بەرپرسیارێتی‌و پابەندی ئەخلاقی هەیە، بڕوای بەخوا هەیەو لە چوارچێوەی ئەو پەیامەشدا دەجووڵێ کە خوا دایبەزاندووە بۆسەر پێغەمبەرەکانی، هیچ ڕێبازێکی کۆمەڵایەتی ناتوانێ بەدەر لە بازنەی ئایین و ئەخلاقەوە شتێ بە مرۆڤایەتی ببەخشێ، ئەمە لەپاڵ مەسەلەی بیروباوەڕو تەشریع و

ئەخلاقدا، هەرگیز دادوەری کۆمەلآیەتیش بەراگەیاندنی جەنگی دژ بە ئایین یان دیدی ماددیگەری تایبەت نایەتەدی، هەر دەبێ مەسەلەی دادوەری کۆمەلآیەتی ببەسترێتەوە بەو بیروباوەڕەوە کە لە چوارچێوەی میتافیزیقی مەشخەڵ ڕووندا لەسەر یەکخواپەرستی وەستابێ، ئەمەش ئیسلام لە قورئاندا خستوویەتیە ڕوو و دەروونی مرۆڤی پێ شیفا داوە لە ڕاڕایی و گەران لەرێی عەقڵ و فەلسەفەکان، بەراستی ئەو ڕاڕایی و گەڕانە ناتوانێ مرۆڤ ڕێنمـوونی بکات چونکە بۆ شتێ دەگەڕێ کە ناتوانێ خۆی تێوەگلێنێ. بیروباوەڕی دروستی ئایینی دوای گۆڕانی چەمکە بنەڕەتیەکانی هۆکاری هەژاری و دەوڵەمەندی کۆتایی دێ، مرۆڤەکان بەرپرسن لە شێواندنی باری سروشتی خۆیان، ئەوان ئەو ستەمەیان داهێناوە کە بەسەر بێبەشان و ڕەنجدەرانەوەیە، دەی با ئەو بارەی ئاستی ژیان کە تیایدا دەژین ڕێک بکەینەوە، ئەوکات بڕوابوونمان بە خوا سەلامەت دەبێ، خوا ڕۆزی دەدات بە کەسێ کە بیەوێ و دەیگرێتەوە لەوەی بیەوێ، تەنها سامان ڕۆزی نیە، بەڵکو هەر تواناو بەهرەیەك و هەر بەخششێکی خوا بۆ مرۆڤ ڕۆزیە (تەندروستی، هێز، شکۆ، دەوڵەمەندی، سامان، لێزانی، زیرەکی). بەڵێ ئیسلام بەرپرس نیە لە هەژاری و زێدەڕەوی موسڵمانان. بەڵکو ئەوە خودی موسڵمانانن بەرپرسن لەو لاوازی و دواکەوتنەیان چونکە پێچەوانەی ئەو شەریعەتە جووڵاونەتەوە کە خوا داینـاوە بۆ خەڵك.

بێگومان هەموو لێکۆڵینەوە زانستیەکان و ڕاستیە مێژووییەکان جەخت دەکەنەوە سەر پەیوەندی ڕوون و دڵنیای نێوان مارکسیەت و صەهیۆنیەت، چونکە ڕێبەری مارکسیەت کارل مارکسی جوولەکە بوو و چەمك و واتاکانیشی چۆڕاوەی ناو دەروونی پڕ بە کینەی دەستە جیاجیاکانی مرۆڤەو حەزی تۆڵەسێنی هەیە، صەهیۆنیەکانیش دان بەوەدا دەنێن ئەوان یەکەم بانگخوازانی شیوعیەت بوون، شۆڕشی بەلشەفیش بڕیارو کاری ئەوان بوو و دەوڵەمەندانی صەهیۆنیەت بۆ پشتگیری کردنی بەشەفیەت بە سامانیان بەشدارییان کرد.

بێگومان نیزامی سەرمایەداری لیبرالی لە کانگەی جوولەکەوە بوو و ئامـانجی هاریکـاری جوولەکەو شیوعیەت بوو بۆ گەیـشتن بـە دەسـتڕۆیی بەسـەر جیهانـدا و خـستنە بەردەسـتی کەرەستە جیهانیەکان و جوولاندنیان بەپێی ئارەزووی خۆیان.

یەکێ لە توێژەران لایەنی بەراوردکاری نێوان صەهیۆنیەت و شیوعیەت دەخاتـەڕوو و بـەم جۆرە ئاماژەی پێدەدات:

**یەکەم:** دیدیان بۆ ئازادی جەخت لەوە دەکاتەوە لای هەردووکیان ئازادی ئەو واتایەی نیـە کە ئازادیخوازان لە هەموو سەردەمێکدا بۆ ئازادی بەکاریان هێناوە، بەڵکو تەنها یەك واتـای هەیە کـە ئـەویش دەسـەڵاتە. دەسـەڵات مـافی ئـازادی کۆیلـەگیری و سـتەمە، دەسـەڵاتی خۆسەپێنی فەرمانڕەوا خاوەنی هەموو شتێکە لەوانەش خاوەنی عەقڵ و ویژدانی خەڵکیشە.

**دووەم:** شیوعیەت و صەهیۆنیەت بانگـەواز دەکـەن بـۆ پێویـستی دارمانـدنی سیـستمی خێـزانو لـەناوبردنی پەیوەندیـە خێزانـسەکان و کورتکردنـەوەی هـەواداری بـۆ دەسـەڵاتی فەرمانڕەوا، لەدیدی ئەواندا جوانترین سیستم بۆ خێزان ئەو سیستمە هەڵوەشاوەیە کـە خێـزان دەکاتە چەند تاکێکی زێدەڕەو کە بەدگومانن لەڕووی یەکدا.

**سێیەم:** صەهیۆنیەت داوا دەکات جگە لە جوولەکایەتی هەرچـی ئـایین هەیـە لـەناوبرێ، کاردەکات بۆ بڵاوکردنەوەی ملهوڕی لە قۆناغێکی دیاری کـراوی خـەباتی ڕێـی دەسـەڵاتدا. ئەمەش داواکەی شیوعیەتە کە داوا دەکات چی ئایین هەیە لەناو ببرێن و ئایینێکی نـوێ لـە بیروباوەڕی خۆی دروست بکات، ئیتر ئەو بیروباوەڕانە لە پیرۆزی ئایین پیرۆزتر سـەیر بکـرێن. لەپشت ئەو ئایینە ماددیەوە هەموو دیاردەیەکی زۆرو دەسەڵات و خۆسەپێنی هەیە. ئامانجی صەهیۆنیەت سەرکەوتنی یەك ئایینە کە جوولەکایەتیەو تـەواو هاوئامـانجی شـیوعیەتە کـە دەیەوێ یەك بیروباوەڕ سەرکەوێ کە بیباتە ئاستی بیروباوەڕی ئایین.

**چوارەم:** وەك چۆن فەرمانڕەوایانی صەهیۆن بانگـەواز دەکـەن بـۆ گرنگـی هەڵگیرسـاندنی ئاگری شۆڕشێکی جیهانی لەپێناو ملکەچکردنی هەموو جیهان بۆ دەسـتڕۆیی صـەهیۆنیەت، هەرواش فەرمانڕەوایانی شیوعیەت بانگەواز دەکەن بۆ هەڵگیرساندنی شۆڕشێکی لـەو جـۆرە

بۆ ملکەچکردنی هەموو جیهان بۆ دەسترۆیی شیوعیەت، لەپێناو هەڵگیرساندنی ئاگری ئەو شۆڕشەدا فەرمانڕەوایانی شیوعیەت و صەهیۆنیەت باکیان نیە لە پەنابردنە بەر فێڵ و پیلانو سەرشێوێنی و هەواڵگری و دزەکردنە ناو ڕیزی کۆمەڵە نەیارەکانی شیوعیەت و صەهیۆنیەت.

بەگشتی ئیسلام بە ڕێبازە بنەڕەتی و گشتگیرو تەواوەکەیەوە بەرامبەر ئەو مەترسیانەی مارکسیەت و صەهیۆنیەت و بیردۆزەکانیان لەسەر تێکەڵ بوون لە چەند بانگەوازێکی نەتەوەیی یان نیشتمانی یان ڕاڤەکردنیان بۆ ئیسلام دەوەستێ.

ئەوان وا ڕاڤەی ئیسلام دەکەن کە لە مارکسیەتەوە نزیکە یان چەندین خەیاڵی تر، بەڵام ئیسلام لەسەر بنەمای بڕوابوونی گومان هەڵنەگر وەستاوەو پێی وایە ئیسلام نیزامێکی تەواوەو لەسەر پێی خۆی وەستاوەو دابەش بوون یان ڕژانە ناو هیچ قالبێکی تری نیە، ئیسلام ئەو نیزامە چەسپاوەیە کە گۆڕانی نیە و هەڵناگیرێ لەکاتێکدا مەزهەب و ڕەوتەکانی تر پەککەوتن و کەمکردن و گۆڕان و مردنیان تووش دەبێ.

# باسی پێنجەم

## (ئیسلام و مرۆڤایەتی)

ئیسلام بەرامبەر بە هەڕەشەکانی مەسیحیەت و صەهیۆنیەت و مارکسیەت و ملـهوڕی و ڕەوتە وێرانکەرەکان وەستاوە، هەروەك بەرامبەر هەوڵی بە مەسیحی کردن و بە جوولەکە کردنی وەستاوەو لەبەردەم هەموو هەڕەشەکاندا پێ چەسپاوانە وەستاوە، کاتێ مرۆڤایەتی پرسیار دەکات ئایا ئایین دەتوانێ مرۆڤایەتی یان شارستانیەت ڕزگار بکات؟ ئیسلام هەڵوێستی وەڵامدانەوەی حەقیقی دەبێ و توانیویەتی وەڵامی ئەرێی بداتەوە لە کاتێکدا زۆربەی ئایینەکان نەیانتوانیوە لەو ڕێیەدا هیچ شتێ پێشکەش بکەن.

جوولەکایەتی کەوتە ژێر دەسەڵاتی بیری کۆنی بابلی و هەموو فەرهەنگی خۆی لێ پێکهێنا، مەسیحیەت کەوتە ژێر دەسەڵاتی بیری ئیغریقی (میسالیەتی ئەفلاتون و مەنتیقی ئەرستۆ)، ئیسلام توانی لەدەست نەزانی و جاهلیەتی عەرەبی و یۆنانی و مەجوسی و هیندیو فیرعەومی ڕزگاری ببەخشێ. ڕێبازو بەرنامەی خۆیشی بەتەواوەتی پێشکەش بە مرۆڤایەتی بکات بێ ئەوەی هیچ لاڕێکردن و تەئویلێکی تووش بێ.

ئیسلام لە ڕوویەرێکی بەرفراوانی سەرزەویدا بڵاوبوویەوە، ڕوویەرێ زۆر زیاتر لەوەی مەسیحیەت و جوولەکایەتی لەسەر بڵاوبوویەوە، هەروەها ئیسلام لە ماوەیەکی زۆر کەمدا ئەو فراوانیە گەورەی بەخۆوە دی. جوولەکایەتی ڕەگەز بەگەورە ڕادەگرێ و ڕەگەزی بەنی ئیسرائیل بە گەلی هەڵبژاردەی خوا دەزانێ، مەسیحیەت لە کۆمەڵگەدا پێگەی مرۆڤ لەبیردەکات و گرنگی دەدات بە بەرزڕاگرتنی تاك، لەوەوە تاکگەرایی وەك بنەڕەتی بیری ڕۆژئاوایی دامەزرا.

ڕاڤەی مەسیحیەت بۆ سیانە خوایی و دنیانەویستی لەو هەڕەشانەیە کە لەگەڵ عەقڵی نوێدا پێکیدادا، گەلە ئەوروپیەکان لە سەدەی سێیەم و شەشەمی زاینیدا بوونە مەسیحی، بەو جۆرە هەزار ساڵ (دە سەدە) لەو بارەدا مانەوە، دواتر نزیکەی چوار سەدە بێداربوونەوە

کاتێ ئیسلام شوێنکەوتوانی ڕاپەڕاندو لە سەدەی یەکەمی کۆچییەوە ژیارە هەڵکەوتەکەی خۆی دامەزراند، ئیسلام هۆکاری دواکەوتنی موسڵمانان نەبوو، مەسیحیەتیش هۆکاری پێشکەوتنی ئەوروپا نەبوو، گەلە ئەوروپیەکان پێش بوون بە مەسیحی لەدوای بوون بە مەسیحی پێشکەوتووتر بوون، (لینج) لە کتێبەکەیدا (فەلسەفەی مێژوو) دەڵێت: جوولەکایەتی خوا بەسەرچاوەی ترس و چاوچنۆکی دادەنێ، مەسیحیەت جیاوازیە قووڵەکانی نێوان خوایەتی و پێغەمبەرایەتی لابردووە. ئێمەش دەڵێین ئیسلام بڕیاریداوە خوای گەورە بەخشندەو میهرەبانەو تۆڵەسێن و بەهێزیشە، ڕەحمەتی پێش تووڕەییەکەی کەوتووە، خوایەتی جیایە لە پێغەمبەرایەتی و هەرگیز نابنە یەك یان هیچکامیان نابن بەوی تریان، لە ڕۆژئاوادا زانست پوخت زانست نەبووە بەڵکو هەولێ بووە بۆ بەرژەوەندی داگیرکەر. دادپەروەری بە پوختی بۆ مرۆڤایەتی نەبووە بەڵکو کورت کراوەتەوە سەر ڕەگەزی سپی. گیانی ڕۆژئاوایی لە یاسا و سیستم و شەریعەتەکاندا بەڕوونی دیارە کە دوور لە ئەخلاق و ئیمان بەڕۆژی دوایین، لەوانە بەڕەوا دانانی سووخۆری و زینا لەجێ خەوی هاوسەریدا.

ئیسلام ڕایگەیاندووە هاتووە تا هەموو پاکیەك بۆ خەڵك حەڵاڵ بکات و هەموو پسیەکیان لێ حەرام بکات و کۆت و بەندیان لەسەر لابەرێ، ئەمە هەڵوەشێنەرەوەی پێشکەوتن نیە بەڵکو وەستانی ژیرانەیە لە کاتی خۆیدا، قورئانیش بەڕاستی و دروستی پەیامی خوای هێناوە و خاوەن هەژموونە بەسەر کتێبەکانی تردا.

هەروەها ئیسلامی درێژبوونەوەی هزری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری پێش ئیسلام و دوای ئیسلام لەلای عەرەب و دواتر هەموو شوێنەکانی تر دەپچڕێنی، ئیسلام چووەتە هەموو شوێنێ و کاری کردووەتە سەر هەموو ڕەوت و شوێنەکان، هەروەها درێژبوونەوەی بتپەرستی لە هەموو جیهاندا پچڕاند، کۆیلایەتی و زەلیلکردنی مرۆڤی لە هەموو جیهاندا پچڕاند.

بەهۆی ئیسلامەوە جیهان مێژووی کۆنی خۆی تێپەڕاندو میسرو سوریاو مەغریب مۆرکی فیرعەونی و ئیغریقی و ڕۆمانی و مەسیحیەتیان لەبیرکرد، ئیسلام وەك جیاکەرەوەی تەواوی نێوان دوو سەردەم و دوو بیرو دوو ژیار هات و بیروباوەڕەکانی لە پاڵەوان پەرستی ڕزگار کرد.

هەروەك ئیسلام بیرۆکەی ڕەهبانیەت و ڕاکردن لە ژیـانی و نـەرێنی بەرپەرچـدایەوە، دژی ئەو ڕاڤە کۆنە ئایینیانەی ڕەهبانیەت و تاودانە ژن و ئارەزوو وەستایەوە کە باوبوون. بیرۆکەی گرتنەوەی ئاشتی ئـارەزوو و حـەزو تاسـەی تـەواوی جەسـتەیی بەرپەرچـدایەوە، بـەڵکو لـە چوارچێوەی خۆیدا ڕەوایەتی پێدا ئیسلام مۆرکی پەیوەستی ئەخلاقی داناو کردنی بە سـایەی واقیعی بۆ پاراستنی بەهاکان لە پەرتبوون و دابەش بوون.

هەروەها ئیسلام ڕێبازو بەرنامەیەکی تەواوی دانا کە ئایین لە دەوڵەت و ئایین لە زانست و ئەخلاق لە کۆمـەڵگە جیاناکاتەوە. حکومەتێکی خوایی ناناسێ. مرۆڤ لە ئاستە مرۆییەکـەی خۆی بەرزتر ناکاتەوە، تاك بۆ کۆمـەڵگەو کۆمـەڵگەش بۆ تاك دەبێ، ئیسلام لەسـەر بنـەمای ڕەنگ و ڕەچـەڵەك یـان ئـایین جیـاوازی ناکـات لـەنێوان خەڵکـدا و بەتـەواوەتی بەرپەرچـی ڕەهبانیەت و دنیاپەرستیش دەداتەوە، موڵکیەتی تایبەت و ئەرکی گشتی بۆ سامان دانـاوە، سوودو قازانجیشی بۆ هەموو خەڵك داناوە.

ئیسلام بەرامبەر چەمك و دیـدی بـیری مرۆیـی و لاڕێکاریـەکانی بیروباوەڕەکـان و ڕاڤـە پووچەکان بۆ ئایینەکان وەستا، ئەمەش دوای ئەوەی ئـەو تێکەڵیـە سەرسـوڕهێنەرەی نێـوان ئایینە دابـەزیوەکان و بـیری بتپەرسـتی مرۆیـی تـا ئیـسلام هـات و ئەوانـەی جیـاکردەوەو بنەڕەتەکانی ئـایینی حـەقی دانـا. دژایـەتی ئیـسلام بـەڕوونی بەرامبـەر پەرسـتشی هێـزە سروشتیەکان و بەرزراگیرتنی شانۆشکۆی خۆر یان ڕووناکی و تاریکی یـان خواوەنـدی چـاکەو خراپە یان مرۆڤ پەرستی یان تەناسوخ بوو، هـەروەك دژی ئـەوە بـوو مـرۆڤ بـەو بانگەشـەیە ڕاوبکرێ کە کوشتنی نەفسیان سۆزی چۆلەکەیە، دژی ڕەواکـاری پێـسنووری سـامان و ژنـە، جەخت دەکاتەوە لەسەر زیندووبنەوەو پاداشت وەرگرتن و بەهەشت و دۆزەخێ کـە جوولەکـەو دەهریەکان لەدژی ئەوەن. ئیسلام یەکبوونی دروستبوونی مرۆیی لەڕووی گیان و جەستەشـەوە ڕاگەیاندووە، دژی ئەوەیە مرۆڤ بۆ دوو ڕەگەزو لایەن دابەش بکرێ یان دوو لایەن لـە مرۆڤـدا لـە ململانێـدابن. جیاوازیـە بنەڕەتیـەکانی نێـوان سروشـتی خـوایی و سروشـتی مرۆیـی خستووەتەڕوو و تایبەتمەندی و مـەحاڵی تێکـەڵبوونیان یـان یـەکبوونیانی هێنـاوە، ئیـسلام

نەمانی ئەرکی سەرشان بەرپەرچ دەداتەوەو دژی ئەو قسەیە کە دەڵێ هەرکەس گەیشت بە مەعریفەی خوا فەرزی لەسەر شان نامێنێ، هەروەها بەرامبەر بیردۆزەکانی فەیزو ئیشراق و وەحدەتولوجودو حلول و ئیتیحاد دەوەستێ، ئایەتە موحکەکەمانی بە ئومولکیتاب داناوەو مەحاڵی تەئویلکردنی ئەو ئایەتانەی هێناوە بەجۆرێ کە لە واتای بنەڕەتی دەقەکانەوە بەرەو چەند واتایەکی لاڕێی ئارەزووبازی ببرێن وەك ئەوەی هەندێ پێشەوای ئایینەکانی تر لە ڕاڤەی ئایینەکانی تردا ئەنجامیان دا.

ئیسلام ئامانجی دروستبوونی خەڵکی ڕوون کردووەتەوەو ڕێی ئەو ئامانجە و هەنگاو و کار بۆ کردنی بە شێوەیەکی ڕوونی گشتگیر بە موسڵمانان بەخشیوە بەجۆرێ موسڵمان پرسیاری گومان و دوو دڵی نیە لە کاتێکدا ئەو گومان و دوو دڵیە دەروونی کەسانی تری ناموسڵمانی داگرتووە سەبارەت بە پرسیارکردن لە نهێنی بوون و ژیان لەم سەرزەویەدا، نا موسڵمان ناتوانن لەو ئامانجانە تێبگەن بۆیە ژیانیان شلۆق و بارشێواو دەبێ.

هەروەها ئیسلام موسڵمانان بەرەو بەڵگەخوازی دروستکراوان لەسەر خوا دەبات، ئیتر دەزانن لەپشت ئەو جیهانەوە دروستکەرێکی گەورەو پەروەردگارێکی بەخشندە هەیە بەردەوام ئەم بوونە بەڕێوە دەبات و سات دوای سات پارێزەرو بەڕێوەبەریەتی. ئیسلام وەك خۆی ئایینی جیهانی بۆ مرۆڤەکان ڕاگەیاندووەو بەپێی ڕەگەز ناوی خۆی وەرنەگرتووە وەك جوولەکایەتی یان لەسەر ناوی پێغەمبەرەکەی ناوی لەخۆی نەناوە وەك مەسیحیەت بەڵکو ناوی خۆی لە کرۆکی فەلسەفە بنەڕەتیەکەیەوە وەرگرتووە کە خۆتەسلیم کردنە بە خوای گەورە.

ئیسلام سیستمی ڕەهبانیەت و نێوەندگیری نێوان خواو دروستکراوانی سڕیوەتەوەو ئازادی بیروباوەڕی ڕاگەیاندووە ﴿لا إكراه في الدين﴾ بنەمایەکی بنەرشەتی داناوە کە ڕێ بە لاڕێبوون دەگرێ، توانای پاك ڕاگرتنی ئیسلام لە خەوش و خاڵەکان دەبەخشێ تا کرۆکەکەی نەشێوێنرێ. ئەوەشی ڕاگەیاندووە ئایین لای خواوەیەو دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی یان بەرهەمی سەرزەوی نیە وەك ئەوەی ملهوڕەکان ڕایان وایە ئایین بەرهەمی سەرزەوی بێت، وەك وتەی

مارکسیەکانیش نیە کە پێیان وایە ئاین سەرخۆشکەری (هۆشبەری) خەڵك و گەلانە، ئیسلام سوورە لەسەر ئەوەی مرۆڤ بەرەو ئەو لایەنە کردەییە کۆمەڵایەتیە ئاراستە بکات کە لەسەر سوود گەیاندن بە خەڵك دەجوولێتەوەو جەخت دەکاتەوە لەسەر ڕەهایی و ئازادی کۆمەڵگە، کۆتی بەر ڕێی توێژینەوەو وردبوونەوە لە بوون و دروستکراوان و نەزانراوەکان لەبەردەم موسڵماناندا هەڵدەگرێ پاش ئەوەی وردەکاریەکی زۆریان دەخاتە بەردەست.

بەڵام ئافەتی بیری ڕۆژئاوایی (بەتایبەت ئەوانەی ڕێبازی بەراوردکاری ئایینیان هەبوو) ئەوە بوو بە دیدی بێلایەنی و لە ڕێبازێکی پوختی زانستیدا سەیری ئیسلامیان نەدەکرد کە ئارەزووی خۆیانی تێکەڵ نەکەن و پەیوەستی نەکەن بە کینەو چاوچنۆکی خۆیانەوە، هەر لە کۆنیشەوە هەڵوێستی بیری ڕۆژئاوا بەرامبەر ئیسلام وابوو، لەو کاتەوەی ڕۆژئاوا داوای کرد ئیسلام لەو خاکە دەرچێ کە هەزار ساڵ بوو ڕۆژئاوا دەستڕۆیی تیادا هەبوو و دەیوت دەبێ ئیسلام بگەڕێتەوە بۆ نیمچە دوورگەی عەرەبی، لەو کاتەوەی ڕۆژئاوا ڕایگەیاند جێ لەقکاری ئیسلام لە ئەوروپا دا قبوڵ بکات و هەوڵیدا موسڵمانان بکات بە مەسیحی یان کۆچیان پێبکات. هەر لەو ڕۆژانەوە ئەوە هەڵوێستی ڕۆژئاوا بووە بەرامبەر بە ئیسلام، هاوارەکەی گلادستۆن بەرامبەر بە قورئان زۆر لەوە ڕوونترە.

چەندین کەس ئەمە دەخەنەڕوو.

برناردشۆ هەڵوێستی مەسیحیەتی ڕۆژئاوا بەرامبەر بە ئیسلام دەخاتە ڕوو و دەڵێت: پیاوانی ئەکلیرۆش لە سەدەکانی ناوەڕاستدا هەوڵیان دەدا لە ناشرین ترین شێوەدا ئیسلام نیشان بدەن، لە ڕاستیدا ئەوان لە ڕقبوونیان لە موحەممەدو ئایینەکەیدا زێدەڕەوی دەکەن کاتێ بە نەیاری مەسیحی دادەنێن، من پێم وایە پێویستە موحەممەد بە ڕزگارکەری مرۆڤایەتی بانگ بکرێ، بڕواشم وایە کەسی وا ئەگەر ڕێبەری جیهانی نوێ بگرێتە دەست دەتوانێ کێشەکانی چارەسەر بکات.

لەم ڕوانگەوە ئامانجی هەموو فەلسەفە ماددیەکانی پێ شکاندنی پایەکانی بڕوابوون بە یەك خوایی بووەو دەبێ بە چاوپۆشی لەبوونی بەدیلی پێشنیارکراو، بەدیلەکەی ئەوانیش

بەخوا کردنی مادده یان مرۆڤ یان حەزو چێژەکان بوو تا بکرێن بە میحوەر بۆ ڕاڤەی بوون، بێگومان هێرش بۆ سەر یەکخواپەرستی لە بنەڕەتدا مەبەست پێی ئیسلامە چونکە ئیسلام تاکە ئایینە سیفەتی بیروباوەڕی یەکخواپەرستی لە هەر خەوش و خالێکی هاوەڵدانان پاراستووە. لە دیدی جوولەکەدا خوایەکی نەتەوەییان بۆ خۆیان هەیە جیا لە خەڵکانی تر. لای مەسیحیەکانیش سێ خوا هەیە.

مارکسیەت هات تا بیرۆکەی خوایەتی دارمێنێ و مرۆڤ و سەرەنجامی ببەستێتەوە بە ماددیەتی جەستەدارەوەو ڕاڤەی بزاوی مێژوو بە چەند پێناوێ بکات کە ویستی خوایان لەسەر نەبێ، ئەمە وێڕای دوژمنایەتی ڕاشکاوانەی کە لە ڕاستیدا تەنها بەرامبەر بە ئیسلام بوو چونکە بە قەڵای بیری ئایینی دادەنا و بە هێمایەکی دەزانی کە پەیوەندی نێوان خوای تەنهاو مرۆڤی دیاری دەکرد، ئەوەش ڕاشکاوانەترین شاڵاوی بیری نوێ بوو بۆ قەڵای یەکخواپەرستی هەرچەندە لە بەدیهێنانی نیازەکانیدا دەستەوسان کەوت دوای ئەوەی لە دیدی زۆربەی بیریاراندا ئەو بیرەی مارکسیەت کەوتە بەر گورز لێدان.

هەوڵی زۆر درا تا ئایین بە مەسەلەیەکی مێژوویی و پرسێکی قۆناغی بەسەرچوو دابنرێ فەلسەفەی وەزعی جەختی لەوە دەکردەوە ئایین بە قۆناغێکی مێژوویی ناو مێژووی مرۆڤایەتی دابنێ و کاریگەری ئیسلام لە بزاڤی مێژوودا بەکەم بگرێ، ساختەی ئەو قسەیە دەرکەوت کە دەبوت ئیسلام پێویستیەکی قۆناغی بوو وەك ئەڵقەیەکی زنجیری گەشەسەندنی مرۆیی، چونکە ڕاستیە مێژووییەکان تا ئەمڕۆش ئەوە دەسەلمێنن ئیسلام پایەیەکی بنەڕەتی جوگرافیاو مێژوو و ستراتیژیەت و جەنگ و ئاشتیەو ئەو دیوارە بەهێزەیە کە ڕێ دەگرێ لە پڕۆژەی بتپەرستی و ماددیگەری و پیلانی شیوعیەت و صەهیۆنیەت و داگیرکەری ڕۆژئاوایی، ئەمە وێڕای لاوازی توانای ماددی ئەو هێزانە، ئیسلام بەردەوام تا ئێستاش بەرامبەر هەڕەشەکان وەستاوەو بەردەوام کاریگەری هەیە لە گەشەسەندنی ڕووداوەکانی مێژوودا و ڕۆژ دوای ڕۆژ پشتیوانی نوێی دەست دەکەوێ و گەلانێ ئازاد دەکات و بیری مرۆییش بەرەو ڕێگەی ڕاستی پاڵ پێوە دەنێ.

ئەگەر ئیسلام ئەو شەریعەتە خراپ و گەندەڵانەی لەناوبرد کە پێش دەرکەوتنی ئیسلام لەناو فارس و فیرعەونی و یۆنان و ڕۆمان و هیندا باوبوون و چینێکیان بەرز ڕادەگرت و کۆیلایەتییان دادەمەزراندو جەختیان دەکردەوە سەر ڕەگەزپەرستی، ئیسلام لەم سەردەمەدا هیچ دوانەکەوتووە لە تێکشکاندنی ئەو سیستمانەداو تێگەیاندنی شوێنکەوتووانی تا ئیسلامیان وەك ئایینێکی گشتگیرو تەواو بناسن و شەریعەتەکەی پەیڕەو بکەن و ئەخلاق و بیروباوەڕی ئیسلامی پەیڕەو بکەن. دیارترین دیاردەی ئەمڕۆ ئەو هەڕەشە ڕوونەیە کە لە ئاسۆی جیهانی ڕۆژئاوادا دەرکەوتووە کە ئەویش گەڕانە بۆ ڕێبازێکی نوێ، ئەو ململانێیەی نێوان ئایدۆلۆژیاو ئایینەکان بەردەوام هەبووە (ئایدۆلۆژیا ئەو سیستمە هزریەیە کە هەوڵ دەدات ببێتە ڕێبازی ژیان و دەستکردی مرۆڤە لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی تر و لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر جیاوازەو لەیەك سەردەمدا پێویستی بە گۆڕانکاری بەردەوام هەیە، لە یەك کۆمەڵگەدا گۆڕانکاری یەك دوای یەکی دەوێ تا ئێستا هیچ ئایدۆلۆژیایەك نەبووە دەساڵ بێ گۆڕانکاری بمێنێتەوە، بەڵام ئایین ئەو ڕێبازە ڕاست و حەقەیە کە دابەزیوە.

توینبی دەڵێت: ئایینە ئاسمانیەکان هاتن تا خێرو چاکەی تاکەکەسی لە ژیانی کەمینەی ناو ئەندامانی کۆمەڵگەدا بگرنەبەر بەجۆرێ نەچێتە بواری ژیان و هەڵسوکەوتیانەوە، دەکرێ لە وەڵامی ئەوەدا بڵێین: خودی ئەو ئایینانە وا پێکهاتوون کە ئایینی پەرستشن، توینبی ئاماژە بەوە دەدات و دەڵێت ئایینی مەسیحی تایبەتە بە مرۆڤ و لە تایبەتمەندی کۆمەڵگە جیایە، بەڵام ئیسلام وانیە چونکە تاکە ئایینە کە بانگەواز دەکات بۆ دامەزراندنی ڕێبازی ژیان و سیستمی کۆمەڵگە لە بنەڕەتێکی خواییەوە (قورئان) بەڵام پرسیارەکە ئەوەیە: ئایا ئەو ڕەوت و ئایدۆلۆژیایانە کە هەموویان بەرهەمی ڕۆژئاواو ژیاری ڕۆژئاوان دەتوانن پەیوەندی ئایینەکان بە مرۆڤەوە کۆتایی پێ بهێنن و چارەسەری کێشەکانی کۆمەڵگەو هەڕەشەکانی سەر مرۆڤایەتی بکەن؟ ئەمە وەڵامی نەرێتی تەواوی بۆ دادەنێ. ئەو کۆمەڵگەیانەی هەوڵیاندا ئایدۆلۆژیای عەقڵی مرۆیی پەیڕەو بکەن تا ئەمڕۆش گیرۆدەن بە

دڵنیاییەوە گەڕانەوەی مرۆڤ بۆ ئایینەکان (ئـاییـنی حـەق) ڕێـی ڕزگاربوونیانـە لـە کـەوتن و لێکهەڵوەشان و دارِمانی ڕۆحی و ماددی.

مرۆڤ بۆی دەرکەوتووە ئەو زانستەی پێـی گەیـشتووە لـە ئاسـت ڕاڤـەبوون و ژیانـدا زۆر کەمـەو وتـەی کۆتـایی لـە سەرەنجامیـشیدا لەبەردەسـتدا نیـە،[1] دەکـرێ بڵـێین کۆمەڵگـە ڕۆژئاواییەکانی ئەمڕۆ تینووی ئایینن و بە چارەسەری ڕاڕایـی ئـەمڕۆی دەزانـن، ئـەزموونی مرۆڤیش لەو بارەوە کەم و دانسقەیە، ئەو کۆمەڵگانەی لە یەکبوونێکی سۆزداری و سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووریدا ئایینیان وەرگرتـووە تێکـەڵ بـوون. لێکۆڵینـەوە لـە ئیـسلام و لـێ تێگەیشتنی بەپێی بنەڕەتەکانی لە داهاتووی نزیکدا دەبێتـە هۆکـارێکی گرنگـی ڕێنمـوونی مرۆڤایەتی دوای ئەوەی زانستی نوێ ئاسۆی جیهانی خـستەڕوو و زیـادە زانیـاری و بەڵگـەی نوێی لەسەر گەورەیی خوا پێـشکەش بـە مـرۆڤ کـرد کاتـێ بەڵگـەی بـۆ دێنێتـەوە لەسـەر گەردوونی بەرفراوان و سەرسوڕهێنەر کە خوا دروستی کردووە.

با موسڵمانان یەکەجار ئیسلام پەیڕەو بکەن و موسڵمان بن هەتا ئـەزموون بخەنـە بـەردەم مرۆڤایەتی با موسڵمانان لە کۆمەڵگەکانی خۆیاندا بەرگری بکەن لە ئیسلام چونکە هـەرگیز ئەوان ناتوانن بەو پەیامەیان مرۆڤایەتی بەرەو ڕووناکیەکی نوێ ڕێنمونی بکەن تـەنها لـەڕێی ئیسلامەوە نەبێ مەگەر ئەوەی خۆیان لەسەر ئیسلام بیروباوەڕو ڕێبازێکی ژیان دابمەزرێنن.

لە شارستانیەتی ڕۆژئاوادا تەنها شتێ کە موسڵمانان پێویـستیان پێـی بـێ ئـەو زانـستە سروشتیە ئەزموونیەیە کە گەورەی عەقڵی مرۆڤایەتیە بەگشتی و موسڵمانانیش لـە بنیـادی یەکەمیدا بەشداربوون کاتێ ڕێبازی زانستی ئەزموونیان دامەزراند، کۆمەڵایـەتی ڕۆژئـاواش بۆ موسڵمانان هیچ پێویست نیە چونکە خۆیان ڕێبازی ڕەسەنی خۆیان هەیە، میتـا فیزیقیـای ڕۆژئاوا بەرهەمی عەقڵی کورتی مرۆییـە، موسـڵمانان ڕێبـازێکی تـەواوی میتـا فیزیقییـان بەخشیوە کە دوای ئەوە لەو بوارەدا پێویستیان بە هیچ ڕێبازێکی تر نیە.

---

١- الأستاذ يحيى الهاشمي في تعليقه عن كتاب العادة والتغيير لتوينبي.

بەڕاستی دەکرێ بڵێین ئیسلام هەرەم و پەیکەری بنیاد نەناوە بەڵکو دەروون و عەقڵەکانی دامەزراندووە، گەلانێ کە ملکەچی کۆیلایەتی و ستەم بوون پەیکەریان دروست دەکرد، بەڵام ئیسلام هات تا دەوڵەتی بیر دابمەزرێنێ و هەموو شتێ بگێڕێتەوە بۆلای خوا.

ئەگەر لە شۆڕشە گەورەکانی ناوچە جیاجیاکانی جیهان بکۆڵینەوە کە پەرستگاکانیان وێران کردن و پیاوانی ئایینییان بەدیل گرتن بنەڕەت و سەرچاوەکەیان شۆڕش بووە دژ بەو کۆت و بەندانەی کە ئەکلیرۆس و کاهینان بەناهەق لەسەر خەڵکیان دانابوون.

ئیسلام بوو ڕۆحی ئەوروپی ڕۆژئاوایی دوای هەزارساڵ کۆیلایەتی و زەلیلی ڕزگار کرد، ئەو دووانەش بەناوی ئایینەوە بەتوندی ڕۆحی ئەوروپییان کۆت کردبوو، لە ئەندەلوس ئیسلام سەرچاوەی ڕووناکی و تیشك بوو بۆ ئەوروپا، جیمس بریستد دەڵێت سەردەمی ئیسلامی لە ئیسپانیا گەورەترین پێناو و هۆکاری مەدەنیەتی ئەوروپا بوو، کەنارگیری موسڵمانان لە ئیسپانیا واتای دارمانی شارستانیەت بوو لەبەردەم هەمەجیەتدا.

دەکرێ بڵێین ئیسلام بیروباوەڕی یەکخواپەرستی بەرامبەر بتپەرستی و فرەخودایی دامەزراند، بیرۆکەی ڕەوایی جوانی و خۆشی ژیانی بەرامبەر بە ڕەهبانیەت دامەزراند، پەیوەندی ڕاستەوخۆی لەگەڵ خوادا بەرامبەر بە نێوەندگیری پیاوانی ئایینی دانا، ڕێبازی تەواوکاری بەرامبەر بە شکاری بەکارهێنا. بەرپرسیارێتی کۆمەڵگەی بەرامبەر هەژارو لاوازان لەبەرامبەر کوشتنی لاواز و هەژاراندا دامەزراند. برایەتی مرۆیی بەرامبەر بە ڕەگەزپەرستی دانا، تاکی بۆ کۆمەڵگەو کۆمەڵگەی بۆ تاك داناوە بەرامبەر بە تاکگەرایی دەمارگیری یان کۆمەڵکاری ستەمکاری، خوا بەرامبەر بە سووخۆری کڕین و فرۆشی حەڵاڵ کردووەو ڕایگەیاندووە خوا پەروەردگاری جیهانیانە، ئەمە بەرامبەر بە ڕای خوای تایبەت، لەبەرامبەر دەهریەدا جەخت دەکاتەوە سەر ڕۆژی دوایی و پاداشت وەرگرتنەوە بەرامبەر بیردۆزەی گەشەسەندنی ڕەها هەریەك لە ڕێبازی چەسپاوی و بزاوتی ڕاگەیاندووە، چەسپاوی ئەخلاقی بەرامبەر بە ڕێژەیی بوونی پووچی ئەخلاقی ڕاگەیاندووە، ئایینێکی پێشکەش کردووە کە لەگەڵ عەقڵدا بەریەك ناکەوێ، ئەمە بەرامبەر بە نهێنی و ئەفسانەکان،

کۆیلایەتی مرۆڤی هەڵوەشاندەوەو لە کۆیلایەتی شارستانیەتەکان ڕزگاری کرد، مافی ئافرەتی بەرامبەر بە ستەمی گەورە لە ئافرەت ڕاگەیاندووە. دەمارگیری هۆزایەتی هەڵوەشاندووەتەوەو لەبری ئەوەدا برایەتی بیروباوەڕی داناوە، تەواوکاری و پەیوەندی نێوان جیهانی ناوخۆو دەرەکی مرۆڤ و نێوان جیهانی غەیب و جیهانی بینراو ڕادەگەیەنێت، هەستی شکۆو عیزەت بەهەڵگرانی دەبەخشێ و لەهەر زۆر لەخۆکردن و ناڕاستکاریەك ڕزگاریان دەکات، بانگەواز دەکات بۆ فیترەت و نکوڵی لە تەقلید دەکات، بانگەواز دەکات بۆ حەق. هەرکات لایەنی ڕاست دەرکەوت، بانگەواز دەکات بۆ چەسپاوی ئامانج و فرەپێناوی،چەسپاوی کرۆك و گۆڕانی وێنە ڕادەگەیەنێت.

دیارترین هێمای بەهێزی ئیسلام توانای خۆداڕشتنەوەیەتی و ئاشکراکردنی ئەو شاراوانەی ژێر پەردەیە کە هەوڵ دەدەن کرۆکی شتەکان بشارنەوە، بەرپەرچدانەوەی ئەو مەزهەب و بیردۆزانەیە کە لەگەڵ ڕێبازی ئیسلامدا ناگونجێن.

ماوەی زیاد لە سەد ساڵە ئیسلام لە دەستەوسانیدا ڕێ دەبڕێ، ئەو هێزەی بەرچاو نیە کە هێزەکانی پاڵنەری دەبن، هێزە دەرەکیەکان ڕێ نادەن بگات بە ئامانج و ویستی بەدیهێنانی دامەزراندنی کۆمەڵگەی ئیسلامی، ئیسلام لە ژیانی موسڵماناندا ماوەتەوەو بە بەردەوامیش دەمێنێتەوەو هەرگیز لە بەردەم موژدەبەری ئەدەبیدا ناکەوێ چونکە ئیسلام دیدی خۆی نوێ دەکاتەوەو پایەی چەسپاوەو بەردەوامیش قورئان لەسەر حەق وەستاوەو حەق دەگەیەنێ. ئیسلام ئەمڕۆ بەخششی هەیە بۆ مرۆڤایەتی و لە داهاتووشدا هەر بەهەمان شێوە بەخشش دەکات. هەموو بەڵگەکان ئەوە نیشان دەدەن ئیسلام بەرەو ئامانجی خۆی دەڕوات تا بەخێراترین کات پەیامەکەی بگەیەنێ و جێبەجێ بکات.

لەو بەراوردکاریەدا کە ئینسکلۆپیدیای مێژووی مرۆڤایەتی لە لێکۆڵینەوەی ئایینەکاندا لە سەدەی بیستەمدا هاتووە، ئینسکلۆپیدیاکە سەبارەت بە ئیسلام دەڵێت: ئیسلام لە سەدەی بیستەمدا بە جۆرێ بەریەککەوتنی هەبووە کە لەگەڵ گۆڕانە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکانی ئەم سەردەمەدا کەوتنی نیە، لەبەرئەوەی ئیسلام ئایینێکە لای شوێنکەوتوانی

یاساو شێوەی ژیـان لـەخۆدەگرێ بۆیـە دەبـێ ڕەگـەزێکی بزاوتـەکانی ئـازادیخوازی گـەلانی ئیسلامی بێ لەدەست حوکم و دەسەڵاتی نا موسڵمانان و بڵاوکردنـەوەی گـۆڕانی گـەورە لـە سەدەی بیستەمدا لە بواری سیاسیدا، زیندووبوونەوەی ئیسلامی بەشێکی جیا نەبووەوەیە لـە شۆڕشی سیاسـی و ئـابووری نێـوان گـەلانی ئیـسلامی. ئیـسلام سەرچـاوەیەکی ڕۆحـی بـۆ نەتەوایەتی و لایەنی ڕۆشنبیری و سیاسی پێـشکەش کـردووە، دژ بـە دەسـتڕۆیی ڕۆژئـاوایی جیهادی بەخشیوە کە هەندێ تایبەتمەندی پیرۆزی جەنگی هەیە، لـە ئیـسلامدا کـە ڕێبـەری ڕەوشتی سیاسیە دەبینین سوور بوونی تەواوی هەیە لەسـەر یەکـسانی نێـوان بـاوەڕداران کـە لەگەڵ ئاراستە نوێ دیموقراتیەکاندا ڕێ دەکات.

ئیسلام هەر لە خۆداڕشتنەوەیەوە پێکهاتەیەکی ڕوونی سەربەخۆی پێکهێنا، خێرا ڕەنگـی تایبەتی لەسەر نەخشەی جیهان دەرکـەوت، جیهـانێکی سـەربەخۆی خـاوەن مـۆرکی تـاك و ڕێبازی تەواوی نوێگەری یەکخواپەرستی و ئیمـان و ئـەخلاق. لـەو ڕۆژەوە موسـڵمانان یـەك قیبلەیان هەبوو کە هەرگیز لەو قیبلە لایان نەداو دڵیان وابەستەی و عەقڵیشیان بـە ئیمـان و هزریش هەواداری بوو، لەو ڕۆژەوە تا ئەمڕۆ و هەتا هەتایە کەعبە مەڵبەنـدی بازنـەی سـەر خاکی ئیسلام دەمێنێتەوە.

پەیڕەوی ئیسلام هەستی خەڵکی کڵپە پێدا تەنانەت ئەوانەش کە ڕێبـازێکی پێـچەوانەیان هەبوو، ئۆگەست کۆنت دەڵێت: کاتـێ دەڕوانمـە دەسـتەیەکی موسـڵمانان کاتـێ پەرسـتش و فەرزی نوێژیان بە کۆمەڵ و چڕوپڕی و بێدەنگی و ئیمانی شیرین و سازگارەوە پـەیڕەو دەکـەن سەرسام دەوەستم بەڵام گەورەیی ئەو ئایینەیە دەزانێ چۆن ئەندێشەکان ژێرو دەروونەکان پاكو دڵەکان ڕۆشن و ئەخلاق بە پەیڕەو بکات و هەڵگەڕانـەوەی ڕۆحـی لەناوبـەرێ و بیگـۆڕێ بـۆ خشوعێکی قووڵ و خاکیبوونێکی پڕ لە ملکەچی بۆ خوا.

بێگومان ئەو واتایە پەیوەندی هەیە بەو ڕۆڵە گەورەوە کە موحەممەد ﷺ لە بنیادنانی ئـەم ئوممەتە لەسەر قورئان پێی هەستا، تا ئێستاش و هەتا هەتایە بە پێـشەنگی بـاڵاو پێـشڕەوی چاك دەمێنێتەوە کە بەرێز دان پێدانانەوە دەمارگیری لەزۆربەی خەڵك دامالێ.

(فیلیپ حەتی) دەڵێت: مێـژوو جگـە لـە پێغەمبـەر موحەممـەد کەسـێکی تـری تۆمـار نەکردووە کە خاوەنی پەیامێك و دروستکەری ئوممەتێك و دامەزرێنەری دەوڵەتێکیش بێ، ئەو سێ شتەی کە موحەممەد ئەنجامیدان دامەزراندنیان یەکبوونێکیان تیابوو کە ناکرێ لـە یـەکتر جیابکرێنەوەو تا ئاستێکی زۆر پشتگیرو بەهێزکەری یەکترن، لەنێویانـدا ئـایین بـە درێـژایی مێژوو تاکە هێزبوو و لە هەموویشیان زیاتر مایەوە تا ئـەوەی کـە خـەڵکی جیهـانی ئـەمڕۆ ببینی دەبینی لە حەوت یان هەشت کەسدا یەکێکیان خۆی بە موسڵمان دەزانێ.

بەو جۆرە ڕاستە بڵێین موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) لە دیدی کەسـە حـەق بێژەکانـدا یەکەم سەرکردەی بیری مرۆییە کە بانگەوازی ئەوە دەکات خۆرو مانگ دوو بەڵگـەی خـوان و هیچکامیان لەبەر هیچ کەس ناگیرێن، ئیسلام زیاتر لە دەستڕۆیی بـیری فەلـسەفەی عـەقڵی دەستڕۆیی هەیە بەسەر مرۆڤایەتیدا، دەستڕۆیی هەیە بەسەر بیرو عەقڵ و ڕۆحـداو ڕێنمـوونی بەهەموو مرۆڤایەتی پێشکەش دەکات و پایە و پاڵپشتیەکانی ژیاری سبەینێ دادەمەزرێنێ.

توێژەران نەیانتوانیوە نهێنی ئەو بڵاوبوونەوە گەورەو بەرفراوانەی ئیسلام هەر لە سەرەتاوە لێکبدەنەوە نهێنی ئەو چەسپاویە گەورەی ئیسلام لە هەر شوێنێ کە بۆی چووە، نهێنـی ئـەو یەکبوونەی کە هەڵگرانی گرتوویانەتەبەرو تا ئێستاش هێزە تـوڕەو داگیرکـەرەکان سـەدەیەکە لێی دەدەن بۆ ئەوەی یەکبوونی لەناوبەرن.

(تریتۆن) ڕاست دەکات کە دەڵێت ڕاڤەی ماددی بە سـەختی شکـست دێنـێ لـەوەدا کـە یەکبوونی عەرەب و سەرکەوتنیان بەسەر کەسانی تردا (لە سەرەتای ئیسلامدا)و دامەزراندنی شارستانیەتیان و فراوانـی مـاوەو سـنوریان و پـێ چەسـپاوییان لـە مـاددی لێکدەدەنـەوە، مێژوونووسان ناچارن بۆ هۆکاری ڕاستی ئەو دیاردە دانسقەیە بڕوانن و دەبیـنن شـتێکی نـوێ لەم نێوەندەدا هەیە کە ئەویش ئیسلامە، دەبینن ئیسلام هێزێکی گەورەی پڕ زیندوێتیـە کـە پاڵنەرە بۆ بنیادو ڕێـی شارسـتانیەت و یەکـدەنگی و بڵاوکردنـەوەی ئیـسلام و بـەدیهێنانی دادپەروەری بەجۆرێ دڵەکان وابەستەی یەك و گەلان وابەستەی یەکدی بکات. لێرەوە دەزانـین

ئەو هێزە چیە کە تا ئەمڕۆش ڕێـی نـەداوە بیروبـاوەڕی ئیـسلام لاڕێ بـێ و ناکەوێتـە داوی تەقلید یان تەئویل یان پاشکۆیی یان دەرچوون لە سەرچاوە یەکەنینەکان.

عومەری کوڕی خەتتاب ڕاستی فەرموو کاتێ بانگمان دەکات تا بڕوانینە مێـژووی کـۆنی پێش ئیسلام تا جیاوازیەکان بزانین، عومـەر دەڵێت (ئیسلام بەرەبەرە لێکهەڵدەوەشـێ ئەگـەر لەناو ئیسلامدا خەڵکێ دەرکەوتن کە نەزانن سەردەمی جاهیلی چۆن و چی بووە).

بەڵێ کلیلی هەموو ئەوانە ئەوەیە ئیسلام بەردەوام کارو ئـەرکی سروشـی پاراسـتووە کـە کتێب و ئایینی خوایە، تا ئێستاش پێـشەنگی پێغەمبـەر ﷺ لەبـەردەم موسـڵمانانندایە بـۆ پەیڕەوی ئەم ئایینە، ئیسلام هەرگیز بڕیاری ئەوە نـادات عـەقڵی مرۆیـی بـە تـەنها توانـای ئەوەی هەبێ لە ژیان تێبگات یان مرۆڤایەتی وای لێهاتبێ بتوانێ پەیامی بەحـەق دابـەزیوی ئاسمان لە بنەڕەتە ڕەسەن و ڕیشەییەکانی خۆی تێپەڕێنێ.

أنور الجندي.

# ناوەڕۆك


بابەت — لاپەڕە

پێشەکی وەرگێڕ....................5
کورتەیەك لەسەر نووسەر(أنور الجندي)....................١٣
ناونیشانی هەندێك لە کتێبەکانی:....................٢١
کورتەیەکی ژیانی ئەنوەرلجوندی (١٩١٧-٢٠٠٢)....................٢٣
خاڵەکانی وەرچەرخان لە ژیانی ئەنورلجوندیدا:....................٢٥
ئاستی فیکری و زانستی ئەنوەرلجوندی:....................٢٥
سەرەتاکانی نووسینی:....................٢٧
هەندێك لە رەوشتەکانی مامۆستا ئەنوەرلجوندی:....................٣١
کۆتا رۆژەکانی ئەنوەرلجوندی....................٣٤
*دەروازەی لێکۆڵینەوەکە:....................٣٧
*پێناسێکی ئیسلام:....................٤٧
بەشی یەکەم: (جیهان و ئیسلام)....................٥٣
باسی یەکەم: (جوولەکایەتی)....................٥٣
باسی دووەم: (مەجووسیەت)....................٦٣
باسی سێیەم: (بەرهەمی و بووزی)....................٦٧
باسی چوارەم: (هێلێنی)....................٧٥
باسی پێنجەم: (ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی)....................٨١
باسی شەشەم: (مەسیحیەت و ڕۆژئاوا)....................٨٥

باسی حەوتەم: (فیرعەونی)........................ ١٠٣
باسی هەشتەم: (بتپەرستی عەرەبی) ........................ ١٠٩
بەشی دووەم: (ئیسلام و جیهان)........................ ١١٥
باسی یەکەم: (فتوحاتی ئیسلامی)........................ ١١٥
باسی دووەم: (سەردەمی پرشنگداری سەدەکانی ناوەڕاست)........................ ١٣٥
باسی سێیەم: (موسڵمانان و دەریای ناوەڕاست) ........................ ١٥١
باسی چوارەم: (مێژووی ئیسلامی) ........................ ١٥٩
باسی پێنجەم: (قورئانو ئایینەکان) ........................ ١٦٥
بەشی سێیەم: (ئیسلام و ئایینەکان) ........................ ١٨٧
باسی یەکەم: (مەشخەڵەکانی ئیسلام) ........................ ١٨٧
باسی دووەم: (یەکخواپەرستی) ........................ ٢٠٣
دواجار ........................ ٢٣٠
باسی سێیەم: (بە شارستانی کردنی مرۆڤایەتی و ڕزگارکردنی مرۆڤ لە کۆیلایەتی)........................ ٢٣٥
باسی چوارەم: (بنیادی کۆمەڵگەو مرۆڤ)........................ ٢٧١
باسی پێنجەم: (ئیسلام و ئایینەکان)........................ ٢٩١
پاشکۆی یەکەم: کورتەیەك لەسەر مەنسووری حەلاج ........................ ٣٠١
بەرهەمەکانی حەللاج ........................ ٣١٠
بۆچی حەلاج کوژرا؟ ........................ ٣١٣
پاشکۆی دووەم: ئازادی ڕادەربڕین لە مێژووی ئیسلامیدا ........................ ٣١٧

**بەشی چوارەم: (ئیسلام و جیهانی هاوچەرخ)** ........................................ ٣٣٥

**باسی یەکەم:: (ئیسلام و جیهانی هاوچەرخ)** ........................................ ٣٣٥

**باسی دووەم: (تەنگژەی ئایینی ڕۆژئاوا)** ........................................ ٣٥٧

**باسی سێیەم: (جوولەکایەتی لە هەوڵی تەنگپێهەڵچنینی ئیسلامدا)** ................ ٣٧٧

**باسی چوارەم: (مارکسیەت لە بەرەنگاربوونەوەی ئیسلامدا)** ........................ ٣٩٣

**باسی پێنجەم: (ئیسلام و مرۆڤایەتی)** ........................................ ٤٠٧

**ناوەڕۆك** ........................................ ٤٢١

